# دیوانی ئەدەب

## عەبدوڵڵا بەگی میصباح دیوان

کۆکردنەوە، بەراورد، ساغکردنەوە و فەرهەنگ:

**محەمەد حەمەباقی**



کتێب: دیوانی ئەدەب – عەبدوڵڵا بەگی میصباح دیوان
کۆکردنەوە، بەراورد، ساغکردنەوە و فەرهەنگ: محەمەد حەمەباقی
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ٣٧٩
دەرهێنانی هونەری ناوەوە و بەرگ: ئاراس ئەکرەم
پیت لێدان: تریسکە ئەحمەد حەمید
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر– ٢٠٠٥
لە کتێبخانەی گشتیی لە هەولێر ژمارە (٣٦٣)یساڵی ٢٠٠٥ی دراوەتێ

پێشکەش بەهاوڕێیانم لە شاری بۆکان، کاکە:

**ئاسۆ «محەمەد سەعید نەجاڕی»          ناسر وەحیدی**

**یونس ڕەزایی**

بۆ ماندووبوونە بێ سنوورەکانیان لە پێناوی جوانتر نیشاندانی
عەبدوڵڵا بەگی میصباح دیوان «ئەدەب»دا.



## سوپاس و پێزانین

ئەمجارەش وەک زۆرینەی کتێبەکانی پێشووترم، مامۆستایان و هاوڕێیان و دڵسۆزانێکی زۆر، بەشێوەی جیا جیا، بوونە ڕێنوێن و پشتیوان و هاوکارم، تا ئەم کتێبە بەم شێوەیە ئامادە ببێ. بۆیە دەبێ ڕێز و سوپاس و پێزانینی خۆمیان پێشکەش بکەم و ئاوات بخوازم هەمیشە وێنەیان زۆر بێ. ئەو مامۆستا بەڕێزانەش:

ئەحمەد هەردی
محەمەد عەلی قەرەداخی
نوری فارس حەمەخان
ناسری وەحیدی (چیرۆکنووس – بۆکان)
ئاسۆ «محەمەد سەعید نەجاڕی» (شاعیر – بۆکان)
یونسی ڕەزایی (شاعیر – بۆکان)
یونس ئەمین پوور (نووسەر – گوندی ڕەحیم خانی بۆکان)
جەعفەری کیانی (مەهاباد)
عەبدولخالقی یەعقووبی (ڕەخنەگر – بۆکان)
ڕەشید کرمانج (نووسەر – بۆکان)
قادری عەبدی (سەقز)
شاپوور حەسەن نەژاد (سەقز)
ڕەسووڵ ئاغای ئێلخانی زادە (ساری – مازەندەران)
مەنسوور شەهلایی (سەقز)

نەوەکانی عەبدوڵڵا بەگی میصباح دیوانی شاعیر (بۆکان و گوندەکانی دەوروبەری)
خاتوو تریسکە ئەحمەد، لە دەسگای چاپ و بڵاوکردنەوەی «ئاراس» کە زۆر بەدڵسۆزییەوە لەگەڵ تایپکردنی ئەم کتێبەدا، ماندوو بووە.
ئاراس ئەکرەم لە دەسگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس کە بەسەلیقەیەکی جوان ئەم دیوانەی بەم ڕازاوەییە دەرهێنا.
نەجیبە ئەحمەد هاوڕێ و هاوسەر، کە هەڵەگیریی ئەم کتێبەی لە ئەستۆ گرت.
ڕاسان محەمەد حەمە باقی، جگەرگۆشم کە لە ئامادەکردنی فەرهەنگی ئەم کتێبەدا یارمەتی دام.

## بەرایی

## عەبدوڵڵا بەگی میصباح دیوان

قوتابخانە شیعرییەکەی نالی و هاوڕێکانی، کە لە ناوەڕاستی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدە، لە کوردستانی خوارووودا چاوی هەڵهێنا، لە ناو زەمینە و کەش و هەوایەکی سیاسی پڕ لە دەستێوەردانی دوو دەوڵەتە زلهێزەکەی ئەو سەردەمە: قاجاری و عوسمانی، لە کاروباری ناوخۆی میرنشینی بابان و ئاژاوە و دووبەرەکی و شەڕی براکوژی نانەوە لە نێوان سەران و ئەندامانی بنەماڵەی بابان و شەڕی میرنشینی بابانیش لەگەڵ هەردوو میرنشینی ئەردەڵان و سۆران لە لایەک و لە لایەکی تریشەوە ململانێی گەرم و سامناک و بەربڵاوی تەریقەتی «قادری» و «نەقشبەندی»، کە هەردوو زانای ناودار شێخ مارفی نۆدێ و مەولانا خالید ڕابەرایەتییان دەکرد، هەموویان پێکەوە و جیاجیا، بەشێوەیەک لە شێوەکان: ئاشکرا و نهێنی، ڕەمزیی و تەماویی، وایان کرد ڕەنگدانەوە و جێ پەنجەی خۆیان لە هەوێنکردن و فرچک گرتنی شیعری ئەو سەردەمەدا جێ بهێڵن؛ کە سەرئەنجام دەتوانرێ بوترێ: سەرەڕای ئەوەش کە شیعری نالی و هاوڕێکانی، بەر لە هەموو شتێک، لایەنە ستاتیکی و جوانییەکانی شیعریان لە سەروو شتەکانی ترەوە لەبەرچاو گرتووە؛ بەڵام دیسانیش خوێندنەوەیەکی سەرلەبەری ئەو قوتابخانە شیعرییە، خوێندنەوەیەکی فرە لایەنە و وردی کۆمەڵگەی ئەو سەردەمەی کوردەواری بەگشتی و کوردستانی خوارووە بەتایبەتی.

ئەم قوتابخانە شیعرییە، ئەگەرچی لە ماوەیەکی زۆر کورتی مێژووییدا، سنووری قەڵەمڕەوی بابانی بڕی و بەهەر چوار دەوری خۆیدا تەنییەوە و تەنگی بەسنوور و مەڵبەندەکانی شیعری دیالیکتی «گۆران»یش هەڵچنی و لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا گەیشتە کوردستانی ئێران و بەخێرایی بەناوچەکانی موکریان و ئەردەڵاندا بڵاوبووەوە؛ بەڵام ئەوەی جێی سەرنج و لێرامان و لێکۆڵینەوەیە، ئەوەیە کە ئەم شیعرە لە کاتی پەڕینەوەیدا بۆ کوردستانی ئێران، هەر تەنیا شێوە زمانەکەی، لای شاعیرانی وەک: سالمی



سنە، حەریق، وەفایی، میسباح دیوان، مەجدی و... بووە سەرمەشق، نەک ناوەڕۆکی گرژ و کەش و هەوای توورە و ناڕەزایی مرۆڤی ستەمدیدەی کورد؛ لە کاتێکدا کە سیما گشتییەکانی قوتابخانە شیعرییەکەی نالی و هاوڕێکانی، لەم قۆناغەدا (نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە) لە ڕوانگەی ناوەڕۆکی شیعری: مەحوی، حاجی قادری کۆیی و شێخ ڕەزای تاڵەبانییەوە، توورەتر و یاخیتر و شۆڕشگێڕانەتر هەڵدەکشا.

ئەم سەرنج و لەنگەرگرتنەش لەسەر ناوەڕۆکی شیعری ئەو قۆناغەی کوردستانی ئێران، خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی بابەتییانە و تایبەتی و تێروتەسەلی لەسەر تایبەتمەندێتی هەلومەرجی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەو بەشەی کوردستان و زەبری مێژینەی شیعری فارسی، لەسەر دەروونی مرۆڤی کورد و لەسەر شیعری کوردستانی ئێران؛ نەک ئەم بەسەرکردنەوە خێرایە.

لەم بەسەرکردنەوە خێرایەدا دەڵێین: ئەگەر شاعیرانی وەک سالمی سنە، وەفایی، حەریق و... هەریەکەیان بەشێوەیەک، نوێنەری قوتابخانە شیعرییەکەی نالی و هاوڕێکانی بن و پێناسەی ناوکۆیی هەموویان بریتی بێت لە بۆنوبەرامە و توێژاڵی لاساییکردنەوەی ئەزموونی شیعری عیرفانی تەمەن درێژی ئێرانی؛ ئەوا ئەزموونی شیعری «**ئەدەب**»، ئەزموونێکی جیاواز و تایبەت و لە هەموویانیش سەربەخۆترە.

لەم ئەزموونە شیعرییەی «**ئەدەب**»دا، سەرەڕای ئەوەش کە ئەم شاعیرە لە چاو تێکڕای شاعیرانی هاوسەردەمی خۆیدا، نزیکترین نوێنەری شیعری نالییە و جێپەنجە و بۆنوبەرامەی لاساییکردنەوەی شیعری **نالی**، لە چەند غەزەل و پێنج خشتەکی و تاک بەیتدا، بەقۆناغی سەرەتای ئەزموونەکەیەوە دیارە و لە ڕستە دارشتن و وێنەسازیی شیعریشدا زۆر لە **سالم** نزیکە؛ بەڵام لە هەمان کاتدا تا بەرەو قووڵترچوونی ئەزموونەکە چووە، بەرەو خۆ دەربازکردن و تەقەللای خۆ پێکەوەنان و سازکردنی کەش و هەوای تایبەتمەندێتی خۆی و خۆ جیاکردنەوە لە نالی و لە هاوڕێکانی خۆیشی چووە.

لەم بوارەدا بەو هۆیەوە کە عەبدوڵڵا بەگ «**ئەدەب**» لە چاو شاعیرانی هاوسەردەمی خۆی (کوردستانی ئێران)دا، تایبەتمەندترین و پڕ بەرهەمترینیانە، بۆیە بەئاسانی دەتوانرێ لەم ئەزموونی خۆ جیاکردنەوەیەدا، ئەم لایەنە لە گەشەکردنی قۆناغی شیعری «**ئەدەب**»دا هەست پێ بکرێ؛ کە تا تەمەنی ئەزموون و بەخشینە شیعرییەکەی درێژتر و قووڵتر دەبێتەوە، سیما و تایبەتمەندێتی عەبدوڵڵا بەگیش درەوشاوەتر دەردەکەوێ؛ بەتایبەتیش لە

ساکارنواندن و سفت و سۆڵ و زوڵاڵ دەرخستنی بروسکەئاسای مەبەستەکانیدا، کە لە دەرفەتی ڕستەی زۆر کورتدا، وێنە و مانای ڕەنگین و بەربڵاو، دەسازێنێ و لە بەکارهێنانی واژە و دەستەواژەشدا، لە شێوە ئاخاوتنی ئاسایی و ڕۆژانەی ناوچەکەی خۆی نزیک و نزیکتر دەبێتەوە، بەجۆرێک ئەگەر لەم بەسەرکردنەوەیەدا ئەوەمان لە یاد بێت، کە بەر لە قۆناغی تەنینەوەی قوتابخانە شیعرییەکەی نالی و هاوڕێکانی، بۆ ناوچەی موکریان، لە سەدان ساڵ پێشترەوە، تاقانە ژانری ئەدەبیی کوردی ناوچەکە، «**بەیت**» بووبێ؛ ئەوا ئەوەش دێتە یادمان کە زەبری زایەڵە و شنینەوەی ڕەگەزەکانی «**بەیت**» لە نەستی عەبدوڵڵا بەگدا بەردەوام زرنگابێتەوە، بەتایبەتی لەو کلاوڕۆژنەیەوە کە خودی عەبدوڵڵا بەگ و بنەماڵە ئاکار ئۆرستۆکراتی و فیۆداڵەکەیان، لە دێرزەمانەوە لەو دەستڕۆیشتووانە بوون، کە هەمیشە «بەیت بێژ»ی دەنگخۆش لە دیوەخانەکانیان نەبڕاوە.

لەم دەرفەتەدا ئەگەر هەندێ لە نیشانە دیارەکانی ژانری «**بەیت**» بەیاد بهێنینەوە، دەتوانین ڕایەڵ و سەرەداوی هاوبەش لە نێوان «**بەیت**» و کەش و هەوای شیعری عەبدوڵڵا بەگدا بەدی بکەین...

لە نیشانە سەرەتایی و دیارەکانی «**بەیت**»:

١- ڕستەی کورتی بروسکەئاسا، کە بریتییە لە دەربڕینی واتای زۆر، بە وشەی کەم.

٢- ڕازاندنەوەی کۆپلە و بەندی بەیتەکان، بەناواخنکردنی وێنەی ساکار و ڕەسەنی ژیانی کوردەواری.

٣- سەرەڕای تراژیدیبوونی سەرومڕی بەیتەکان، بەڵام لە هەمان کاتیشدا سیخناخن بەگیانی شاد و ئاهەنگاویی و دیمەنی ڕەنگین و خەون و خۆزگەی بەردەوام.

٤- لەمانەش لە بەرچاوتر: وێنەی «ئافرەت»ە.

ئافرەت لە «**بەیت**»دا، وێنەیەکی زاڵ و ئاشکرای هەیە، کە سەرلەبەری بۆشاییەکانی کۆپلە و بەندەکانی «**بەیت**» پڕ دەکاتەوە...

ئامادەبوونی هەمیشەی ئافرەت لە بەیتدا، ئامادەبوونێکی ئافرەتانەیە، بەهەموو تایبەتمەندێتی ئافرەتانەی خۆیەوە بەگشتی و وەک ڕەگەزێکی مێینە بۆ ڕازاندنەوەی ژیان و بۆ پاراوکردنی حەز و تامەزرۆیی پیاو بەتایبەتی... کە لەم وێنە ئاشکرایەی ئافرەت لە بەیتدا، سیمای دەرەوەی ئافرەت لە بەرچاو دەگیرێ، هەر لە ڕازاندنەوەی جلوبەرگ و خشڵ و جوانییەکانییەوە، تا پێناسەکردنی بێ پەردەی ئەندام و لەشولاری.



بەواتەیەکی تر: ئەوەندەی لە بەیتدا ئافرەت وەک جەستە بەدی دەکرێ؛ ئەوەندە وەک ڕۆح بەسەر ناکرێتەوە... جەستەی ئافرەت لە بەیتدا، جگە لەوەی ئامادەبوونێکی هەمیشە و بێ هەدادانی هەیە، هاوکات ئامادەبوونێکی نزیکیشی لە پیاوەوە هەیە، کە لە بەیت و «گۆرانی»یشدا لە ناوچەی موکریان (بەناوچەکانی فەیزوڵڵا بەگیشەوە) بەپێچەوانەی زۆربەی ناوچەکانی تری کوردستانەوە، تێکستی بەیت، کەمتر واژەگەلی وەک: ئاخ و ئۆف و حەسرەتی لێک دابڕان و دووریی بۆ ئافرەت تێدا هەیە؛ بەڵکو ئافرەت سەرەڕای ناز و عیشوە و دەستەمۆ نەبوونیشی بۆ پیاو، بەڵام لە نزیک پیاو و بەبەرچاوی پیاوەوە خۆ دەنوێنێ و ئارەزووەکانی پیاو دەوروژێنێ...

ئەم نیشانانەی بەیت، بەهەموویان پێکەوە، تایبەتمەندیی و سەربەخۆییەکی ئەوەندە بەرچاویان بە«**بەیت**» بەخشیوە، کە دەتوانرێ بوترێ: ژانری بەیت؛ نەک هەر بەتەنیا جیاوازیی و مەودایەکی زۆری لەگەڵ ژانرەکانی تری ئەدەبی ئێرانیدا هەیە، کە تێکڕایان نوقمی عیرفانێکی دێرینەن و هەموویان ئافرەت وەک «ڕۆح» و وەک بەشێک لە جوانییەکانی خودا سەیر دەکەن؛ بەڵکو «**بەیت**» جیاوازیی لەگەڵ ژانر و بابەتەکانی تری ئەدەبی فۆلکلۆری ناوچەکانی تری کوردستان و ئەدەبی نووسراوی کوردی-یشدا هەیە.

لەم پێوەدانەوە؛ کاتێ دەزانین جێ پەنجە و زەبری ئەم ڕەگەزانەی بەیت، لە شیعری «**ئەدەب**»دا شەپۆل دەدەنەوە، یان بەواتەیەکی تر: کاتێ دەزانین شیعری «**ئەدەب**» تێکەڵەیەکی فرە هەوێن و فرە دەستەچیلەی ئەم ڕەگەزانەیە، ئەوسا دەزانین کە شیعری «**ئەدەب**» جیاوازییەکی بەرچاوی لەگەڵ شیعری شاعیرانی کوردی هاوسەردەمەکەشیدا هەیە... کە هەر ئەم جیاوازییەش پێناسەیەکی تایبەت و سەربەخۆی بەشیعری «**ئەدەب**» بەخشیوە.

جیاوازیی و تایبەتمەندیی شیعری «**ئەدەب**» لەگەڵ شیعری سەرومڕی شاعیرانی کورد بەگشتی و لەگەڵ شاعیرانی هاوڕۆژگار و هاوناوچەی خۆیشیدا بەتایبەتی، جێگەی سەرنج و لێڕامانە؛ چونکە لە هەموو سەردەمێکدا شاعیرانی هاوڕۆژگار و هاوناوچەی یەکتر، لە هەر جێگەیەکی ئەم سەرزەمینەدا بووبن، کەم و زۆرێک نزیکایەتییان لە وێکچوونی وێنەی شیعریی و واژە و دەستەواژە و کەش و هەوای شیعریدا هەبووە... بۆ وێنە دەڵێین: نالی و سالم و کوردی، ئەوەندە کەرەسەی شیعرییان لە یەکتر چووە، کە تا ئێستاش مشتومڕ لەسەر هەندێ شیعریان هەن، کە ئاخۆ شیعری کامیانن!... لە کاتێکدا ئەم سێ

شاعیره، بەهۆی هەلومەرجی سیاسی سەردەمەکەیانەوه، چەند جارێکیش ئەوەندە لە یەکتر هەڵبڕاون، کە سەدان و هەزاران کیلۆمەتر لە یەکتر دوورکەوتوونەتەوه... یان شاعیرانی وەک: مەحوی، حاجی قادری کۆیی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی؛ ئەمانیش لەگەڵ ئەوەدا کە بەجوگرافیاش لەیەکەوە دووربوون، کەچی پردی نێوانی هەرسێکیان بریتییە لە کەش و هەوای توورەیی و یاخیبوون و شۆڕشگێڕێتی و... هەر ئەمانیش کە هاوڕۆژگاری «**ئەدەب**»ن، بەڵام چ نزیکایەتیی و کەش و هەوایەکی وێکچوویان لەگەڵ شیعری «**ئەدەب**»دا نییە... کە ئەم وێکچوونە شیعرییە، تا دوایین دەستەی شاعیرانی ئەم قوتابخانە شیعرییە: ئەحمەد حەمدی ساحێبقڕان، ئەحمەد موختار جاف، عەلی باپیر (کەمالی)، بێخود و... هتد، بەشێوەیەکی گشتی هەروا ماوەتەوه.

لە پاڵ ئەم سەرنجانەدا، ئەگەر ئەو بیروڕا سەلێمنراوەشمان لەسەر شێوە دیالیکتی قوتابخانە شیعرییەکەی نالی لە یاد بێت؛ کە هەموو شاعیرانی ناو بازنەی ئەم قوتابخانە شیعرییە، دیالیکتی «بابان»یان بەو شێوەیە کردبێتە سەرمەشق، کە نالی ڕەنگی بۆ ڕشتوون (بەشاعیرانی کوردستانی ئێرانیشەوه: وەفایی، سالمی سنە، حەریق، مەجدی و ئەدەب). بەڵام دیسان لەگەڵ ئەوەدا کە «**ئەدەب**»یش وەک: وەفایی، مەجدی، سالمی سنە و... لەو پێشەنگ و سەرباشقانە بوون، کە بۆ یەکەمین جار شێوە زمانی ئەدەبی یەکگرتووی «بابان»یان کردۆتە سەرمەشق و بەشێوەی نووسین لە ناو خوێندەوارانی ناوچەکانی موکریان و ئەردەڵاندا بڵاویان کردۆتەوە و برەویان پێداوه؛ کەچی لە هەمان کاتدا، لە شیعری «**ئەدەب**»دا هەست بەجۆرێک لە پڕکێشیی و چاوقایمی دەکەین، کە لەتەک سەرمەشقکردنی دیالیکتی باباندا، شێوە ئاخاوتنی ڕۆژانە و سادە و ساکاری ناوچەی موکریانیشی پێ موتوربە و ئاوێتە کردووه!، لە کاتێکدا ئەم تەقەللایەی «**ئەدەب**»، لای شاعیرانی وەک شێخ ڕەزای تاڵەبانی (کەرکووک)، حاجی قادری کۆیی (کۆیە)، تاهیر بەگی جاف (بناری هەورامان)، سالمی سنە (ئەردەڵان) و... نەکراوه؛ کە شێوە ئاخاوتنی ناوچەی هەریەکێکیان، لەگەڵ شێوە ئاخاوتنی ئەو کاتەی ناوچەی باباندا (بەئێستاشەوە) جیاوازیی زۆریان هەبووه... تەنانەت ئەم تەقەللایە لای شاعیرێکی وەک «وەفایی»ش-کە هاوشێوەزار و هاوشاریی «**ئەدەب**»ە؛بەو ئەندازە بەرچاوە نەکراوه.

نیشانەیەکی تری بەرچاوی شیعری ئەدەب، بەشێوەیەکی گشتی، بایەخدان و گرنگیدانێتی بە«غەزەل»، کە دیاردەیەکی زەق و سەرومڕی دیوانی «**ئەدەب**»ە و جگە لە



چەند پێنج خشتەکییەک، ئیتر دیوانەکەی هەر غەزەلە و کەمتر لای لە قەسیدەی درێژ کردۆتەوه؛ کە نوێنەرانی ڕێبازی نالی و سالم و هاوڕێکانیان، ئەم ئەزموونەیان هەیە، بەڵام ئەم تاقیکردنەوەیە لای «**ئەدەب**» نییە؛ بەڵکو «غەزەل» لایەنی هەرە دیار و زاڵی دیوانی شیعری «ئەدەب»ە و دیسانیش وەک هەموو تایبەتمەندییەکانی تری هونەری ئەم شاعیره، لە زۆربەی غەزەلەکانیدا شێوازی (یەکێتی بابەت) بەدی دەکەین؛ کە ئەم دیاردەیە لە غەزەلی کوردیدا بەمجۆرە پەیڕەو نەکراوه، بەڵکو زەقترین سیما گشتییەکانی غەزەلی کوردی، سەربەخۆیی بەخشینە بە تاکە بەیت و ئەم کارەش وا کەوتۆتەوه، کە هەر تاکە بەیتێک، لەگەڵ بەیتی پێش خۆی و دوای خۆیدا، ئەوەندە سەروپێوەندی (یەکێتی بابەت)یان بەسەریەکەوە نەبێت... کەچی لای «ئەدەب»، زۆرینەی بەیتەکان، پێوەندی و ڕایەڵی هاوبەشییان لەگەڵ یەکتردا هەیە. ئەمەش گەوهەری ئەو گۆڕانکارییەیە، کە «ئەدەب» بەسەر غەزەلی کوردیدا هێناوه.

لە دوو توێی ئەم غەزەلە پڕ لە بۆنومەرامە و کەش و هەوا جیاوازەوه، کە لە هەموویاندا هەر دەنگ و ڕەنگ و مۆرکی تایبەتی «**ئەدەب**» هەست پێ دەکەین، ڕوخسار و دیمەنی شۆڕئافرەتێکی نازەنین دەبینین، کە وەک گوڵ ئەستێرەیەکی درەوشاوه، لە هەناوی هەموو کۆپلە و بەیت و تەنانەت لە پەنجەرەی هەموو وشەیەکەوه، سەرەتاتکێ و چاوبڕکێیەکی نوقمی ناز و هەڵوەداکردن لەگەڵ «**ئەدەب**»دا دەکات و لەگەڵ هەموو درەوشانەوە و دەرکەوتنێکیشدا، وێنەیەکی تری ڕوخسار و لەشولاری جوان و دڵبزوێنی دەنوێنێ و بەجۆرێک خۆی نیشانی «**ئەدەب**» دەدا؛ وەک ئەوەی بۆ دیدار و ژوان بانگی بکات... کەچی کە شاعیر دەیەوێ بگاتە نزیکی و لێی تێبگات، ئەم ئافرەتە-گوڵئەستێرە، لە غەزەلێکەوە بۆ غەزەلێکی تر باڵ دەگرێ و پەژارەیەکی جوان و بێ سنوور و بێبڕانەوه، بۆ «**ئەدەب**» دەخولقێنێ... کە ئەم پەژارەیە لەم غەزەلانەدا، دەبێتە شەیدابوونێکی بێ پەروا، بۆ جوانی و بۆ دیدار و بۆ بەڵێن و بۆ ژوانێکی تراویلکەیی و ئەمانەش ئارام و ئۆقرە و حەسانەوە و هۆش و خەو، لە گیان و لە چاوە هەمیشە بێدارەکانی «**ئەدەب**» دەفڕێنن.

بەواتەیەکی تر: ئەم غەزەلانە، نهێنییە شاراوەکانی دڵدارێکی موکریانین، کە لە کاتی عەشقێنیدا، بێ پەروا دەڕسکێن و دەدرکێن... خۆ ئەگەر هەر عاشقێکی تری گومناوی هەمان ناوچە و لە پێش «**ئەدەب**»دا، ئەم نهێنییانەی لە دەلاقەی «**بەیت**»ەوە درکاندبێ؛ ئەوا «**ئەدەب**» ئەم نهێنییە درکاوانەی لە پەنجەرەی شیعری عەرووزئامێزدا نەخشاندن؛ کە پێش

«**ئەدەب**» و دوای ئەویش، کەسێکی تر، ئەم دڵبەرە تایبەتەی بەم شێوازە تایبەت و جیاواز و هونەرکارییە نەڕازاندۆتەوە...

ئەم دڵبەرە تایبەت و ڕازاوەیەی ئەم هەموو پەژارە و دڵەڕاوکە جوانەی لەم غەزەلانەی «**ئەدەب**»دا، بۆ ئەدەبی کوردی جێهێشتوون، ئافرەتێک نییە کە «**ئەدەب**» لە خەیاڵی شاعیرانەی خۆیدا ڕازاندبێتەوە؛ بەڵکو ئافرەتێکی ئاسایی «نوسرەت خانم»ی[1] ناوچەکەی خۆیەتی، کە هەروەک تایبەتمەندیی بەشیعری «**ئەدەب**» بەخشیوە، هەر بەوجۆرە هەڵسوکەوت و ئاکاری تایبەتیشی بەژیانی ڕۆژانە و سروشتی دڵدارانەی «**ئەدەب**»ی ئاکار ئەرستۆکراتیانە و فیۆداڵانە بەخشیوە... بۆیە «**ئەدەب**» ئاکار و هەڵسوکەوتی تایبەتی و جیاوازیشی لەگەڵ ئەم دڵبەرەیدا نواندووە؛ کە وەک خەڵکی ناوچەکەیان دەگێڕنەوە: کاتێ نوسرەت خانم، لە گوندەکەی خۆیانەوە، واتە: لە ئاوایی «کانی مەمیلە»وە بەرەو «ئەرمەنی بلاغ»ی گوندەکەی «**ئەدەب**» بەبووکیی بۆ «**ئەدەب**» گوێزراوەتەوە، ئەدەب بەدرێژایی ڕێگەی نێوان کانی مەمیلە و ئەرمەنی بلاغ، قوماشی قەیفە (مەخمەڵ)ی لە بەرپێ و لە سەرەڕێی نوسرەت خانمدا ڕاخستووە و دوای هەموو هەنگاو هەڵهێنانێکی، کچان و ئافرەتانی هەردوو گوندەکە، پەلەی بڕین و بەرکەوتنی بەشی خۆیان لەو قوماشە قەیفەیە کردووە، تا کلۆنجەی لێ دروست بکەن...

یا دەڵێن: هەر لە گەرمەی ئەم ئەوینەی «**ئەدەب**»دا بۆ نوسرەت خانم، کە بەهرەی «**ئەدەب**»

---

(١) نوسرەت خانم، کچی موظەففەر سوڵتانی ئەمیرتومانی کوڕی زەفەرولدەولە، کوڕی فەڕوخ خانی برا گەورەی عەزیز خانی سەرداری بۆکان بووە... شایانی باسە، عیزەتوڵڵا خانی باوکی نوسرەت خانم، مۆسیقاژەن و دەنگخۆش و خەتخۆش بووە... هێشتا «**ئەدەب**» لە ژیاندا بووە، کە نوسرەت خانم لە ڕۆژگاری نەخۆش کەوتنی «**ئەدەب**»دا، تەڵاقی لێ وەرگرتووە و لە پێشدا شووی بە«ئەمیرتومان»ی فەرمانڕەوای سابڵاخ کردووە و دوایی مێردی بە(عەلی ئاغای-گەورک) کردووە و دواییش بە(سەیفەدین خان-ی سەقز)...[*] هەرچەندە نیکیتین- کە هاوڕۆژگاری «**ئەدەب**» بووە و ناسیاویی لەگەڵ «**ئەدەب**»دا پەیدا کردووە-دەڵێ: نوسرەت خانم هەرگیز نەبۆتە ژنی «**ئەدەب**». (واتە: ماوەیەکی زۆر کەم هاوسەری «**ئەدەب**» بووە و بەلایەوە دانەنیشتووە) بنواڕە: نیکیتن، کُرد و کردستان-بررسی از نظر جامعەشناسی و تاریخی-ترجمەء: محمد قاضی، انتشارات نیلوفر، چاپ اول، تابستان ١٣٦٦ش ص ٢٢٥.

*(*) ئەو زانیارییانەم لە مامۆستا عەبدوڵڵای کوڕی حاجیساڵح مەحموودی (١٩٢٤ز)ی دانیشتووی شاری «بانە» وەرگرتووە، کە ئێستا مامۆستای خانەنیشنە.*



لە نیگارکێشانیشدا، لە بەهرەی شیعری کەمتر نەبووە؛ دیوار و دەرگای ژوورە تایبەتەکەی خۆی، بەوێنەی نوسرەت خانم ڕازاندۆتەوە و هەموو سەری ساڵێکی تازە، کە دەکاتە: نەورۆز؛ بۆ نەورۆزانە، ڕەنگی کراسی وێنەکەی نوسرەت خانمی بەڕەنگێکی جیاواز و تازە گۆڕیوە و وتوویەتی:

ساڵی تازەیە و دەبێ نوسرەت خانمیش کراسی تازە لەبەر بکات.

لە جێی خۆیدایەتی، لە باسی بەهرە جیاوازەکانی «**ئەدەب**»دا، جگە لە بەهرەی نیگارکێشیی، دەبێ باسی بەهرەی خۆشنووسی «**ئەدەب**» بکەین، کە خاوەنی خەتێکی زۆر جوان و خۆش بووە... هەروەها شارەزاییەکی زۆری لە زانستی مۆسیقا و ئامێرەکانی مۆسیقاشدا هەبووە، کە لە هەندێ لە شیعرەکانی «**ئەدەب**»دا بەگشتی و لە دوا شیعری کوردی ئەم دیوانەدا بەتایبەتی، کە بەناوی «گۆرانی» یادداشتم کردووە؛ بەڵگەی ئەوە دەردەکەوێ، کە «**ئەدەب**» شارەزایی و ئارەزوویەکی زۆری لە مۆسیقا و ئاواز دانان و گۆرانیدا هەبووە و ئەم گۆرانییانەی «**ئەدەب**»، تا ئێستاش لە ناوچەی موکریاندا دەوترێنەوە. هەروەک پیران و بە ساڵاچووانی ناوچەکە دەگێڕنەوە: «**ئەدەب**» دەنگیشی زۆرخۆش بوو.

جگە لەم بەهرانەش، هەر لە ناو ئەو دەستنووسانەی «**ئەدەب**»دا، کە دواتر «لە دەرفەتی وتارێکی جیاواز و سەربەخۆ لەم پێشەکییە» باسیان دەکەین و دەستمان کەوتوون، دەستنووسێکی زۆری «**ئەدەب**» هەن و تیایاندا چۆنێتی دەرمان گرتنەوە و زانیاریی «**ئەدەب**» لە بواری زانستی «پزیشک»دا دەردەخەن.

هەموو ئەم بەهرە جیاوازانەش پێکەوە، بەڵگەی خوێندەوارییەکی باڵا و فرە لایەنەی «**ئەدەب**» نیشاندەدەن، کە بۆ ئەو ڕۆژگارەی سەدەیەک زیاتر لەمەوبەری کوردستان، دیاردەیەکی جیاواز و بەرچاو بووە و وەک ڕووناکبیرێکی هەڵکەوتە و ناسراو لە ناوچەکەدا درەوشاوەتەوە؛ بۆیە کوردناسێکی ناوداری وەک؛ ڤاسیلی نیکیتین (١٨٨١-١٩٦٤ز) کە لەو سەردەمەدا لە ناوچەکانی ئازەربایجان و ورمێ، خەریکی کۆکردنەوەی هەواڵ و زانیاریی بووە، بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر کاروباری کوردۆلۆژی، چۆتە سابڵاخ (مەهاباد) و تەقەڵلای دیدار و دیتنی «**ئەدەب**»ی داوە و وەک «نیکیتین» خۆی دەیگێڕێتەوە، لە شاری سابڵاخ دیداری لەگەڵدا ئەنجامداوە.[1]

---

(١) بنواڕە: نیکیتین- کُرد و کُردستان-ص ٥٨٣ - ٥٨٤.

هەڵبەتە «**ئەدەب**» خۆیشی، هەروەک پلە و پایەی شاعیرێتی و خوێندەواریی خۆی دەناسێ؛ بەهەمان شێوەش مەودا و جیاوازیی نێوان خۆی و کۆمەڵگەکەی دەناسێ و لە چەندان شیعردا، دەردە دڵ لە دەست ئەو نەخوێندەوارانە دەکات، کە بایەخی بەهرەی ئەم، دەرک پێ ناکەن و زۆر ئازایانە و یاخیبووانەش بەگژ نەریتە سەپاو و دواکەوتووەکاندا دەچێتەوە و توانج و تەشەری چاوقایمانەش لە هۆکارانی ئەو دواکەوتنە دەدا و دەستنیشانیان دەکات، کە بریتین لە پیاوانی ئایینی!



## من و ئەم دیوانە

١

ساڵی **١٩٨٩**، نووسەر و هونەرمەندی شاری سەقز: مامۆستا موحسینی سدیقی (١٩٣٥-١٩٩٤)، کە گەنجینەیەکی دەگمەنی بوارەکانی: فەرهەنگ، مۆسیقا، گۆرانی و... لە ئەرشیفە دەوڵەمەندەکەیدا بوو، ئاگادارمی کرد لەوەی لە دەمێکەوە دیوانێکی دەستخەتی «**ئەدەب**»ی بەلاوەیە و پێی خۆشە بەمەبەستی چاپکردنی، بەلاوەمی بنێ و لوتفی کرد دیوانی ناوبراوی لا دانام.

ئەم دیوانە دەستخەتە بریتییە لە (٧٤) لاپەڕەی قەوارە (٢١سم × ١٥سم) و لە هەر لاپەڕەیەکیشدا (١٥ تا ١٨) دێر شیعری بەخەتێکی زۆر خۆش و جوانی نەستەعلیق تێدا نووسراوەتەوە.

بەڵام ئەو کاتەی مامۆستای ناوبراو ئەم دیوانە دەستخەتەی بەلاوە دانام، سەرگەرمی ئامادەکردن و چاپی هەردوو کتێبی: **مێژووی مۆسیقای کوردی** و **سەیید عەلی ئەسغەری کوردستانی** بووم و هەردووکیشیان جگە لە پێویستی کاری نووسین، پێویستییان بەکاری گەڕان و دیتن و هەڵسووڕانی مەیدانیی بوو... لەبەر ئەوە دەبووایە نۆرەی ئامادەکردنی ئەم دیوانە، بۆ دەرفەتێکی لەبار و ڕەخساوتر بهێڵمەوە؛ چونکە لە یەکەمین بەراوردی سەرپێیی دەستخەتەکە و نوسخە چاپەکانی دیوانی «**ئەدەب**»دا، سەرنجم دا جیاوازییەکی یەکجار زۆر و شپرزە لە نێوانیاندا هەبوو... بۆیە کاری هێنانە سەر ڕێنووس و بەراوورد و ساغکردنەوەی ئەم دیوانەم خستە دوای ئەنجامدانی کاری ئەو چەند کتێبەی لەو کاتەدا لە بن دەستمدا بوون...

چەند ساڵێکی خایاند و بەردەوامیش سەرقاڵییم کەمی نەدەکرد؛ بۆیە بەچاکم زانی بۆ زەمینە خۆشکردنی هێنانە سەر ڕێنووسی ئێستای دەستخەتەکە، داوا لە مامۆستا (حسێن مەولایی-سەقز) بکەم، تا لەو بوارەدا تەقەڵلایەکی لەگەڵدا بدات، ماوەی نزیک ساڵێک دەستخەتەکە لای ناوبراو مایەوە و دیار بوو دەرەقەتی خوێندنەوە و هێنانە سەر ڕێنووسی ئێستای کوردی نەهاتبوو؛ بەڵام هەندێ غەزەلی تا لاپەڕە (٣٠) بەهەڵە و نیوەناچڵی (گوایە) هێنا بووە سەر ڕێنووسی ئێستا... ناچار لێم وەرگرتەوە و دیسانەوە چەند ساڵێکی تریش لای خۆم دامنایەوە... تا جارێک لەگەڵ هاوڕێی چیرۆکنووسی بۆکانی:

کاکە ناسری وەحیدی دا پێشنیاری ئەوەم کرد، کە بۆچی دیوانە دەستخەتەکەی «**ئەدەب**» نەسپێرمە هاورێ و شاعیری بۆکانی: کاکە سەعیدی نەجاڕی-ئاسۆ؟!، کە توانا و سەلیقەیەکی جوان و شارەزایانەی لە خوێندنەوە و تێگەیشتنی شیعری کلاسیکی و دەستخەتەکە و هێنانە سەر ڕێنووسی کوردی ئێستادا هەیە و لە هەمان کاتیشدا هەر خۆی هاوناوچەی «عەبدوڵڵا بەگ-**ئەدەب**»یشە!

ئەم پێشنیارەم عەرزی کاکە ئاسۆ کرد و بەپەرۆشەوە پەسەندی کرد و دیوانەکەم پێسپارد و بۆ ئەوەش بۆ کارەکە زیاتر هانی بدەم، بەڵێنم دایە کە بەدووقۆڵیی کاری لەسەر دەکەین... هەر لەگەڵ دەستخەتەکەدا، دیوانی چاپکراوی «**ئەدەب**»ی ساڵی **١٩٣٩**، کە گوایە لە لایەن «بەشیر موشیر»ەوە ئامادە کراوە، لەگەڵ چەپکە شیعرێکی تری «**ئەدەب**»دا، کە دوکتۆر مارف خەزنەدار بەچاپی گەیاندبوون. ئەوانەشم بۆ پەیداکردن و بەکاکە ئاسۆم سپاردن.

ماوەی چوار پێنج ساڵێکیش دەستخەتەکە لای کاک ئاسۆ مایەوە و من نەمپەرژایە سەر هاوکاری کردنی؛ تا دوایی کاک ئاسۆ بۆی دەرکەوت کە دەبێ بەتەنیا کاری لەسەر بکات... ئەوسا قۆڵی لێ هەڵماڵی و بەشەوقێکی زۆرەوە کاری ڕاستەقینەی لەسەر کرد و دواییش لوتفی کرد بەرئەنجامی کارەکەی بۆ من هێنایەوە، تا سەرنجی بدەم و پێمیشی وت کە ئەو تەنیا (٩٩) غەزەلی کوردی و غەزەلێکی فارسی لە دەستخەتەکە هەڵبژاردووە... ئەمەش دیارە بۆتە سۆنگەی ئەوەی دەربەستی ئەنجامدانی کاری سەرەکی، واتە: ئامادەکردنی سەرجەمی دیوانی «**ئەدەب**» نەبووبێ، بۆیە بەنامە عەرزم کرد، کە خۆزگە:

١- بەگیانی ئامادەکردنی دیوانی «**ئەدەب**» ڕەنگی بۆ کارەکەی بڕشتایە.
٢- سەرجەمی شیعرەکانی «**ئەدەب**»ی لە ڕووی دەستخەتەکە و نوسخە چاپەکانەوە بنووسیبایەتەوە.
٣- بەراووردی یەکە یەکەی نوسخە چاپەکانی دیوانی «**ئەدەب**»ی بکردایە.

بەڵام کاک ئاسۆ کارەکەی هەر بەوەندە دوایی پێهێنا و هەر بەوجۆرەش بەچاپی گەیاند... هەرچەندە دەبێ سەبارەت بەکارەکەی بڵێم: خوێندنەوەی بۆ دەستخەتەکە و هێنانە سەر ڕێنووسی ئەو (٩٩) غەزەلە، بەبەراوورد لە چاو نوسخە چاپەکانی پێشتردا، لە هەموویان شیاوتر و شارەزایانەتر بووە.



**٢**

لەو سەروبەندەدا کە دەستخەتەکەی دیوانی «**ئەدەب**» بەلای کاک ئاسۆ-وە بوو، منیش و کاک ئاسۆ و هەندێ هاوڕێی تریشمان بیستبوومان لە «ئەرمەنی بڵاغ-گوندەکەی ئەدەب»دا، مەلایەک بەناوی (مەلا قادر-١٩٤١ز)ی کوڕی میرزا ساڵح هەیە و شیعر و نامە و نووسراوێکی زۆری «**ئەدەب**»ی بەلاوەیە و کاک ئاسۆ-ش سەردانی کردووە و تەقەڵلای چنگخستنی شیعری «**ئەدەب**»ی لەگەڵدا داوە، بەڵام هیچی چنگ نەکەوتووە.

باوکی ئەم مەلایە، واتە: میرزا ساڵح (؟-١٩٧٨ز)ی کوڕی مەلا محەمەدئەمین کوڕی مەلا عەبدولڕەحمانی کیانی، هەر بەلاوێتیی لەبەردەستی (ئەدەب)دا پەروەردە بووە و زۆری خۆش ویستووە برازایەکی خۆیشی لێ مارەکردووە کاری نووسیاریی لە بەردەستی «**ئەدەب**»دا کردووە و زۆربەی شیعر و نامەی تایبەتی و شوێنەواری ئەدەبیی و هونەریی و کتێبخانەکەی «**ئەدەب**»ی بەلاوە بووە و دوای مەرگی «**ئەدەب**»یش، ئەو شیعر و شوێنەوار و بەرهەمانەی «**ئەدەب**»ی بەشێوەیەکی زۆر جوان و بەئەمانەتەوە لای خۆی پاراستوون و نرخیانی زانیوە. بەڵام مخابن دوای مەرگی «میرزا ساڵح»، ئەو شوێنەوارانە کەوتوونەتە لای هەندێ لە ئەندامانی نەخوێندەواری بنەماڵەکەی ئەم مەلا قادرە نەخوێندەوارە، کە نرخیان نازانێ و لە بەرامبەر هەندێ دەستکەوتی زۆر کەمدا، بەم و بەویان دەفرۆشی و لەناویان دەبات!، کە هەر جۆرێ لەناوبردنەکانیان ئەوەندە دڵتەزێنە، هیچ کەڵکێکیان بۆ ئەدەبی کوردی و تەنانەت بۆ کڕیارەکەش نامێنێ. چونکە (بۆ وێنە) ئەگەر شیعر، یان نامەیەکی «**ئەدەب**» بریتی بن لە لاپەڕەیەک زیاتر، ئەوا هەر تاکە لاپەڕەیەکیان بەیەکێک دەفرۆشی!، کە هەر بەم شێوەیە هاوڕێمان کاک یونس ئەمین پوور-ی گوندی (ڕەحیم خان)ی هاوسێی «ئەرمەنی بڵاغ» توانیبووی هەندێ شیعر و تابلۆی نیگارکێشیی و نامەگەلێکی «**ئەدەب**» لە مەلا قادر وەربگرێ و بەلوتفەوە بۆ منی بهێنێ و منیش چەند جارێکی تر، لەگەڵ خۆی و هاوڕێی شاعیر: کاکە یونسی ڕەزاییدا بەرەو ڕووی مەلا قادر بکاتەوە و لە چەند سەردانێکماندا بۆ لای مەلا قادر لە ئەرمەنی بڵاغ، هەندێ شیعری بڵاو نەکراوە و دەیان نامەی تایبەتی «**ئەدەب**»ی بەچەندان شێوە، لێ بسێنین، کە دوا سەردانمان و بەنیازی زیاتر ناچارکردن و گوشار خستنە سەری و ڕازیکردنی، ڕۆژی (٢٠٠٣/٦/٣٠) لەگەڵ بەڕێزان: هەردوو فەرمانداری شاری سەقز: کاکە حسێنی فیرۆزی و فەرمانداری شاری بۆکان: کاکە عەبدولڕەحمانی ئەبازەری و کاکە یونسی

ڕەزاییدا، چووینە سەردانی و ئەمجارەش توانیمان هەندێ شیعر و نووسراوی تری وەک بابەتی پزیشکی «**ئەدەب**»ی لێ بسێنین.[٢] هەر لەم سەردانەشماندا بۆ «ئەرمەنی بلاغ» پێشنیارم بۆ هەردوو فەرمانداری ناوبراو کرد، تا هیمەتی هەڵبەستنی گۆڕ و مەزارەکەی «**ئەدەب**» بکەن[٣]، کە لە گوندی «باخچە»ی نزیک (ئەرمەنی بلاغ)ە و کاک عەبدولڕەحمانی ئەبازەری پێشنیارەکەی پەسەند کرد و لە ئەستۆی فەرمانداریی بۆکانی نا و هەر ئەو ئێوارەیەش بەهەمان پێشنیارەوە، بەکۆمەڵ چووینە سەر گۆڕەکەی «**ئەدەب**»، لە گۆڕستانی «مەرقەدان»ی گوندی «باخچە»، کە بەداخەوە ئەوەندە بێ ناز و پەرپووت بووە، خەریکە شوێنەواری دیار نامێنێ[٤].

---

(٢)- جگە لە شیعر، دەیان نامەی هەمەجۆری «ئەدەب»، دەسکەوتی ئەم چەند سەردانەمان بووە بۆ لای مەلا قادر لە «ئەرمەنی بلاغ»، کە ئەو چەپکە نامانە لە داهاتوویەکی نزیکدا، بۆ دوو توێی کتێبێکی تری وەک بەڵگەنامە، دەبنە کەرەسە.

(٣)- زۆر پێشتر ئەم پێشنیارەم لەگەڵ کاکە ناسری وەحیدی و کاکە یونسی ڕەزایی و هاوڕێیانی ترا باس کردبوو، کە هەموویان ئەو شانازییەیان بەئەرکی سەرشانی خۆیان و ئەنجوومەنی ئەدەبیی بۆکان دەزانی و خۆیشیان ئامادەی ئەنجامدانی بوون.

(٤)- بەمزگێنییەوە بەخوێندەواران و شیعردۆستانی «ئەدەب» ڕادەگەیەنم، کە لە دوایین سەردانمدا بۆ شاری بۆکان «کۆتایی مانگی ٢٠٠٥/٤ تا ٢٠٠٥/٥/٢٠»، هاوڕێیانم: کاکە ناسر وەحیدی «چیرۆکنووس»، کاکە یونسی ڕەزایی «شاعیر»، کاکە محەمەد سەعید نەجاڕی - ئاسۆ «شاعیر»، ئاگادارمیان کرد لەوەی: لەسەر پێشنیاری دوو ساڵ پێشترمان بۆ هەڵبەستن و نوێژەنکردنەوەی گڵکۆی «ئەدەب» ئەو هاوڕێیانە هیمەتیان نواندووە و کێل و لاوانەی گۆڕیان لە بەردی مەڕمەڕی بەشیعری خودی «ئەدەب» هەڵکۆڵراو ئامادە کردووە و سەردانەکەمیان بەدەرفەت زانی، تا لە چەند ڕۆژی داهاتوودا تەدارەکی هەڵبەستنی گڵکۆکە و پەردە لەسەر لابردنی ساز بکەن...
بۆ ئەمەش هەر خۆیان و کاکە یونسی ئەمین پوور و هاوڕێیانی تریان لە چەند ڕۆژێکدا گۆڕەکەیان بەشێوەیەکی زۆر جوان نوێژەن کردەوە و عەسری ڕۆژی دووشەممە: ٢٠٠٥/٥/١٦زایینی، بەرابەر بە: ١٣٨٤/٢/٢٦ هەتاوی، بەئامادەبوونی ژمارەیەکی زۆر لە نووسەران و شیعردۆستانی بۆکان و سەقز و مەهاباد و نەوە و خزمەکانی خودی «ئەدەب» و خەڵکی گوندی «باخچە» و بەڕێز فەرمانداری شاری بۆکان «کاک ڕەحمانی ئەبازەری»، کە ژمارەیان لە سەدان کەس زیاتر دەبوون، لە نێوان وتار و شیعر خوێندنەوەیەکی بەشکۆدا، پەردە لەسەر گڵکۆی تازە نوێژەنکراوەی شاعیری گەورەی موکریان «ئەدەب» لابرا.



٣

دیوانێکی تری دەستخەتی «**ئەدەب**»، کە ساڵی (١٣١٦هەتاوی - ١٩٣٧ز) لە شاری «بانە» بەخەتی «ئەنوەر پوور؟» نووسراوەتەوە، بریتییە لە (٧٢) لاپەڕەی قەوارە (١٢×١٩سم) و لە هەر لاپەڕەیەکیشدا (١٢ - ١٣) دێڕی بەخەتێکی یەکجار جوانی فارسی نەستەعیلق تێدا نووسراوەتەوە و لاپەڕەی یەکەم و دووەمی ئەم دیوانە، بەشێوەیەکی تایبەت و زەخرەفەی ئەو سەردەمە و بەچەند ڕەنگێکی جیا جیا و هونەری «تذهیب کاری» نەخشێنراوە و ڕازێنراوەتەوە.

ئەم دیوانەم لای بەڕێز: ڕەسووڵ ئاغا (١٣٠٩هەتاوی - ١٩٣٠ز)ی کوڕی عەبدوڵڵا ئاغای کوڕی مەحموود ئاغای کوڕی حاجی ئێلخانی زادە چنگخست، کە ناوبراو زێدی «حەمامیان»ی ناوچەی بۆکانە و ئێستا نزیکەی (٤٠) ساڵێکە بەهۆی کاروباری فەرمانبەرێتی، لە شاری «ساری»ی ناوەندی پارێزگەی «مازەندەران»ی ئەوپەڕی باکووری ئێران دەژی.

٤

دەستخەتێکی تری دیوانی «**ئەدەب**» کە بەخەتی شاعیری کۆچکردوو: شێخ محەمەد جەمیلی زیائەدینی (١٩٢٥-١٩٨٣ز)ی کوڕی شێخ محەمەد شەریف کوڕی شاعیری ناسراوی کورد: شێخ محەمەد سەلیم، ناسراو بە(سالمی سنە) نووسرا بۆوە و بەلوتفی هەردوو کوڕە هونەرمەندەکانی: کاک هادی و کاک مەهدی زیائەدینی لە سنەوە بۆمیان ناردبوو.

ئەم دیوانە دەستخەتە لەتەک دیوانی دەستخەتی شاعیرانی تر: ناری، کوردی، ئەدیب و مەحوی دا نووسرابۆوە، کە بەشی دیوانەکەی «**ئەدەب**» لەم دەفتەرە گەورەیەدا (٤٩) لاپەڕەی قەوارە (٢٢سم × ١٤سم)ە و لە هەر لاپەڕەیەکیشدا (٢١ تا ٢٢) دێر شیعری بەخەتێکی زۆر خۆش و جوان تێدا نووسراوەتەوە... ساڵ و شوێنی نووسینەوەی دیوانەکە دیاری نەکراوە، بەڵام بەو هۆیەوە کە (شێخ محەمەد جەمیل زیائەدینی) خۆی شاعیر بووە، بەسەلیقەیەکی شاعیرانەشەوە شیعرەکانی بێ هەڵە نووسیونەتەوە و لە چاو نوسخە چاپەکانی تری دیوانی «**ئەدەب**»دا، جیاوازیی هۆشیارانە و زۆر وردی تێدا ڕەچاو کراوە.

### ٥

کەشکۆڵێکی شیعرییم لە هاوڕێم (کاک فاروقی ناهید-سەقز)[٥] وەرگرتبوو، کە ئەویش لە پێشینەی بنەماڵە ڕۆشنبیرەکەیانەوە بۆ جێمابوو. ئەم کەشکۆڵە بەو هۆیەوە کە چەند پشتێکی کردبوو، بەهەمان ماناش چەند نووسەرێکی بنەماڵەکە، بیرەوەری و شیعری زۆر و هەمەجۆریان تێدا یادداشت کردبوو، کە چەپکێ شیعری «**ئەدەب**»یشیان بەرکەوتبوو... بەو هۆیەشەوە کە نووسیارەکانی ئەم کەشکۆڵە، هەموویان خوێندەوار و شارەزای شیعر بوون، بۆیە تێکستی شیعرەکان هەندێ جیاوازییان لەگەڵ تێکستی نوسخە چاپەکاندا هەبوو.

### ٦

مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداخی لە گۆڤاری نووسەری کورد، ژمارە (١)ی خولی دووەم-ساڵی ١٩٧٩ز-دا (٤) غەزەلی «**ئەدەب**»ی بڵاو کردۆتەوە، کە هیچیان لە نوسخە چاپەکانی (تا ئەو کاتە ١٩٧٩)ی دیوانی «**ئەدەب**»دا نەبوون.

### ٧

«ئەبوبەکر خوانچە سپەهرەدین» ساڵی ١٣٦٨هەتاوی-١٩٨٩ز- غەزەلێکی کوردی و (٢) شیعری فارسی[٦] «**ئەدەب**»ی بڵاو کردبۆوە، کە لە هیچ نوسخە چاپەکانی دیوانی «**ئەدەب**»دا نەبوون.

***

بەمجۆرە ئەم کەرەسە و بنەمایانە بەگشتی، بوونە مایەی هاندان و دەستەچیلەی ئامادەکردنی سەرجەمی دیوانی «**ئەدەب**» و بەتایبەتیش:

١- هەر (٣) دەستخەتی دیوانی «**ئەدەب**»: ئەوەی مامۆستا موحسینی سدیقی و، ئەوەی شێخ محەمەد جەمیلی زیائەدینی، بەگشتی و بەتایبەتیش دیوانە دەسخەتەکەی لای جەنابی ڕەسووڵ ئێلخانی زادە، کە لە هەموو ڕوویەکەوە لەوانیتر دەوڵەمەندتر و ڕێکوپێکترە، بکەمە دەسکەلا و بنەوان.[٧]

٢- ناتەواویی و شپرزەیی نوسخە چاپەکانی دیوانی «**ئەدەب**»-کە هیچیان شایانی پلە و پایەی شاعیرێتی عەبدوڵڵا بەگ نین-.

٣- کارە شایانەکەی کاک ئاسۆ-محەمەد سەعید نەجاڕی، لە ئامادەکردنی (٩٩) غەزەلەکەی «**ئەدەب**»دا.

٤- دەستخستنی ژمارەیەک شیعری بڵاو نەکراوەی «**ئەدەب**».

---

(٥)- بنەماڵەی (ناهید)ی سەقز، بەشێکن لە بنەماڵە و هۆزە ناودار و ڕووناکبیر و بەربڵاوەکەی «فەیزوڵڵا بەگی»، کە نیشتەجێی ناوچەکانی نێوان (سەقز-بۆکان-مەهاباد)ن و لە دێرزەمانەوە بزووتنەوەی ڕووناکبیریی کوردستانی ئێران قەرزارباری شاعیر و نیگارکێش و مۆسیقاژەن و خەتخۆش و دەنگخۆشی بەناوبانگی ئەم بنەماڵە بەبڕشت و فراوانەیە و هێشتاش لەو بوارانەدا سەرباشقەی ناوچەکانی خۆیانن.

(٦)- ابوبکر خوانچە سپهرالدین: زندگینامەء عارف ربّانی حضرت شیخ یوسف ملّقب بە شمس الدین برهانی-چاپ اول ١٣٦٨ش-انتشارات صلاح الدین ایوبی- صص: ١٧٩، ٣٦٢-٣٧٢.

(٧) هەر لە سەرەتای دەست بەکاربوونمەوە لە دیوانی «ئەدەب»دا، بەڵێنی چنگخستنی ئەم دیوانە دەستخەتەم لە کاک (هەباس ئێلخانی زادە - بۆکان)ی برای ناوبراو و هەندێ دۆستی ترەوە وەرگرتبوو؛ بەڵام درێژەکێشانی بەڵێنەکان و دووریی من (سەقز) لە مازەندەران (٩٥٠کم) و سەرقاڵییشم لەگەڵ کاروباری نووسیندا، ناچار بووم بەبێ ئەم دەستخەتە، مل لە کاری دیوانی «ئەدەب» بنێم و یەکسەریش دوای گەڕانەوەم بۆ هەولێر (مانگی ١٠ی ٢٠٠٣)، سەرجەمی کارەکەم بەئامادەکراویی بەدەسگای چاپ و پەخشی (ئاراس) بسپێرم و بکەوینە تایپکردن و هەڵەگیریی؛ کە بەدرێژایی ماوەی ساڵ و نیوێکی خۆ خەریک کردن لەگەڵ هەڵەگیریی دیوانی «ئەدەب»دا، هەمیشە پەژارەیەکی شاراوەی پڕ لە چاوەنواڕی، ڕەوتی ڕاپەڕاندن و تەواوکردنی کارەکەی سست و خاو دەکردەوە و نەیدەهێشت کارەکە تەواو بێ و هاوکاتیش تروسکەیەکی هیوا، سەرەتاتکێی لەگەڵدا دەکردم، تا لە سەرەتای مانگی ئایاری (٢٠٠٥)دا، کارە گەڵاڵەکراوەکانی «ئەدەب»م ڕاگرت و بەنیازی چنگخستنی ئەم دیوانە دەستخەتە و تەواوکردنی هەندێ کاری تری نیوەناچڵ بەجێهێڵراو، لە چەند شارێکی کوردستانی ئێراندا، سەردانی ئێرانم و دوای هاوئاهەنگیی کردن لەگەڵ هاوڕێیانی دێرینەی سەقزدا، کاکە قادری عەبدی و (مهندس) شاپووری حەسەن نەژاددا ڕۆژی پێنجشەممە (١٣٨٤/٢/٢٢ هەتاوی - ٢٠٠٥/٥/١٢ز) ڕومان لە شاری «ساری» و ماڵی جەنابی ڕەسووڵ ئاغای ئێلخانی زادە کرد، کە زۆر جوامێرانە بەپیر داخوازییەکەمانەوە هات و ڕێگەی داین و نوسخەیەکی بە(CD) لێ فۆتۆکۆپی بکەینەوە و هەمان ڕۆژ، کاکە شاپوور و کاک فەرهادی کوڕی ڕەسووڵ ئاغا چوونە بازاڕ و کاری فۆتۆکۆپی کردنەکەیان ئەنجامدا و بەخۆشییەکی لە ڕادەبەدەرەوە، گەڕامەوە هەولێر و سەرەوکاری دیوانی «ئەدەب» و پێداچوونەوە و بەراوردکردنی شیعرەکانی ئەم دیوانە دەستخەتە و سەرلەبەری کارە ئەنجامدراوەکانی پێشووم، کە دیارە بۆ ئەم کارەش، دەبوو زۆرینەی ئەو کارانەی ئەنجاممان داون، سەرلەنوێ و دووبارە پیایاندا بچینەوە و بەم ئاکامەی ئێستای بەردەستتانی بگەیەنین.

## سەرەتاکانی دیوانی «ئەدەب»

١- ساڵی ١٩٣٥-١٩٣٦ز-دیوانی «**ئەدەب**»، یان بەشێک لە دیوانی «**ئەدەب**»، بۆ یەکەمجار لە لایەن «حسێن حوزنی موکریانی»یەوە لە «ڕەواندز» چاپکراوە. ئەم دیوانە بریتییە لە «٣٣» غەزەل و قەسیدە (دوێ شەو شەوی شەمبە)، کە ئەم قەسیدەیە لەم دیوانەدا (٣٩) پێنج خشتەکییە.

٢- ساڵی ١٩٣٩ز- دیوانی **ئەدەب** لە لایەن «بەشیر موشیر»ەوە لە بەغداد چاپکراوە؛ کە دەبێ بۆ ڕاستیی و بۆ مێژوو بڵێین ئەم دیوانە لە لایەن شاعیری ناسراو: شێخ سەلامی عازەبانییەوە ئامادەکراوە و بەچاپ گەیەندراوە... ئەم دیوانە بریتییە لە «٧٦» غەزەل و «٤١» پێنج خشتەکی لە قەسیدەی «دوێ شەو شەوی شەمبە».

٣- ساڵی ١٩٦٦ز- دیوانی ئەدەب لە لایەن گیوی موکریانییەوە لە هەولێر بەچاپ گەیەندراوە؛ کە وەک بەدیار دەکەوێ ئەم دیوانە هەر دووبارەکردنەوەی چاپە پێشووەکەی حسێن حوزنی موکریانییە و تەنیا جیاوازییان لەوەدایە کە لەم چاپەدا تەقەڵلایەکی بژاری واژە بیانییەکانی دیوانەکە دراوە. ئەمەش لە ڕووی زانست و مێژووی گەشەکردنی زمانی کوردییەوە زیانێکی زۆر لە سامان و کەلەپووری ئەدەبی کوردی دەدا و دەبێتە سۆنگەی شێواندنی تێکستی شیعرەکان و ئاڵۆزاندنی مانا جوان و مەودا بەربڵاوەکانی ئەو واژە قەلاچۆکراوانە!.

٤- جارێکی تر (بەبێ دەستنیشانکردنی ساڵی چاپ)، دیوانی ئەدەب لە ڕووی چاپەکەی (١٩٣٩ز)ی بەغداوە لە لایەن کتێبفرۆشی «سەییدیان» لە مەهاباد ئۆفسێت کراوەتەوە. لەم چاپەدا پێشەکییەکەی چاپی (١٩٣٩)یان لێ دەرهاویشتووە و هەندێ بژاری هەڵەکانی چاپی پێشوویان ڕاستکردۆتەوە.

٥- لە سەرەتای ساڵی (١٩٨٠ز)یشدا (بەبێ دەستنیشانکردنی ساڵ و شوێنی چاپ) مستەفا ئێلخانی زادە، دیوانێکی «**ئەدەب**»ی لە دوو توێی کتێبێکی قەوارە گیرفانی (١٧٨) لاپەڕەییدا لە ڕێگەی کتێبفرۆشی محەمەدی-سەقز بڵاو کردۆتەوە. لەم دیوانەدا ئێلخانی زادە دەڵێ (گوایە) پشتی بەدەستخەتێکی «ئەحمەد حەیدەری»ی کوڕی عەبدوڵڵا بەگ «**ئەدەب**» بەستووە. ئەم دیوانە (٨٤) غەزەل و قەسیدەی درێژی: دوێ شەو شەوی شەمبە (٤١) پێنج خشتەکی و شیعرێکی تری پێنج خشتەکی و غەزەلێکی فارسی تێدایە.



٦- ساڵی ١٣٨١هەتاوی-٢٠٠٢ز-محەمەد سەعید نەجاڕی «ئاسۆ» بەپشتیوانی دەستخەتێکی دیوانی ئەدەب (وەک پێشتر ئاماژەمان پێ کرد و لای من بووە)،[٨] (٩٩) غەزەلی کوردی و قەسیدەی (دوێ شەو شەوی شەمبە) (٤١) پێنج خشتەکی و (٢) غەزەلی فارسی، لە کتێبێکی (٢٥٦) لاپەڕەییدا بەشەرح و لێکدانەوەوە ئامادە کردووە؛ کە ئینتیشاراتی سەلاحەدینی ئەیوبی-ورمێ، تەقەڵلاکەی کاک «ئاسۆ»ی وەک (دیوانی ئەدەب) ناو لێناوە و چاپ و بڵاو کردۆتەوە... وەک پێشتریش وتمان ئەم تەقەڵلایەی کاک ئاسۆ، لە چاو هەر (٥) نوسخە چاپەکانی دیوانی ئەدەب دا، لە هەموویان شارەزایانە و نزیکترە بەگیانی «**ئەدەب**»... ئەگینا هەر (٥) چاپەکەی پێشووتری دیوانی ئەدەب، بەکارێکی زانستی ناژمێردرێن، چونکە ئامادەکاران لە گەڵێ واژە و دێڕی شیعریی غەزەلەکان نەگەیشتوون و مانایان بۆ واژە گران و نامۆکان لێ نەداوەتەوە و خۆیشیان لەگەڵ ساغکردنەوەی واژە و ڕستە و مەبەستی «**ئەدەب**»دا ماندوو نەکردووە و زۆر شێواوانەش ڕوونووسی دەستخەتەکانیان بۆ سەر ڕێنووسی ئێستای کوردی گواستوونەتەوە... جگە لەوەی کە پێنج دیوانەکە هەڵەیەکی چاپی یەکجار زۆریان تێدایە کە ئەم کارانەش هەمووی؛ بوونەتە سۆنگەی شێواندنی هونەری شیعری «**ئەدەب**» و تەماویی کردنی جێگەی شیاوی لە پۆلێنکردنی خانەی باڵاتر لەوەدا، کە نەشارەزایانە بەخوێندەواران و بەمێژووی ئەدەبی کوردی ناساندراوە. لەمانەش سەیرتر هیچ کام لە ئامادەکارانی ئەم پێنج نوسخە چاپەی دیوانی ئەدەب، بەگیانی کۆکردنەوەی سەرجەمی بەرهەمی شیعری «**ئەدەب**» بەرنامەیان بۆ کارەکەیان دانەناوە! ئەمەش بەوەدا دەردەکەوێ کە هیچیان نوسخە چاپەکانی پێش خۆیانیان نەخوێندۆتەوە!، تا ئەو غەزەلانەی لای خۆیان نەبوون، لە نوسخە چاپەکانی پێش خۆیانەوە بۆ لای خۆیانی بگوێزنەوە؛ کە لەم بوارەدا کاک «ئاسۆ»ش هەر وای کردووە...

جگە لەمانەش؛ هیچیان شتێکی تازە و جیاوازیان لە چاو یەکتردا سەبارەت بەژیننامەی «**ئەدەب**» نەکردووە و زۆریان هەڵەی یەکتر و زانیاریی و پێشەکی یەکتریشیان دووبارە کردۆتەوە... تەنانەت یەکێکی وەک مستەفا ئێلخانی زادە، کە خۆی خەڵکی ناوچەی بۆکان، واتە: مەڵبەند و زێدی لە دایکبوون و ژیانی «**ئەدەب**»ە؛ کەچی زانیاریی پێشەکییە بێ ناوەڕۆکەکەی چاپی (١٩٣٩ز)ی بۆ کتێبەکەی خۆی دووبارە کردۆتەوە!.

(٨)- کاک ئاسۆ بەلوتفەوە ئاماژەی بەم ڕاستییە کردووە. بنواڕە: لاپەڕەکانی: ١١،٩.

## کاری تر

جگە لە کاری «دیوانی ئەدەب»، ئەم کارانەی تریش لەم دەیان ساڵەی دواییدا هەر بۆ «**ئەدەب**» ئەنجام دراون:

١- ساڵی ١٩٣٥-١٩٣٦، بۆ یەکەمجار گۆڤاری «ڕووناکی» ژمارەی (٢٨) پێنج خشتەکی لە قەسیدە درێژەکەی ئەدەب: دوێ شەو شەوی شەمبە-بڵاو کردۆتەوە.[٩]

٢- ساڵی ١٩٥٢، مامۆستا عەلائەدین سەججادی بەشێکی شایانی لە کتێبی: مێژووی ئەدەبی کوردی، بۆ بەسەرکردنەوەی پلە و پایەی شیعریی و ژیننامەی «**ئەدەب**» تەرخان کردووە.[١٠]

٣- ساڵی ١٩٧٠، دکتۆر مارف خەزنەدار ژمارەی (١٣) غەزەلی بڵاونەکراوەی «**ئەدەب**»ی لە دوو توێی کتێبێکی (٦٠) لاپەڕەییدا بەشەرح و لێکدانەوەوە بڵاو کردۆتەوە...[١١]

ئەم (١٣) غەزەلەشی لە کۆی ئەو (٢٥) غەزەلە هەڵبژاردوون، کە لەلایەن سالار سەعیدی برای عەبدوڵڵا بەگ، بۆ کوردناسی ناودار: ڤاسیلی نیکیتین (١٨٨١ز-١٩٦٤ز) نێردراوە.

دکتۆر مارف ئەم (٢٥) غەزەلەی لە «ئامۆژگای خۆرهەڵاتناسی ئەکادیمییەی زانستی شوورەوی لە لینینگراد- ئەرشیفی نیکیتین» چنگ خستوون و دوای بەراووردیان لەگەڵ نوسخە چاپەکانی (تا ئەو کاتەی) دیوانی ئەدەب دا، بۆی دەرکەوتووە کە (١٣) غەزەلیان لە هیچ کام لە دیوانە چاپکراوەکاندا نین.

ئەم کارەی دکتۆر مارف، کە لەگەڵ شیعری بڵاونەکراوەی «**ئەدەب**»دا کراوە. باشتر دەبوو ئەگەر:

- هەموو دەستخەتەکەی «**ئەدەب**»ی وەک خۆی-شیعری بڵاوکراوە و بڵاونەکراوە- بەفۆتۆکراویی لەگەڵ کتێبەکەیدا چاپکردایە. چونکە ئەو دەستخەتە، لە بواری لێکۆڵینەوەدا نرخێکی تایبەتی دەبوو.

(٩)- گۆڤاری ڕووناکی، هەولێر، ١٩٣٥-١٩٣٦، ژمارەکانی: ١، ٢، ٣، ٨، ١٠.

(١٠)- عەلائەدین سەججادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپی دووەم، بەغداد ١٩٧٠، لاپەڕەکانی: ٤٣٧ تا ٤٥٧.

(١١)- دکتۆر مارف خەزنەدار، عەبدوڵڵا بەگی میصباح-ددیوان، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئیرشاد، بەغداد ١٩٧٠.



- (١٣) غەزەلە بڵاوکراوەکانی دەستخەتەکەی لەگەڵ نوسخە چاپەکانی دیوانی ئەدەبدا بەراوورد بکردایە و جیاوازیی و ناتەواوییەکانیانی دەستنیشان بکردایە.

٤- ساڵی ١٩٧٩، محەممەد عەلی قەرەداخی (٤) غەزەلی بڵاونەکراوەی[١٢] «**ئەدەب**»ی لە گۆڤاری «نووسەری کورد»دا[١٣] بڵاو کردۆتەوە... ئەم شیعرانەیشی لە دوو توێی دەفتەرێک-کەشکۆڵێکی دەستخەتی «مستەفا سائیب»دا هەڵبژاردوون، کە دەڵێ ئەم دەفتەرە (١٩) شیعری «**ئەدەب**»یان تێدا بووە!. خۆ ئەگەر ئەمیش هەموو شیعرەکانی «**ئەدەب**»ی ناو ئەو دەفتەرەی بڵاو کردبایەتەوە، بۆ کاری لێکۆڵینەوە و بەراووردیان لەگەڵ نوسخە چاپەکاندا بەکەڵکتر دەبوو.

٥- ساڵی ١٣٦٨هەتاوی-١٩٩٠ز- ئەبوبەکر خوانچە سپەهرەدین، لەتەک ژیننامەی «شێخ یوسف-شمس الدین برهانی»دا،[١٤] ژمارەی (٣) شیعری فارسی و شیعرێکی کوردی بڵاونەکراوەی «**ئەدەب**»ی بڵاو کردۆتەوە.

٦- ساڵی ٢٠٠٣، دکتۆر عەبدوڵڵا یاسین ئامێدی لە دوو توێی کتێبێکی ڕەخنەییدا، وتارێکی (٣) لاپەڕەیی لە بارەی شاعیرێتی «**ئەدەب**»ەوە نووسیوە.[١٥]

٧- مامۆستا ئیبراهیم ئەفخەمی لە کتێبی: «تاریخ فرهنگ و أدب مکریان - بوکان»دا[١٦]، لاپەڕەکانی (٤١٥ - ٤٣١) بۆ «**ئەدەب**» تەرخان کردووە.

(١٢)- مەبەست لە بڵاونەکراوە، بەمانای تا کاتی بڵاوکردنەوەی ئەو (٤) غەزەلە، واتە: تا ساڵی ١٩٧٩، بەڵام دواتر یەکێک لەو (٤) غەزەلە، لە ناو کارەکەی مستەفا ئێلخانی زادە و دواتریش لەتەک (٩٩) غەزەلە ئامادەکراوەکەی «ئاسۆ»دا هەبووە، کە لە شوێنی خۆیدا ئاماژەی پێ دەکەین.

(١٣)- محەممەد عەلی قەرەداخی- نووسەری کورد- ژمارە (١)ی خولی دووەم-ساڵی ١٩٧٩، لاپەڕەکانی: ٥٨-٦٤.

(١٤)- ابوبکر خوانچە سپهرالدین: زندگینامهء عارف ربّانی حضرت شیخ یوسف ملّقب به شمس الدین برهانی-انتشارات صلاح الدین ایوبی-ارومیە-چاپ اول ١٣٦٨ش. صص: ١٧٩، ٣٦٢-٣٧٢.

(١٥)- عەبدوڵڵا یاسین ئامێدی (دکتۆر): پەیدابوونی ڕەخنەی ئەدەبی لە شیعری کلاسیکی کوردیدا تا جەنگی گێتی یەکەم-چاپی یەکەم ٢٠٠٣-چاپەمەنی دەسگای ئاراس-لاپەڕە ١٠٩-١١١.

(١٦) أفخمی، ابراهیم: تاریخ فرهنگ و ادب مکریان - بوکان، انتشارات محمدی، سقز، چاپ رضائی - تبریز، سال چاپ؟.

## بەرنامەم بۆ بەراورد

بەر لەوەی یەکسەر بەراوردی تێکستی نوسخە دەستنووس و چاپەکانی شیعری «**ئەدەب**» دەست پێ بکەم، هەموو نوسخە دەستنووس و چاپەکانی دیوانی «**ئەدەب**»م ڕیزکردن و پێرستێکم بۆ کردن؛ ئەوسا بەپشوویەکی درێژەوە بەراوردێکی وردم لە نێوانیاندا کرد و هەر غەزەل و پێنج خشتەکییەک لە هەمووییاندا هەبووە و هەرچی تەنیا لە هەندێکیاندا هەبوون، هەموویانم دەستنیشانکردن؛ بەرئەنجامیش تێکستێکم لە سەرجەمی نوسخە دەستنووس و چاپکراوەکان هەڵبژارد و هەر جیاوازییەکیش لە دیدی خۆمەوە و لە ناو نزیکایەتی کەش و هەوای شیعری «**ئەدەب**»دا، کە ماوەیەکی زۆری پێوە ژیاوم و لە هەمان کاتیشدا هەرچی ڕێی تێچوو بێ، لە پەراوێزدا ئاماژەم پێ کردوون و بۆ دیاریکردنی نوسخە دەستنووس و چاپکراوەکانیش، ئەم هێمایانەم وەک نیشانە بۆ دانان:

١- نوسخەی دەستنووسی موحسینی سدیقی: مس.

٢- نوسخەی دەستنووسی ڕەسووڵ عەبدوڵڵا ئێلخانی زادە: ڕە.

٣- نوسخەی دەستنووسی شێخ محەمەد جەمیلی زیائەدینی شاعیر: شج.

٤- نوسخەی دەستنووس، کە لای مەلا قادری ئەرمەنی بلاغ چنگم خستوون: مق.

٥- نوسخەی دەستنووسی کەشکۆڵەکەی فاروقی ناهید-سەقز: فن.

٦- نوسخەی چاپی حسێن حوزنی موکریانی: حم.

٧- نوسخەی چاپی بەشیر موشیر: بم.

٨- نوسخەی چاپی گیوی موکریانی: گم.

٩- نوسخەی چاپی دکتۆر مارف خەزنەدار: مخ.

١٠- نوسخەی چاپی محەمەد عەلی قەرەداخی: مع.

١١- نوسخەی چاپی ئەبوبەکر خوانچە سپەهرەدین: ئن.

١٢- نوسخەی چاپی: تاریخ فرهنگ و ادب مکریان - بوکان. ابراهیم افخمی: ئی.

١٣- نوسخەی چاپی مستەفا ئێلخانی زادە: ئە.

١٤- نوسخەی چاپی محەمەد سەعید نەجاری «ئاسۆ»: ئا.

هەر بەو هۆیەشەوە کە ئەمە یەکەمجارە ئەم بەراوردە لە نێوان نوسخە چاپەکانی دیوانی «**ئەدەب**»دا دەکرێ؛ بۆیە ئەم کاری بەراوردکردنەم، وەک کارێکی سەربەخۆ لەگەڵ هەمان



لاپەڕەی چاپی شیعر و غەزەلەکاندا - بەڵام لە پەراوێزدا - بەجیا دەستنیشان کردن و تێکەڵ شەرح و لێکدانەوەی شیعر و غەزەلەکان نەکرد، کە ئەمیان؛ واتە: شەرح و لێکدانەوەی هەندێ واژە و زاراوە و شیعر و غەزەل، کردە کارێکی تر و بەجیا، لە بەشی پاشکۆی دیوانەکەدا یادداشتم کردن... لەم کارەشدا، بەپێچەوانەی ئەو جۆرە شەرح و لێکدانەوە باوانەی بۆ شاعیرانی کلاسیکی کوردی کراون؛ نەهاتووم سەرلەبەری شیعرەکان شەرح بکەم، بەڵکو مانای ئەو واژە و زاراوە عەرەبی و فارسییانەم لێکداونەتەوە کە پێم وابوون بۆ خوێندەوارانی کوردی ئێران و کوردی باشوور نامۆن. لەمەشدا خۆم لە دووبارەکردنەوەی ئەو شەرح و لێکدانەوانە پاراستووە، کە هاوڕێی هێژا: کاک «ئاسۆ» بەماندووبوونێکی زۆرەوە بۆ دیوانی «**ئەدەب**»ی کردوون.

# ژیننامەی ئەدەب

لەو بڕوایەوە کە هەمیشە پێم وابووە تەنیا و تەنیا «دەق-تێکست»، تاقانە پێناسەیەکی هەموو نووسەر و هونەرمەند و داهێنەرێکە، بۆیە لە سەرەتای ئامادەکردنی ئەم دیوانەوە، ئەوەندەی هەڵوەدای چنگخستن و کۆکردنەوەی زۆرترین ژمارەی شیعر و بەرهەمی نووسراوی «**ئەدەب**» بووم، ئەوەندە بەتەنگ کۆکردنەوەی زانیاریی لەسەر ژیننامە و ژیانی تایبەتی «**ئەدەب**»ەوە نەبووم. هەر لەبەر ئەمەش بەهیوا نەبووم خۆم و خوێنەریش بەم لایەنەوە خەریک بکەم... بەڵام بەداخەوە بەسۆنگەی ئەوەی ئەوانەی لە سەرەتاوە ژیننامەی «**ئەدەب**»یان لە دیوانی «**ئەدەب**»دا بەسەرکردۆتەوە، جگە لەوەی هەندێ شتی لاوەکی و ژیانی تایبەتی «**ئەدەب**»یان باسکردووە، کە هیچ پێوەندییەکیان بەداهێنان و بەهرەی «**ئەدەب**»ەوە نییە، لە هەمان کاتیشدا هەندێ مێژوویان بۆ ساڵی هاتنە دنیا و مەرگی «**ئەدەب**» دیاری کردووە، کە ئەمانیش بەڵگە و بناغەیەکی زانستییانەیان نییە... لەبەرئەوە دەبێ بەناچاریی قسەیەک لەسەر ژیننامەی «**ئەدەب**» بکەم.

بەڵام جارێ پێشەکی، دەبێ بڵێین عەبدوڵڵا بەگ کوڕە گەورەی ئەحمەد بەگ، کوڕی برایم بەگ، کوڕی ڕۆستەم بەگ، کوڕی سەیفەدینە و لە گوندی «ئەرمەنی بلاغ»ی خۆرهەڵاتی ڕێگەی نێوان بۆکان-میاندواو، واتە: نێوان سێگۆشەی: بۆکان-میاندواو-سایین قەڵا، لە بنەماڵە و بەرەبابێکی خوێندەوار و دەسەڵاتدار بەدنیا هاتووە و «ئەحمەد بەگ»ی باوکی، کە بە«وکیل الرعایا» بەناوبانگ بووە، نەوەی «بوداق سوڵتان»ی گەورەیە و لە بەگزادە و خاوەن زەویوزار و مالیکی چەندان گوند بووە. ڕۆستەم بەگی باپیری ئەحمەد بەگ، ئەو کەسەیە کە مزگەوتی «ڕۆستەم بەگ»ی شاری مەهابادی دروستکردووە و ئەم بنەماڵەیە پشتاوپشت خوێندەوارپەروەر و خزمەتگوزاری خوێندن و زانست بوون... بوداق سوڵتانی باپیرە گەورەشیان «مزگەوتی سوور» و «پردی سوور»ی مێژینەی مەهابادی دروستکردووە... ئەحمەد بەگی باوکی «**ئەدەب**»یش خوێندەوارنەواز و لە چەندان گوندا خوێندنگەی بۆ قوتابیان دروستکردووە و مامۆستای ناوداریشی بەتایبەتی بۆ پەروەردە و فێرکردنیان ڕاگرتووە.

«**ئەدەب**»یش لەسەر هەمان نەریت و هەر لە گوندەکەی خۆیاندا «ئەرمەنی بلاغ» بەر خوێندن نراوە و مامۆستای تایبەتی بۆ ڕاگیراوە و خوێندنی باوی ئەو سەردەمەی تەواو کردووە... لە تافی لاویدا چەند جارێک باوکی لەگەڵ خۆیدا بۆ شاری «تەورێز»ی بردووە،



و سەردانی گەورە بەرپرسانی شار و پیاوانی «دەربار»ی قاجاریان کردووە. (کە لەو ڕۆژگارەدا لە گەلێ لایەنەوە پێشکەوتنی زانستی و پیشەسازیی ئەوروپایی گەیوەتێ و هاوکات ناوەندی نشینگەی وەلیعەهدی ئێرانیش بووە).... دواتریش کە چەژی شیعری گەشەی کردووە؛ نازناوی «**ئەدەب**»ی بۆ خۆی هەڵبژاردووە و لە یەکێک لەو سەردانانەشدا، کە دیسان هەر باوکی لەگەڵ خۆیدا بۆ تەورێز و دیدەنی «محەمەد عەلی»ی وەلیعەهدی قاجاری بردووە، وەلیعەهدی ناوبراو لەقەبی «مصباح الدیوان»ی داوەتێ: کە پێ دەچێ یان:

١- لە بەرامبەر پلە و پایەی خوێندەوارییەوە پێی درابێ.

٢- لە بەرامبەر دەسەڵاتی شاعیرانەی «**ئەدەب**»دا لە بواری شیعری فارسیدا... هەرچەندە ئەمەیان بەلای «**ئەدەب**»ەوە زۆر گرنگ و مەبەست نەبووە، چونکە لە لایەکەوە ئەوەندە شیعری فارسی نییە و لە لایەکی تریشەوە ئەوەندەی بۆ شیعری کوردی ژیاوە، ئەوەندە مەبەستی نەبووە وەک شاعیرێکی فارس بناسرێ و بەڵگەی ئەمەش ئەو چەپکە شیعرەیەتی، کە هەمووی کوردین و لە ژیانی خۆیدا بۆ ئەوەی ئامادە کردوون، بۆ «ڤاسیلی نیکیتین»یان بنێرێ، کە دیارە مەرگ مەودای نەداوە و دوای مەرگی خۆی، «عەلی بەگ سالار سەعید»ی برا بچووکی، بۆ «نیکیتن»ی ناردوون.[١٧]

ساڵی بەدنیا هاتن و مەرگی «**ئەدەب**» لە دوو توێی سەرجەمی ئەو نووسینانەدا، کە تا ئێستا لەسەر ژیننامەی «**ئەدەب**» نووسراون، بەپێی بەڵگەیەکی ئاشکرا، هێشتا تەماوییە. بۆ نموونە: مامۆستا حسێن حوزنی موکریانی لە یەکەمین چاپی دیوانی «**ئەدەب**»دا، بەبێ هیچ بەڵگەیەک، ساڵی «١٩١٢ز»ی بۆ مەرگی «**ئەدەب**» دەستنیشان کردووە!. دوای ئەمەش، لەو ڕوانگەیەوە کە بیستوویەتی، یان زانیویێتی «**ئەدەب**» لە قۆناغێکی تەمەنیدا، تووشی نەخۆشی ئیفلیجی و لەرزۆکی: «شەپلە» بووە و بەو نەخۆشییەش مردووە؛ ئەوسا وای بۆچووە، کە دەبێ «**ئەدەب**» هەر «٥٠» پەنجا ساڵێک ژیا بێ!، بۆیە وتوویەتی: ئەدەب نزیکی پەنجا ساڵێک ژیاوە.[١٨]

بەدوای ئەمدا، مامۆستا عەلائەدین سەججادی، هەمان قسەکەی حوزنی موکریانی،

(١٧) مەبەست لەو «٢٥» غەزەلەیە، کە دکتۆر مارف خەزنەدار «١٣» غەزەلی لێ چاپ و بڵاو کردنەوە و پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد.

(١٨) دیوانی ادب، عبدالله بگ مصباح، رواندز-١٩٣٦، ل (١) پێشەکی حسێن حوزنی موکریانی.

واتە: ساڵی «**١٩١٢**ز»ەکەی بۆ ساڵی مەرگی «**ئەدەب**» دووپات کردۆتەوە!. بۆ ئەمەش هەمان قسەکەی حوزنی موکریانی، لەمەڕ «نزیکەی» پەنجا ساڵ ژیانەکەی «**ئەدەب**» بەگوێرەی مێژوویەک پیادە بکات و بیگونجێنێ، بەمەزەندە ئەم «نزیک پەنجا» ساڵەی کردووە بە«**٥٣**» پەنجا و سێ ساڵ و بۆ ئەوەش «**٥٣**» ساڵێک بۆ مێژووی پێش مەرگی «**ئەدەب**» بگەڕێتەوە، هاتووە ساڵی «**١٨٥٩**ز»ی بۆ مێژووی هاتنە دنیای «**ئەدەب**» دیاری کردووە.[١٩] دوای ئەمان، مامۆستا گیوی موکریانی هەمان ساڵی «**١٩١٢**ز»ی هەر لە حوزنی موکریانی وەرگرتووە؛ بەڵام ئەم، بۆ ئەوەی ساڵی لە دایکبوونەکەی «**ئەدەب**»، کتومت بکاتە ئەو «**٥٠**» ساڵەی کە حوزنی موکریانی باسی کردووە، هاتووە ساڵی «**١٨٦٢**ز»ی بۆ ساڵی هاتنە دنیای «**ئەدەب**» دیاری کردووە.[٢٠] دوای ئەمان، مامۆستا «ئەبوبەکر خوانچە سپەهرەدین» ساڵی «**١٩١٨**ز»ی بۆ مەرگی «**ئەدەب**» دیاری کردووە.[٢١] بەڵام دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ دەڵێ: ڤاسیلی نیکیتین ساڵی **١٩١٧**ز– لە مەهاباد چاوی بە«**ئەدەب**» کەوتووە.[٢٢]

هەروەها دکتۆر عەبدوڵڵا ئامێدی بەپەیڕەوی لە گیوی موکریانی، هەمان ساڵی (**١٨٦٢**ز)ی بۆ ساڵی هاتنە دنیای «**ئەدەب**» دووبارە کردۆتەوە و بەبێ دیاریکردنی سەرچاوەیەکیش، ساڵی «**١٩١٧**ز»ی بۆ مەرگی «**ئەدەب**» داناوە.[٢٣]

«مستەفا ئێلخانی زادە»ش، کە خۆی خەڵکی ناوچەی بۆکان؛ واتە: زێد و مەڵبەندی لە دایکبوون و ژیانی «**ئەدەب**»ە، کەچی بۆ نووسینەوەی ژیننامەی «**ئەدەب**»، زانیاریی ناکۆکی لە نووسینەکانی حسێن حوزنی موکریانی و گیوی موکریانی و عەلائەدین سەججادی بۆ کتێبەکەی خۆی گواستۆتەوە! و دیسانەوە ئەمیش ساڵی «**١٨٥٩**ز»ی بۆ هاتنە دنیا و

(١٩) عەلائەدین سەججادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەغداد، چاپی دووەم **١٩٧١**، ل **٤٣٧–٤٤١**.

(٢٠) دیوانی ئەدەب، یادگاری عبداللە بەگی مصباح الدیوان، چاپی سێیەمین، هەولێر–١٩٦٦– پێشەکی گیوی موکریانی.

(٢١) ابوبکر خوانچە سپهرالدین: زندگینامەء عارف ربّانی حضرت شیخ یوسف ملّقب بە شمس الدین برهانی–انتشارات صلاح الدین ایوبی–ارومیە–چاپ اول **١٣٦٨**ش.صص: **٣٦٢–٣٧٢**.

(٢٢) د.عزالدين مصطفى رسول، الواقعية في الادب الكردي، بيروت **١٩٦٧**، ص **٨١**، حاشية **٣**.

(٢٣) دکتۆر عەبدوڵڵا یاسین ئامێدی، پەیدابوونی ڕەخنەی ئەدەبی لە شیعری کلاسیکی کوردیدا، هەولێر، ئاراس، چاپی یەکەم، **٢٠٠٣**، ل **١٠٩**.



ساڵی «**١٩١٢**ز»ی بۆ مەرگی «**ئەدەب**» دیاری کردووە.[٢٤]

دوایین کەس لەم بوارەدا، مامۆستا محەمەد سەعید نەجاری «ئاسۆ»یە، کە بەگومانەوە نێوان ساڵانی «**١٩١٢ تا ١٩١٦**» بۆ گریمانی مەرگی «**ئەدەب**» داناوە.[٢٥]

***

وەک دەردەکەوێ ئەو ساڵانەی لە سەرووتر ئاماژەمان پێکردن و بۆ مێژووی هاتنە دنیا و مەرگی «**ئەدەب**» دیاری کراون، هیچیان وەک «مێژوو» ناکرێنە مێژووی ژیننامەی «**ئەدەب**» و مێژووش چونکە بەر لە هەموو شت «زانست»ە و زانستیش پێویستی بەبەڵگە هەیە، بۆیە ناتوانرێ ئەو مێژووانە بسەلمێنرێن... هەرچەندە لە کاتی نەبوونی بەڵگەی مێژووییدا، وەک کاری ناچاریی، پەنا بۆ «مەزەندە بردن و گریمان» دەبرێ، بەتایبەتیش ئەگەر «یەکێک لە ساڵی هاتنە دنیا، یان مەرگی بزانرێ». بەڵام دیسانەوە زانست بەگومانەوە وەریان دەگرێ و نایان سەلمێنێ، بەتایبەتیش هەردوو ساڵی مردنی «**ئەدەب**»، کە حسێن حوزنی موکریانی و دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ دیاریان کردووە؛ (واتە: **١٩١٢** و **١٩١٧**) چونکە:

١– لە ناو ئەو دەیان نووسین و نامە تایبەتییانەی «**ئەدەب**»دا، کە پێشتر وتمان لای مەلا قادری ئەرمەنی بلاغ چنگمان کەوتوون، چەندان نامەیان بەخەتە خۆشەکەی خودی «**ئەدەب**» تێدایە، کە هەموویان دوای ساڵی **١٩١٢**، واتە: لە نێوان ساڵانی **١٩٠٩**–**١٩١٤**دا نووسراون، وەک نموونەی ئەم (**٣**) نامەیە.[٢٦]

٢– لەو دیدار و یەکترناسینەی نێوان «**ئەدەب**» و کوردناسی ناودار: «ڤاسیلی نیکیتین»دا، کە لە سابلاخ «مەهاباد» سازیان داوە، نیکیتین بەڕوونی دەڵێ: ساڵی **١٩١٥**ز–لە سابلاخ یەکتریان دیوە.[٢٧]

(٢٤) دیوان مصباح الدیوان ادب–مستەفا ئێلخانی زادە–پێشەکی؛ ل ٦–١٠.

(٢٥) بنوارە بەشی پاشکۆ–ی ئەم کتێبە، بەڵگەنامەکانی:

(٢٦) دەقی نامەکان–بڕوانە پاشکۆ.

(٢٧) ڤاسیلی نیکیتین، کُرد و کُردستان، ترجمەء (فارسی) محمد قاضی–چاپ اول **١٣٦٦**ش– انتشارات نیلوفر–ص**٥٨٣**–٥٨٤.

دیسانیش تەرجەمەی عەرەبی هەمان سەرچاوە، کە بەم ناونیشانەیە: باسیل نیکیتین، الکُرد وکُردستان–دراسة سوسیولوجیة وتاریخیة– نقله من الفرنسیة الی العربیة الدکتور نوري طالباني–منشورات ئاراس، الطبعة الاولی ٢٠٠٤–ص **٣٤٣**.

٣- هەر لە ئەرشیفی ڤاسیلی نیکیتندا، نامەیەکی «عەلی بەگ سالار سەعید»ی برای «**ئەدەب**» هەیە، کە بەمێژووی «٢٦ی زی حەججەی ١٣٣٥ هیجری» نووسراوە و تیایدا دەڵێ: «بعد از عرض ارادت وبندگی هنگام مرخص از خدمت عالی کە بەساوجبلاخ مراجعت کردم اشعار مرحوم «مصباح-دیوان» اخوی را حاضر نموده کە حضور حضرت عالی بفرستم». (٢٨)

واتە: «دوای پێشکەشکردنی ڕێز و بچووکایەتیم، ئەوودەمەی لە خزمەتتان مۆڵەتم خواست، بۆ سابڵاخ گەڕامەوە؛ شیعرەکانی خوالێخۆشبوو «مصباح دیوان»ی برام ئامادەکردن، تا بۆ پایە بەرزتانی بنێرم...».

بەم پێیە و بەگوێرەی ئەم نامەیە، کە وەک دکتۆر مارف لە کاتی گۆڕینی مێژووی «٢٦ی زی حەججەی ١٣٣٥ هیجری»دا، بۆ مێژووی زایین، بۆتە: «١٣ی تشرینی یەکەمی ١٩١٦»(٢٩)؛ کاتێ عەلی بەگ-سالار سەعیدی برای «**ئەدەب**»، ناوی «عەبدوڵڵا بەگ-ئەدەب» دێنێ؛ بە«خوا لێخۆشبوو»ی ناو دەبا و دەردەکەوێ کە «**ئەدەب**» لە پێش ئەو مێژووەدا، کۆچی دوایی کردبێ...

٤- دیسان لە سەرچاوەیەکی تری خودی نیکیتیندا، کە «بیرەوەرییەکانێتی»، باسی ئەوە دەکات کە لە پاییزی «١٩١٥ز»دا واتە: لە کۆتایی ساڵی ١٩١٥دا، سەردانی سابڵاخی کردووە؛(٣٠) بەم پێیە دەبێ مەرگی «ئەدەب» لە نێوان پاییزی (١٩١٥ز) و (١٩١٦/١٠/١ز)دا بووبێ.

**٥- مزگێنی تازە:**

لە دوایین سەردانمدا بۆ «بۆکان»، کە پێشتر ئاماژەم پێدا (کۆتایی مانگی نیسان و سەرەتای مایسی ٢٠٠٥)، هاوڕێم کاکە یونسی ئەمین پوور بەخۆشییەوە ئاگادارمی کرد لەوەی، کە کاک جەعفەری نەوەی ئەو «میرزا ساڵح»ەی پێشتر وتمان نووسیاری دڵسۆزی

(٢٨) دکتۆر مارف خەزنەدار، عەبدوڵڵا بەگی میصباح دیوان، چاپخانەی ئیرشاد، بەغداد ١٩٧٠، پێشەکی -ل ٨.

(٢٩) بەڵام ئەو مێژووە لە کاتی گۆڕیندا بۆ مێژووی زایینی، دەکاتە: (ڕۆژی شەممە: ١٢ی تشرینی یەکەمی ١٩١٧ز)؛ کە هەر لەم گۆڕینەدا، ماوەی ساڵێک جیاوازیی دەبینرێ. جگە لەوەی کە لە ڕووی زانستەوە دەبووایە خودی نامەکەش فۆتۆ بکرابایە.

(٣٠) خاطرات و سفرنامە موسیو ب نیکیتین، ترجمە علیمحمد فرەوشی (مترجم همایون)-چاپ دوّم ٢٥٣٦ شاهنشاهی-(١٣٤٠ش)، انتشارات کانون معرفت، ص ٢٢٩.



بەردەستی «**ئەدەب**» بووە، کاتێ زانیبووی لە گۆڤاری «سروە»دا، گلەییم لە بنەماڵەکەیان «مەلا قادری کیانی»ی ئەرمەنی بلاغی کردووە، لەسەر ئەوەی بەرهەمی نووسراوی «**ئەدەب**»یان بەلاوەیە و ناماندەنێ، بەکاک یونسی وتبوو: دەبێ بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو گلەییانە، مزگێنی و بەڵگەیەکی گرنگتان دەربارەی «**ئەدەب**» بدەمێ. مژدەکەش ئەوە دەبێ، کە «میرزا ساڵح» لە دامێنی کتێبێکی مێژوویدا، کە لە کاتی مەرگی «**ئەدەب**»دا بەدەستییەوە بووە و خەریکی خوێندنەوەی بووە، مێژووی مەرگی «**ئەدەب**»ی نووسیوە؛ ئەو کتێبەش ئێستا بەلای من (جەعفەر)ەوەیە و بەڵێنیشی دابوو، کە دەبێ بەدەستی خۆم کتێبەکەتان لە مەهابادەوە بۆ بهێنم... بۆ ئەمەش کاک یونس هاوئاهەنگی لەگەڵدا کردبوو، تا ڕۆژی (١٣٨٤/٢/١٥)ی هەتاوی: (٢٠٠٥/٥/٥ز)، کتێبی ناوبراومان بۆ «بۆکان» بۆ بهێنێ...

دەمەونیوەڕۆی هەمان ڕۆژ، کاک جەعفەر و هەندێ لە خزمەکانی کتێبەکەیان بۆ هێنایین و بەئامادەبوونی کاکە ناسری وەحیدی (چیرۆکنووس)، کاک یونسی ڕەزایی (شاعیر) و کاک یونسی ئەمین پوور (نووسەر)، بەئەمانەت لێمان وەرگرت و بەتاسەوە سەیری دامێنی ئەو لاپەڕەیەمان کرد، کە مێژووی مەرگی «**ئەدەب**»ی بەقەڵەمێکی مۆر (کەمێک کاڵەوە بوو) و بەمجۆرە یادداشت کردبوو: «وفات مرحوم عبداللەخان مصباح دیوان شب شنبه ١٩ جماد الآخر ١٣٣٤»، واتە: «کۆچی خوالێخۆشبوو عەبدوڵڵاخانی مصباح دیوان، شەوی شەممە: ١٩ی جەمادی دووەمی ١٣٣٤هیجری».

ئیتر هەر دوای دیتن و خوێندنەوەی مێژووەکە، بەپەلە و خورپە و خۆشییەکی زۆرەوە، لەگەڵ کاکە ناسردا چووینە بەڕێوەبەرایەتی (ثبت أحوال)ی شاری بۆکان و لای کاک عەبدولڕەحمان ساڵح زادە (١٩٦٤ز)ی بەڕێوەبەر و کاک جەعفەر سەلیم زادە (١٩٥٨ز)ی کارمەند (کە هەردووکیان هاوڕێی دێرینەی کاک ناسر بوون)، تا لە شێوەی یادداشت کردنی مێژووی مەرگەکە بنوارن و لە هەمان کاتیشدا تا مێژووی مەرگی «**ئەدەب**»، کە بەمێژووی «هیجری» یادداشت کرا بوو، بگۆڕنە سەر مێژووی زایینی و هەتاوی... ئەوانیش دوای دڵنیابوون لە چۆنێتی یادداشت کردنەکە، بەگوێرەی لیستی ڕۆژمێری تایبەت بەو کاروبارانە، کە لە شێوەی کتێبی چاپکراودا بەلایانەوە بوو، مێژووی (١٩ جماد الثانی ١٣٣٤هیجری)یان بەمجۆرە کردە مێژووی (هەتاوی) و (زایینی):

١- ١٢٩٥/٢/٢هەتاوی.

٢- ١٩١٦/٥/٢٢زایینی.

دوای ئەم ئاڵوگۆڕەش، یەکسەر چووینە ماڵی هاوڕێمان کاک عەبدولخالق یەعقووبی (ڕەخنەگر) و لەویش کاکە ڕەشید کرمانج (نووسەر)، بەکۆمپیوتەرەکەی کاک عەبدولخالق، لاپەڕەی مەبەستی ئەو کتێبە مێژووییە و دامێنی لاپەڕەکەی، بەچەند جۆرێک بۆ (سکێن) کردین و هەر لەویش هەمان لاپەڕەمان خستە سەر (CD) و هەمان ڕۆژیش کتێبەکەمان بەسوپاسەوە بەکاک «جەعفەر» دایەوە.[٣١]

بەمجۆرە ئەم بەڵگە زیندووەمان لەسەر مێژووی مەرگی «**ئەدەب**» چنگخست، کە نزیکەی (٩٠ ساڵ) بوو لای مێژووی ئەدەبی کوردی بەشاراوەیی مابۆوە؛[٣٢] کە وەک سەرنج دەدەین ئەم مێژووە دەکەوێتە نێوان دوا دیدەنی «ڤاسیلی نیکیتین» لەگەڵ «**ئەدەب**»دا (پاییزی ١٩١٥ز) و نامەکەی سالار سەعیدی برای «**ئەدەب**»دا، کە وتمان لە (١٢/١٠/١٩١٧ز)دا، واتە: نزیکەی ساڵ و نیوێک دوای مەرگی «**ئەدەب**» بۆ «ڤاسیلی نیکیتین» نووسرا بوو.

هەڵبەتە لێرەدا ئەوەشمان لە یاد بێ، کە «ڤاسیلی نیکیتین»، کاتێ باسی دیدارەکەی خۆی و «**ئەدەب**» دەکات، هێما و ئاماژەیەک بەوە ناکات، کە «**ئەدەب**»ی بەنەخۆشیی دیوە. هەرچەندە وەک زانراوە «**ئەدەب**» لە دوایین قۆناغی ژیانیدا، تووشی نەخۆشیی «شەپلە» بووە و وەک لە پیران و بەسالاچووانی ئەرمەنی بلاغ و موکریانیم بیستووە، لە دوا قۆناغی ژیانیدا (کە وەک وترا کۆتایی ١٩١٥ و سەرەتای ١٩١٦ بووە)، ئەم نەخۆشییە زۆری بۆ «**ئەدەب**» بردووە و ئارام و ئۆقرەی لێ بڕیوە و تەنینەوەی یەکەمین جەنگی جیهانی و لەشکرکێشیی سوپای (ڕووس)یش لە ناوچەی موکریان بەگشتی و دەوروبەری شار و ناو شاری سابلاخیش بەتایبەتی؛ کە هەموو شیرازەیەکی ژیانیان ئاڵۆزاندووە، کەسوکاری «**ئەدەب**» وایان بەچاک زانیوە «**ئەدەب**» بۆ شوێنێکی تەریک و چەپەکی دوور لە شەڕ و هەرای وەک گوندی «باخچە»ی (٢٥ کیلۆمەتری باکووری خۆرهەڵاتی سەقز) بگوێزنەوە و لەوێ بەماڵە ئاغاکانی «ئەدهەمیی» بسپێرن و بۆ دامرکاندنەوەی ژان و ئازاری نەخۆشییەکەیشی (لۆرک-جۆلانە)ی بۆ هەڵبەستن، تا بەو جۆلانە پێکردنە، کەمێک ئۆخژنی بگاتێ... بەڵام لە لایەکەوە دیارە نەخۆشییەکەی کوشندە بووە و پرزەی لێ بڕیوە و

(٣١) کتێبەکە ئەگەرچی زۆر جوان هەڵگیرا بوو، بەڵام لەبەرئەوەی زۆر کۆن بوو، چەند لاپەڕەیەکی بەر و پێشی پێوە نەما بوو، بۆیە نەمانزانی ناوی چییە.

(٣٢) بنوارە بەشی پاشکۆی ئەم کتێبە.



لە لایەکی تریشەوە تەنگوچەڵەمەکانی جەنگەکە، بواری دانیشتوانی گوندەکەی نەهێشتووە، تا بەگوێرەی شایان و پێویست خزمەتی بکەن... بەمجۆرە هەر نزیکەی (٤) مانگێک بەو حاڵەوە ژیاوە و هەر لەوێ کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێش لەسەر وەسێتی خۆی، لە گۆڕستانی «مەرقەدان» بەخاک سپێردراوە.

## ئەم دیوانە بۆ؟

وەک لە بەسەرکردنەوەی نوسخە چاپەکانی «**ئەدەب**»دا زانیمان، لە ماوەی ئەم (٧٠) ساڵەی ڕابووردوودا، تا ئێستا لە لایەن (٦) کەسەوە، (٦) جار و بە(٦) تەقەللای شێوە جیاوازەوە، بەچاپ گەیەندراوە؛ کە وردەکارییەکانی ئەو جیاوازییانە، لە ورد خوێندنەوەی ئەم تەقەللایەی بەردەستتان و بەتایبەتیش بەدەم بەراوردی نوسخە چاپەکاندا زیاترمان بۆ ڕوون دەبنەوە؛ بەڵام:

١- لە تەقەللای ساخکردنەوەی شیعری «**ئەدەب**»دا، ئەوەندەی پشتم بەنوسخە چاپەکانی دیوانی «**ئەدەب**» و نوسخە دەستخەتەکان بەستووە، ئەوەندەش زیاتر پشتم بەخوێندنەوە و نوارین و لێکدانەوەی خۆم بۆ شیعر و هونەری شیعریی «**ئەدەب**» بەستووە؛ کە ئەمە تازەترین شێوازی ساخکردنەوەی دیوانی شیعرە. چونکە لە کاتێکدا ئامادەکاری دیوانی شیعرێک، خۆی بۆ ساخکردنەوەی دیوانی شاعیرێک ئامادە دەکات؛ بەر لە هەموو شتێک، ئەوین و زەبری شیعر و هونەری شیعر و تایبەتمەندێتی ئەو شاعیرە و لێکدانەوەی تایبەتی خۆی بۆ شیعرەکانی؛ ئەو ئامادەکارە دەخاتە سەر کەڵکەڵە و خولیای ئامادەکردن و ساخکردنەوەی دیوانی شیعرەکەی... کە هەر هەمان ئەم هۆیانە، کاتێک دەبنە مایەی هاندان و ساخکردنەوەی دیوانەکەی، ئیتر بەدەم کارکردنی زۆری ئامادەکردنی دیوانەکەوە، دەبنە ناسنامەی ناسینەوەی شیعری شاعیرەکە. بەهەموو جۆرەکانییەوە، بەجۆرێک وەک چۆن هەر گوڵێک بەجیا، بۆن و بەرامەی تایبەتی خۆی هەیە، هەر بەوجۆرەش هەموو ئەو شاعیرانەی خاوەنی تایبەتمەندێتی خۆیانن، کەشوهەوا و شێوەی کار و هونەری کاری خۆیان هەیە و ئامادەکار لە تێکەڵاوبوونیدا بەکەشوهەوا و تایبەتمەندێتی شاعیرەکە، هەموو سنعەت و ئەفراندنەکانی شاعیرەکە دەناسێتەوە... لەبەر ئەوە هەرکە شیعرێکی نامۆ، تێکەڵ بەدیوانی شاعیرەکە بووبێت، یەکسەر هەستی پێدەکا و دەیناسێتەوە. بۆیە پشتبەستنی بێ سێ و دوو، بەنوسخە چاپەکانی دیوانەکە و نوسخە دەستخەتەکانیش، مەترسی و گرێمانی ئەوە دەخولقێنێ، ئامادەکارانی ئەو چاپانەی پێشوو، یان نووسیارانی ئەو نوسخەخەتانەش، هەڵەیان لە پاش و پێش خستنی واژە و ڕستە و لە چۆنێتی خوێندنەوەی دەستخەتەکان و لە دووپاتکردنەوە و چاولێکەریی یەکتردا؛ کردبێت... یان کتومت پشتیان بەدەستخەتەکان بەستبێ و وەک خۆیان ئامادەی چاپیان بکەنەوە؛ کە نموونەی ئەم شێوە



دەستخەت خوێندنەوەیە، هەر لە دوایین چاپی دیوانی «**ئەدەب**» و بەسەر ئامادەکاری دیوانەکەدا تێپەڕیوە؛ کە دیوانەکەی لەبەر ڕۆشنایی دیوانە دەستخەتەکەی «**ئەدەب**»دا ڕوونووس کردبۆوە.(٣٣)

٢- جگە لەم لایەنەش، لایەنێکی تری گرنگ لە شیعری کلاسیکدا هەیە، ئەویش خوێندنەوەی چەند لایەنە و چەندین مەودای واژەیە، کە لە دەقی شیعری کلاسیکیدا «واژە» هەر بەتەنیا مانا قاموسییەکەی نابەخشێ؛ بەڵکو چەندین مانای جیاجیا لە خۆ دەگرێ و زۆرینەی شاعیرانی کلاسیکی، پێیان وایە بەشێکی گرنگی شانازیی و هونەری شیعریان لەوەدایە ئەگەر چەندین خوێندنەوەی جیاواز، بۆ واژەیەکیان بکرێ، ئەوەندەش خوێندنەوەی جیاجیا، بۆ شیعرەکانیان دەکرێ؛ کە نموونەی ئەم بەخۆنازینە، شاعیرێکی وەک «نالی» دەریدەبڕێ، دەڵێ:

«نالی» بەداوە شەعری دەقیقی خەیاڵی شیعر
بۆ ئەو کەسەی کە شاعیرە، سەد داوی نایەوە

هەر ئەم بوارە، زەمینەی ئەوەش لە بەردەم توێژیاردا ساز دەکات، تا خوێندنەوەی جیاجیا بۆ دیوانەکانیان بکرێ. بۆیە لە سەرێنی شاعیرانی گەورە و ناسراوی وەک: حافظ، جەلالەدینی ڕۆمی، سەعدی، عەتتار... هتد. تا ئێستا دیوانەکانیان لە لایەن دەیان نووسەری ناسراوی جیاجیاوە، دەیان جار و بەدەیان دید و لێکدانەوەی جیاجیاوە لە چاپ بدرێ... کە ئەم کارە لە لایەکەوە ئاسۆی تێگەیشتن و چەژی شیرینتری خوێنەران لە شاعیرەکە و لە لایەکی تریشەوە ئاسۆی دەسەڵاتی شاعیرانەی شاعیرەکە بەرینتر دەردەخات؛ کە بەداخەوە ئەم کارە هێشتا لای ئێمە نەبۆتە شێوازێکی باو، بۆیە لەم کلاوڕۆژنەیەوە خۆزگەم دەخواست «لەپاڵ» ئەو هەموو سەرنج و لێکدانەوە قووڵ و بەنرخانەی مامۆستا مەسعوود محەمەد-دا، کە سەبارەت بە«نالی» و «حاجی قادری کۆیی»، لە کتێبەکانی: «چەپکێک لە گوڵزاری نالی»، «دەستە و دامێنی نالی» و

(٣٣) ئەو نموونەیەی باسی لێوە دەکەین، چاوەنوارِ نەدەکرا بەسەر کەسێکی شاعیر و شارەزای وەک کاک ئاسۆ «محەمەد سەعید نەجاری»دا تێپەڕێ! بەڵام چونکە پشتی بەدەقاودەق ڕوونووسکردنی دەستخەتەکە بەستووە، ئیتر پێی وابووە دەبێ بەئەمانەتەوە ڕوونووسی بکاتەوە؛ کە دەستخەتەکە ئاوایە: بەبێ تۆ، گوڵشەنە کوڵخەن! (دیوانی ئەدەب، ئامادەکردنی ئاسۆ، ل ٨٧)
لە کاتێکدا ڕاستییەکەی پێچەوانەکەیەتی و دەبێ ئاوا بخوێندرێتەوە: بەبێ تۆ، گوڵخەنە گوڵشەن.

«حاجی قادری کۆیی»دا نووسینی، «خۆزگه» دیوانی نالی و حاجی قادری کۆییشی بەو نوارین و لێکدانەوانەی خۆیەوە چاپکردبان... خۆزگە «پیرەمێرد»ی شاعیریش «لەپاڵ» تەرجەمەی ڕۆحی «مەولەوی تاوەگۆزی»دا، دیوانی مەولەویشی بەدیالیکتی «گۆران» چاپکردبا... خۆزگە شەهید عەبدولخالق مەعرووف «لەپاڵ» ئەو سەرنجانەیدا بۆ هەردوو چاپی دیوانی نالی، کە بنەماڵەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و دکتۆر مارف خەزنەدار چاپیانکردن، خۆیشی دیوانی نالی چاپکردبا... خۆزگە... و... خۆزگە...

٣- جیاوازی تری ئەم دیوانەی «**ئەدەب**»، لەگەڵ (٦) نوسخە چاپەکانی پێشوودا بەگشتی و لەگەڵ دوایین دیوانی «**ئەدەب**»دا، ئەوەیە کە ئەم دیوانە، ژمارەی (**٣٩**) شیعری زیاتر تێدایە و لەم ژمارەیەش (٣٢)یان کوردین و (٧)یان فارسین[١]، ئەمەش ئاکامی تەقەللای بەردەوامی ئەم چەندین ساڵە دوورودرێژەی عەشقێنی من و ئەم دیوانەیە... هەرچەندە لە کاتێکدا ئەم دیوانە بەمجۆرە بەرەو تەواوبوون و چاپخانە دەچێ؛ بەدڵنیاییەوە ئەوە دەزانم و دەڵێم کە هێشتا شیعری تری «**ئەدەب**» ماون، ئەم تەقەللایەی من دەستی پێیان نەگەیشتبێ. چونکە وەک پێشتر ئاماژەم پێ کرد: «**ئەدەب**» لە چاو شاعیرانی سەردەمی خۆیدا، پڕ بەرهەمترین شاعیرە و ئاوات دەخوازم، لە تەقەللایەکی تردا، چ من، چ کەسێکی تر، بتوانی دەستی پێیان بگات و دیوانی «**ئەدەب**» بەشێوەیەکی دەوڵەمەندتر و ڕازاوەتر بەچاپ بگەیەنرێ.

**محەمەد حەمەباقی**

**هەولێر - بەهاری ٢٠٠٥**

(١) لە کۆتایی ئەم دیوانەدا، دەستنیشانی ئەو شیعرانە کراون.

## ١[١]

ئەی حەددی کبریات، وەرای فەهمی ماسیوا[٢]
وەی حەصری ئیعتیلات لە وەهمی مە، ماوەرا[٣]
چبکەم! ئەگەر نەکەم سەر نامە، بەنامی تۆ
چ بلێم! ئەگەر نەلێم سەر دەفتەر: هُوَ العُلا
ئەووەڵ ئەتۆی و ئاخر ئەتۆی، هەرچی هەی، ئەتۆی[٤]
نەت ئیبتیدا لە ئەووەڵ و نەت ئاخر، ئینتیها[٥]
خەللاقی ئینس و جانی و ڕەززاقی دام و دەد
سەتتاری عەیب پۆش وخەتا بەخشی«ذُو العَطا»
تۆی سانیعی بەدیع، لە یەک قەترە ئاوی خام[٦]
چەندین هەزار چیهرە، دەکەی:یەک لە یەک جودا
تۆی موبدیعی موحیتی سەماواتی سەرنگوون
تا کەشتی کەواکیب تێدا بکەن شەنا[٧]
سەتح و فەزا؛ ئەگەر بەنەزەر پڕ مەئاثیرن[٨][٩]
«لا شَيء غَير ذاتك في السَّطح والفَضا»
گەر دوو جیهان بەضدی قەزا،مشوورەت بکەن[١٠]
«لا يقضى المقتدر إلاّ بما قضى»
گەر نۆ سیپهیر و حەفت زەمین ببنە یەک زبان[١١]
یەک زەڕە، کەی سەنای سیفاتت دەکەن ئەدا!
خوانێکە نیعمەتت، بەسەراپای دوو جیهان[١٢]
لەو خوانە، هەرکەسێ بەقەدەر قیسمەتی دەبا
تۆی خالیقی غەفوور و ئێمە عەبدی پڕ قسوور[١٣]
تۆی ساحێبی عەتا و ئێمە: قالبی خەتا[١٤]
گەر تۆ،گوناهی ئێمە نەبەخشی،بەعەفووی خۆت[١٥]



کێی دی هەیە بچینە پەناهی بەئیلتیجا؟
غەیرەز ئەوەی موقەڕەڕە، بەحەقیقەت «**ئەدەب**»[١٦]
کوا تاعەتێ کە بیبێ بەڕۆژی جەزا؛ سزا!
خۆت دەستگیری گومڕەهـ و عاسی،بەڕەحمی خۆت
هەر خۆت مەگەر ئێمە، لە مەعاصی بخەیتە: لا[١٧]

..........................................................................

(١) ئەم شیعرە لای: ڕە، مس، بم، گم، شج و مە هەیە. ئێمە ئەم شیعرەمان بەخەتی خودی «**ئەدەب**» لای «مق» چنگخست (بنوارە بەشی پاشکۆ-بەڵگەنامەی ژمارە « »).

(٢) وەرای فەهمی ماسیوا: وەر فەهمی ماسیوا: بم، گم.

(٣) وەی حەصری ئیعتیلات: ڕەی حەصری ئیعتیلات: بم. ڕەی حەضری ئیعتیلات: گم. لە وەهمی مە، ماوەرا: لە وەهمی مناوا: بم، گم. لە وەهمی منا نەوا: شج.

(٤) ئەوەڵ ئەتۆ هەی و...: بم، گم.

(٥) بۆ تۆ نە ئیبتیدا لە ئەوەڵ و ئاخر، نە انتها: شج. نەت ئیبتیدا لە ئەوەڵ و...: بم. أنت ابتدا لە ئەوەڵ: گم.

(٦) ئەم بەیتە لای: بم، شج، گم و ئە نییە.

(٧) ئەم بەیتە لای: گم، بم، شج، ئە نییە.

(٨) ئەم بەیتە لای: گم، بم، شج، ئە نییە.

(٩) حوکم و قەزا ئەگەر بەنەزەر پڕ مەئاثەرەت.

(١٠) گەر دوو جیهان بەخود قەزا و مشوورەت بکەن ئانێ بەغەیری حوکمی قەدەر ناکرێ قەزا: بم، شج، گم، ئە، ڕە.

(١١) گەر تۆ سەما و حەفت زەمین: بم، شج، گم.
گەر تۆ و سەما و حەفت زەمین: ئە.

(١٢) بەسەراپای دوو جیهان: لە سەراپای دوو جیهان: گم، شج، مە، بم.

(١٣) تۆی خالیقی غەفوور و ئەمن: شج.

(١٤) تۆی واهیبی عەتا و ئێمە ساحیبی خەتا: بم، ڕە، گم. تۆی واهیبی عەتا و ئەمن: شج، تۆی واهی عەتا و: ئە.

(١٥) گەر تۆ گوناهی ئێمە نەبەخشی بەمەغفەرەت: بم، گم، شج، ئە، ڕە.

(١٦) غەیرەز ئەوە موقیڕە بەتەقسیری خۆی «**ئەدەب**»: شج. غەیری ئەز ئەوەی موقەڕەڕە بەحەقیقەت چییە «**ئەدەب**»: گم.

(١٧) ئەم بەیتە لای: ئە نییە.

۲ (۱)

ئەی نووری ئیهتیدات لە ماهی هەتا سەما
وەی فەخری ئیستیفات لە ماهی هەتا سەرا
ئەی شاهی ئەنبیا، کە وجوودی شەریفی تۆ
ئەقدەمترە لە خیلقەتی مەخلووقی دوو سەرا
ئادەم–ئەبولبەشەر، کە بەزاهیر لە سولبی ویی
هێشتا قوڕی گەلاڵە بوو، تۆ خەتمی ئەنبیا
تۆ هەر ئەوەی کە حەزرەتی خالق، لە بەدوی خەڵق
مەنزووری هەر وجوودی ئەتۆ بوو لە ماسیوا
رایج نەبوو تەلای نبووەت، بەئیسمی غەیر
بۆیە بەنامی ئەشرەفی تۆ، سککە لێدرا
رۆحولئەمین کە بەدرەقەیی رەهـ بوو، بۆ حوزوور
تا سیدرە بوو، ئیجازەتی پەروازی مونتەها
تۆ خۆت بەباڵی شەوق فڕیت، تا بەجێگەیەک
بەینی حدووس تا بەقیدەم، دوو کەوانی ما
عیسا لە چەرخی چارەوە؛ کورسی کە دابنێ
دەستی کوا بەکۆنگەرەیی قەدری تۆ دەگا!
گەر تۆ نەبایە، هادیی مووسا بەنەخلی توور
بۆ دەفعی سیحر، چۆنی دەبوو ئەژدەها، عەسا!
رەحمت نەبایە؛ ناجیی یوونس لە بەتنی حووت
تا رۆژی رەستخێز؛ لە دەریایەدا دەما
ئەنگوستی تۆ ئەگەر نییە رەهبەر بەنییەتت
بۆچی ئیشارەتت مەهی دوو هەفتە شەق دەکا!
قەدرت لەوەی ئەجەلە، بەقوربانی خاکی پات
تا شەئنی تۆ، بەمەدحێ ببێ، عولووئیرئیقا
مەدحەتگەرت، بەمەدحی ئەتۆ، خۆی دەکا بڵێند
گەر نە، سەزایی قەدری ئەتۆ، کوا هەیە سەنا!



قەسدی منیش، لە عەرزی جەسارەت بەحەزرەتت
جوبرانی نەقسی حاڵە، بەنامت لە «ما مضی»
گەر سالحە «**ئەدەب**» و گەریش «تالحێ» شەمی
ئومێدەواری عەفووتە؛ تۆ و خەمسەیی عەبا
هیندەم بەسە لە حەشر، کە چەتری شەفاعەتت
من روو سیەهـ، لە سایەیی رەحمت وەلا نەخا

..........................................................

(۱) ئەم شیعرە لای: مس و ئا هەبوو.

## ٣[١]

ئەگەر تووبایە وەک تۆ، جەننەت ئارا
لە شێوەی قامەتی تۆیە؛ نیگارا[٢]
چە سیحرێکە! بەدوو زوڵفی چەلیپات
کە مەقبووڵی؛ بەئیسلام و نەصارا[٣]
لە دڵدا: ئاتەشێکی عالەم ئەفرۆز
لە دیدە: گوڵشەنێکی عالەم ئارا
هەتا دوورم؛ دەڵێم دەتگرمە باوەش
کە دێمە ڕووبەڕووی تۆ؛ نیمە: یارا
نەهانیی بوو لە دڵدا سۆزی عیشقت
لە دوودی سەرمەوە بوو ئاشکارا[٤]
بەدیدارت؛ ئەگەر تارێ لە زوڵفت
بەموڵکی«کەی»بدەم، یا تەختی «دارا»
بەخوێنی من؛ ئەگەر سەرخۆش دەبی تۆ
وەکو جامی صوبوحت بێ گەوارا[٥]
لە جەوری تۆ، دڵم نەشکاوە، قەت من
عەجەب لەو شیشەیەی نەشکا، بەخارا[٦]
دەڵێم: جانا، مودارایەک، دەفەرموێت
دەگەڵ عاشق، ئەگەر بووبێ مودارا
«**ئەدەب**»؛ بەو غایەتی تۆ پای بەندی
بەفریادت بگا شاهی بوخارا[٧]

........................................................

(١) ئەم شیعرە لای: ڕە، ئا، بم، گم، ئە، شج، مس هەیە.
(٢) لە شێوەی قامەتی تۆیە: لە سایەی قامەتی تۆیە: ئا، بم، گم، ئە، ڕە.
(٣) کە مەقبووڵی: کە مەقبووڵە: ئا.
(٤) لە دوودی سەرمەوە: لە دوودی سورمەوە: بم.
(٥) وەکو جامی صوبوحت بێ: وەکو جامی صوبوحت با: بم.
(٦) لەو شیشەیە: بم، گم. لەو شیشەوە: شج.
(٧) بەفریادت بکا: بم.



## ٤[١]

ئەمرۆ، کە بەبادەی مەیەوە هاتی لەسەردا[٢]
هێناتەوە بەر؛ جانی سەفەر کەردە لەبەردا[٣]
لەو خستنە سەر ڕوو، بەجەفا، دەستەیی گێسوو[٤]
وەعدەی وەتەنێکت بەغەریبانی سەفەردا[٥]
بەم تەرزە، کە جانپەروەرە نوتقی شەکەرینت[٦]
ئەنفاسی مەسیحێکە لە ناو دورجی گوهەردا
ئەو تەلعەتی حۆرانی و لوتفی مەلەک ئاسات[٧]
حاشا کە کەسێک دیویە لە تەرکیبی بەشەردا
یەک حەلقە و سەد سیحرە، بەری پەرچەمت ئیمرۆ
دیسانەوە ئاخۆ چ خەیالاتی لەسەردا
زوڵف و سەری کوڵمەت بنوێنە بەمونەجیم
حوکمی چییە عەقرەب، لە موحاذاتی قەمەردا
قەدری چییە خورشید، لەکن پرتەوی حوسنت[٨]
جلوەی چ دەکا: قەترە، لە دەریای خەزەردا![٩]
لەو صورەتی زیباتە، کە ڕۆحێکە موجەسسەم[١٠]
وەک صورەتی دیوارە، ئەوی ڕۆحی لەبەردا
لەو ڕۆژەوە جانا! کە نەزەرت لێمە کلاکرد[١١]
چوونی سەر و ماڵم بەخودا هەر لە نەزەردا
سینەم سوپەری ناوەکی دڵدۆزی موژەت بوو[١٢]
نەمزانی کە ناوێستێ خەدەنگت لە سوپەردا
ئەو ماچی شەوی دی، بەمنت دا بەدوو سەد ناز[١٣]
وا ئێستە بەکامی «**ئەدەب**»ی طەعمی شەکەردا[١٤]

........................................................

(١) ئەم شیعرە لای: ڕە، بم، ئە، گم، مس، ئا، شج هەیە.
(٢) ئەمرۆ، کە بەبادەی مەیەوە: ئەمرۆکە بەبادەی مەیەوە: ئاسۆ. کە بەجامی مەیەوە: شج. بەبۆ و تەڕی و بادەوە: بم. ئەمرۆ بەبوتڵی بادەوە هاتی، کە لەسەردا: ڕە.

(٣) سەفەرکەردە لەبەردا: سەفەرکەردە لە دەردا: ڕە.
(٤) بەجەفا دەستەیی گێسوو: بەسەفا دەستەیی گێسوو: ڕە.
(٥) وەعدەی وەتەنێکت: وەعدەی وەتەنێکی: ئا، شج، بم، گم، ئە، مس.
(٦) بەم تەرزە: بەو تەرزە: ڕە.
(٧) ئەو تەلعەتی حورانی و لوتفی مەلەک ئاسات: ئەو تەلعەتی غیلمانی و شێوەی مەلەکی تۆ: ڕە.
(٨) لەکن پرتەوی حوسنت: لە لای پرتەوی حوسنت: ڕە، مس.
(٩) لە دەریای خەزەردا: لە دەریای خەتەردا: شج، بم، گم.
(١٠) صورەتی زیباتە: صورەتی زیبایە: بم، شج، گم. صورەتی زیبات: ئا.
(١١) لێمە کلاکرد: لێمە کە لابرد: بم، گم، ئە، شج.
(١٢) سوپەری ناوەکی: سوپەری ناوکی: گم، ئە، شج، بم.
(١٣) شەوی دی: شەوی دوێ: ئا.
(١٤) وا ئێستە بەکامی: وەڵڵاهی لە زەوقی: ڕە.



٥[1]

ئەبرۆیی کەشیدەت لە پەنا طوڕەیی سەودا
ماهێکی نەوە؛ گۆشەیی کێشاوە لە شەودا
فەرمووتە: دەبێ گیان بەفیدای تیغی بڕۆکەم
ئەی ماهی دوو هەفتە؛ بەمنت موژدەیی نەودا
خاڵ و خەتی بەر ئەو گەردەن و سینەت
شایستەیە سەد تەعنە؛ لە خاڵ و خەتی کەو دا
ئەمشەو، کە گوتم: دەردی دڵم، چی هەیە دەیڵێم
حەیفێ؛ کە دەمی وەسڵەتی تۆ، کورتە لە شەودا
نەمزانی چییە سیڕی دەهانی وەکو نوقتەت
خۆی نوقتەیی مەوهووم و جیهان قەیدییە لەودا[2]
هەمدەرس کەنین: بەختی من و چەشمی سیاهت
بۆچی وەکو: یەک ڕۆژ و شەون،هەردوو دەخەودا![3]
سۆفی؛ کە دوێ مەنعی ئەمەی کرد و مەلامەت
ئەمڕۆ لە خەراباتە؛ عەمامەی لە گرەودا
هەرچەندە مەتاعی سوخەن؛ ئەم عەهدە کەسادە
ئەمما گوهەری شیعری «**ئەدەب**» هەر لە برەودا

........................................................

(١) ئەم شیعرە لای: مس، ئا، مخ هەبوو.
(٢) جیهان قەیدییە لەودا: جیهان خەیرییە لەودا: خم.
(٣) ئەی بۆچی وەکو ڕۆژ و شەون...: ئا.

**٦**(١)

ســاقــیــا! مــەی زەدەی بادەیی پارم بەخــودا
تێکە بۆم جامی شەرابێ. کە خومارم بەخودا
نەشئەیی بادە مەحاڵە، ئەسەری بۆمە، کە من
مەستی بادەی لەبی وەک ساغەری یارم بەخودا(٢)
گەر خومارم، نە خوماری مەی و جام و بادەم
مەستی بادەی لەبی گوڵڕەنگی نیگارم بەخودا(٣)
شۆخی تەرسا بەچەیێ؛ غارەتی دین و دڵی کرد
نە دڵی هێشت و نە تاقەت، نە قەرارم بەخودا(٤)
ئەی صەنەم!تابەکەی ئەو عیشوە و ئەو نازە؛ بەما
کــە نەمــا تاقــەتی باری خەمی یارم بەخــودا(٥)
چ بڵێم چۆنە لە دووری قەدی تۆ، حاڵەتی من(٦)
چی بڵێ زیللەتی من، یەک بەهەزارم بەخــودا(٧)
بۆچمە زەحمەتی پەیکان و بەزێهکردنی تیــر!(٨)
منی بێچارە، بەیەک غەمزە؛ شکارم بەخودا(٩)
با وجودی روخی ئەو، بۆچمە گوڵزاری بەهار!(١٠)
تەڵعەتی گـوڵشـەنمە، ڕوویە بەهارم بەخــودا
عالەمی وەسڵی لە دنیا، چەخۆشە گەر دەست دا
مـن لە هیـــجـــرانی ئەوا، زار و نزارم بەخـــودا(١١)
قەدی تۆ: سەروە و کەناری منە: جۆباری سرشک
چ ســزاوارە، ئەگــەر بێــیــە کــەنارم بەخــودا(١٢)
دائما جان بەکەف و دەستی تەوازوع بەکەمەر(١٣)
گـــوێ بەئاوازەی فـــرمـــان نـثـــارم بەخـــودا
گەرچی ئەو مەرحەلەیە نابەمە سەر، بەیەقین(١٤)
تا بەئاخــر نەفــەســیش ڕاهـ ســپــارم بەخــودا



قەت مەفەرموو:کە«**ئەدەب**»عیشقی مەی لێ بۆتە هەوا(١٥)
سـەر بگاتە فـەلەک؛ ئەو زەڕە غـوبارم بەخـودا(١٦)

........................................................

(١) ئەم شیعرە لای: ڕە، ئە، گم، ئا، مس، بم، شج هەیە.
(٢) ئەم بەیتە لای: بم، گم، شج نییە.
(٣) ئەم بەیتە لای: ئا، مس نییە.
(٤) ئەم بەیتە لای: بم، گم، شج نییە.
(٥) ئەم بەیتە لای : مس نییە.
(٦) حاڵەتی من: حاڵەتی زار: بم، گم، شج.
(٧) چی بڵێ زیللەتی من: چی بڵێ لەززەتی من، یەک بەهەزارە بەخودا: گم، شج، بم، ئە.
(٨) بۆچمە زەحمەتی...: بۆچییە: بم، گم، شج.
(٩) منی بێچارە: من بەبێ چارە: شج، گم، بم.
(١٠) باوجوودی ڕوخی ئەو: باوجوودی ڕوخی تۆ: شج، گم، بم.
(١١) نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لای «ڕە» ئاوایە:
دنیا بەویساڵی ئەوەوە خۆشە، کە بیبێ
ئەم بەیتە لای: ئا، گم، بم، شج، ئە نییە.
(١٢) چ سزاوارە: مەی سزاوارە: ئا.
(١٣) ئەم بەیتە لای: ئە نییە.
(١٤) گەرچی ئەم مەرحەلەیە: ئەگەر ئەم مەرحەلەیە: ئە، شج، بم.
(١٥) عیشقی مەی لێ بۆتە هەوا: عەشقمی لێ بۆتە هەوا.
(١٦) ئەو زەڕە غوبارم بەخودا: هەر ئەو زەڕە غوبارم بەخودا: گم.

## ٧[١]

دڵ ئارامی نەمـــا جـــارێ، دڵارامم ســـەری نادا[٢]
سەرێکی سەرسەری جارێ لە کوشتەی خەنجەری نادا[٣]
ئەسـیری دامی سـەییـادێکی نەوکـارە؛ دڵـی وەحـشی
هەوەڵ نەخـچـیـرە؛ گـرتوویە و بەئاسـانی بەری نادا[٤]
ئەگەر عاشق «ئەرەستوو»بێ، لە بەحری عیشقدا غەرقە
چ گـێـژێکە خـوداوەند!، کـە ڕێی «ئەسکەندەر»ی نادا
دەکـەن مـەنعم ڕەفـیـقـانم، کـە بۆچم دڵ بەدڵبـەر دا!
چ دڵسـەختـێکە! ئەمڕۆ دڵ؛ بەخـاڵی عـەنبـەری نادا!
لە لای بێگانە گەر تاڵە؛ ئەگەر ترشە، عـیـتـابی تۆ
بەوەڵڵا ئاشنای قـــەهرت، بەقـــەندی بەندەری نادا
بەصـــورەت مـــاهڕوو زۆرن، بەڵا وەڵڵا لە مـــەعنادا
پەری وەک تۆ؛ بەزیبـایی، قـیـافـەی دڵبـەری نادا[٥]
کەسێ شەهدی لەبی چەشتی؛ نییە مایل بەشیرینی
کەسێ شیرین نیگاری بێ، شەککەر لەب هەمسەری نادا[٦]
مەفەرموو:عارە پێم، بەندەت، کە دێ بێتە غوڵامی تۆ[٧]
گـەدایی ئاسـتـانەی تۆ، بەتاجی «قـەیسـەری» نادا
ئەگەرچی تۆ بەهیچێ من، لە دەرکت دەردەکەی؛ ئەمما[٨]
«ئەدەب» تارێ لە زوڵفی تۆ، بەموڵکی «سەنجەری» نادا

................................................................

(١) ئەم شیعرە لای: ڕە، مس، مخ، ئا هەیە.
(٢) دڵارامم سەری نادا: دڵامم سەرێ نادا: مخ.
(٣) سەرێکی سەرسەری: سەرێکی سەرسڕی: مخ.
(٤) هەوەڵ نەخچیرە: هەوەڵ نێچیرە: مخ.
(٥) قیافەی دڵبەری نادا: قیافەی دڵ بەری نادا: مخ.
(٦) شەککەر لەب هەمسەری نادا: بەشەککەر هەمسەری نادا: ئاسۆ.
(٧) کە دێ بێتە غوڵامی تۆ: کەوی بێتە غوڵامی تۆ: مخ، ڕە.
(٨) ئەگەرچی تۆ بەهیچێ من: ئەگەرچی تۆ بەهیچی من: مخ.



## ٨[١]

قـەت بـووە دڵبـەری مـە، جـارێ لەمـە یاد نەکـا[٢]
بەســەلامێ، بەپەیامێ، دڵـی مـــە شـــاد نەکـــا
ئەی خودا عـاشقی سەخابەچچە، دڵـی خۆی کە بوێ[٣]
کـەس خـەرابەی دڵـی خـۆی قـەت بـووە ئاباد نەکـا
ڕەهڕەوی بـادیەیی عــیــشـق، بەپێی شـەوق ئەوەیە
فـــیـکرەتی راحـــیلە ڕێ و راحـــیلە و زاد نەکـــا
عـــاشق و مـــەنزل و مـــەئوا! ئەمـــە لافـــێکە درۆ
عــاشـقی سـادیق ئەوەیە: خـانە لە بونیـاد نەکـا[٤]
وەک دەڵێن مـــەیلی بەئازادیی بەندانە، گـــوڵم
گـــەر منم بەندە، خـــودایە قـــەتم ئازاد نەکـــا
چی دەبێ جـارێ ئەگـەر ڕێ بخـەیە خـەسـتـە دڵان
با لە دووری، دڵ هـێند ناڵـە و فـــریاد نـەکـــا
سایەیێک لەو قـەد و باڵایە بخە سەحنی چەمەن
تا چ کـەس سەیری قـەد و جیلوەیی شمشاد نەکا[٥]
جەورەکەت خاریجی قانوونە و دەفەرمووی: مەکە داد
چی بکا جـەورەکـەشت جـارێ ئەگـەر داد نەکـا
تا نەسـیـمێ لەسـەری زوڵفـەوە دێ، چاترە سـوز
بۆیە سـووتاو دەبێ؛ ڕوو قـەت بەتەرەف باد نەکـا[٦]
هەر کەسێ دیدەیی وەک شەتتی منی دیبێ «**ئەدەب**»
ڕەنگە قەت سەیری«کۆڕ»و«دیجلەیی بەغداد» نەکا

................................................................

(١) ئەم شیعرە لای: ئا، مخ، مس هەیە.
(٢) قەت بووە: قەت نەبوو: ئا.
(٣) ئەی خودا عاشقی سەخابەچچە: ئەی خودا عەشقی سەخابەچچە: ئا.
(٤) خانە لە بونیاد نەکا: خانەیێ بونیاد نەکا: ئا.
(٥) تا چ کەس: تا چی کەس: مخ.
(٦) چاترە سووز: چاترە سوز: ئا، مخ.
(٦) ڕوو قەد بەتەرەف باد نەکا: ڕوو بەتەرەف باد نەکا: مخ.

## ٩[١]

ئەی دەهەن خونچەی شەکەر لەب، چەندەتم کێشا جەفا
بەو هەموو ڕەنج و جەفایەش، لێم نەدیوی جوز سەفا
بێ وەفایی حەقڤە، ڕەسمی گوڵعوزارانە، بەڵان
نەک دەگەڵ یاری وەکو من، ساحێبی میهر و وەفا
باری جەورت من دەکێشم؛ سەیری گوڵ: خەڵکی دەکا
دەردی هیجرت من دەبینم؛ سەیری: بۆ کێیە شەفا!
نامەوێ دایم لە سەیری گوڵشەنت سێراب بم
جار بەجار ماچێ لە کونجی لێوی خونچەت «قَدْ كَفا»
لەو گلەییانەم مەڕەنجە، ڕۆحەکەی شیرینی من
من هەر ئەو بەندەم، سەراسەر تۆ جەفاکەی یا وەفا
یا ڕەب! ئەو کەس باعیسی دووریی من و تۆ بوو لەیەک
بێ نەسیبی کەی لە مەحشەردا، لە حەشری موستەفا
ئیقتیفا دەکرێ بەتەرزی شیعری شیرینت «**ئەدەب**»
گەر موداوابێ بەئیعجازی مەسیحا ئیقتیفا

.........................................................

(١) ئەم شیعرە لای: مس، ئە، ئا هەیە.



## ١٠[١]

شۆخی مە، هەردەم بەتەرزێ قەسدی نەخچیرم دەکا
گا لە نێو دامم دەخا، گا خەستەیی تیرم دەکا
سوێند دەخۆم چیدی فریبی غەمزەیی جادووی نەخۆم
ئەمکەڕەت زووتر بەئەفسوونێکی تەسخیرم دەکا
سەردەمێ ڕووی پێ نیشاندام؛ سەردەمێکی زوڵفی خام
ئەووەڵی شێتم دەکا، پاشان لە زنجیرم دەکا
وەعدەیی وەسڵم دەداتێ؛ دەچمە لای، نایێیەتە لام
گەر دەچم زویرم دەکا، ناچم ئەگەر: بیرم دەکا
جار بەجار تاتا دەکا بۆم زوڵفی شێواوی و دەڵێ[٢]
کوا دڵی تێدا؟ قسەی نادانە دڵگیرم دەکا
من دەڵێم: چۆن بوو قەزا، ئەمنی بەتۆ دڵبەستە کرد!
ئەو بەچاوانی حەواڵەی حوکمی تەقدیرم دەکا
ئەو دەمەی تفلی دڵم بگری و گڕوو بگرێ لە ڕووی
ئەو بەماچی هەر وەکو قەندی لەبی؛ ژیرم دەکا
گەر دەڵێم: جانا، بەچی دەعوای جیهانداریی دەکەی![٣][٤]
ئەو ئیشارەی پڕتەوی حوسنی جیهانگیرم دەکا
بەستەیی زونناری مووی کردووم و دەشڵێ: کافری!
خۆی لە ڕێگەم دەردەکا، بۆ خۆشی تەکفیرم دەکا
مەیگوساری بادەیی مینا قەدێکم من «**ئەدەب**»
دەمبەدەم مەستی مەیی حوسنی جیهانگیرم دەکا[٥]

.........................................................

(١) ئەم شیعرە لای: ڕە، مس، ئا، ئە هەیە.
(٢) زوڵفی شێواوی دەڵێ: زوڵفی شێواو و دەڵێ: ئا.
(٣) ئەم بەیتە لای: ئە نییە.
(٤) بەچی دەعوای جیهانداریی دەکەی: بەچی دەعوای فەرمانداری دەکەی: ئە.
(٥) ئەم بەیتە لای: مس نییە.

## ١١(١)

قورصی قەمەر لەو ڕوخی ئەنوەر شکا
سەرووی سەهی لەو قەدی دڵبەر شکا(٢)
عەسکەری زەنگیت بەدوو غەمزە شکاند(٣)
وەک لە خەجاڵەت شەهی خاوەر شکا(٤)
شەهدی دەمی؛ قەدری نەباتی نەهێشت
وەک لە لەبی، لەززەتی کەوثەر شکا
تا بتی من مەعجەری لادا لە ڕوو
قودرەتی سەرپەنجەیی ئازەر شکا
رائیحەی طوڕەیی ئەو هاتە مەشام(٥)
قەدری گوڵاوی گوڵ و عەنبەر شکا(٦)
لەو شکەنی زوڵفی خەمی؛ ئەندەر خەمی
گەردنی «دارا» و «سکەندەر» شکا
ئەو شەوە فەرمووت کە: نەکەم ماچی ڕوو(٧)
دڵ کە شکا بوو، بەهەموو سەر شکا
تۆ دڵی «قەیسەر» دەشکێنی بە ناز
باکت چییە بۆ دڵی من؛ گەر شکا(٨)
لەو دەمەوە ساقی و بادەم ئەتۆی(٩)
ڕەنجی خوماری مەیی خوللەر شکا(١٠)
لەو دەمەوە حەڵقەیی موو؛ کەوتە ڕوو(١١)
موعجیزی داوودی زرێگەر شکا
جلوەیەکی قامەتی تۆ کەوتە باخ
شەوکەتی باڵایی سنەوبەر شکا(١٢)
ساعیدی سیمین، کە دەرتخست بە ناز(١٣)
دەبدەبەی قیمەتی گەوهەر شکا



عەهدێ کە دەتفەرموو: ئەدەم ناشکێ
تاجی سەرم! چۆن بەهەموو سەر شکا(١٤)
تا کە «**ئەدەب**» هاتە بیساتی سوخەن
ڕەونەقی بازاڕی سوخەنوەر شکا

.........................................................

(١) ئەم شیعرە لای: مس، بم، گم، شج، ئە، ئا هەیە.
(٢) سەرووی سەهی: سەروو سەهی: شج، گم.
(٣) عەسکەری زەنگیت: عەسکەری زەنگی: ئا.
(٤) وەک لە خەجاڵەت شەهی خاوەر شکا: وەک لە جەماڵی شەهی خاوەر شکا: ئا.
(٥) رایحەی طوڕە دەهاتە مەشام: بم، ئە، شج، گم.
(٦) قەدری گوڵاوی گوڵاو و عەنبەر شکا: قەدری گوڵاوی گوڵی قەمسەر شکا: ئا.
(٧) فەرمووت کە بکەم ماچی ڕوو: شج. ئەکەم ماچی ڕووت: ئا. بکەم ماچی دەم: ئە.
(٨) باکت چییە بۆ دڵی من: باکی چییە بۆ دڵی مە: ئا.
(٩) لەو دەمەوە ساقی و بادەم ئەتۆی: لەو دەمەوە ساقی بادەم ئەتۆی: ئا.
(١٠) ڕەنجی خوماری خوللەر شکا: ڕەنجی خەممارای مەهی خوللەر شکا: شج.
(١١) ئەم بەیتە لای: شج، بم، ئاوایە:

لەو دەمەوە حەلقەیی موو کەوتە ڕوو
شەوکەتی باڵای سنەوبەر شکا

(١٢) ئەم بەیتە لای: بم، شج، گم، مس نییە.
(١٣) ئەم بەیتە لای: ئا نییە.
(١٤) چۆن بەهەموو سەر شکا: چۆن بوو کە خودسەر شکا: ئا.

## ١٢[١]

دلبەرا ئەمرۆ نیگاهت؛ کاری سەد خەنجەر دەکا[٢]
یەک بەیەک نێشی موژەت، زەخمی دوو سەد نەشتەر دەکا[٣]
نایرەی پشکۆیی کولمەت، ڕەونەقی مەجمەر دەبا
رایحەی شەوبۆیی طوڕەت، لەومەیی عەنبەر دەکا
ئیلتیهابی عیشقی تۆ، ئیمڕۆ لە سینەی ئێمەدا
دەستوبردی ئاتەشی سوزان لە نەیشەککەر دەکا[٤]
خۆش بەحاڵی خاڵەکەی هیندوو لەسەر گەنجی لەبت
کافرێکی دۆزەخیی، سەیری لەبی کەوثەر دەکا
بەندەیی شەهدی لەبی، وەک شەککەری شیرینی تۆ[٥]
خوسرەوێکە؛ سەڵتەنەت بێ خاتەم و ئەفسەر دەکا[٦]
هەر کەسێ مەستی صەبوحی نێرگسی مەخمورتە
کەی خەیاڵی جامی سەهبا، یا مەیی خللەر دەکا[٧]
چونکە پێت عارە نیشانەی «ناوەک»ی تۆ بین دەمە[٨]
تیرەکەت: جارێ سەر و جارێ بەعەمدەن بەر دەکا
زوڵفەکەت: جارێ طەناب و جارێ نافەی مشکی ناب
ئەلحەق ئەم عەییارە ئەمڕۆ؛ کاری جادووگەر دەکا
بەو خەیاڵەی جارێ بەڵکە بێیە باڵینی «**ئەدەب**»[٩]
گەر لەسەر ئەورەنگی جەم بێ، یادی نێو بەستەر ئەکا[١٠]

........................................................

(١) ئەم شیعرە لای: مس، بم، ئە، گم، ئا، شج هەیە.
(٢) دلبەرا ئەمڕۆ: دڵبەرا ئەمڕۆکە: بم.
(٣) کاری دەمی نەشتەر دەکا: ڕە.
(٤) ئاتەشی سوزان: ئاتەشە سوزان...: بم.
(٥) بەندەیی شەهدی: بەندەیی عەشقی: بم، شج، گم.
(٦) سەڵتەنەت بێ خاتەم و ئەفسەر ئەکا: سەڵتەنەت بێ خانم و ئەفسەر دەکا: بم، شج، گم.
(٧) جامی سەهبا، یا مەیی خللەر دەکا: ساغەری پڕ بادەیی خللەر دەکا: ڕە.
(٨) چونکە پێت عارە ئەمن ببمە نیشانەی نامەکەت: بم، شج، گم.
(٩) بەو خەیاڵەی جارێ بەڵکە ببیە باڵینی «ئەدەب»: بەو خەیاڵەی بەڵکو جارێ...: ڕە، ئا.
(١٠) یادی نێو: ئارەزووی: ئە.



## ١٣[١]

دولبەرێ وا بێ، کە ئەمڕۆ زلڵفی عەییاری دەکا[٢]
قوتبی بەستامی بەدینێک؛ مەیلی زنناری دەکا
خەنجەری غەمزەی لە جەرگم داوە، بێ حاڵی ئەوەم
مەرهەمی زەخمم حەواڵەی زوڵفی خونخواری دەکا
دڵ بەسەد خوێنی جگەر؛ خونچەی گەیاندێ بۆ گوڵم[٣]
ئەو ڕەقیبە گەبرە ئێستا، مەنعی گوڵزاری دەکا[٤]
من قەرارم بوو: دەبێ بێ، تا بەسۆزێک بای سەبا[٥]
بێ قەراری بوو، قەرارە زوڵفی طەڕاری دەکا[٦][٧]
دڵ بەچاوی موبتەلا بوو؛ زوڵفی زەنگیی حەبسی کرد
کافرە؛ هەردەم بەتەرحێ ڕەنج و ئازاری دەکا[٨]
گەر بەقووەی عەسکەری شاهان جەهانگیری دەکەن[٩]
دڵبەرم تەنیا بەیەک غەمزە جەهانداریی دەکا[١٠]
مەنعی عاشق بۆ دەکا؛ عاقڵ لە عیشقی دڵبەران
عاشقی بێچارە چ بکا، حوسنە ناچاری دەکا[١١]
پێم دەڵێن شیعری «**ئەدەب**»، یا سیحرە، یا جادوو، بڵێ[١٢]
شیعری من: جادوو بەیادی چەشمی سەحەاری دەکا[١٣]

........................................................

(١) ئەم شیعرە لای: ڕە، مس، ئە، ئا، بم، شج، گم هەیە.
(٢) کە ئەمڕۆ زوڵفی عەییاری دەکا: کە ئەمڕۆ دوو سیەهـ ماری دەکا: گم.
(٣) خونچەی گەیاندێ بۆ گوڵم: خونچەی گەیاندی بۆ دڵم: بم، گم، شج.
(٤) ئەو ڕەقیبە گەبرە ئێستا: ئەو ڕەقیبە کافرەی ئاوێستا: بم. ئەو ڕەقیبە کافرە: گم. ئەو ڕەقیبەی کافر: ئا. ئەو ڕەقیبە گەبرە ئێستا: ڕە.
(٥) من قەرارم بۆ دەبێ بێ؟ تا بەسۆزێک بای سەبا
بێ قەراری، بەو قەرارە زوڵفی فەڕاڕی دەکا-ئا.
(٦) من قەرارم بۆی دەبێ تا بەسۆزێک بای سەبا
بێ قەراری بوو، قەرارە مشکی تاتاری دەکا: بم، شج، گم.

(٧) من قەرارم بۆ دەبێ بێ، تا بەسۆزێک بای سەبا
بێ قەراری بەو قەرارە، مەنعی تاتاری دەکا: گم.

(٨) کافرە هەردەم بەتەرحێ: کافرە هەردەم بەرزێ: ڕە.

(٩) گەر بەقووەی عەسکەری: گەر بەقووەت عەسکەری: ئا.

(١٠) ئەم بەیتە لای: ئە، بم، گم، شج نییە.

(١١) حوسنە ناچاری دەکا: حوسنی ناچاری دەکا: شج، گم، بم.

(١٢) پێم دەڵێن سیحرە شیعاری، جادووە شیعری «ئەدەب»: بم. گەر دەڵێن: ئا، ڕە.

(١٣) با خەبەر بن هەرچی ئەیکا، چەشمی سەححاری ئەکا: بم.



## ١٤[1]

ڕوومەتت بەدری مونیرە، پەرچەمت وەک مشکی ناب
لەو: خەجەڵ ما ئافتاب و لەم: شکا، قەدری گوڵاب[2]
عیشقی تۆ، دەمسازە بۆمە؛ گەر فیراقە، گەر ویساڵ
نوتقی تۆ، جان بەخشە بۆمە، گەر خیتابە، گەر عیتاب[3]
گەر حیجابی عیسمەمەتە، یا حەسرەتە بۆ منی هەژار
مەعجەرت لادە لە ڕوو تۆ، وەختە هەڵگیرێ حیجاب[4]
با غەریقی بەحری هیجرت بم، وەکو نیلوفەڕیش[5]
دوور بەدوور خۆ هەم بەرابەر: بەو جەمالی ئافتاب[6][7]
بێ حسابن کوشتەیی پەیکانی غەمزەی چاوەکەت[8]
گەر وەکو ئەمثالی ئێمە، بێنە سەر حەد و حیساب[9]
تەوسەنی خۆت رامە بۆ ئەغیار؛ چی بێ ئەی عەجەب![10]
گەر دەگاتە بەختی مە؛ ئەو سەرکەشێکە، بەد ڕیکاب
هێندە ڕاوەستا لە داوێن، ئاوی فرمێسکی فیراق
بۆیە وێستا؛ ئەشکی دیدەم، قەترەیەک و سەد حوباب[11]
طوڕەیی شەوڕەنگ و خەتتی سەبز و زوڵفت کافییە[12][13]
بۆ عەزابی مە، چە لازم؛ بەند و زنجیر و طەناب!
بۆ نیثاری مەقدەمت، لەکنم عەزیزە جانی خۆم[14]
بۆیە بۆ ئیثاری جانی خۆم هەمە هێندە شەتاب[15][16]
لەودەمەی هاتوومە دەرگاهت، بەئومێدی نیاز
غەیری بارانی سرشکی خۆم نەدی قەت فەتحی باب
دڵبەرا! بێ میهری تۆ، ڕۆژ و شەوی تارە «**ئەدەب**»
باوجوودی لوتفی تۆ، گەر دۆزەخە: نِعْمَ المآب[17][18]

........................................................

(١) ئەم شیعرە لای: مس، بم، شج، گم، ئا، ئە هەیە.

(٢) لەم شکا قەدری گوڵاب، لەو شکا قەدری گوڵاب: ئە.

(٣) نوتقی تۆ، جان بەخشە: نوتقی جان بەخشە: بم.
(٤) مەعجەرت لادە لە ڕوو تۆ: موعجیزەت لادە: بم، شج، گم. مەعجەری لادە: ئا.
(٥) وەک گوڵی نیلوفەڕم، گەه غەریقی بەحری عەشقی تۆ: ئا.
(٦) دوور بەدوور خۆم هەم بەرابەر: دوور بەدوور خۆم هەم بەرابەر: ئا.
(٧) بەو جەمالی ئافتاب: بۆ جەمالی ئافتاب: بم، شج، گم.
ئەم بەیتە لای: ئە نییە.
(٨) غەمزەی چاوەکەت: غەمزەت چاوەکەم: ئا.
(٩) بێنە سەر حەد و حیساب: بێنییە جەرگەی حیساب: ئا.
(١٠) تەوسەنی خۆت: تەوسەنی تۆ: ئا. تەوسەنی خۆت بۆ ئەغیار چی ئەلعەجەب: ئە.
(١١) بۆیە وێستا ئەشکی دیدەم: بۆیە ئەشکی کەوتە دامەن: ئا.
(١٢) طوڕەیی شەوڕەنگ و: طوڕەیی شەوزەنگت: گم، شج، بم.
(١٣) خەتتی سەبز و زوڵفت: خەتتی سەبزی زوڵفت: ئا. خەتتی سەبز و زوڵفت کافر: شج.
(١٤) بۆیە بۆ ئیثاری جانی خۆم: بۆیە ئیثاری جانی تۆم: گم.
(١٥) بۆ دەکەی جانی عەزیزم بۆ نیثاری خۆت شیتاب: ئا.
(١٦) خۆم هەمە هیندە شەتاب: خۆم هەیە: شج، بم، گم. شەتاب: هەڵەداوان، پەلەپڕۆزێ.
(١٧) باوجوودی: باوجود: بم، شج، گم.
(١٨) گەر دۆزەخە: کر دۆزەخە: بم، شج، گم.



## ١٥[١]

بۆ حیجابی عیسمەتی چیهرە؛ لە قورصی ئافتاب
پەردەیی گێسوو، لەسەر خورشیدی ڕوو، بۆتە نیقاب
کەوتە داوی زوڵفی قوللابت: دڵی ئازادی من[٢]
(.........................................................................)[٣]

هادیی دڵمە غورابی زوڵفی تۆیە و ڕوومەتت
ئاخری خێر، ڕەهڕەوێکی ڕاهنمایی کا: غوراب[٤]
گەر لە لوتفت کۆتەهە، دەستی وەفا، بۆ حاڵی من[٥]
کۆتەهی ناکا لە من؛ زوڵفی درازی تۆ: عیتاب
گەر مەگەس ڕێی نیشتنی قەندی لەبی تۆی بدەنێ[٦]
تا بەڕۆژی ڕەستەخێزیی، شەککەر ئالوودە لوعاب
مەرگی تۆ، تا ڕۆژی مردن؛ زەحمەتە من هەڵگرم
دڵ لە:دڵبەر؛ دەست لە:ساقی؛ لەب:لەسەر جامی شەراب[٧]
هێندە ڕاوەستا لە داوێن؛ ئاوی فرمێسکم بەکوڵ
گەر بەخوڕ بێ، ئەشکی دیدەم؛ قەترەیەکی سەد حوباب[٨]
بۆ نەشاطی بەزمی مەستانت لە لوتفی تۆ: «**ئەدەب**»
چونکە: سینە ناڵەزارە؛ دەنگی دێ هەروەک ڕوباب[٩]

.........................................................

(١) ئەم شیعرە لای: مس، ئا، بم، شج، گ، ئە هەیە.
(٢) ئەم بەیتە لای: شج نییە.
(٣) ئەم نیوە بەیتە لە (مس)دا جێگەکەی خاڵییە، بەڵام لای: بم ئاوا نووسراوە: ماسی تی کردە نامە هەڵبێن، وەر نییە طەناب. لای (گم)یش ئاوایە: ماسی پێ گیراوە نامە هەڵێین وەر نییە طەناب!.
ئەم بەیتە لای: ئە. شج نییە. منیش بۆم ڕاست نەکرایەوە.
(٤) ئاخری خێر بێ، کە کێ دی هادی ڕەعنایی غوراب: ئا. ئاخری خێر، ڕوویەکی هادی ڕەعنایی غوراب: مس، د، شج.
(٥) گەر لە لوتفت کوتەهە: گەر لە لوتفت کورتە وا: ئا. گەر لە لوتفت کەوتەوە: بم، شج.
(٦) گەر مەگەس ڕێی نیشتنی قەندی لەبی تۆی پێ بدەن: شج.
(٧) ئەم بەیتە لای: ئە نییە.
(٨) قەترەیەکی سەد حوباب: قەترەیەک و سەد حوباب: ئا.
(٩) سینە ناڵەزارە: سینەی ناڵەزارە: ئا.

## ١٦[١]

چەشمی تۆ؛ مەستی شەراب و حاڵی خەمبارم خراب[٢]
چیهری تۆ؛ پشکۆی نار و سینەیی زارم کەباب[٣]
جیسمی مە و دوو سونبولت: دووهەمسەرن مایل بەتاو[٤]
بەختی مە و دوو نێرگست: دوو تەوئەمن مایل بەخواب[٥]
غەیری چەشمی فیتنەزا، وا خاڵەکەی دونیالەیە
ذو ذەنەب؛ کێ دی تلووعی بێ، بەقورصی ئافتاب[٦]
گەر سەری رشتەی بەدڵ رەبتی نییە، بۆچ ئەی صەنەم[٧]
تا کەمێ زوڵفت دەشێوێ؛ من دەکەومە ئیزتیراب!؟[٨]
بێ سەبەب خۆم کوشت ئەمن، بێ تۆ، لە دووری ڕوویی تۆ
نە گوناهی کەوتە سەر تۆ، نە بەخۆمی بوو ثەواب[٩]
دڵ وەها ئۆگر بەزوڵفە، ساعەتێ بێی ناسرەوێ[١٠]
تا سەرئەنجامی چییە، ئەو سوحبەتەی کەبک و عەقاب[١١]
گەر لە بێ میهری، خیتابی تۆ، دەگەڵ ئەغیارە، قەت
کۆتەهی ناکا لە من، زوڵفی درازی تۆ: عیتاب
رشتەی میهرت لە مل خستم، دەڵێی بۆ کوێ دەچی![١٢]
تۆ دەزانی مەقسەدم، جانا؛ بەدەست تۆیە طەناب
شۆری عیشقت؛ کەوتە سەر عوششاقێ بێ بەرگ و نەوا
بۆیە بێ پەردە دەناڵێنن، وەکو تار و روباب[١٣]
مەرگی تۆ، تا وەقتی مردن؛ زەحمەتە هەڵگرتنم
دڵ: لە عیشق و دەست: لە ساقی، لەب: لەسەر جامی شەراب
ذایقەی بۆسەی لەبم بێ؛ بۆچمە جامی صەبووح![١٤]
رایحەی طوڕەی ئەتۆم بێ؛ چم لە نافەی مشکی ناب!
شیعری من؛ وەجدی چییە بۆ ئەو کەسەی زەوقی نەبێ!
نەغمەیی بولبول، چە تەفریحێکە بۆ مەغزی غوراب![١٥]



سەد هەزار ئەفسووس بۆ: ئەهلی بیلادی مە: «**ئەدەب**»
قەت نەبوو فەرقی بکەن: کێ زەڕگەرە؛ کێ کوورە تاب[١٦]

........................................................

(١) ئەم شیعرە لای: ڕە، مس، بم، ئا، شج، ئە، گم هەیە.
(٢) چەشمی تۆ: چاوی تۆ: گم.
(٣) چیهری تۆ: چیهر تۆ: ئە. سینەیی زارم: سنەیی زارم: بم.
(٤) جیسمی مەو: جیسمی مو و: بم، گم، شج. دوو هەمسەرن: دوو تەوئەمن: ئە.
(٥) مایل بەخواب: عادی بەخواب: ڕە.
(٦) بەقورصی ئافتاب: لە قورسی ئافتاب: بم، شج.
(٧) گەر سەری ڕشتەی بەدڵ: گەر سەری ڕشتەی بەدەن: گم، ئە، بم. گەر سەری ڕشتەی بەمن: شج.
(٨) تا کەمێ زوڵفت دەشێوێ: تا کەمێ زوڵفت ئەپۆشی: شج، بم، گم.
(٩) لە گوناهی کەوتە سەر تۆ، نە لە بۆمن بوو ثەواب: شج. نە گوناهی کەوتە سەر تۆ، نە نجومی بوو صەواب: بم، گم.
(١٠) دڵ وەها ئۆگر بەزوڵفە: دڵ کەها لەو گرەی زوڵفە: شج، بم، گم.
(١١) تا سەرئەنجامی چییە: تا سەرئەنجامی چبێ: ڕە، ئا. کەبک و عەقاب: کیک و عیتاب: بم.
(١٢) ڕشتەی میهرت: ڕشتەیی قەهرت: مس.
(١٣) بۆیە بێ پەردە: بۆیە بێ پەروا: گم.
(١٤) ذایقەی بۆسەی لەبم بێ: هەر سەحەر ماچی ئەتۆم بێ: ئا.
(١٥) چە تەفریحێکە بۆ مەغزی غوراب: چە تەفریحێکە لە بۆ مەغزی غوراب: بم.
(١٦) کێ گۆزە تاب: ئا. کێ گەورە باب: بم، شج، گم.

## ١٧[١]

یاری مه، بۆ حەسرەتی مه، مووی له رووی کرده نیقاب
بێـخـەبەر ئەمما کـه: سـایه؛ بوو بەزیبی ئافـتـاب[٢]
هەر فـریشـتـه تەلعـەتێک، فـەخری بەنووری خـیلقـەته[٣]
هات و رووی تۆی دی؛ دەڵێ «یا لَیْتَنِي كُنتُ تراب»
لەودەمـەی عـەتری سـەری گـێسـووی تۆ هاته مـەشام
کـێیـه مننەت هەڵگرێ؛ ئیـدی له عـەنبـەر، یا گـوڵاب؟
کـۆمـەڵێ خـاڵن وەدەرکـەوتن له تەخـتی سـینەدا[٤]
یا نومـایان عـیـقـدی پەروینن له شـوعلەی مـاهتـاب![٥]
مـێش ئەگـەر جـارێ بنیـشێ لەو لەبی وەک قـەندی تۆ
تا بەرۆژی مـردنی؛ هەر شـەککەر ئالووده لوعـاب
ئەی عـەجەب حوققەی دەهەنت و ئەو ددانی گەوهەرین[٦]
چۆن له ناو نوقتێکه پەنهان، سی و دوو دوڕی خوشاب!
کـەوته دامی زوڵفی قـوڵلاب، ئەو دڵەی ئازادی من[٧]
...............................................................................[٨]
غـافـڵن ئەورۆ له خـوێنی کـوشتـەیی هیـجـرانی خـۆت[٩]
دامـەنت دەگـرن بڵا پاکی، بەرۆژی ئیـحـتـیـسـاب[١٠]
بۆ سـەر ئەو چاهی زەقـەن، زوڵفی زەغـەن بوو، رەهبـەرم
ئاخـری چاهە؛ کـەسـێکی رەهبـەری رێی بێ غـوراب
بۆ نیـشـانی بەزمی مـەسـتـانت، له دووریی تۆ «**ئەدەب**»[١١]
چەنگە: سینەی، تار: ناڵەی، زاره دەنگی، وەک روباب

---

(١) ئەم شیعره لای: مس، ئا، ئه هەیه.
(٢) بوو بەزیبی ئافتاب: بوو برینی ئافتاب: ئه.
(٣) فەخری بەنووری خیلقەته: وا فەخره نووری خیلقەته: ئه.
(٤) کۆمەڵێ خاڵن: کۆمەڵی خاڵی: ئه.
(٥) عیقدی پەروینن: عیقدی پەروینه: ئه.



(٦) ئەم بەیته لای: ئه نییه.
(٧) ئەم بەیته لای: ئه نییه.
(٨) ئەم نیوه بەیته لای: «ئا»ش جێگەکەی چۆڵه.
(٩) غافڵن ئەورۆ: غافڵی ئەورۆ: ئه.
(١٠) بەرۆژی ئیحتیساب: هەموو رۆژی حساب: ئه.
(١١) ئەم بەیته لای: ئه نییه.

## ١٨[١]

لەو دەمەی مەستی سوراحی چەشمی دڵدارە ئەدەب
قەت نەکەن باوەڕ، بڵێن: یەک لەحزە هوشیارە ئەدەب[٢]
ڕێم بەگوڵزارت تەڵەب کرد، ئەو شەوە فەرمووت:نەیێ[٣]
یەک نەفەس بێت و بچێ، لەم باخە موختارە ئەدەب
دەم بەخەندەی خونچەیەک بوو، ڕەونەقی گوڵزاری مە
بۆ گوڵی گوڵزاری ڕووی؛ وەک بلبلی زارە ئەدەب
تووتیی تەبعم کە دێتە مەدحی لێوی شەککەری
شەهدی سافێکی عەلاوەی قەندی گوفتارە ئەدەب[٤]
شەو لە ناو جێ؛تا سەحەرگاهان بەیادی ماهی ڕووت[٥]
ساتێ ئەختەر؛ باری ئەشک و ساتێ بێدارە ئەدەب
دڵبەرا بۆ خۆت مەگەر ڕەحمێ بەحاڵی من بکەی[٦]
گەر نە، لەم دنیایە کێی وا یار و خەمخوارە ئەدەب[٧]
تا بەتاری زوڵفی خاوت؛ خامە بێتە ئیرتیعاش[٨]
دەفتەری پڕ عەنبەر و مشکی تاتارە ئەدەب
شەو لەبەر سۆزی دەروون و ئەشکی دیدەم؛ نازەنین
لایەکی: ئاوی ڕەوان و لایەکی: نارە، ئەدەب
دڵ برینداری خەدەنگی غەمزەکەی دڵدوزتە[٩]
جارێ ناپرسی؛ بزانی چۆن بریندارە ئەدەب
گەر سزاواری خیتابت نیم، قبووڵە ئەی ئەدەب[١٠]
بۆ عیتابیشت مەگەر هەر: ناسزاوارە ئەدەب؟
گەر بەقانوونی وەفاداریی دەپرسی حاڵی زار
ڕەنگی زەرد و ئاهی سەرد و ئەشکی گوڵنارە ئەدەب
چەشمی بیمارت تەبیبی ئەو دڵەی بیماری مە[١١]
سەیری بیماری کە، بیماری پەرستارە ئەدەب
شەو بەیادی زوڵفی پڕ نێشی هەتاکو سوبحەدەم
هەمنیشینی عەقرەب و هەمسوحبەتی مارە ئەدەب[١٢]



زاهیدا! زەحمەت مەکێشە بۆ ثبوتی وەرعی من[١٣]
زوڵفی ساقی خۆی گەواهە، ئەهلی زنارە ئەدەب[١٤]
دڵ، کە کەوتە دامی زوڵفت، من گوتم ئاسوودە بووم
وەک ئەوێستا تێدەفکرم، خۆی گرفتارە ئەدەب
زاهیدان تەزویری بێجایانە، بۆ تەکفیری ئەدەب
زوڵفی یارم خۆی گەواهە، ئەهلی زنارە ئەدەب
وا نییە واعیز بەتەنها بێ لەمە، بێزار و بەس[١٥]
سەد ئەوەندەی وەی لەوی بیللاهی بێزارە ئەدەب

.........................................................

(١) ئەم شیعرە لای: بم، ئا، گم، شج، مس هەیە. لەگەڵ شیعری دواتریشدا زۆر لەیەک نزیکن. بەڵام «ئا» بەیتی سەرەتای ئەم غەزەلەی نەنووسیوە.
(٢) قەت مەکەن باوەڕ: قەت نەکەن باوەڕ: ڕە.
(٣) قەت نەکەن: قەت مەکەن: ئا.
(٤) یار ئەگەر تۆ بی: تۆ ئەگەر یاری: ڕە.
(٥) فەرمووت: نەیێ: فەرمووت بەڵێ: گم. فەرمووت نەبێ: بم، مس، شج.
ئەم بەیتە لای: ئا نییە.
(٦) شەهدی سافێکی: شەهدی سافێکە: گم.
(٧) ماهی ڕووت: ماهی ڕووی: گم.
(٧) دڵبەرا بۆ خۆت: دڵبەرا هەر خۆت: شج.
(٩) گەر نە لەم دنیایە کێی: گەر نە لەم دنیایە کێ: بم، گم، شج. گەر نە: وەرنە: شج.
(١٠) تا بەتاری: با بەتاری: بم، شج، گم.
(١١) غەمزەکەی دڵدۆزتە: غەمزەکەی دڵدۆزییە: ئا.
(١٢) ئەی «ئەدەب»: ئەی عەجەب: ئا. ئەی «ئەدەب»: ئەی ئەسەف: شج. ئەم بەیتە لای: گم نییە.
(١٣) چەشمی بیمارت تەبیبی: چەشمی بیمارت تەبیبێ: بم. ئەم بەیتە لای: شج نییە.
(١٤) ئەم بەیتە لای: ئا نییە.
(١٥) ئەم بەیتە و بەیتێکی دواتر لەیەک نزیکن. ئەم بەیتە لای: شج نییە.
(١٦) ئەم بەیتە لای: مس، ئا نییە.
(١٧) ئەم بەیتە لای: ئا، مس نییە.

خەستە حاڵی غەمزەیی شۆخێکی عەییارە «**ئەدەب**»
هەر مەپرسە چۆن نزار و زار و بیمارە «**ئەدەب**»
لەو دەمەی مەستی مەیی چەشمی خوماری دڵبەرە
قەت مەکەن باوەڕ، بڵێن: یەک لەحزە هوشیارە «**ئەدەب**»(٢)
شەو بەیادی زوڵفی مشکینی، هەتاکو سوبحدەم
بەستەری پڕ عەنبەر و پڕ مشکی تاتارە «**ئەدەب**»
چی جەفای باری ملم کرد، وەم نەکرد ئازوردە بێ
تا بزانێ تا چ ئەندازە، وەفادارە «**ئەدەب**»(٣)
شەشپەڕی غەمزەت بەچەندین جێ، لە سینەم کارییە
وەم نەکرد کەس پێ بزانێ؛ چۆن بریندارە «**ئەدەب**»
ئەی بتی ڕەعنا، لەسەر چی هێندە ئازارم دەکەی!
کامەیە جورمی؟ کە موستەوجیب بەئازارە «**ئەدەب**»!
هەرچی کردی، عیشقی تۆ کردی، دەگەڵ مە، گەر نە بۆچ؟
بێ سەبەب ڕسوای کووچە و شار و بازاڕە «**ئەدەب**»؟
ئاشنایی تۆم بەسە؛ عالەم هەموو بێگانە بێ
یار ئەگەر تۆ بی؛ چ باکی یار و ئەغیارە «**ئەدەب**»!(٤)
تۆ، گوڵی خونچە دەهان، تابوویە زیبی باغی مە
شێتییە هەر کەس بڵێ: مایل بەگوڵزارە «**ئەدەب**»
وا دەزانی هەر ڕەقیبت، لێمە بێزاریی دەکا!(٥)
سەد ئەوەندەی وی، لەوی بیللاهی بێزارە «**ئەدەب**»
بۆ دەپرسێ پیری مە، ئەمڕۆ لە ئایینی ئەمە(٦)
زوڵفی تۆ، بۆ خۆی گەواهە، ئەهلی زوننارە «**ئەدەب**»
هەر کەسێ وەک من ئەسیری چەنبەری زوڵفت نەبێ
کوا دەزانێ دوور بەدوور، چۆنت گرفتارە «**ئەدەب**»

(١) ئەم شیعرە لای: مس، ڕە، ئە، ئا هەیە. ئەم غەزەلە لەگەڵ غەزەلی پێشوودا هاووێنە و تێکەڵ و پێکەڵە.
(٢) با بزانێ تا چ ئەندازە: ئا.
(٣) وا دەزانێ هەر ڕەقیبە: ئا. (٤) ئەم بەیتە لای: مس نییە.





گەر مەتڵەعە بۆ ماهی موقەننەع، چەهی نەخشەب(٢)
ماهی مە، تلووعی لە چەهی غەبغەبە هەر شەب(٣)
گوڵزاری جەماڵە، موتەشەکیل بەدوو سونبول
یا بەدری درەخشندە، لە مابەینی دوو عەقرەب
ئەی سەروو چەمانی قەمەریی، نووری قەمەر ڕوو(٤)
ئەی خونچە دەهانی شەکەری نوتق، شەکەر لەب(٥)
تاکەی بەجەفا؛ ئێمە خەتابار و گونەهکار
تاکەی بەستەم، ئێمە گرفتار و موعەززەب؟
گەر نوتقە؛ هەتاکەی دەگەڵ ئەغیارە خیتابت(٦)
گەر قەهرە، هەتاکەی منی بێچارە موخاتەب
سەد حەیفێ کە بۆ دەردی دڵی مە، دەمی وەسڵت(٧)
شەو کورتە و فرسەت کەم و تووڵانییە مەتڵەب(٨)
گەر بادە، فەرحبەخشە، بەیادی لەبی تۆیە(٩)
نەشئەی چییە، بێ شەهدی لەبت: جامی لەبالەب!
گەر لۆمەیە، گەر مەنعە، ئەگەر کفرە، گەر ئیسلام
گەر تابعی قانوونە؛ ئەگەر خارجی مەزهەب
تا جان لە بەدەندایە، «**ئەدەب**» تۆ دەپەرستێ(١٠)
زوننار ملم: زوڵفی خەمت؛ قیبلەمە: غەبغەب(١١)

(١) ئەم شیعرە لای: ڕە، مس، بم، ئا، شچ، گم، ئە هەیە.
(٢) چەهی نەخشەب: چییە نەخشەب: گم، شچ، بم، مە.
(٣) ماهی مە: ماهی ئێمە: شچ.
(٤) نووری قەمەر ڕوو: بۆی قەمەری ڕوو: ئا.
(٥) ئەی خونچە هانی: وەی خونچە دەهانی: ڕە.
(٦) گەر نوتقە: گەر لوتفە: ئا، ئە، بم، شچ، مس، گم.
(٧) سەد حەیفێ: سەد حەیف: شچ، بم، گم.
(٨) فرسەت کەم و: فرسەت نییە: شچ.فرسەت کەم و شەو کورتە و تولانییە مەتڵەب: بم، گم، ئا، شچ.
(٩) بەیادی لەبی تۆیە: بەیادی لەبی تۆ: شچ.

( ١٠ ) تا جان له بەدەندایە: تا گیانی له لەشدایە: گم. تا جانی له لەشدایە: شج.
( ١١ ) زنناری ملم: زنناری ملی: شج. زونناری قەدەم: ئا. زوڵفی خەمت: زوڵفی خەمە: ئا.
ئەم بەیتە لای: شج ئاوایە: تا جانی له تەندایە «ئەدەب» تۆ دەپەرستێ
: زونناری ملی زوڵفی خەمت، قیبلەیە غەبغەب.



## ٢١[١]

ئەو زوڵفی سەمەن سا، کە سەراپایە له باڵات[٢]
چەشمی بەدی لێ دوور بێ؛ چە زیبایە له باڵات[٣]
گەهـ دەستە، گەهێ بەستە، گەهێ کرژ و گەهێ خاو
هەر تەرزێ کە مەطبوعە بەدڵ وایە له باڵات[٤]
شوعلەی روخت و تیرەگیی زوڵفی سیەهفام[٥]
مەهتابە، کە تێکەڵ شەوی یەڵدایە له باڵات
ڕوخساری فروزندە، طەڕازی قەدی نەخلت
نوورێکە تەقازایی تەجەللایە له باڵات
باخی ئیرەمە؛ سینە و گولزاری جەمالت[٦]
حەسرەت بەدووسەد جەننەتی مەئوایە له باڵات[٧]
خونچەی دەهەنی تۆیە، گەهی خەندە و گوفتار
دورجێکی شەکەرخێز و گوهەر زایە له باڵات[٨]
قامەت نییە بیللاهی، قیامەت بوو هەڵستا
لەو شۆڕش و غەوغایە، کە پەیدایە له باڵات
جانا! مەکە مەنعی «**ئەدەب**»ی زار، له زاریی
شێتی گوڵی دیداری تۆ؛ شەیدایە له باڵات[٩]

........................................................

( ١ ) ئەم شیعرە لای: مس، ئا، شج، گم، ئە، بم هەیە.
( ٢ ) ئەو زوڵفی سەمەن سایە: ئا. زوڵفی سەمەن ساکە: گم، شج.
( ٣ ) چەشمی بەدی لێ دوور بێ: چاوی بەدی لێ دوور بێ: ئا، گم.
( ٤ ) هەر تەرزێ: هەر تەرزە له مەطبوعە: بم، مس، گم.
( ٥ ) شوعلەی ڕوخت و تیرەگەهی: شوعلەی ڕوخی تۆ، تیرەگەهی: بم، مس. شوعلەی ڕوخی تۆ، نەیروگە: شج. ئەم بەیتە لای: ئە نییە.
( ٦ ) باخی ئیرەمە سینە دەگولزاری جەمالت: ئا. باخی ئیرەمە، گولزارە: گم.
( ٧ ) جەننەت مەئوایە: بم.
( ٨ ) ئەم بەیتە لای: ئا بەمجۆرەیە:
غونچەی دەهەنی تۆ بەگەهی خەندە و گوفتار
دورجێکە گوهەرخێز و شەکەر زایە له باڵات
( ٩ ) شێتی گوڵی دیدارت و: ئا. ئە.

## ٢٢[١]

ئەی شەککەرین دەهانی شەکەر نوتفی، لێو نەبات
شیرین هەموو شەمایل و شیرین هەموو ئەدات
جارێ لە حالّی خەستە دلّانت بەلوتف و ناز[٢]
بۆچی دەبی نەپرسی؛ کە چۆنن لە خاکی پات!
جان و سەرم بەبادی فەنادا بەخاکی ڕێت
نەمزانی تا سەرت نییە؛ ئەی بێ بەقا: وەفات[٣]
عومرێکی بێ لەبت گوزەرا؛ بۆ مە مردنە
وەک مردنی بەرابەری تۆ، بۆ مەیە حەیات
یاڕەب! دەبێ هەر ئەمن و ئەتۆ بین، بەبێ ڕەقیب[٤]
بگرم؛ لە گەردنی بخەم، ئەو زولّفی تا بەتات[٥]
وەعدەت بەوەسلّ بێنییە جێ؛ هات و دەولّەتە[٦]
چ بکەم ئەگەر نەهاتی! چ دەکرێ دەگەلّ نەهات!
بۆ ئیمتیازی بەینی من و عاشقانی تۆ[٧]
یەک بۆسە کافییە، کە کەرەم کەی بەئیلتیفات
خوێنی منت حەلّالّە، بەشەرتێکی خۆت بلّێی:
ماچێ لەکونجی دوو لەبی خوێنیمە؛ خوێن بەهات[٨]
شام و سەحەر دوعاتە «**ئەدەب**» بۆ ویسالّی یار
جارێکی وا نەبوو، بەئیجابەت بگا: دوعات

..........

(١) ئەم شیعرە لای: ڕە، مخ، ئە، ئا، مس هەیە.
(٢) جارێ لە حالّی خەستە دلّانت: جارێ لە حالّی خەستەی دلّانت: مخ. بەلوتف و ناز: بەنازەوە: مس، ڕە.
(٣) نەمزانی باسەرت بەنەوای بێ ئیجازە هات: ئا.
(٤) هەر ئەمن و ئەتۆ بین، بەبێ ڕەقیب: هەر ئەمن و ئەتۆ بین و دوو بەدوو: ڕە.
(٥) بگرم لە گەردنی بخەم: بەلّکم لە گەردنی بخەم: مس.
(٦) هات و دەولّەتە: هاتی دەولّەتە: مخ.
(٧) بۆ ئیمتیازی بەینی من و جەمعی عاشقان: ئا. بۆ ئیمتیازی بەینی من و عاشقانی تر: مس.
(٨) ماچێ لە کونجی دوو لەبت خوێنمە، خوێن نەهات: مخ.
ماچێ لە کونجی دوو لەبی خوێنیمە، خوێن نەهات: ئە.



## ٢٣[١]

بەو خیلقەتە شیرینە، کە خولقا قەدی ڕەعنات[٢]
هەر من بەتەنێ شیفتە نیم، عالەمە شەیدات
گەر قیبلەیی ئیسلامە، ئەگەر موعجیزی زەردەشت[٣]
قیبلەی مەیە ئەمڕۆکە، فروغی روخی زیبات[٤]
مەخموری سوراحی شەوە، مینایە لەبەر خەو[٥]
من بم بەفیدای غەمزەیی ئەو نێرگسی شەهلات
سەودایی بڕانی سەری خۆیە دەسەریدا
هەر کەس وەکو زولّفت دەسەریدا هەیە سەودات
ئەمڕۆکە ئەگەر لێمە کەنارە، قەدی سەرووت
هەر شەو لە کەناری منی زاری، بەخەیالّات
طوڕەت بەدەمێ دەکا زیندە، سەد دلّی مردە
ئیعجازی مەسیحێکە، دەکا زولّفی چەلیپات
بۆیەم بەدەسی خۆ، بەسەری زولّفەوە بەستی[٦]
تا ماچکەم ئەغزات؛ لەسەر دۆشەوە؛ تا پات[٧]
بەو جیلوەوە صەخرەی صەنما، دەخەیە ڕەقس[٨]
لۆمەی نییە، زاهید؛ کە ئەتۆی دی، بەسەما هات[٩]
سەرمایەیی عیشقت؛ صەنەما! دلّ بوو، ئەویش چوو
عوززا سیفەتان عیشوە فرۆشن؛ ئەمنیش: لات
شیرینە ئەگەر گوفتەی من، وەک لەبی قەندت
مەوزونە وەکو شیعری «**ئەدەب**»، قامەت و بالّات

..........

(١) ئەم غەزەلە لای: مس، بم، ئا، ئە، شج، گم هەیە.
(٢) بەو خیلقەتە شیرینە: لەو خیلقەتی شیرینە: ئا.
(٣) گەر قیبلەیی ئیسلامە: گەر قیبلەیی ئیسلامی: گم، ئە. گەر کەعبەیی ئیسلامە: بم، شج.
(٤) قیبلەی مەیە ئەمڕۆکە: قیبلەی منە ئەمڕۆ: شج.

(٥) سوراحی شەوە: سوراحی شەبەوە: بم.

(٦) بۆیە بەدەسی خۆ: بۆیەم بەدزی خۆ: ئە، ئا.

(٧) لەسەر دۆشەوە: لەسەر و دۆشەوە: بم، شج، گم.

(٨) بەو جیلوەوە تۆ صەخرەی صەنەما دەچییە ڕەقس: گم.

(٩) بۆ مەی نییە زاهید: گم.



## (١)٢٤

سەحەرگاهان شکۆفەی دا، گوڵی نازت لە گوڵزارت
لە سەد جێ کەوتنە ناڵین هەزاران عاشقی زارت
خوداوەندا! چی جانبەخشن دوو گوڵبەرگی تەڕ و تازەت
تعالی الله چە ڕەنگینن دوو نەورەس؛ گوڵبەدەم نارت(٢)
بەغەمزێکت، لەسەر کوڵمەت وەلاچوو زوڵمەتی گێسوو(٣)
یەدی بەیزای هەیە قوربان، دەڵێی ئەو چەشمی بیمارت(٤)
خەدەنگی غەمزەکەت: ئەڵماس و دڵ وەک شیشەیە، نازک
کەسێ دێوانەیە وەک من؛ ئەگەر بووبێتە پەیکارت(٥)
دەزانم جانی شیرینم، بەهای لەعلی لەبت نابێ
بەڵێ. ناچارییە مایە، کە بێمایەم خەریدارت(٦)
ئەگەر باری خەمی تۆیە؛ ئەگەر جەوری ڕەقیبی تۆ
بەشەرتێ تۆ نەڕەنجی لێم؛ ئەمن ڕازیم بەهەر بارت
مەکە باوەڕ بەدیدارێ، لە تۆ تێر بێ: دڵ و دیدەم
بەدیدارت؛ هەتا مردن، ئەگەر تێر بم لە دیدارت
گرفتارم بەدامی تۆ، وەفادارم بەعەهدی تۆ
دەبێ تۆ بی و وەفای عەهدت نەبێ قەت بۆ گرفتارت(٧)
عیتابت وەک خیتابت، تۆ گەوارایە بەمە گیانە
کە حەنزەل شەهدی شیرینە، بەئەلفازی شەکەربارت(٨)
سەر و سامانەکەم تابوو، نەبوو کەس بۆ سەروکارت
لە بێ سامانیی وێستا، دەگەڵ غەیرە، سەروکارت(٩)
لەبەر تازە گرفتاران، دەزانم مەیلی مەت ناوە
بلا جارێ لەمەش پرسە، کە ئێمەش بووین گرفتارت(١٠)(١١)
«**ئەدەب**» بەو غایەتەش یارت نەبوو، نا میهرەبان، ئەمما
لە ئاهی ئاتەشینی تۆ، خودا گیربێ سەبەب کارت

---

(١) ئەم شیعرە لای: مس، بم، ئە، گم، شج هەیە.

(٢) تعالى الله چه ڕەنگینن: چه ڕەنگین: بم، گم.
(٣) بەغەمزێکت لەسەر کولّمت وەلاچوو: بەغەمزێکت لەسەر کولّمەی وەلاچوو: ئە، گم، بم.
(٤) دەڵێی ئەو چەشمی بیمارت: دڵی ئەو چەشمی بیمارت:بم، شج. دوو چاوی مەستی سەحارت: گم.
(٥) کەسێ دێوانەیە: مەگەر دێوانەیە: ئە.
(٦) بەڵێ: بلّێ: شج.
(٧)،(٨) ئەم دوو بەیتە لای: بم، مس، گم، شج نییە و مخ هێناویێتی.
(٩) لە بێ سامانی وێستا: لە بێ سامانی وێستاکە: شج، گم.
(١٠) ئێمەش بووین گرفتارت: لێرەش بووین گرفتارت: بم.
(١١) ئەم نیوە بەیتە لای: مس نییە.



## ٢٥[١]

لەو دەمەی سەر ڕشتەیی زوڵفی خەمی تۆم کەوتە دەست
بۆ خەمی زوڵفت، سەری ڕشتەم هەموو دەرچوو لە دەست
ساقیی مەستان: ئەتۆ بی و چاوی مەستت: جامی مەی
زاهیدی سەد ساڵە، تا دێنێ، دەبێتە مەی پەرست[٢]
بۆ شکستی قەسری دینم؛ جووتە ئەبرۆی تاقی تۆ
چونکە نووری ئەحمەدیی بوو، تاقی کیسرا بوو شکەست
غەمزە، چی کردی دەگەڵ مە، ئیسمی مەستی ختە سەر[٣]
چونکە زانی دەستی ئاخر، جورمێ ناگیرێ لە مەست[٤]
دوێ شەوێ فەرمووت: عەهد بێ، بێ وەفایی قەت نەکەم[٥]
کامە شەو بوو چاوەکەم، سەد وەعدەی وا سەختت نەبەست؟
ساغەری مەی، چونکە وەک جامی دەهانی تۆ دەچێ
دەم بەدەم بویێ لە مەجلیسدا دەسووڕێ دەست بەدەست
کامە جارە بێینە سەر دیداری ماهی تەلعەتت
زوڵفی عەقرەب نێشەکەت؛ لێمان نەبێتە بەرهەڵست؟
چاوەکەم قەدرم بزانە، تا لە دەستت دەرنەچووم
چونکە وەک ئەمنت غولامی باوەفا، کەم دێتە دەست
وە نییە هەر تەنیا «**ئەدەب**» بێ، خەستەیی پەیکانی تۆ
لەو خەدەنگی ئابداری غەمزەکەت، کێ بوو خەلەست؟

..........................................................

(١) ئەم غەزەلە لای: مس، ئا، مخ هەیە.
(٢) زاهیدی سەد ساڵە، تا دیتی، دەبێتە مەی پەرست: ئا.
(٣) غەمزە، چی کردی دەگەڵ مە: غەمزەچی کردی دەگەڵ مە: مخ. ئیسمی مەستی خستنیە سەر: مخ.
(٤) جورمی پاکێڕی لە مست!؟: مخ.
(٥) دوێ شەوێ: وی شەوێ: مخ.

واتە: ئەگەر «ئەدەب» لە پیاوچاکان دادەنرێ، یا کڵۆڵ و چارەڕەشە، ئەوا هەموو هیوایەکی بەگەورەیی و لێبووردەیی خۆت و بنەماڵەکەتانە، کە تکاکارم دەبن؛ کە لە ناو جەماوەردا بە«خەمسەی عەبا» یان «ئالی عەبا» ناو دەهێنرێن و بریتین لەو ناوانەی لە سەرووتر ئاماژەمان پێکردن.

«نالی» «خەمسەی ئالی عەبا»ی بەمجۆرە بەکاربردووە:

گوتی تاجی عەرەب و «ئالی عەبا» فەرموویان:
عەیبە تەن پەروەریی و نازک بەدەنیی
«٦٧١»

**١٦– هێندەم بەسە لە حەشر، کە چەتری شەفاعەتت**
**من ڕوو سیەهـ، لە سایەیی ڕەحمەتت وەلا نەخا**

ڕووسیەهـ: ڕووڕەش، ناپاک، بەد.

واتە: من خۆم دەناسم و دەزانم کردەوە و کارنامەم، زۆر ڕەش و ناشیرینە و ڕووی ڕۆژی حەشرم نییە، تا لە ڕووم بێت خۆم دەربخەم، بۆیە هەر ئەوەندەم لە بەزەییت گەرەکە، تا لەو ڕۆژەدا، لە ژێر چەتری میهرەبانیی و دڵنەرمیتدا بمشاریتەوە و جێگەم بکەیتەوە.



**٣**

کێش: بەحری هەزەج موسەددەس مەقسوور: (مفاعیلن مفاعیلن فعولن) وەک نموونەی:

١– ژ ڕەعنا نێرگزێن تەی مەست و خون ریز
زەمان بوو عەهدێ جەنگ ئەنگیزێ جەنگیز
«مەلای جزیری، ٢٧٠»

٢– لەبت: میم و قەدت: ئەلف و زوڵف: چیم
دەزانی بەم سیانە، تاڵبی چیم!!
«نالی، ٣١٢»

٣– دەبێتە باغی جەننەت؛ دەفعەیی بێ
بەکولبەی «سالما» گەر مەقدەمی یار
«سالم، ٥٧»

**١– ئەگەر تووبایە وەک تۆ جەننەت ئارا**
**لە شێوەی قامەتی تۆیە؛ نیگارا**

تووبا (طوبا): دارێکە لە بەهەشت (دهخدا، بەرگی ١٠، ل ١٥٥٣٨).

جەننەت: بەهەشت.

ئارا: ڕازێنەرەوە.

واتە: گیانەکەم! تۆ ئەوەندە جوان و باڵا ڕێک و زراڤیت، تەنانەت داری تووباش، کە بۆتە هۆی ڕازاندنەوەی بەهەشت؛ ئەوە لاسایی باڵای بەرزی تۆ دەکاتەوە و بەهۆی ئەوەوەیە، کە داری تووباش، وەک بەژنی جوانی تۆ وایە.

«سالم» و «وەفایی»، داری «تووبا»یان بەمجۆرە بەکاربردووە:

١– بێ ڕەوانم؛ ئەگەر نەدا بۆسە
وەسڵی دڵبەر: درەختی تووبایە
«سالم، ١٣٤»

٢– دەمێکی هەستە پێ، قوربان! جەماڵت عالەم ئاراکە
بزانن نەخلی تووبا، باغی جەننەت، خار و خاشاکە
«وەفایی، ١٢٨»

٣- فیردەوسی جەمالم بەنیهالی قەدی تووبام
یەعنی بەدوو لەب ساحێبی ئیعجازی مەسیحام
«وەفایی، ٤٦»

**٢- چە سیحرێکە! بەدوو زوڵفی چەلیپات**
**کە مەقبوولی بەئیسلام و نەصارا!**

چەلیپا: خاچ، سەلیب.

مەقبوول: پەسەند.

نەصارا: فەلە، دیان، مەسیحی.

واتە: ئاخۆ قژ و زوڵفی وەک چەلیپای تۆ، چ ئەفسوون و جادوویەکی هەیە؛ وا ئیسلام و مەسیحیش، هەردوولایان پێیان جوانە و پەسەندی دەکەن!؟

«سالم» دەڵێ:

لە ڕووتا موئمین و تەرسا. لە وەسفت هەردوو سدیقن
چەلیپای زوڵفی نووری تەلعەتت، جێی کوفر و ئیمانە
«١٢٩»

**٣- لە دڵدا: ئاتەشێکی عالەم ئەفروز**
**لە دیدە: گوڵشەنێکی عالەم ئارا**

ئاتەش: ئاگر.

عالەم: جیهان، گێتی.

ئەفروز: ڕووناکیی، ڕووناککەرەوە، سووتێنەر (کە ئەمیان مەبەستە).

گوڵشەن: گوڵزار، گوڵجار، باخی گوڵ.

واتە: لە دڵمدا ئاگرێکی ئەوەندە گەورەت کردۆتەوە، پێم وایە هەموو جیهانی پێ دەسووتێ! کەچی لە چاومدا گوڵجارێکی ئەوەندە جوان و فراوانیت، دەڵێی هەموو دنیات ڕازاندۆتەوە.



**٤- هەتا دوورم؛ دەڵێم: دەتگرمە باوەش**
**کە دێمە ڕووبەڕووی تۆ؛ نیمە یارا**

یارا: توانا، وزە.

واتە: ئەو کاتانەی کە لێم دووریت، لە دڵی خۆمدا بەحەسرەتەوە دەڵێم: خوا بکات ئەمجارە چاوم پێی بکەوێتەوە، یەکسەر باوەشی پێدا دەکەم و لە ئامێزی دەگرم. کەچی کاتێکیش بەرەو ڕووت دەبمەوە؛ زاتم نییە هیچ بکەم و توانا و دەسەڵاتی هیچیشم لە جەستەدا نامێنێ.

«نالی» دەڵێ:

لە وەسڵی تۆ، زیاتر خەوفناکم، نەک لە هیجرانت
بەمیثلی شەمع و پەروانە، بەڵێ عاشق دەبێ وابێ
«٥٩٧»

«وەفایی» دەڵێ:

نە بەوەسڵی تۆ سروورم، نە بەدووریی تۆ صەبوورم
گێژ و سەرگەردان و حەیران، هەروەکو ماسی سەر ئاوم
«٧٠»

**٥- نەهانیی بوو لە دڵدا سۆزی عیشقت**
**لە دوودی سەرمەوە بوو ئاشکارا**

نەهانیی: نهێنی، شاراوە.

سۆزی عیشقت: کڵپە و بڵێسە و ئاگری عیشقت.

واتە: کڵپەی سووتان و بڵێسەی خۆشەویستییت، هەر بەنهێنی و شاراوەیی لە دڵ و دەروونمدا دەگڕا، کەچی دووکەڵی ئەو ئەوینە، لەسەر سەرمەوە دەرکەوت و بەمەش ئەوینەکەم ئاشکرا بوو.

«حەریق» دەڵێ:

تازە فەرمووتە: لە لای کەس، ڕازی عیشقی من مەڵێ
نەتدەزانی دڵ کە کون کون بوو، دەنگی لێ دێ وەک جەرەس
«٢٧»

٦- بەدیدارت، ئەگـــــەر تاریێ لە زوڵفت
بەموڵکی «کەی» بدەم، یا تەختی «دارا»

کەی: ئەم ناوە، لە بنەچەدا لە ئەستێرەی «کەیوان»ەوە وەرگیراوە، کە گەورەترین ئەستێرەی گەڕۆکە و دواتر ناوەکە بۆتە «کیان» و مانای قامووسیی ئەمیش: ئازا و دلێرە، بۆیە کردوویانەتە نازناوی پاشاکانی ساسانی، کە مەبەستیش لە نازناوەکە «پاشای پاشایان»ە و لەم بوارەدا ئەم پاشایانە، ئەم نازناوەیان هەبووە: کەیقوباد، کەیکاوس، کەیخەسرەو، کەی لوهراسب، کەی بشتاسب، کەی ئەردەشێر (دهخدا، بەرگی ١٢، ل ١٨٨٠٣).

دارا: مەبەست لە «داریوشی سێیەم»ی کوڕی ئارسان کوڕی ئەستێ کوڕی داریوشی دووەمە. بەم پێیە ئەم پاشایە بەچوار پشت دەچێتەوە سەر «ئەردەشێر». ئەم دارایە هەر ئەوەیە، کە بەدەستی «ئەسکەندەر» کوژراوە (دهخدا، بەرگی ٧، ل ١٠٢٦٤).

واتە: سوێند بەدیدارت دەخۆم، کە تەنیا تاڵێکی زوڵفت، بەهەموو موڵکی «شایەکانی ساسانی» و «دەسەڵاتی شاهانەی دارا»ی نادەم.

«وەفایی» دەڵێ:

بەگۆشەی چاو و خاڵی لێو و خاکی کۆی یار نادەم
ئەگەر سەد جامی جەم، ئابی خضر، ئەورەنگی دارا بێ
«١٧٣»

٧- بەخوێنی من؛ ئەگەر سەرخۆش دەبی تۆ
وەکو جامی صوبحت بێ گەوارا

جامی صوبحی: ئەو بادەیەی لە بەرەبەیاندا دەخورێتەوە. گەوارا: ئەو خواردنەوەیەی سازگار و ڕەوان و زوڵاڵە و خواردنەوەی زۆر زوو نۆش دەبێ.

واتە: گیانەکەم! ئەگەر لە خواردنەوەی خوێنی منە و بەخوێنی من سەرخۆش دەبیت، ئەوە خوێنم، پێشکەشت بێ؛ وەک ئەو مەیەی لە بەرەبەیاندا دەخورێتەوە و نۆش کردنیشی ئاسان و ڕەوان و سازگارە.



٨- لە جەوری تۆ، دڵم نەشکاوە، قەت من
عەجەب لەو شیشەیەی نەشکا بە: خارا

خارا: سەختترین جۆری بەردە و لێرەدا مەبەست لە دڵڕەقیی یارە.

واتە: من هیچ کاتی گلەیی و گازەندەی ئەوەم لە دەست تۆ نەبووە، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان، دڵم لە تۆ ئێشا بێ، ئەگەرچی ئەوەش دەزانم کە دڵ، وەک شووشە ناسکە و جەور و ستەمی تۆش، وەک بەردی خارا وایە.

«سالم» واژەی «خارا»ی بەمجۆرە بەکاربردووە:

پەناهم شەهسەوارێکە، گوزەرکا گەر بە«ئەلبورز»ا
دەکا زەربی سمی ئەسپی لە «خارا» تووتیا پەیدا
«١٨»

٩- دەڵێم: جانا! مودارایەک؛ دەفەرمووێت
دەگەڵ عاشق، ئەگەر بووبێ مودارا!

مودارا: هەڵکردن و پێکەوە ژیان. پێکەوە سازان.

واتە: پێی دەڵێم: گیانەکەم! بەڵکو وا بکەیت کەمێک لەگەڵم بسازێی و لەگەڵم هەڵ بکەیت. کەچی دەفەرمووێت: بۆچی لەگەڵ ئەویندارا قەت پێکەوە سازان و هەڵکردن هەبووە؟!

«مەحوی» دەڵێ:

زوو ئەو شۆخە، لە عاشق وەردەچەرخێ
لەگەڵ کەس، چەرخی ئەو، ناکا مودارا
«٨»

١٠- ئەدەب بەو غایەتی تۆ پای بەندی
بەفەریادت بگا: شاهی بوخارا

غایەت: مەبەست، هیوا، ئامانج.

پای بەند: پێ بەستراو، بەڵام لێرەدا بەمانای دڵبەستە و هۆگربوون و بەتەنگەوە هاتنە.

شاهی بوخارا: مەبەست لە نازناوی یەکەمین ڕابەری ڕێبازی ئایینی «نەقشبەندی»یە،

کە ناوی تەواوی بریتی بووە لە: (بەهائەدین محەمەد کوڕی محەمەد «١٣١٨ز – ١٣٨٩ز).

واتە: بەو بۆنەیەوە کە تۆ ئەوەندە بەتەنگ ئەوینی ڕاستەقینەوەیت، بۆیە «ئەدەب» لای «شاهی بوخارا» بۆت دەپاڕێتەوە، تا دەست بەباڵتەوە بگرێ و هەمیشە گوێی لە داخوازیی و پێویستییەکانت بێت و بۆت جێبەجێ بکات.

مەحوی بەمجۆرە هاواری «پیری بوخارا» دەکات:

نەگەیە ئەو جوانە و گەیە پیریی
مەدەد یا پیری پیرانی بوخارا
«ل ٨»



٤

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن) وەک نموونەی:

١- میرزا وەرە لێم لادە، دەستی من و دامانت
ئەیمەن مەبە لێم نەک بێم یەک دەفعە بەمەیدانت
«سالم، ٥٠»

٢- تالانی سەر و ماڵم، چاوی ڕەشی فەتتانت
پابەندی دڵ و دینم؛ کاکۆڵی پەرێشانت
«کوردی»

٣- ئەم عومرە عەزیزە، کە لە بۆت نەقد و دراوە
سەد حەیف و درێغا، کە موسڵمانی نەماوە
«نالی، ٥٣٣»

**١- ئەمڕۆ، کە بەبادەی مەیەوە هاتی لە سەردا**
**هێناتەوە بەر: جانی سەفەرکەردە، لە بەردا**

واتە: ئەمڕۆ، کە لەو سەرەوە، دەهاتیە خوارەوە و بادەت بەدەستەوە بوو، ئەوەندە جوان بوویت، ئەوەندە شیرین و دڵفرێن بوویت، منی گیان تێدا نەما و، گیانی سەفەر کردووم هاتەوە بەبەردا و زیندوو بوومەوە.

**٢- لەو خستنە سەر ڕوو، بەجەفا، دەستەیی گێسوو**
**وەعدەی وەتەنێکت؛ بەغەریبانی سەفەردا**

گێسوو: زوڵف، پەلک.
وەعدە: پەیمان، بەڵێن.
وەتەن: نیشتمان، وڵات.
غەریب: نامۆ، ئاوارە، دوورە وڵات.

واتە: لەو جۆرە تووڕەییەی کە بەرقەوە پەلکەکانت خستنە سەر ڕوخسارت، بووە هۆی ئەوەی دڵی ئەو هەموو دڵدارانەی لە دەمێکەوە بەهەودا و تاڵە مووەکانی قژتەوە، گیرۆدە

ببوون و له خاوەنەکانیان دابڕاو و دوور کەوتبوونەوە، بۆ لای نیشتمانی جەستەی خاوەنەکانیان بچنەوە و سەرێکیان لێ بدەنەوە و پێیان شاد ببنەوە، چونکە سەردەمانێکی زۆر بوو، ئەو دڵانە، لە ناو پێچ و چین و لوولی قژەکەتدا، ئاوارە و دوورە نیشتمانی خاوەنەکانیان بوون.

**٣- بەم تەرزە، کە جانپەروەر نوتقی شەکەرینت**
**ئەنفاسی مەسیحێکە، لە ناو دورجی گەوهەردا**

بەم تەرزە: بەمجۆرە، بەم شێوەیە.

جانپەروەر: گیانپەروەر، دۆستی گیان، دڵسۆزی گیان.

نوتق: گفتوگۆ، ئاخاوتن، قسە و دواندن.

شەکەرین: شیرین.

ئەنفاس: هەناسە.

مەسیح: حەزرەتی مەسیحی پەیامبەر.

دورجی گوهەر (یان: گەوهەر): ئەو سندووقچە بچووک و تایبەتانەی، کە ئافرەت، خشڵ و زێڕ و زیوی خۆی تێدا هەڵدەگرێ. (دهخدا، بەرگی ٧، ل ١٠٥٦٢).

واتە: بەمجۆرەی کە هەناسە شیرینەکانت، گیان دەلاوێنێتەوە، هەر دەڵێی هەناسەکانی حەزرەتی مەسیحن، کە کاتێ هەناسەی لە دەم دەردەهات، مردووی پێ زیندوو دەبوونەوە. لێرەدا دورجی گەوهەر، هێمایە بۆ ددانەکانی یار، کە لە ناو سندووقچەی دەم و زاردان.

«مەحوی» دەڵێ:

ساعیدی دەرکەوت و عالەم بوو بەمووسایی هەموو
موعجیزەی لێوی کە دەرخا، جوملە دەبنە عیسەویی
«٣١٨»

«وەفایی» دەڵێ:

١- نەسیمی فەیزی تۆ، دین و دڵی دووبارە ئیحیا کرد
درێغا، وەک مەسیحا باعیثی ئیحیایی مەوتاکەم
«٧٧»



٢- یەعنی بەدوو لەب ساحێبی ئیعجازی مەسیحام
ماچێکی دەمم کافییە بۆ کوشتەیی باڵام
«٤٦»

**٤- ئەو طەلعەتی حۆرانی و لوتفی مەلەک ئاسات**
**حاشا کە کەسێک دیویە لە تەرکیبی بەشەردا**

طەلعەت: ڕوخسار.

حۆرانی: وەک حۆری و حۆری ئاسا.

مەلەک ئاسا: وەک فریشتە، فریشتە ئاسا.

تەرکیب: پێکهاتە.

واتە: ئەو دەرکەوتنی ڕوخسارە وەک پەری و میهرەبانییەی کە هەر دەڵێی فریشتەیت، بڕوا ناکەم هیچ کەسێک شێوەی مرۆی بەو جۆرە و بەو پێکهاتەیە دیبێ.

**٥- یەک حەلقە و سەد سیحرە، بەری پەرچەمت ئیمڕۆ**
**دیسانەوە ئاخۆ چ خەیاڵی لەسەردا!**

واتە: بەرهەمی کاکۆڵ و زوڵفەکانت، کە لە هەر تاڵ و تاوێکیدا، سەد سیحر و ئەفسوونیان پێوەیە، ئاخۆ دیسانەوە نیاز و مەبەستی چی بێ!؟.

**٦- زوڵف و سەری کوڵمت بنوێنە بەمونەججیم**
**حوکمی چییە عەقرەب، لە موحاذاتی قەمەردا!**

مونەججیم: ئەستێرەناس، ئەستێرەوان.

عەقرەب: بورجی هەشتەم لە زانستی گەردوون و ئەستێرەناسیدا. لە هەمان کاتدا بەمانای دووپشکیش دێت.

موحاذات: واژەیەکی عەرەبییە و بەمانای هاوشان و هاوتەریب و بەرانبەر دێت.

قەمەر: مانگ. بەڵام لە زاراوەی ئەستێرەناسیدا «قەمەر لە عەقرەبدا»، بەمانای شووم و بەد و خراپ دێت.

واتە: زوڵف و سەری کوڵمت نیشانی ئەستێرەوانێک بدە، بزانە زوڵفت؛ کە سەری تاڵە مووەکانی، وەک دەست و چنگەکانی دووپشک وان و ڕەنگیشیان وەک ڕەنگی دووپشکە

ڕەشەیە و ڕوخساریشت، کە هەر دەڵێی مانگە؛ ئەوە نیشانەی چییە، کە «عەقرەب = دووپشک» لە بەرامبەر «قەمەر = مانگ»دا وەستاوە!؟ چونکە دەبێ بەگوێرەی زانستی ئەستێرەناسیی، شتێکی شووم و بەد و خراپ بێ. بۆیە بەچاکی دەزانم زوو ئەم کارە بکە.

بەواتەیەکی تر: «ئەدەب» دەیەوێ بەشێوەیەکی شاعیرانە، بەیارەکەی بڵێ: تۆ؛ کە ڕوخسار و کوڵمەکانت، هەروەک مانگە و منیش کاتێ دەمەوێ بێم و بۆ سەیرکردنی مانگی ڕوخسارت، لێت نزیک ببمەوە، زوڵفەکانت، کە هەر دەڵێی دووپشکن، ڕێگەی دیدەنی ڕوخسارتم لێ دەگرن، بۆیە یار بەوە هوشیار دەکاتەوە، کە بەگوێرەی زانستی ئەستێرەناسیی، نزیکبوونەوەی دووپشک لە مانگ شتێکی باش نییە و باشتر وایە مشوورێکی دوورخستنەوەی دووپشکی زوڵفەکانی، لە مانگ «قەمەر»ی ڕوخساری بخوات و بەم بیانووە بۆ لای «ئەستێرەوان»ی دەنێرێ.

**٧- قەدری چییە خورشید، لەکن پرتەوی حوسنت**
**جیلوەی چ دەکا: قەترە، لە دەریای خەزەردا!**

قەدر: ڕێز.
خورشید: هەتاو، خۆر.
پرتەو: تیشکدانەوە.
حوسن: جوانیی.
جیلوە: خۆنواندنی پڕ ناز و عیشوە.
قەترە: دڵۆپ.
خەزەر: مەبەست لە زەریای «مازەندەران»ە، کە «خەزەر»یشی پێ دەڵێن و کەوتۆتە باکووری ئێران و نێوان سنووری ئێران و ڕووسیاوە.

واتە: هەتاو لە بەرامبەر بریسکە و پرشنگی جوانیی تۆدا، ڕێز و پلە و پایەی چییە!؟ پلە و پایەی خۆر، لە بەرامبەر جوانییتدا، هەروەک خۆنواندن و خۆ دەرخستنی عیشوەدارانەی دڵۆپە ئاوێکە، لە ئاست زەریای خەزەردا.

**٨- لەو صورەتی زیباتە، کە ڕۆحێکە موجەسسەم**
**وەک صورەتی دیوارە، ئەوی ڕۆحی لە بەردا**

صورەت: وێنە، شێوە، دیمەن.



زیبا: جوان، شیرین.
موجەسسەم: بەرجەستە.

واتە: لە بەرانبەر ئەو دیمەن و شێوە جوانەی تۆدا، کە هەر دەڵێی ڕۆحە و بەرجەستە کراوە، هەرچی مرۆڤ هەیە، هەر دەڵێی وێنەی سەر دیوار و شتی بێ گیانن.

بەمانایەکی تر: هەر مرۆڤێ کە سەیری شێوەی جوانت دەکا، یەکسەر گیان و هۆشی تێدا نامێنێ و گیانی دەچێتە شێوەی جوانەوە و شێوەت، ڕۆحی مرۆڤی تری تێدەچێ و دەبێتە ڕۆحێکی بەرجەستەکراوی جوان.

«مەحوی» «نەقشی دیوار» ئاوا بەکار هێناوە:

بەدەردی خۆمەوە، گەر گۆشەیەک دەگرم بەبێ دەنگیی
بەلاما دێ بەخەشم و ڕق، دەڵێ: خۆ نەقشی دیوارە
«٤٦٣»

**٩- لەو ڕۆژەوە جانا! کە نەزەرت لێمە کلا کرد**
**چوونی سەر و ماڵم بەخودا، هەر لە نەزەردا**

نەزەر: نواڕین، سەیرکردن.
کلا: لادان، دوورخستنەوە.

واتە: گیانەکەم! لەو ڕۆژەوەی کە سەرنجی چاوەکانتم لێ دوور و نەبان دەگریت و لێم دوورەپەرێزیت، ئەوەم لە بەرچاوە، کە ڕۆژێک دێت سەر و ماڵیشم؛ لێم تەوەللا و دوورەپەرێز دەبن، هەروەک چۆن تیلەی چاوەکانت، لە من یاخی و دوورن.

**١٠- سینەم سوپەری ناوەکی دڵدۆزی موژەت بوو**
**نەمزانی کە ناوێستێ خەدەنگت لە سوپەردا**

سوپەر: قەڵغان، زرێ.
ناوەک: پەیکانی تیر.
دڵدۆز: دڵ ئازاردەر، مایەی ئازاردانی دڵ.
موژە: برژانگ، مژۆڵ.
خەدەنگ: تیر.

واته: من بەخەیاڵی خۆم؛ سنگم کردبووە قەڵغانی دڵم، تا خۆی لەبەر تیری برژانگە دڵفڕێنەکانتدا بگرێ، کەچی نەمزانی تیرەکانی برژانگی چاوت، ئەوەندە کاریگەرن؛ سوپەر و زرێ و قەڵغان بەرگەیان ناگرن و تا قووڵایی سنگ ڕۆ دەچن و لەوێوە دڵ دەپێکن.

**١١- ئەو ماچی شەوی دی، بەمنت دا بەدوو سەد ناز**
**وا ئێستە بەکامی «ئەدەب»ی طەعمی شەکەردا**

شەوی دی: دوێنێ شەو.

طەعم: تام، چێژ.

واتە: دوێنێ شەو، بەدوو سەد ناز و نووزەوە بەهەزار حاڵ، ماچێکت دامێ، ئەو ماچە، لە دوێنێ شەوەوە ئەوەندە خۆش و بەتام و مایەی مەستییم بوو؛ ئێستا کامی دەکەم و تامەکەی لە دەمدا، وەک تامی شەکرم دەداتێ.

یان بەواتەیەکی تر: ئەو ماچەی دوێنێ شەو، بەهەزار حاڵ و بەسەد نازەوە پێمت بەخشی، بووە مایەی ئەوەی: ئێستا شیعری وەک شەکر شیرین بە«ئەدەب» بنووسێ.

**٥**

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن) وەک نموونەی:

١- «نالی» وەکو زوڵفت، کە موطیعی بەری پێتە
تێکی مەشکێنە، بەجەفا مەیخەرە لاوە
«نالی، ٥٣٧»

٢- وەک خەنجەری ذی جەوشەن، تا ڕۆژی حەشر دەتکێ
خوێنی دڵی مەزڵوومان بەو خەنجەری موژگانت
«سالم، ٥١»

٣- ئەی مورسەلی حەق، تاجی سەری جوملە پەیەمبەر
ئەی نووری دڵی ئەرز و سەما، سەییدی سەروەر
«ئەحمەد حەمدی، ٢٥»



**١- ئەبرۆیی کەشیدەت لە پەنا طورەیی سەودا**
**ماهێکی نەوە، گۆشەیی کێشاوە لە شەودا**

کەشیدە: کشاو.

طورە: کاکۆڵ. پیتی «ط»ی واژەی «طورە»م بەئەنقەست بەعەرەبی نووسیوە و نەمکردووە بە«ت»، تا واژەی «طورە» لەگەڵ واژەی «توورە» جیا بکرێتەوە.

سەودا: ڕەش.

ماه: مانگ.

نەو: نوێ، تازە.

واتە: برۆ کشاوەکانت، لە پەنا کاکۆڵە ڕەشەکانتدا، هەر دەڵێی مانگی نەو، یان سەری مانگی تازەن و لە تاریکی شەودا وێنەی کەوانەییان کێشاوە.

**٢- فەرمووتە: دەبێ گیان بەفیدای تیغی برۆکەم**
**ئەی ماهی دوو هەفتە؛ بەمنت موژدەیی نەودا**

تیغ: کەرەسەی بڕندە و بڕین.

ماهی دوو هەفتە: مانگی چواردە.

موژدەیی نەو: مزگێنی تازە.

واتە: ئەی مانگە چواردەکەم! فەرمووتە: دەبێ گیانم بەقوربانی شمشێری برۆت بکەم. ئای کە ئەمە مژدەیەکی خۆش و شیرینە، تا خۆم بەقوربانی ئەم مانگە چواردەیە بکەم، کە هەمیشە نەوە؛ چونکە هەرگیز کۆن نابێ و هەرکە دەگاتە شەوی چواردە، ئیتر دووبارە خۆی بۆ نوێبوونەوە ئامادە دەکاتەوە و بەم بۆنەیەوە منیش شادمانم، کە لەتەک نوێبوونەوەی مانگی چواردەی برۆکانتدا، نوێ دەبمەوە، بۆیە هەموو نوێبوونەوەیەک دیاری و شاباش و شتی پێشکەشی گەرەکە؛ بەتایبەتی کە گیانی منیش لەگەڵ تازەبوونەوەی برۆکانتدا تازە دەبێتەوە.

ئەم بەیتە شیعرەی «ئەدەب»؛ شیعرێکی مەولەوی تاوەگۆزیم بەیاد دێنێ، کە «شێخ عەزیزی جانەوەرەیی» هاوڕێیی، داوای خەرجیی لە مەولەوی کردووە. مەولەویش لە وەلامدا پێی دەڵێ: بەسەرچاو؛ چونکە تۆ خۆت «مانگ»یت و دەبێ مانگانەت بۆ بنێرم.

ئەمرت دڵگیرەن، فەرمـوودەت خاسـەن
بێ شک مـاهەنی؛ مـاهانەت راسـەن
«٢٤٦»

«وەفایی» دەڵێ:

چونکە دڵ عـاشق بەئەبرۆی بوو، بەداوی زوڵفی بەست
حـەقـیـە زنجـیـری بکا، دێوانەیی مـاهی نەوە
«١٥٨»

**٣- خـاڵ و خـەتی بەر ئەو گـەردەن و سـینەت**
**شایستەیە سەد تەعنە؛ لە خاڵ و خەتی «کەو»دا**

شایستە: شایان.

تەعنە: توانج، تەشەر، پلار.

واتە: ئەو خەت و خاڵەی بەگەردنی جوانی تۆوەیە، ئەوەندەت لێ جوانە؛ شایانی ئەوەیە سەد تەشەر و توانج، لە خاڵ و مێڵی گەردنی کەو بدات، چونکە سەد ئەوەندەی خەت و خاڵی، گەردنی کەو جوانترە.

**٤- ئەمشەو، کە گوتم: دەردی دڵم، چی هەیە دەیڵێم**
**حەیفێ؛ کە دەمی وەسڵەتی تۆ، کورتە لە شەودا**

وەسڵەت: یەکتر دیتن، دیدەنی، دیدار.

واتە: ئەمشەو، کە پێم وتیت: شتم لە دڵدا زۆر کۆبوونەتەوە و خەمم بەسەریەکدا زۆر لا کەڵەکەبوون و هەموویت لا هەڵدەڕێژم، کەچی دیدەنییەکەی ئەمشەوت، ئەوەندە کورت و تیژ تێپەڕ بوو، فریای دەربڕینی هیچیان نەکەوتم.

**٥- نەمـزانی چییـە سیـڕی دەهانی وەکو نوقـتـەت**
**خۆی نوقتەیی مەوهووم و جیهان قەیدییە لەودا**

سیڕ (سرّ): نهێنی.

دەهان: دەم، زار.

وەکو نوقتەت: وەکو نوقتە بچووکت.



مەوهووم: تەماویی، شاراوە، نادیار.

قەید: بەستراو، گیبیردراو، گیر خواردوو.

واتە: نەمـزانی نهـێنی بچـووکـیی دەمی تۆ چییـە؛ کـە هەر دەڵێی نوقـتـە، یان دەڵێی خاڵێکە، کەچی سەرەڕای ئەوەی خۆی وا بچووک و نادیارە؛ بەڵام نهێنی جیهان لەودا (لە دەمتدا) گیبیردراوە.

«وەفایی» دەڵێ:

چییـە ئەم نوقـتـە! کـەوا بۆتە نیـشـانەی دەمی تۆ
نوقـتـەیی هیـچـە؛ کـەچی نوکـتـەیی سـەد ئاهی دڵە[1]
«١٣٣»

«حەریق» دەڵێ:

نوقـتـەی دەهەنت وا دڵـی هێناومـە تەنگیی
جـێگایی خـەیاڵـی نیـیـە بۆ فکری بەکـارەت
«١٤»

«مەحوی» دەڵێ:

دەم نادیـار و نازی قسـەی: پڕ دەشت و شـار
دنیـایەک ئاوی زیندەگیی و دەرخرێ لە هیچ
«٩٩»

**٦- هەمدەرس کـە نین: بەختی مـن و چەشمی سیـاهت**
**بۆچی وەکو: یەک ڕۆژ و شەون، هەردوو دەخەودا!؟**

هەمدەرس: هاودەرس.

چەشم: چاو.

سیاه: ڕەش.

واتە: چاوی تۆ و بەختی من؛ کە هەردووکیان ڕەشن، هاودەرس و هاوپۆل و هاوشانیش

(١) وەفـایی نموونەی یەکجـار زۆری لەسـەر «دەمی بچووک» هەیە، لەم بارەیەوە بنوارە لاپەڕەکـانی: ٤، ٥، ١٠، ١١، ١٣، ١٥، ١٦، ٧٢، ١٣٣، ١٣٧، ١٨٥.

نەبوون؛ کەچی هەردووکیان ڕەشن و هەردووکیشیان هەمیشە خەوتوون!. تۆ بڵێی ئەمە چی بێ!؟.

**٧- سۆفی؛ کە دوێ مەنعی ئەمەی کرد و مەلامەت**
**ئەمڕۆ لە خەراباتە؛ عەمامەی لە گرەودا**

سۆفی: لێرەدا مەبەست لە موسڵمانی ڕیاکار و بەڕواڵەت موسڵمانە.

ئەمەی کرد: ئێمەی کرد.

مەلامەت: سەرکۆنە، سەرزەنشت.

عەمامە: سەرومێزەری مەلایەتی.

واتە: سۆفی؛ کە هەتا دوێنێ ڕێگەی لە ئێمە دەگرت و سەرکۆنەی دەکردین؛ کەچی وا ئەمڕۆ خۆی مەست بووە و لە کەلاوەکاندا دەکەوێ و دەمێنێتەوە و سەرومێزەرەکەیشی لە بارمتەی مەیدا داناوە.

«مەحوی» دەڵێ:

١- لە چینی پەرچەما؛ نووری جەبینی دی، وتی زاهید
کە سووتا دامی تەزویرم بەنووری دامی تەنویرت
«٦٧»

٢- زاهید ئەو زوڵفەی لەسەر ڕوو دی، وتی:
کوفری وا، ڕووپۆشی ئەم ئیمانە بۆچ!
«٩٧»

٣- ببینن گەر لە ساقی: ناز و عیشوێک، ئێمە دەیبینین
بەمەی نۆشیی دەدەن فتوا؛ بەمەستیی موفتیی و قازی
«٣٠٥»

«وەفایی» دەڵێ:

١- لە سایەی چاوەکانی؛ بوومە ڕەندی خەرابات
لە لای پیری مەیخانە، خەرقەم لە گرۆی مەی ناوە
«١٥٣»



٢- ئەو غەمزە، کە چاوی بەشەهیدان دەفرۆشێ
چی زاهیدە، ئەو زوو دڵ و ئیمان دەفرۆشێ
«١٩٨»

**٨- هەرچەندە مەتاعی سوخەن؛ ئەم عەهدە کەسادە**
**ئەمما گوهەری شیعری «ئەدەب» هەر لە برەودا**

مەتاع: کەرەسە، شمەک.

سوخەن: قسە، ڕەوانبێژیی (لێرەدا مەبەست لە ڕەوانبێژیی ئەدەبیی و بەتایبەتیش لە: شیعرە).

عەهد: سەردەم، ڕۆژگار.

کەساد: خەوتوو، کز، بێ بازاڕیی.

گوهەر: گەوهەر.

برەو: ڕمێن، بەها.

واتە: ئەگەرچی لەم سەردەم و ڕۆژگارەدا، بازاڕی ڕەوانبێژیی، سارد و کز و بێ ڕمێنە؛ بەڵام لەگەڵ ئەم بێ بازاڕییەشدا هێشتا گەوهەری شیعری «ئەدەب»، برەوی باشن و بەڕمێن و بەبەهایە.

(ئەدەب لێرەدا داکۆکی لە هونەری باڵای بەهرەی شیعر و شاعیریێتی خۆی دەکات).

«نالی» دەڵێ:

عومرێکە بەمیزانی ئەدەب، توحفە فرۆشم
زۆرم وت و کەس تێی نەگەیی، ئێستە خەمۆشم
«٢٨٠»

٦

کێش: بەحری ڕەمەل مەخبوون موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن)
وەک نموونەی:

١- دێ ژ حەق جازیبەیەک دل بگرت وەرنە مەلا
ژ ئەزەل گەر تو هیدایەت نەبت ئرشاد دێ چ کت؟
«مەلای جزیری، ١٣٦»

٢- وەسفی ڕوخساری لە فیکری بەنی ئادەم بەدەرە
ئیبتیدای مەدحی دەمی؛ وەک خەبەری بێ ئەسەرە
«نالی، ٤١١»

٣- مایلە وەک سەری زوڵفت: سەری من بۆ بەری پا
بەجەفا مەیخەرە لا، سا صەنەما، توبی خودا
«سالم، ٢٧»

**١- ساقیا! مەی زەدەی بادەیی یارم بەخودا**
**تێکە بۆم جامی شەرابێ، کە خومارم بەخودا**

ساقیا: ئەی مەیگێڕ، ئەی بادەگێڕ.

مەی زەدە: مەی بردوو؛ وەک چۆن کەسێک ئەگەر زۆر لەبەر تیشکی بەتینی هەتاو بووبێ و پێستی لەشی هەڵقرچا بێ، دەڵێن هەتاو بردوویەتی؛ هەر بەوجۆرەش ئەوانەی زۆر مەی دەخۆنەوە و مەیەکە کاریان تێدەکات، دەڵێن: مەی بردوو، یان: مەی لێ داوە؛ یان: مەی ئەنگاوتە.

بادە: مەی.

خومار: سەرئێشەی دوای مەست بوون.

واتە: ئەهای مەیگێڕ! سوێند بەخودا، لە ساڵی پارەوە، ئەنگاوتە و هێشتا مەستی ئەو مەیەم، کە یارم پێی بەخشیوم، تکایە پیاڵەیەکی تریشم بۆ تێبکە، تا هەر بەمەستیی و سەرخۆشیی بمێنمەوە.



**٢- نەشئەیی بادە محاڵە، ئەسەری بۆمە، کەمن**
**مەستی بادەی لەبی وەک ساغەری یارم بەخودا**

نەشئە: زەبری مەی.

بادە: مەی.

محاڵ: شتێک کە توانای ئەنجامدانی نەبێ و نەکرێ.

ئەسەر (ئەثەر): زەبر، کاردانەوە، ڕەنگدانەوە.

بۆمە: بۆ ئێمە (هەڵبەتە هەر مەبەستی: بۆ منە-یە).

ساغەر: پیاڵە و دەفری مەی پێ خواردنەوە.

لەب: لێو.

واتە: هەرگیز خواردنەوەی مەی، زەبرێکی لەسەر من نابێ، چونکە من مەستی ئەو مەیەم کە لە لێوی وەک دەفری مەیی یار، نۆشم کردووە. یان: لە ساڵی پارەوە مەستی ئەو ماچی لێوانەی یارم، کە هێشتا بەرمی نەداوە و زەبری لە هۆش و جەستەمدا کاریگەرە.

«سالم» دەڵێ:

من لە نەشئەی جامی لەعلت، مەحشەریش نایێمە هۆش
جامی وا «سالم» لە دەورا، قیسمەتی «جەم» کەی دەبێ
«١٤٢»

«مەحوی» دەڵێ:

با وجوودی لێوی شەککەر باری تۆ
بێ وجوودە نەشئە بەخشینی شەراب
«٤٤»

**٣- گەر خومارم، نە خوماری مەی و جام و بادەم**
**مەستی بادەی لەبی گوڵڕەنگی نیگارم بەخودا**

گوڵڕەنگ: وەک ڕەنگی گوڵ، ڕەنگی گوڵێن، ئاڵ.

واتە: ئەگەر مەستیش بم، مەستی مەیی و پیاڵەی مەی نیم، سوێند بەخودا، مەستی بادەی لێوی ئاڵی یاری خۆمم.

«وەفایی» دەڵێ:

من وەها زوو مەستی مەی نابم، بەنەشئەی چاوەکەت
مەرگی من؛ ساقی! لەگەڵ ئەو جامە، لێوت بێنەوە
«١٥٨»

**٤- شۆخی تەرسا بەچەیێ، غارەتی دین و دڵی کرد**
**نە دڵی هێشت و نە تاقەت، نە قەرارم بەخودا**

تەرسا بەچە: مەسیحی زادە.

غارەت: بەتاڵانبردن، هێرش.

واتە: نازدارێکی شۆخ و شەنگی مەسیحی، ئایین و دڵمی فڕاند، بۆیە ئیتر جەستەم دڵی تێدا نەماوە و جەستەیەکیش کە دڵی تێدا نەمێنێ، هێز و توانایشی لێ دەبڕێ و کە هێز و تواناش نەمێنێ، چ بڕیارێک نادرێ.

**٥- ئەی صەنەم! تابەکەی ئەو عیشوە و ئەو نازە؛ بەما**
**کە نەما تاقەتی باری خەمی یارم بەخودا**

صەنەم: بت.

بەما: بەئێمە.

واتە: ئەی بتەکەم! ئەو ناز و عیشوە شیرینەت بۆ من، تاکەی بێ! بڕوا بکە، سوێند بەخودا،ئیتر بەبەرمەوە نەماوە ئەوەندە قورسایی ئەو ناز و عیشوە گرانەت لە ئەستۆ بگرم.

**٦- چ بڵێم چۆنە لە دووری قەدی تۆ، حاڵەتی من**
**چی بڵێ زیللەتی من، یەک بەهەزارم بەخودا**

زیللەت: ڕسوایی، داماویی، کلۆڵیی.

واتە: گیانەکەم! چۆن چۆنیی باسی گوزەرانی خۆمت بۆ بکەم، کە بەدەست دەرد و ئازاری دووریتەوە، چۆن داماو و پەککەوتە بووم! خۆ ئەگەر ئەم بارەی من، زمانی هەبووایە و خۆی قسەی بۆ بکردیتایە، ئەوا ئەوسا پێیم دەوتیت: هەرچی کە زمانی داماویی من، خۆی بۆت باس دەکات؛ من دەڵێم: هێشتا کەمێکی بۆ باس کردوویت و هێشتا هەزار ئەوەندەی ماوە، کە بۆی باس نەکردوویت.



**٧- بۆچمە زەحمەتی پەیکان و بەزێهکردنی تیر!**
**منی بێچارە، بەیەک غەمزە؛ شکارم بەخودا**

زەحمەت: ماندووبوون.

پەیکان: نووکی تیژی تیر.

زێه: ژێی کەوان.

بەزێهکردنی تیر: ئامادەکردنی تیر بۆ هاویشتن.

غەمزە: تیلەی چاوی نازاویی.

شکار: ڕاو.

واتە: بۆ ڕاوکردنم، پێویست بەخۆ ماندووکردنی پەیکان و تیر هاویشتن نییە، چونکە سوێند بەخودا، ئەوەندە بێ دەسەڵاتم، هەر بەیەک تاقە تیلەی چاوت، دەپێکرێم و دەکەومە ژێر دەسەڵاتی خۆتەوە.

«کوردی» دەڵێ:

بۆ قەتڵی منی خەستە، هەروەکو تیرە
ئەی من بەفیدای تیری نیگای پڕ خەتەرت بم

«وەفایی» دەڵێ:

تۆ ڕەنجە مەبە، کوشتنی ئاسانە «وەفایی»
بەو غەمزە ئیشارەت بکە، بەو چاوە بفەرموو
«١١٠»

«مەحوی» دەڵێ:

لە غەمزەی چاوت، ئەبرۆ داگرە و بەس
مەکە بۆ قەتلی عاشق: ڕەنجە بازووت
«٨١»

**٨- با وجوودی ڕوخی ئەو، بۆچمە گوڵزاری بەهار**
**تەلعەتی گوڵشەنە، ڕوویە: بەهارم بەخودا**

با وجوودی: بەهۆی هەبوونی ئەوەوە.

ڕوخ: ڕوخسار.

تەلعەت: دەرکەوتن.

گوڵشەن: گوڵزار.

واتە: سوێند بەخودا، هەتا خاوەنی ڕوخساری یار بم، ئیتر پێویستیم بەگوڵزاری بەهار نییە، چونکە هەر دەرکەوتنی وەک گوڵزارە و دەموچاویشی؛ بەهارێکە بۆ خۆی.

**١٠- قەدی تۆ: سەرو؛ کەناری منە: جۆباری ئەشک**
**چ سزاوارە، ئەگەر بێنییە کەنارم بەخودا**

قەدی تۆ: بەژن و باڵای تۆ.

جۆباری ئەشک: جۆگەلەی فرمێسک.

سزاوار: شایان، شایستە.

واتە: بەژن و باڵای بەرز و هەمیشە سەوزی تۆ، وەک داری سەرووە و تەنیشتی منیش، جۆگەلەیەکی فرمێسکی چاوەکانمە، ئەی ئیتر گیانەکەم! تۆ خۆت دەزانیت کە داری سەروو، بۆ ئەوەی هەمیشە بەسەوزیی بمێنێ، پێویستی بەئاوە و ئەوەش جۆگەلەی فرمێسکەکانی من، کە لە تەنیشتمدایە؛ ئای ئەو درەختی سەرووی باڵای تۆیە، چەند شایانی ئەوەیە بێتە نزیک و کەناری ئەم جۆگە فرمێسکەی من!

«سالم» دەڵێ:

کەناری چاوی «سالم» جۆبارە
بەسەرو و قامەتی مەوزوونی دڵجوت
«٤٩»

«مەحوی» دەڵێ:

بەسەر ڕوخساری زەردا؛ جۆگەلەی کێشاوە ئەشکی سوور
بەیادی سەروی باڵایەک، ئەوەندەم شین و زاری کرد
«١٠٨»

**١١- دائیما جان بەکەف و دەستی تەوازوع بەکەمەر**
**گوێ بەئاوازەی فرمان نثارم بەخودا**

دائیما: هەمیشە، بەردەوام.



جان: گیان.

بەکەف: لەسەر دەست.

تەوازوع: خۆ بەکەم زانین.

نثار: پەخشان و بڵاوکردنەوە و وەشاندنەوە.

واتە: هەمیشە ئامادەی گیانبەخشینم و ڕۆحم بۆ بەخشین، لەسەر لەپی دەستمە و دەستەکەی تریشم بەخۆ بەکەم زانینەوە لە کەمەرمدایە و گوێیشم بۆ ئەوە هەڵخستووە، تا فرمان بکەیت و گیانم پێشکەش بکەم.

**١٢- گەرچی ئەو مەرحەلەیە نابەمە سەر، بەیەقین**
**تا بەئاخر نەفەسیش جان سپارم بەخودا**

مەرحەلە: قۆناغ، ئاست.

جان سپار (جان سپاردن): گیان بەلای کەسێکەوە دانان.

واتە: ئەگەرچی ئەوەندە ناژیم، تا گیانت لە پێناودا دابنێم، بەڵام قەیناکە، با تا ئەو کاتەی بەمردنی خوداییش دەمرم، گیانمت لە لا دائەنێم و بەخۆتی دەسپێرم، تا زیاتر دڵنیا بیت، کە دەربەستی گیانبەخشین نیم.

**١٣- قەت مەفەرموو کە: «ئەدەب» عەشقی مەی لێ بۆتە هەوا**
**سەر بگاتە فەلەک؛ ئەو زەڕە غوبارم بەخودا**

واتە: گیانەکەم! هەرگیز ئەوە بەبیرتا نەیەت، کە بەهۆی گەیشتنم بەئەوینی تۆ، ئیتر خۆم لێ گۆڕا بێ و گەورە بووبێتم، چونکە سوێند بەخودا، ئەگەر بەهۆی ئەوینی تۆوە و لە خۆشیاندا سەرم بگاتە کەشکەڵانی فەلەک، بەڵام هێشتا گەردیلەیەکی یەکجار بچووکم لە ئاستدا.

«وەفایی» دەڵێ:

دەستم بگری تۆ، کە بەجامێکی صەبووحیی
بەو چاوە، ئەگەر پادشەهی شامە، گەدامە
«١٣٥»

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم: (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن) وەک نموونەی:

١- بەداما موحبەتێ بەندم، خەدەنگا فورقەتێ دل نوهت
ب شوبهی مورغی نیم بسمل د هەڤ وەرتێم د خوونی دا
«مەلای جزیری، ٣٧»

٢- نەزانینت لەبەر عیجزە، نەوەک جەهلە، کە ئەم چشتە
قەدیمە؛ نایەتە تەقریری قەولی حاکیی و ڕاویی
«نالی، ٦٨٧»

٣- لە مەوجی بەحری فیکرەتدا، پلـوپووشانە گەردانم
لە ئەوجی نووری وەحدەتدا میشالی زەڕە حەیرانم
«حەمدی، ١٨، ١٦»

**١- دڵ ئارامی نەما جارێ، دڵارامم سەری نادا**
**سەرێکی سەرسەری جارێ، لە کوشتەی خەنجەریدا**

سەرسەری: ڕاگوزارییانە، سەرپێیانە. هەرچەندە دەبێ ئەوەش بڵێم کە واژەی «سەرسەری» لە کوردستانی عێراق، مانای تری لێ کەوتۆتەوە بەڵام ئەم واژەیە لە کوردستانی ئێران، هەر بەمانای ڕاگوزارییانە دێت و پێشتریش «سالم» بەهەمان مەبەست و مانا بەکاری بردووە:

سەرسامی ماجەرای فەلەک بم، ئەگەر ببێ
سەودای عیشقی تۆ، لە سەرمدا بە: سەرسەری
«١٤٥»

واتە: دڵم بەجارێ ئارام و ئۆقرەی لێ براوە، چونکە ئەوەی مایەی هێوریی و ئۆخژن و ئارام و حەسانەوەی بوو، تەنیا جارێک سەردان و دیدەنییەکی ئەم کوشتەی خەنجەرەی خۆی ناکات.



**٢- ئەسیری دامی سەییادێکی نەوکارە، دڵی وەحشی**
**هەوەڵ نەخچیرە گرتوویە؛ بەئاسانی بەری نادا**

دام: داو، تەڵە، تەپکە، هۆ و ئامێرێک بۆ ڕاوکردن.

سەییاد (صیّاد): ڕاوکار.

نەوکار: تازەکار، کەسێک تازە بەتازە فێری کارێک بووبێ.

دڵی وەحشی: دڵی هێشتا کێوییە و ماڵیی و دەستەمو و هۆگر و ئاشنا نەبووە.

نەخچیر: نێچیر.

واتە: دڵم کەوتۆتە داوی ڕاوکارێکی تازەکار و منداڵکار و دڵ هێشتا سڵ و بەپارێز؛ چونکە یەکەم ڕاو و یەکەمین نێچیرە (دڵم)، دەبێ دڵی بەم ڕاوەی زۆر خۆش بێ و زۆری لا بمێنێتەوە، بۆیە ڕەنگە (دڵم) هەروا بەئاسانیی بەرنەدا و دەستبەرداری نەبێ.

**٣- ئەگەر عاشق «ئەرەستوو» بێ، لە بەحری عیشقدا غەرقە**
**چ گێژێکە خوداوەندا، کە ڕێی «ئەسکەندەر»ی نادا**

ئەرەستوو: فەیلەسووف و بیرمەندی دێرینەی یۆنانی.

ئەسکەندەر: مەبەست لە ئەسکەندەری مەکدوونییە، کە جیهانی داگیر کرد.

واتە: ئەگەر ئەویندار، تا ئاستی ئەرستووش زانا و لە هەموو بوارەکانی زانیندا سەر دەرچوو بێ، بەڵام هێشتا سەری لە عیشق دەرناچێ و هێشتا لە زەریای ئەویندا نوقمە! دەی خودایە! دەبێ ئەم زەریای ئەوینە چی بێ و چ تەنوورە و گێژاوێک بێت، کە کەسێکی بەناوبانگی وەک ئەسکەندەریش تیایدا واقی وڕماوە و تیایدا گیر ماوە و ڕێ دەرنابات!؟.

لە فۆلکلۆری کوردیدا «گێژی ئەسکەندەر» زۆر ناوی براوە:

ساقی! بەخودا و بەپێغەمبەر
کەوتوومە گێژی ئەسکەندەر
ڕزگار نابم بەسەد لەنگەر

**٤- دەکەن مەنعم ڕەفیقانم، کە بۆچم دڵ بەدڵبەر دا!**
**چ دڵسەختێکە! ئەمڕۆ دڵ؛ بەخاڵی عەنبەری نادا!**

مەنع: ڕێگەگرتن، بەرگیریی.

دڵسەخت: دڵڕەق.

عەنبەر: جۆرە بۆنێکی زۆر خۆشە؛ کە لە گیا، یان لە قەوزەی ئەستووری زەریایی، یان هەر لە بنی زەریادا پەیدا دەبێ و گیانلەبەرانی زەریایی (بەتایبەتی ماسی) دەیخۆن و پێی دەمرن و دوای مردنیان لە گەدەیان دەردەهێنرێ و بەکار دەبرێ... هەندێکی تر دەڵێن: لە «مۆم»ی هەنگوین پەیدا دەبێ؛ کە ئەم مۆمەش وەک دەزانین هەنگ، لە هەڵمژینی گوڵی هەمەجۆرەوە دروستی دەکات و لە ئاکامدا بەهۆی سێلاو و هەڵسان و نیشتنەوەی ئاوی زەریاوە، شەپۆلی زەریا و سێلاو، ئەم مۆمە لەگەڵ خۆیاندا بۆ ناو زەریا دەبەن و بەو هۆیەشەوە کە قورسە، بۆیە دەکەوێتە بنی زەریاوە و لە بنی زەریایشدا گیانلەبەرانی دەیخۆن و چونکە پێیان هەرس ناکرێ، پێی دەمرن... بەم پێیە دەڵێن ئەمجۆرە مۆمە (کە ڕەنگی خۆڵەمێشیی و شێوە بنێشت و چەسپی بۆن خۆشە)، لە چیاکانی هیند و چین دروست دەبێت.

عەنبەر، جگە لە بۆنە خۆشەکەی، بۆ زۆر نەخۆشیش بەکار دەهێنرێ، بۆ زانیاریی زیاتر، بنواڕە: (دهخدا، بەرگی ١١، ل ١٦٣٩٦).

سەرنج: وەک لە پێشەکیشدا ئاماژەمان بەئاگاداریی و زانیاریی «ئەدەب» لە زانستی پزیشکیدا کرد، دەردەکەوێ کە «ئەدەب» لە بەکارهێنانی «عەنبەر»دا، مانای دەرمانسازیی مەبەست بووە.

واتە: دۆستان و هاوڕێیانم، ڕێگریی و سەرکۆنەی ئەوەم دەکەن، کە نەدەبووایە دڵم بەو دڵبەر و دڵدارەم بدەم. منیش دەڵێم: ئاخر یار، ئەوەندە شیرین و ناسک و دڵفڕێنە، کێ دەتوانێ و کێ ئەوەندە دڵی ڕەقە، تا خۆی ڕابگرێ و دڵ بەو خاڵە وەک عەنبەر بۆن خۆشانەی یار نەدات!؟.

«وەفایی» دەڵێ:

ئەو ڕۆژە کە دیم طورە، لەسەر عەنبەری خاڵی
زانیم ئەوە بۆ صەیدی دڵم: دانەو دامە
«١٣٤»



«کوردی» دەڵێ:

ئەلای هەرکەس دەچم، مەنعم دەکا؛ خۆت بۆچی ڕسوا کرد!؟
دریغ! کوا حاڵ زانێ! ڕەببی تووشم بێنی بیماری

**٥- لە لای بێگانە گەر تاڵە، ئەگەر ترشە، عیتابی تۆ**
**بەوەڵڵا ئاشنای قەهرت، بەقەندی بەندەری نادا**

عیتاب: گلەیی، سەرکۆنە، سەرزەنشت.

قەهر: تووڕەیی، تووڕەبوون.

قەندی بەندەر: مەبەست لەو جۆرە شەکرە بووە، کە کاتی خۆی لە ڕێگەی بەندەر و کەنداوی فارسەوە بۆ ئێران چووە، کە دیارە شەکری وڵاتانی ئەوروپا بووە و لە شیرینیدا بەناوبانگ بووە.

واتە: ئەگەر لای بێگانە و نەناس و ئەوانەی ئاشناییان لەگەڵتدا نییە، گلەییەکانت ترش و تاڵ و نامۆ بن، سوێند بەخودا، ئەوەی ئاشنایی و شارەزایی لە شێوەی تووڕەبوونی تۆ، هەبێ؛ ئەوەندەی بەلاوە شیرین و خۆشە، بەوجۆرە شەکرە بەناوبانگەی ناگۆڕێتەوە، کە لە ڕێگەی بەندەری فارسەوە، بۆ ئێران چووە.

«حەریق» دەڵێ:

چت داوە لە ڕووترشیی و سرکەی دەمی ئەغیار؟!
قەندی لەبت شیرین، بەدەمی تاڵی خومارم
«٢٥»

«نالی» دەڵێ:

شیرینیی و لە تاڵیی و ترشیی عیتابی ڕووت
خاڵت لەسەر جەبین، بووەتە دانەیی سماق
«٢٤٩»

**٦- بەصورەت ماھ ڕوو زۆرن، بەڵا وەڵڵا لە مەعنادا**
**پەری وەک تۆ؛ بەزیبایی، قیافەی دلبەریی نادا**

«حاجی قادر» دەڵێ:

باسی حوور و باسی غیلمان و پەری بۆ من مەکەن
وەک مەهی بێ میهری خۆم؛ نەمدیتەوە و نەمبیستووە
«١٢٠»

صورەت: وێنە.
ماھ ڕوو: ڕوخسار وەک مانگ، مانگ ئاسا.
مەعنا: واتا، مانا، ناخ.
زیبا: جوان.
دلبەر: دڵفڕێن، دڵ داگیرکار.
واتە: ڕەنگە کچی یەکجار جوانی وەک مانگ، زۆر هەبن، بەڵام بەخودا لە ناوەڕۆکدا، پەرییش وەک تۆ، بەژن و باڵای جوان و وەک تۆ دڵفڕێن و وەک تۆ ڕازاوە نییە.

**٧- کەسێ شەهدی لەبی چەشتی؛ نییە مایل بەشیرینی**
**کەسێ «شیرین» نیگاری بێ، «شەککەر» لەب هەمسەری نادا**

شەهد: هەنگوینی پاڵاوتە.
مایل: ئارەزوو.
شیرین: ژنی یەکەمی خوسرەو پەروێز و دڵبەری فەرهاد (ی شیرین و فەرهاد).
نیگار: نواڕین، سەرنج، وێنە، یار (کە لێرەدا مەبەست لە یارە).
شەککەر: دووەمین ژنی خوسرەو پەروێزە و لە بنەچەدا خەڵکی ئەسفەهان بووە و لە ڕقی «شیرین» هێنای. وەک دەڵێن زۆر لە «شیرین» جوانتریش بووە و ناوبانگی جوانییەکەی سەرلەبەری دنیای گرتۆتەوە. کەچی «خوسرەو» هەر شەیدا و دڵبەستەی «شیرین» بووە.
لەب: لێو.
هەمسەر: هاوسەر، ژن و مێرد.
واتە: هەر کەسێک، هەر تەنیا یەک جار ماچت بکات، شیرینایییەکی وەک هەنگوین لە



لێوەکانتایە، کە ئیتر هەتا ماوە ئارەزووی شیرینی خواردنی نابێ؛ هەروەک چۆن: کەسێک (وەک خوسرەو)، ئەگەر «شیرین» دڵبەری بێ، ئیتر ئەوەندە ئارەزووی ماچی لێوی «شەککەر»ی نابێ.

**٨- مەفەرموو: عارە پێم بەندەت، کە دێ بێتە غوڵامی تۆ**
**گەدایی ئاستانەی تۆ، بەتاجی «قەیسە»ی نادا**

عار: نەنگیی، شوورەیی.
بەندەت: نۆکەرت.
غوڵام: خزمەتکار و نۆکەر.
گەدا: سواڵکەر، دەرۆزەکەر.
ئاستانە: دەروازە، بەردەرگای ماڵە گەورە و خاوەن دەسەڵات و مەزن.
قەیسەر: پێشتر لە غەزەلی ژمارە «٣»، بەیتی «٦»دا، لە مانای واژەی «کەی» دواین؛ کە «قەیسەر»یش هەمان مانای هەیە.
واتە: هەرگیز ئەوە مەفەرموو؛ کە ئەم بەندە و غوڵامەت، بەندایەتی و نۆکەرایەتی تۆی پێ عار بێ؛ چونکە باوەڕ بفەرموو: تەنانەت سواڵکەریش؛ سواڵکەرایەتیی کردن، لە بەردەرگەکەتاندا، بەتاج و تەختی «قەیسەری» نادا.

«نالی» دەڵێ:

کە تۆی شای کەچ کوڵاهی دیدە مەستان
چ باکم قەیسەر و فەغفوورە ئەمشەو؟!
«٣٨٩»

«مەحوی» دەڵێ:

١- ڕێی دا لە قاپییا بمرم، پێشی سەرسەرم
نا، وا گەدا دەبێ بەخوداوەندی تەخت و تاج
«٩٢»
٢- ڕێ درابێ بەگەدایێ نەفەسێ لەو دەرەدا
هەر کەسێ،تا نەفەسە؛ عارییە شاهەنشاهی
«٣١٩»

**٩- ئەگـەرچی تۆ بەهیـچی من، لە دەرکت دەردەکـەی؛ ئەمما**
**«ئەدەب» تاریٰ لە زوڵفی تۆ، بەموڵکی «سەنجەر»ی نادا**

بەهیچی من: لەسەر هیچ.

ئەمما: بەڵام.

سەنجەر: شاه سوڵتان «سەنجەر»ی پاشا و مەزنی سەلجووقییەکان.

واتە: هەرچەندە تۆ، لەسەر شتێک لە نیشتمانی ئەوینت دەردەکەی، کە ئەو شتە و ئەو تاوانەم نەکردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا «ئەدەب»، تاڵێک لە قژ و زوڵفی تۆ، بەهەموو موڵکی سەنجەری نادات.



٨

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون: (فعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن) وەک نموونەی:

١- دیٰ ژ حەق جاذبەیەک دل بگرت وەرنە «مەلا»
ژ ئەزەل گەر تو هدایەت نەبت ئرشاد دیٰ چ کت؟
«مەلای جزیری، ١٣٦»

٢- وەسفی ڕوخساری لە فیکری بەنی ئادەم بەدەرە
ئیبتیدای مەدحی دەمی، وەک خەبەری بیٰ ئەسەرە
«نالی، ٤١١»

٣- مایلە وەک سەری زوڵفت؛ سەری من، بۆ بەری پا
بەجەفا مەیخەرە لا، سا صەنەما توبی خودا
«سالم، ٢٧»

**١- قەت بووە دڵبەری مە، جاریٰ لەمە یاد نەکا!**
**بەسەلامیٰ، بەپەیامیٰ، دڵی مە شاد نەکا!**

واتە: دڵبەر و دڵدارەکەی من، هەمیشە منی لە یادە و هەمیشە و بەهەر جۆرێک بیٰ، یان: بەسەلامێک، یان: بەڕاسپاردەیەک، هەر منی بەسەرکردۆتەوە و هەر دڵشادی کردووم.

**٢- ئەی خودا! عاشقی سەخا بەچچە، دڵی خۆی کە بویٰ**
**کەس خەرابەی دڵی خۆی قەت بووە ئاباد نەکا!**

خەرابە: کەلاوە.

ئاباد: ئاوا.

واتە: ئەی خودایە! ئەم بەخشندەزادەیە (مەبەستی ئەدەب لەوەیە بڵێ: ئەم دڵبەرەی کە بۆتە دڵدارم، نەک هەر خۆی بەخشندەیە، بەڵکو بەبنەچەش هەر بەخشندەن) کاتیٰ دڵی خۆی (کە بۆتە دڵی من؛ یان: دڵی من، کە بۆتە موڵکی دڵی ئەو) ئاوەدان دەکاتەوە، کارێکی زۆر چاک دەکات، چونکە کەس پێی خۆش نییە دڵی ببێتە کەلاوە و وێرانیی.

**٣- ڕەهرەوی بادیەیی عیشق، بەپێی شەوق ئەوەیە**
**فیکرەتی ڕاحیلە ڕێ و ڕاحیلە زاد نەکا**

ڕەهرەو: ڕێڕەو، ڕێباز.

بادیە: بیابان، چۆڵەوانیی.

فیکر: بیر.

ڕاحیلە ڕێ: کۆچە ڕێ.

ڕاحیلە زاد: توێشووی سەفەر.

واتە: ئەوەی بیەوێ ڕێگەی ئەوین بگرێتە بەر، دەبێ نەترسێ و بەتەنگ ئەوەوە نەبێ هەر بیر لە چۆنێتی ڕێگاکە و مەترسییەکانی و خۆراک و توێشووی ڕێگا بکاتەوە.

**٤- عاشق و مەنزڵ و مەئوا! ئەمە لافێکە درۆ**
**عاشقی سادیق ئەوەیە: خانە لە بونیاد نەکا**

مەنزڵ: خانوو.

مەئوا: حەوانگە.

سادیق (صادق): ڕاستگۆ.

خانە: خانوو، ماڵ.

بونیاد: بناغە، بنەڕەت.

لاف: خۆهەڵکێشان.

واتە: ئەوەی بیەوێ بەدڵ و بەڕاستیی، ئەویندارىی بکات، دەبێ بیر لە ماڵ و حاڵ و پێکەوەنانی گوزەرانی باش نەکاتەوە، چونکە ئەوینداری ڕاستگۆ، هەر لە بنەڕەتەوە نابێ بیر لە دروستکردنی خانووبەرەش بکاتەوە.

**٥- وەک دەڵێن: مەیلی بەئازادیی بەندانە گوڵم**
**گەر منم بەندە، خودایە قەتم ئازاد نەکا**

مەیل: ئارەزوو.

بەندان: زیندانییان.

واتە: وەک بیستوومە دەڵێن یارەکەم نیازی ئازادکردنی دیلەکانێتی؛ بەڵام ئەگەر یەکێک لەو دیلانە، منم، حەز دەکەم هەرگیز ئازادم نەکات.



**٦- چی دەبێ ئەگەر جارێ ڕێ بخەیە خەستە دڵان**
**با لە دووریی، دڵ هێند ناڵە و فریاد نەکا**

خەستە: نەخۆش، ماندوو.

فریاد: هاوار، گازە.

**٧- سایەیێک لەو قەد و باڵایە بخە سەحنی چەمەن**
**تا چ کەس سەیری قەد و جیلوەیی شمشاد نەکا**

سایە: سێبەر.

سەحن: حەوشە.

چەمەن: چیمەن و سەوزایی و باخ.

جیلوە: خۆنواندنی پڕ ناز و ناسکیی.

شمشاد: دارێکی بەرز و باریک و هەمیشە سەوز و بۆن خۆشە. دارەکەیشی سەرەڕای ئەوەی زۆر پتەوە، لە هەمان کاتدا لە ڕۆژگارێکدا شانەی سەر داهێنانیان لێ دروست کردووە، دیسانیش بەو هۆیەوە کە گەڵاکانی زۆر باریکن و لە تاڵی مووی قژ و زوڵفی کچانی جوان دەچن، بۆیە پرچی کچانیشی پێ دەڵێن. ئەم درەختە زۆرتر لە ڕۆخەکانی دامێنی زوورگە پڕ لە دارستانەکانی باکووری ئێران، واتە: لە «ئاستارا»وە تا «میاندەرە» هەیە (دهخدا، بەرگی ١٠، ل ١٤٤٨٤).

«مەحوی» دەڵێ:

شمشادە ئەمە، یا: قەدە، یا: سەروی ڕەوانە!
یا: عەرعەرە، یا: نەخلی مرادی دڵ و جانە!؟
«٢٨٠»

واتە: گیانەکەم! تکایە با هەر تەنیا سێبەرێکی ئەو بەژن و باڵا بەرزەت، لە ناوجەرگەی باخەکەدا دەرکەوێ (مەبەستی ئەوەیە بڵێ: سەردانێکی باخ و چیمەن بکە)، تا ئیتر هیچ کەس سەیری بەژنی جوان و جیلوەی نازاوی شمشاد نەکات.

**٨- جەورەکەت خاریجی قانوونە و دەفەرمووی: مەکە داد**
**چی بکا جەورەکەشت! جارێ ئەگەر داد نەکا**

جەور: ستەم، زوڵم.

خاریج: دەرەوە، بەدەر.

قانوون: یاسا.

داد: سکاڵا، گازە، گازەندە.

**٩- تا نەسیمێ لەسەری زوڵفەوە دێ، چاترە سوز**
**بۆیە سووتاو دەبێ؛ ڕوو قەت بەتەرەف باد نەکا**

نەسیم: شەماڵ، سروە.

سوز: سووتان.

واتە: تا سروەیەک لای سەری زوڵفی تۆوە، بەرەو لای من بێت، بڵێسەی سووتانی من زیاتر دەبێ و زیاتر دەگەشێمەوە. بۆیە وتوویانە: کەسێک ئاگری تێبەر بێ، نابێ ڕووی بەرەو «با»وە بکات. چونکە ئەگەر ڕوو بەرەو با بکات، زیاتر گڕ دەگرێ. بەڵام من دەمەوێ بەپێچەوانەی ئەم بۆچوونەوە بکەم و ڕوو لە سروەی قژی تۆ بکەم، تا بڵێسەی سووتانم زیاتر و خۆشتر دەبێ.

**١٠- هەرکەسێ دیدەیی وەک شەتتی منی دیبێ «ئەدەب»**
**ڕەنگە قەت سەیری «کوڕ» و «دیجلەیی بەغداد» نەکا**

شەت (شط): زێ، چەم، ڕووبار (کە وەک دواتر دەردەکەوێ هەر مەبەست لە - شط العرب -ی باشووری عێراقە).

کوڕ: دوو ڕووبار بەهەمان ناوەوە هەن؛ یەکێکیان لە ناوچەی «شیروان»ی نزیک «گەنجە» و ئەویتریان لە پارێزگەی «فارس»ی ئێراندایە، کە «ئەدەب» مەبەستی لەم ڕووبارەی دووەمیانە، چونکە ناوی ڕووباری «دیجلە»ی بەغدا و دواتریش ناوی «شط العرب»ی باشووری عێراق دێنێ.



٩

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلات) وەک نموونەی:

١- سووتنێ و دەردێ ئەڤینی، عیللەتی داغ و برینێ
خوەش دبن ما ئەو ب دینێ؟، شەربەتا لێڤان موفایە
«مەلای جزیری، ٥٢٢»

٢- دڵبەرا! دڵ بێ قەرارە، چاوەکانم گریە بارە
سینەکەم هەر داغدارە، یار یەک و غەم سەد هەزارە
«سافی، ٥٥»

٣- یا ڕەسووڵ الله زەلیل و دڵ حەزینم ڕەحمەتێ
موستەمەند و بێ قەرار و بێ قەرینم ڕەحمەتێ
«حەمدی، ١٧»

**١- ئەی دەهەن خونچەی شەکەر لەب، چەندەتم کێشا جەفا**
**بەو هەمەو ڕەنج و جەفایەش، لێم نەدیوی جوز جەفا**

دەهەن: زار، دەم.

شەکەر لەب: لێو شەکر، لێو شیرین.

جوز: بێجگە، جگە لە.

واتە: ئەی دەم و زار وەک خونچە و لێو وەک شەکر، چەندم سزا و دەرد بەدەستتەوە چەشتووە و هێشتاش لەباتی ئەوەی قەرەبووی ئەو هەمەوو دڵئازاردان و سزایەم بۆ بکەیتەوە، کەچی جگە لە سزا و دەردەسەریی، هیچی ترم لێ نەدیویت.

**٢- بێ وەفایی حەققە، ڕەسمی گوڵعوزارانە، بەڵان**
**نەک دەگەڵ یاری وەکو من، ساحێبی میهر و وەفا**

ڕەسم: (لێرەدا) ئاکار، ڕەوشت و خوو.

گوڵعوزار: ڕوخسار وەک گوڵ.

میهر: میهرەبانی، سۆزداریی.

واتە: دەزانم و ڕاستە، کە ئاکاری ڕوخسار گوڵان، هەر ئازار بەخشین و پەیمان شکاندن و نامیهرەبانییە، بەڵام ئاخر لەگەڵ یارێکی وەک منی ئەوینپەروەر و خاوەنی میهرەبانیی و پابەندی وەفا و بەڵێن، کارێکی دڵڕەقانەیە.

«وەفایی» دەڵێ:

بەوەفا بە؛ کە دەشمکوژی، بەمیهرم وەرە سەر
دا نەڵێن عاشقی بێ «میهر و وەفا» سەرسەرییە[1]
«١٦٢»

**٣- باری جەورت من دەکێشم؛ سەیری گوڵ: خەڵکی دەکا**
**دەردی هیجرت من دەبینم؛ سەیری: بۆ کێیە سەفا!**

واتە: ئەی گوڵەکەم! من لەگەڵ پەروەردەکردن و پێگەیاندنتا، ماندوو دەبم و تۆی گوڵم هێناوەتە بەرهەم، کەچی وا ئێستاکە خەڵکانی تر، چێژ لە سەیرکردن و بۆنکردنت دەکەن و هەر منیشم کە دەردی دووریت دەچێژم، کەچی خەڵکانی تر، بەدیدارت شاد دەبن و خۆشیی دەبینن.

«مەحوی» دەڵێ:

نەمامی قامەتی؛ پەروەردەی ئاوی دیدەکەی من بوو
کەچی گوڵچینی باغی وەسڵی ئەو، ئێستاکە ئەغیارە
«٤٦٣»

«کوردی» دەڵێ:

شادن لە تەماشای نەزەرت، مەحرەم و ئەغیار
مروەت نییە تەنها هەر ئەمن، دەربەدەرت بم

**٤- نامەوێ دایم لە سەیری گوڵشەنت سێراب بم**
**جار بەجار ماچێ لە کونجی لێوی خونچەت «قَدْ کَفا»**

سێراب: پاراو، تێرئاو.
گوڵشەن: باخی گوڵ، گوڵزار، گوڵجار.

(١) لێرە واژەی «سەرسەری» بەمانای: ڕاگوزارییانە-یە.



کونج: جۆگە.
قَدْ کَفا: سەروزیاد.

واتە: نامەوێ ئەوەندە لە سەیری باخی جوانیتدا بمێنمەوە، تا لێت پاراو ببم، بەڵکو دەمەوێ بەئەندازەی ئەوە لە سەیرکردنتدا بم، تا هەمیشە تامەزرۆ و پەرۆش و بەحەسرەتت بم، بۆیە حەز دەکەم بەردەوامیش لات نەبم و بەردەوامیش دەمم لە ناو دەمتدا نەبێ، بەڵکو ناو بەناوێک ماچێکی جۆگەی لێوەکانت بکەم، نەک لە جۆگەی لێوەکانت بخۆمەوە و هەر ئەوەندەشم بەسە و لێم سەروزیادە.

**٥- لەو گلەییانەم مەڕەنجە، ڕۆحەکەی شیرینی من**
**من: هەر ئەو بەندەم، سەراسەر تۆ جەفاکەی، یا وەفا**

واتە: گیانەکەم! ئەگەر جار جار، ڕاز و سکاڵایەک لە دەروونما پەنگ بخواتەوە، دەبێ هەر بۆ تۆیانی هەڵبڕێژم، خۆ ئەگەر ئەو ڕازانە، لە چوارچێوەی گلەییدا دەژمێریت، ئەوە نیشانەی ئەوە نییە، کە ئەوەندەی یەک تۆز، لە پابەندیی و لە خزمەتگوزاریمدا بۆتان، کەم دەبێتەوە، چونکە ئەم پابەندییەم ئەوەندە تۆکمە و دامەزراو و پتەوە؛ تۆ هەرچیم بەرامبەر بکەیت؛ هەر لە جەفا، تا بەوەفا، من هەڵوێستم هەروەک خۆیەتی و نالەقێ.

**٦- یاڕەب! ئەو کەس باعیسی دووریی من و تۆ بوو لەیەک**
**بێ نسیبی کەی لە مەحشەردا، لە حەشری موستەفا**

باعیس: هۆ، سۆنگە، مایە.
حەشری موستەفا: حەشری «محەممەد - پەیامبەر».

واتە: خودایە! هەرکەسێ بووە سۆنگەی دووریی من و تۆ، لە یەکتری، لە ڕۆژی حەشردا، لەو تکا و پاڕانەوانەی حەزرەتی محەممەد بێ بەشی بکەیت، کە شیفاعەت بۆ پەیڕەوانی خۆی دەکات.

**٧- ئیقتیفا دەکرێ بەتەرزی شیعری شیرینت «ئەدەب»**
**گەر موداوا بێ بە ئیعجازی مەسیحا ئیقتیفا**

ئیقتیفا: لاساییکردنەوە، شوێن پێ هەڵگرتن، چاولێکەریی.
تەرز: شێوە، جۆر.
موداوا: دەرمانکردن، چارەسەر.

واته: وەک چۆن حەزرەتی مەسیح، کاتێ وتەیەکی لە زار و دەم دەردەهات، مردووی پێ زیندوو دەبوونەوە و بەم موعجیزەیەش، خەڵکی شوێن پەیامی حەزرەتی مەسیح دەکەوتن و دەچوونە سەر ئایینەکەی؛ هەر بەوجۆرەش؛ کە خەڵکی شیعری من «ئەدەب» دەخوێننەوە و لێی تێدەگەن، یەکسەر دەچنە سەر ڕێبازی شیعری «ئەدەب» و شوێن پێی هەڵدەگرن و دواتریش دەبنە شاگردی و پەیڕەوی ڕێبازی شیعری «ئەدەب» دەکەن و لاسایی دەکەنەوە.

(وەک لەم دوا بەیتەی ئەدەبدا دەردەکەوێ، ئەدەب بەدڵنیاییەوە قسە لەسەر ئەوە دەکات، کە هەتا لە ژیانی خۆیدا بووە، بۆی دەرکەوتووە، کە ڕێبازی شاعیرێتی خۆی، بۆتە شێوازێکی تازەی ئەدەبیی و شاگرد و شوێن کەوتووان و لاساییکار و چاولێکەریی زۆرن و پەیڕەوی لە جۆری ڕێبازەکەی دەکەن.



## ١٠

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن) وەک نموونەی:

١- کوشتنێن دیدار و دینێ بێ خەطا هەردەم سەدن
هەر سەحەر دیسا ژ نوو وێن تێنە کێرێ سەد جەلەب
«مەلای جزیری، ٧١»

٢- لەحزەییێک و لەمحەییێک چاوم بەچاوی ناکەوێ
کێ دەڵێ وەحشی غەزالە، مەیلی ئینسانیی هەیە
«نالی، ٥٧٦»

٣- حاڵی عیشق و تابشی هیجرت نیشانی دا بەمن
ئاگری سوزەندە هەر کارێ بەبێشەی نەی دەکا
«سالم، ٢٩»

**١- شۆخی مە، هەردەم بەتەرزێ قەسدی نەخچیرم دەکا**
**گا لە نێو دامم دەخا، گا خەستەیی تیرم دەکا**

شۆخی مە: دڵبەرە شۆخەکەی ئێمە.

هەردەم: هەر جارەی.

بەتەرزێ: بەجۆرێک، بەشێوەیەک.

نەخچیر: نێچیر.

گا: یان.

دام: داو، تەڵە.

خەستە: بریندار.

واتە: دڵبەرە شۆخەکەمان هەر جارەی بەجۆرێک ڕاوم دەکا، یان داوم بۆ دەنێتەوە و بەداو دەمگرێ؛ یان بەهۆی تیرەوە (مەبەستی لە تیر، لە تیلەی چاو و غەمزەی چاوە) بریندارم دەکا و بەبرینداریی دەمگرێ.

**٢- سوێند دەخۆم چیدی فریبی غەمزەیی جادووی نەخۆم**
**ئەمکەڕەت زووتر بەئەفسوونێکی تەسخیرم دەکا**

فریب: تەفرە.

تەسخیر: داگیر و گیرۆدەکردن.

واتە: لە بەرامبەر ئەم دوو شتەی یاردا؛ بەداوەوەکردن و بریندار بوون بەتیری غەمزەیەوە؛ لە دڵی خۆمدا سوێند دەخۆم کە ئیتر تەفرەی تیلەی چاوە سیحراوییەکانی نەخۆم؛ کەچی ئەو، ڕێگەیەکی تر دەدۆزێتەوە و بەفێڵ و جادوویەکی تر گیرۆدەم دەکا.

**٣- سەردەمێ رووی پێ نیشاندام، سەردەمێکی زوڵفی خام**
**ئەووەڵی شێتم دەکا، پاشان لە زنجیرم دەکا**

واتە: ماوەیەک ڕوخساری جوانیم نیشان دەدا و ماوەیەکیش زوڵفی خاوی، کە بەیەکەمیانی شێتم دەکا (بەوەی منی دڵپاک و شەیدای جوانیی، حەز لە ڕووناکیی دەکەم - کە ڕوخساری یار بوو)، ئەمجار بەدووەمیان؛ کە ڕەشایی و تاریکییە و هۆی شێت بوونە، ئەوسا بەئاسانی و بەناوی ئەوەوە کە شێت بووم و شێتیش دەبێ ببەسترێتەوە و زنجیر و پێوەند بکرێ؛ بەمجۆرە جارێکی تر و بەم ڕێگە تازەیە، گیرۆدەم دەکا. کە دیسان مەبەست لە زنجیرکردن و بەستنەوەش، هەر بەهۆی تاڵی جوانی قژە ڕەشەکەوەیەتی.

**٤- وەعدەیی وەسڵم دەداتێ؛ دەچمە لای، نایێتە لام**
**گەر دەچم: زویرم دەکا؛ ناچم ئەگەر: بیرم دەکا**

وەعدەیی وەسڵ: پەیمانی یەکتر دیتن.

**٥- جار بەجار تاتا دەکا بۆم: زوڵفی شێواوی، دەڵێ:**
**کوا دڵی تێدا؟ قسەی نادانە، دڵگیرم دەکا**

واتە: هەندێ جار، هەموو قژەکەی لە بەرچاوم تاتا دەکا و وەک بۆ شتێک بگەڕێ، ئاوا قژی خۆی دەپشکنێ و ئەوە بەڕووم‌دا دەداتەوە، کە پێیان وتووە: گوایە تاوتاوی قژەکەی، دڵدارانی پێوە گیرۆدە و زیندانیی کراوە و کاتێ دڵدارێکیان تێدا نابینێ، ئەوسا پێم دەڵێ: ئەم پروپاگەندانەی ئەم نادانانە، دەربارەم بڵاویان دەکەنەوە (کە گوایە دڵدارانم لە دوو توێی تاوە مووەکانی سەرمدا زیندانیی و گیرۆدە کردوون) یەکجار دڵگیرم دەکا



(هەڵبەتە بەم کارەش دیسانەوە یارەکەی شەیدا دەکات؛ کاتێ کە لە بەرچاوی، قژی شانە دەکات. چونکە مەبەست لە تاوتاوکردنی قژی، شانەکردنێتی.

**٦- من دەڵێم: چۆن بوو قەزا، ئەمنی بەتۆ دڵبەستە کرد!**
**ئەو، بەچاوانی حەواڵەی حوکمی تەقدیرم دەکا**

قەزا: چارەنووس.

حوکمی تەقدیر: بەخت و دەسەڵاتی بڕیاردانی چارەنووس.

**٧- ئەو دەمەی تفڵی دڵم بگری و گڕوو بگرێ لە رووی**
**ئەو، بەماچی هەروەکو قەندی لەبی؛ ژیرم دەکا**

تفل (طفل): کۆرپە، ساوا، منداڵی بچووک.

گڕوو: بیانوو، گریان و گڕۆزی.

**٨- گەر دەڵێم: جانا! بەچی دەعوای جیهانداریی دەکەی؟**
**ئەو، ئیشارەی پرتەوی حوسنی جیهانگیرم دەکا.**

دەعوا: بانگەشە، داوا.

جیهانداریی: دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی هەموو جیهان.

پرتەو: پڕ ڕووناکیی.

واتە: کاتێ لێی دەپرسم: گیانەکەم! ڕاستە تۆ هەموو جیهانت داگیر کردووە، بەڵام ئەی بەچی بەڕێوەی دەبەی، یان: هەر لە سەرەتاوە، چۆنت ئەم دنیایە داگیر کرد؟!. لە وەڵامدا ئاماژە بەچاوەکانی دەکا و پێم دەڵێ: چاوەکانم؛ هەتاون و هەتاویش، هەموو جیهان داگیر دەکا و لە هەمان کاتیشدا هەموو جیهان بەڕێوە دەبا.

**٩- بەستەیی زوننار(ی) مووی کردووم و دەشڵێ: کافری!**
**خۆی لە ڕێگەم دەردەکا، بۆ خۆشی تەکفیرم دەکا**

بەستە: گیرۆدە، زیندانیی.

زوننار (یان: زننار): واژەکە لە بنەڕەتدا یۆنانییە و بریتی بووە لە: زوناری و کورتییەکەی «زونە» بووە و چەندین مانای هەیە:

– پشتێنێک بووە بەئەستوورایی قامکێک، کە پەیڕەوانی ئایینی زەرتوشتی لە کەمەریان بەستووە.
– لە دوای بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام، لەسەر فرمانی موسڵمانان، مەسیحی و جوو، لە پشتیان بەستووە، تا لەگەڵ پەیڕەوانی ئایینی ئیسلام جویێ بکرێنەوە. بەڵام بۆ جیاکردنەوەی مەسیحی و جوو؛ ڕەنگی پشتێنی جوو؛ هەنگوینی بووە.
– ئەو هێڵ و پشتێنەیەیە، کە بەئەندازەی مەی و بادە، لە لێوان و پیاڵە و پەرداخ دەکرێ. لە هەمان کاتدا دیسان هەر ئەو هێڵ و پشتێنەیەیە، کە لە دوای خواردنەوەی بادەکە، لە پەرداخەکەدا دەمێنێتەوە و بەمەش هەر دەڵێن: زوننار.
– هەندێ جاریش لە زمانی فارسیدا، بەمانای «کەشتی» هاتووە.
– لە زاراوگەلی تەسەوف و عیرفانیشدا، بەمانای: ڕاستیی و یەکڕەنگیی لە خواپەرستیدا دێت.
– ملوانکەیەکی مل و گەردنی کەشیشانی مەسیحە، کە لەگەڵ خاچێکدا بەگەردندا ئاوێزانی دەکەن. ئەم ملوانکەیە زۆر جار لە هەورێشم، یان لە: کەتان دەبێ.
– زۆرجاریش هەمان پشتێن بەستنی زوننار، بەمانای ئامادە و تەیاربوونە، بۆ ڕاپەڕاندنی کار و فرمانێک. لە کوردیشدا دەوترێ:
فڵان کەس، کەمەربەستەی فیسار کەسە.
– هەندێ جاریش بەمانای ئاشکراکردنی نهێنییەکی شاردراوە دێت، کە لە فارسیدا بەمەیان دەڵێن: لە ژێر جبەدا شاردنەوە. لەم مانایەیاندا «حافظ»ی شاعیری گەورە دەڵێ:

حافظ! این خرقە کە داری تو ببینی روزی
کە چە زنار ز زیرش بەجفا بگشانید
(دهخدا، بەرگی ٩، ل ١٢٩٣٨)

ئەم بەیتەی «ئەدەب»یش لەم غەزەلەدا، بەم مانایە دێت، نەک بەمانای پشتێن و شتی تر، کە بەداخەوە تا ئێستا مانای واژەی «زوننار» لە ئەدەبی کلاسیکی کوردیدا، هەر بەمانای «پشتێنی مەسیحیانە» لێکدراوەتەوە. چونکە «ئەدەب» دەڵێ:

بەردەوە زونناری موو، با وەرگەڕێ عالەم لە دین
کفری پەنهان؛ تا بەکەنگی؟ ئاشکرا بێ چاترە



بەم پێیە واژەی «زوننار» لەم بەیتەدا، بەمانای ئەو نهێنییە شاراوەیەی لە دەمێکەوە پاراستووتە و ئەگەر دەربخرێ، دەبێتە مایەی ئاشکراکردنی شتێکی تازە و وەرسووڕانی بڕوای خەڵکی، لە دوی بڕوایەکی تازە. بەمەش «ئەدەب» نرخ و بەهای زوڵف و قژی یار بەباڵا دەبڕێ و دەریدەخات، کە ئاستی خۆشەویستیی قژ و زوڵفی یار، بەئەندازەی خۆشویستنی خەڵکە، بەرامبەر بەبڕوا و ئایینێکی تازە.
«مەحوی» دەڵێ:

لەگەڵ دەستی مەلا، ڕێ ناکەوێ زونناری زوڵفی یار
وەکو «شێخ» ئیختیاری مەزهەبی «تەرسا» نەکەم، چبکەم؟!
«٢٣١»

## ١٠- مەیگوساری بادەیی مینا قەدێکم من «ئەدەب»
## دەمبەدەم مەستی مەیی حوسنی جیهانگیرم دەکا

مەیگوسار: عادەت و خووگرتن بەمەی خواردنەوەوە.
مینا قەد: بەژن و باڵای زراڤ و شووش و باریک، وەک گەردنی شووشەی مەی.
واتە: من (ئەدەب) خوو پێوە گرتووی بادەی باڵا زراڤێکم، کە کاتێ مەستی نقوم بوونی دەبم لە جوانییە جیهان داگرەکەیدا، هەر بەوجۆرەش ناوبانگم لە جیهانی دڵداریدا، پێ پەیدا دەکا و دەبمە عاشقێکی، وەک عاشقانی بەناوبانگ و ناوبەدەرەوەی جیهانی.

١١

کێش: بەحری سەریع موسەددەس مەتوی (مطوی): (مفتعلن مفتعلن فاعلن) وەک نموونەی:

١- ئەرچی کەسێ عیلمەکی قەنج خوەندیە
دەوڵەتە، گەر وی ئەسڵ زانییە
«خانی»

٢- جانی عەزیزم، بەسەری زوڵفی خاو
یوسفی دڵ، چی دی لە زیندان مەکە
«وەفایی، ١٢٩»

٣- من لە غەمت، ڕێگەیەکم کەوتە بەر
خوانی بەهەشت و سەفەری هەشت خوان
«حاجی قادر، ٩٤»

**١- قورصی قەمەر، لەو ڕوخی ئەنوەر شکا**
**سەرووی سەهی، لەو قەدی دڵبەر شکا**

قورص: بازنەیی.

قورصی قەمەر: ڕوخساری شێوە خڕی وەک مانگ بازنەیی.

ڕوخ: ڕوخسار.

ئەنوەر: ڕووناکترین.

سەرووی سەهی: داری سەرووی بەرز و ڕێک هەڵچوو.

لە ڕێنووسی «قورص»دا، بەئەنقەست بەپیتی «ص»م نووسی، تا واژەی «قورص» و «قورس» لە یەکتر جوێ بکەمەوە و مانایان تێکەڵ نەبێ.

«حەمدی» واژەی «قورص»ی مانگی ڕوخسار و ڕوومەتی یاری بەمجۆرە بەکاربردووە:

١- تێر ئەبێ برسی خەیاڵی گەر لە قورصی مانگ بدا
لازمە ئەمجا؛ کە مانگ گیرا، هەموو کەس بانگ بدا
«١٦٨»



٢- زەمانێکە بەڕۆژووم، بەو ئومێدەی هەر دەڵێم بیکەم
لە قورصی ڕوومەت و عەننابی لێوت، بەڵکە بەربانگێ
«٣٦٨»

٣- سحوورم قورصی ڕۆژی ڕوومەتی بوو، ئەم سبەینێیە
چ خۆشە گەر ببێنم، مەغریبیش بیکەم بەئیفطارێ
«٣٧٠»

واتە: ڕوخساری خڕ و بازنەیی مانگ، لە بەرامبەر ڕوخساری گەشتر و ڕووناکتری یاردا، ڕمێن و بەها و برەوی نەما و داری سەرووی باڵا بەرزیش، لە ئاست بەژن و باڵای زراڤی یاردا، شکۆی شکا.

«مەولانا خالید» (لە بارەی سەرووی سەهی) دەڵێ:

١- سروسهی ز گلشن سلطان انبیا است
نوباوەی حدیقەی «زهرا» و «حیدر» است
«٤٨٠»

٢- شمس خاور بر سر سروسهی بگرفته جای
یا بلا یاخود همین بالا و رخساراست این
«٥٥٤»

«سالم» دەڵێ:

ڕووت: نازک و لەتیفە، وەک گوڵی نەوبەهار
قەدت: بەڕاستی چو: سەهی سەروی جۆیبار
«٦٠»

«وەفایی» دەڵێ:

سەروی سەهی، قوربان! ئەگەر ئازادە؛ ئەدی بۆچ
بادام و گوڵ و سونبول و نەسرینە بەری تۆ؟
«١١١»

**٢- عەسکەری زەنگیت بەدوو غەمزە شکاند**
**وەک لە خەجاڵەت مەهی خاوەر شکا**

عەسکەری زەنگی: سەربازی پێست ڕەشی هیندی، یان ئەفریقایی و لە هەمان کاتیشدا «زەنگی» بە«ناموسڵمان» دێت.

مەهی خاوەر: مانگی خۆرهەڵات (مەبەستی لە مانای جوگرافیاییی هەموو خۆرهەڵاتە).

واتە: ئەو لەشکرە پێست ڕەشانەی لە هیند و ئەفریقاوە لەشکرکێشییی و هێرشیان بۆ خۆرهەڵات دەهێنا، تۆ (ئەی یار) ئەو لەشکرەت هەر بەتەنیا بەدوو تیلەی چاوی جوانت تێکشاند و مانگی هەموو خۆرهەڵاتیش، لە بەرامبەر مانگی ڕوخسارتا شکا و پاشەکشەی کرد.

هەڵبەتە وەک لای «ئا» بە«شەهی خاوەر»، لەجیاتی «مەهی خاوەر» هاتووە، دەگونجێ لە لێکدانەوەی لەشکرکێشییی و جەنگدا، «شەهی خاوەر»یش هەر بەڕاست بخوێنرێتەوە و وا لێک بدرێتەوە، کە لە بەرامبەر جەنگی جوانییی تۆ و توانای لەشکرکێشی لەشکری بیانیدا، سوڵتان و شای هەموو خۆرهەڵاتیش، هەر بەهێزی لەشکری جوانیت، لە شەرمەزاریدا شکا.

**٣- شەهدی دەمی؛ قەدری نەباتی نەهێشت**
**وەک لە: لەبی، لەززەتی کەوثەر شکا**

شەهد: هەنگوین.

نەبات: جۆرە کڵۆیەکی وردی ڕەنگ ئاویی سپیات و چێژ شیرینە و لە وشککردنەوە و پەروەردەکردنی لیمۆی شیرین دروست دەکرێ؛ کە جاران لەباتی شەکر بەکاربراوە.

کەوسەر (کەوثەر): ئاوی کەوسەری بەهەشت.

واتە: هەنگوینی دەمت (ماچت) ڕمێن و ڕێزی نەباتی نەهێشت و مژینی لێویشی، لە مژینی ئاوی کەوسەر خۆشترە و برەوی ئەو ئاوە بەناوبانگ و پیرۆزەی نەهێشت.

«وەفایی» واژەی «کەوثەر»ی بەمجۆرە بەکار هێناوە:

«نەهری» کە جێگەیێکە هەموو خاکی سورمەیە
نەهری، کە جەننەتی گوڵ و گوڵ ئاوی کەوثەرە
«١٢٤»



«نالی»یش «کەوثەر» بەمجۆرە بەکار دەبا:

«طەیبە» کە یەعنی طەبیب و طاهیر بەڕەوحی ڕۆح
فەرقی دەڵێن: گڵی لە گوڵ، ئاوی: لە کەوثەرە
«٤١٨»

**٤- تا بتی من، مەعجەری لادا لە ڕوو**
**قودرەتی سەرپەنجەیی ئازەر شکا**

مەعجەر: چارشێو، سەرپۆش، ڕووپۆش.

ئازەر: ئازەر-ی پەیکەر و بتتاشی مامی حەزرەتی ئیبراهیم

واتە: هەرکە بتەکەی من (یارم)، چارشێوی لە ڕوو لادا و جوانیی دەرکەوت، ئیتر ئازەری بتتاش و پەیکەرتاش، هێز و توانا و هونەری پەیکەرتاشینی تێدا نەما.

**٥- ڕائیحەی طوڕەی ئەو، هاتە مەشام**
**قەدری گوڵاوی گوڵ و عەنبەر شکا**

ڕائیحە: بۆن.

طوڕە: کاکۆڵ.

مەشام: شوێنی بۆن (بۆنگە)، لووت.

واتە: هەرکە بۆنی کاکۆڵی دڵبەر، لای خەڵکەوە بۆن کرا، ئیتر بەجارێ ڕێزی گوڵاوی گوڵ و عەنبەر نەما.

**٦- لەو شکەنی زوڵفی خەمی، ئەندەر خەمی**
**گەردنی «دارا» و «سکەندەر» شکا**

شکەن: تێکشکاو.

خەم: لوول و پێچاوپێچ.

ئەندەر: لە ناوەوە.

ئەندەر خەم: پێچ و لوولی ناو پێچ و لوول.

واتە: لە بەرامبەر و لە ئاکامی پێچ و لوولی بسکی یاردا، گەردن و ملی «دارا» و «ئەسکەندەر» شکان.

**٧- ئەو شەوە فەرمووت کە: نەکەم ماچی ڕوو**
**دڵ؛ کـە شکا بوو، بەهەمـوو سـەر شکا**

واتە: دڵبەرەکەم! ئەو شەوە، کە پێمت وت: کوڵمەکانت ماچ نەکەم، لە ڕاستیدا دڵم خۆی پێشتر شکا بوو، بەڵام بەم قسە و قەدەغەکردنەت، ئەوەندەی تریش شکا.

**٨- تۆ، دڵی «قـەیسـەر» دەشکێنی بەناز**
**باکت چییـە بۆ دڵی من؛ گـەر شکا!**

واتە: نازی تۆ ئەوەندە گەورەیە، باکت بەگەورەیی کەسانی وەک «قەیسەر»یش نییە، کە پاشای ساسانییە، ئیتر چ باکت بەدڵی منەوەیە!.

**٩- لەو دەمـەوە سـاقی و بادەم ئەتۆی**
**ڕەنجی خـومـاری مـەیی خـوللەر شکا**

ڕەنج: ماندووبوون، تەقەللا، کۆشش.

خومار: مەست و سەرخۆشبوون.

خـوللەر: شـارێکی نزیک شـاری «شـیـراز»ی ئێـرانە و لە ترێی زۆر جـوان و چاکـدا بەناوبانگە و هەر بەم هۆیەشەوە شـەرابی زۆر بەناوبانگی هەیە (دهخـدا، بەرگی ٧، ل ٩٩١٥).

واتە: جـاران بۆ ئەوەی زۆر مـەست بم، هەر بادەی «خـوللەر»م دەخـواردەوە؛ بەڵام لەو کاتەوەی تۆ بۆم بوویتە مەیگێڕ و بادەکەش پێکەوە، ئیتر پێویستیم بەبادەی «خوللەر» نییە، چونکە تۆ لەو چاکتر مەستم دەکەیت.

«مەحوی» دەڵێ:

١- وەرنە سەیری سەرخۆشان! ئەو شۆخی مینا گەردنە
بوو بەساقی، دەم بەشەککەر خەندە دێ، مینا بەکەف
«١٧٤»

٢- با وجوودی لێوی شەککەرباری تۆ
بێ وجوودە نەشئە بەخشینی شەراب
«٤٤»



«سالم» دەڵێ:

جورعەنۆشیی تۆ بکەم، ئیتر لە بەزمی مەیکەدە
چاوی مەخموورت بەعاشق: کاری بادەی مەی دەکا
«٢٩»

**١٠- لەو دەمەوە حەلقەیی موو کەوتە ڕوو**
**موعجیزی داوودی زرێگەر شکا**

داوودی زرێگەر: مەبەست لە حەزرەتی «داوود»ە، کە زرێی جەنگیی دروست دەکرد و بەدەستی ڕووتیی، ئاسنی سوورەوەکراوی لە کوورە دەردەهێنا و موعجیزەی دەنواند.

واتە: لەو کاتەوەی کە حەلقەی تاڵی قژی تۆ، کەوتۆتە سەر ڕوخسارت، کە وەک کوورەی ئاسنگەر؛ گەرم و گەش و ڕووناکە و هەر حەلقەیەکیشی بۆ داو و کەمەند و بەدیل گرتنی خەڵکی بەکاریان دەهێنی، ئیتر خەڵک چ پێویستی بەو حەلقەی زرێیەی حەزرەتی داوودە؟!.

**١١- جلوەیەکی قامەتی تۆ؛ کەوتە باخ**
**شەکەوتی باڵایی سنەوبەر شکا**

واتە: کە خۆنواندنێکی نازاویی باڵای بەرزی تۆ، لە باخدا بینرا، شکۆی باڵای بەرزی سنەوبەر شکا.

**١٢- ساعیدی سیمین، کە دەرتخست بەناز**
**دەبدەبی قیمەتی گەوهەر شکا**

ساعید: قۆڵ و مەچەک.

سیمین: زیوین.

**١٣- عەهدێ؛ کە دەتفەرموو: دەدەم ناشکێ**
**تاجی سەرم! چۆن بەهەموو سەر شکا؟!**

واتە: ئەی تاجی سەرم و مایەی سەربەرزیم! ئەو بەڵێنەت چۆن چۆنی بوو، کە دەتفەرموو، پەیمانێکە، داومە و نایشکێنم. کەچی هەر ئەو بەڵێنەت، کە شانازیم پێوە دەکرد و وەک تاجی سەرمم بۆ دەڕوانی، هەر لە خۆیەوە شکا!.

**١٤- تا كه «ئەدەب» هاتە بیسـاتی سوخەن**

**ڕەونەقی بازاڕی ســـوخـــەنوەر شكا**

بیسات (بیساط): مەیدان.

سوخەن: قسەوێژیی هونەریی.

سوخەنوەر: وێژەر.

واتە: لەو ساتەوە كە «ئەدەب» لە مەیدانی ڕەوانبێـژیدا، هونەر دەنوێنێ، ئیتـر بازاڕی وێژەران و شاعیران شكاوە.

(ئەدەب لەم شیعرەشدا بەدڵنیاییەكی تۆكمەوە، لە دەسەڵاتی شاعیرێتی خۆی دەدوێ).





كێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلات) وەك نموونەی:

١- دی ژی چەرخی پەنجـومین بیتن تەننەزول كیت مـیـریخ
میثلی شەمسی گەر كیشینیتین لی وان تیغین غەزەب
«مەلای جزیری، ٧١»

٢- ئاسـمـانی حوسنی مـەحبـووبەم لە ئەبرۆ و زولف و ڕوو
دوو هیـــلال و دوو شــەو و دوو مــانگی تابانی هەیە
«نالی، ٥٧٤»

٣- تا سـوپاهی خوسـرەوی عـیـشـقت ئیـحـاتەی جـانی دا
بۆ شەڕوشۆڕی موسیبـەت، دڵ لە موڵكی «ڕەی» دەكا
«سالم، ٢٩»

**١- دڵبــەرا! ئەمــڕۆ نیگاهت كــاری ســەد خــەنجــەر دەكـا**

**یەك بەیەك نێشی موژەت، زەخمی دوو سەد نەشتەر دەكا**

دڵبەرا: ئەی دڵبەرەكەم، لێرەدا حەرفی (ئەلف)ی دڵبەرا، ئامرازی بانگەوازە.

نیگاه: نوارین.

نێش: چزووی پێوەدانی دووپشك و مار و ئەوانەی چزوویان هەیە.

موژە: برژانگ، مژۆڵ.

زەخم: زام، برین.

**٢- نایرەی پشـكۆیی كــوڵمــەت، ڕەونـەقی مــەجـمــەر ئەبا**

**ڕایحـەی شـەوبۆیی طوڕەت، لەومـەیی عـەنبـەر[١] دەكا**

(١) وەك لە پێشـەكـیدا ئامـاژەمـان بەئاگـادارییی و زانیـاریی «ئەدەب» لە زانسـتی پزیشكـیدا كـرد؛ دەردەكەوێ كە (ئەدەب) لە بەكارهێنانی «عـەنبەر»دا مانای دەرمـانسازیشی مەبەست بووە، چونكە جگە لە بۆنە خـۆشـەكـەی، بۆ زۆر نەخـۆشـیش بەكـار دەبرێ. دیسـانەوە بنوارە: (دهخـدا، هەمـان سەرچاوە).

نایره: بڵێسه.

مەجمەر: ئاگردان، مقەڵی، پشکۆدان، شکڵدان.

ڕایحه: بۆن.

طوڕه: کاکۆڵ.

عەنبەر: لەگەڵ شەرحی غەزەلی ژمارە (٧، بەیتی ٤)دا بەدرێژیی پێناسەمان کرد.

«نالی» و «سالم» و «وەفایی» بەمجۆرە «عەنبەر»یان بەکارهێناوە:

١- داخڵ نەبی بەعەنبەری سارایی «خاک و خۆڵ»
هەتا نەکەی بەخاکی «سولەیمانی»یا عوبوور
«نالی، ١٨١»

٢- سەوادی قیرگوونی شەو، لە نوسخەی عەنبەرین مووتە
سەراسەر ڕەونەقی دونیا، لە عەکسی خاڵی هیندووتە
«سالم، ١٢١»

٣- ئەو ڕۆژە کە دیم طوڕە لەسەر عەنبەری خاڵی
زانیم ئەوە بۆ صەیدی دڵم دانە و دامە
«وەفایی، ١٣٤»

**٣- ئیلتیهابی عیشقی تۆ، ئەمڕۆ لە سینەی ئێمەدا**
**دەستوبردی ئاتەشی سووزان لە نەیشەککەر دەکا**

ئیلتیهاب: هەوکردن، سووتانەوە.

ئاتەش: ئاگر.

سووزان: سووتان.

نەیشەککەر: قامیشی شەکەر.

واتە: هەوکردن و سوورەوەبوونی گڕی عیشقی تۆ، ئەوەندە بەخێرایی لە سینەمدا دەتەنێتەوە، هەر دەڵێی ئاگرە و لە قامیشەڵانی وشک بەربووە.

«سالم» دەڵێ:



حاڵی عیشق و تابشی هیجرت نیشانی دا بەمن
ئاگری سوزەندە هەر کارێ بەبێشەی نەی دەکا
«٢٩»

**٤- خۆش بەحاڵی خاڵەکەی هیندوو لەسەر گەنجی لەبت**
**کافرێکی دۆزەخیی، سەیری لەبی کەوثەر دەکا**

خۆش بەحاڵی: خۆزگە بەوە.

خاڵی هیندوو: خاڵی ڕەش.

مەبەستیش لە هیندوو: پێست ڕەشی هیندی و ئەفریقایی و ناموسڵمان.

گەنج: گەنجینە.

لەبی کەوثەر: لێوی کەوثەر (مەبەست لە لێوی یارە).

واتە: خۆزگەم بەخاڵی لای لێوت، کە هەر دەڵێی کافرێکی ناموسڵمان و دۆزەخییە و لەسەر گەنجینە و خەزێنەی لێواری ئاوی وەک ئاوی کەوثەری لێوی تۆ، دانیشتووە و ماچی دەمت (ئاوی کەوثەر) دەمژێ.

«وەفایی» دەڵێ:

ئەمن نەمدیوە: هیندوو؛ باغەبانی باغی جەننەت بێ
بەشیرینیی چ دڵکێشە؟ بنازم! خاڵی ڕوخسارت
«٢٥»

**٥- بەندەیی شەهدی لەبی وەک شەککەری شیرینی تۆ**
**خوسرەوێکە؛ سەڵتەنەت بێ خاتەم و ئەفسەر دەکا**

بەندە: نۆکەر.

شەهد: هەنگوین، هەنگوینی پاڵاوتە، کە مێوەکەی لێ جیا کرابێتەوە.

خوسرەو: مەبەست لە خوسرەو پەروێزە.

خاتەم: موستیلە، ئەنگوستیلە، کلکەوانە.

واتە: بەندە و غوڵامی هەنگوینی لێوی تۆ، هەر دەبێ کەسێک بێ وەک خوسرەو پەروێز، کە بەبێ ئەنگوستیلەی پادشایەتی و بێ ئەفسەر و لەشکر، پاشایەتیی بکات.

**٦- هەر کەسێ مەستی صەبوحی نێرگسی مەخموورتە**
**کەی خەیاڵی جامی صەهبا، یا مەیی خوللەر دەکا!؟**

«مەولانا خالید» و «وەفایی» بەمجۆرە واژەی «صەهبا»یان بەکاربردووە:

هرانکو مست صهبای جنون است
همه کارش زحیرت واژگون است
«مەولانا خالید، ٦١٥»

لەو صەهبایە روحی دڵە، ئارەقی ڕووی بەرگی گوڵە
زانی دڵم بێ حاسڵە، دەستی دڵی بیماری گرت
«وەفایی، ٢٧»

صەبوحیی: ئەو بادەیەی لە بەرەبەیاندا دەخورێتەوە.

نێرگس: مەبەست لە چاوەکانی یارە.

مەخموور: مەستی مەی.

صەهبا: مەیی و بادەی نایاب و دەگمەن و چاک.

خوللەر: شاری (خوللەر)ی پێشتر باسکراو. (غەزەلی ١١، بەیتی ٩).

واتە: هەر کەسێک لە بەرەبەیاندا بادەی چاوە مەستەکانی تۆ، مەست و سەرخۆشی بکات، ئیتر دڵی لای بادەی نایاب و مەیی شاری «خوللەر»ی لە بادەی باش و بەناوبانگدا ناکات.

**٧- چونکە پێت عارە نیشانەی ناوەکی تۆبین ئەمە**
**تیرەکەت جارێ سەر و جارێ بەعەمدەن بەر دەکا**

ناوەک: پەیکانی تیر.

ئەمە: ئێمە (من).

عەمدەن: بەئەنقەست.

واتە: دەزانم تۆ گەورەیت و پێت کەم و هیچە، ئەگەر بکەوینە بەر نیشانەی تیرەکانت (غەمزەی چاوت)، بۆیە بۆ ئەوەی بەر تیرەکانت نەکەوین و تیرەکانت نەمانئەنگێوێ، بەدەستی ئەنقەست وا دەکەیت، تا ئەندازە و مەودای تیرەکەت؛ جارێ زۆرتر لە مەودای



ئێمە بهاوێژی و لەمەیاندا بەسەرماندا تێدەپەڕێ و بەرمان ناکەوێ، جاری واشە؛ مەوداکەی لە ئێمە کورتتر دەهاوی و کەم بڕ دەکا و لە پێشمانەوە دەکەوێ و لەمەشیاندا هەر بەرمان ناکەوێ.

«نالی» دەڵێ:

«نالی» ئەو وەحشی غەزالە، کەس ئەبەر داوی نەکەوت
چونکە شاهێنی دوو چاوی تیژە، دائیم سەر دەکا
«١١١»

**٨- زوڵفەکەت جارێ طەناب و گاهی نافەی مشکی ناب**
**ئەلحەق ئەو عەییارە ئەمڕۆ؛ کاری جادووگەر دەکا**

طەناب: تەناف؛ کە لێرەدا مەبەست لە تەناف و پەتی سێدارەیە و لە هەمان کاتیشدا هێمایە بۆ تاڵی قژی یار.

نافە: ناووک.

مشک: میسک، یا: موشک، یا: میشک: ناوی جۆرە ئاسکێکە، کە لە بنەڕەتدا ناوی «موسکس» و «موسکیفروس» بووە و لە لووتکە بەرزەکانی «سیبیریا، تیبەت، کۆریا، چین، خەتا، خوتەن...» دەژی و ئەم هەرێمانەش هەموویان دەکەونە خۆرهەڵاتی ئاسیاوە. ئەم ئاسکە، بەقەبارە بچووک و تووک زبر و قاوەیی ڕەنگە؛ بەرزایی دەستی، تا سەرشانی (٦٠ سانتیمەترێکە). ئەوەی ئەمجۆرە ئاسکەی ناودار کردووە؛ هەر تەنیا نایابیی و جوانیی و چاوە ڕەشەکانی نین، بەڵکو ئەو: مسک، مشک، موشک»یەتی، کە لە شێوەی تەڕاییەکی مەیلە و ڕەشدا، ئاڵوو: «غُدّە»ی بەر سکی، یا ناووکی نێرەی خرتی ئەمجۆرە ئاسکە دەیدەڵێنێ. ئەم تەڕاییەش کاتێ بەشوێنی خۆیەوە وشک دەبێتەوە؛ دەبێتە ئەو «مسک»ە بۆن خۆشە، کە لە بۆنە هەرە خۆشەکانە.

شاعیرانی گەلانی: کورد، تورک، فارس و عەرەب، لە شیعرەکانیاندا ناوی ئاسکی «چین، خەتا، خوتەن...»یان بردووە؛ کە خەتا و خوتەن دوو شارن، یەکەمیان لە باکووری چین و خۆرئاوای شاری «خەبالیق»، یا: شاری «پەکین»ی ئێستەیە و «خوتەن»یشیان بەر تورکستانی ئێستا دەکەوێ و شارێکی کۆنە و لەسەر سنووری «چین - تیبەت»ە، کە لە سەردەمانی کۆنیشدا سەر بە«چین» بووە. لە بەرهەمی شیعریی ئەم گەلانەدا، کە ناوی «نافە»ش دەبرێ؛ هەر مەبەست لە «ناووک»ی ئەمجۆرە ئاسکانەیە.

«سالم» دەڵێ:

١- حسابی نەفحەی زوڵفت، لەگەڵ مشکی خەتا ناکەم
خەتا ناکەم، سەبا شاهیدمە؛ تەشبیهی وەها ناکەم
«٨٥»

٢- ئەگەر ئەفشان بێ نەفحەی چینی زوڵفت
خەجاڵەت دەیگرێ: ئاهووی تەتار
«٥٨»

**٩- بەو خەیاڵەی جارێ بەڵکە بێیە باڵینی «ئەدەب»**
**گەر لەسەر ئەورەنگی «جەم» بێ، یادی نێو بەستەر دەکا**

باڵین: ژوورسەر.

ئەورەنگ: تەختی پاشایی.

بەستەر: نوێنی خەو، خەوگە.

واتە: ئەوەندە حەز دەکەم لێم نزیک بیت، تەنانەت ئاواتی ئەوەش دەخوازم جارێک نەخۆش بکەوم و تۆ بێیتە سەرینم؛ بۆیە ئەگەر بزانم کاری وام لەگەڵ دەکەیت و لە نەخۆشیمدا، دێیتە سەردانم، ئەوا ئەو کاتە ئەگەر لەسەر تەختی پاشایەتی «جەم»یش بم، حەز دەکەم خێرا خۆم بەژێر نوێنەکەمەوە بکەم.



١٣

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن) وەک نموونەی:

١- سوفتی بێن پڕ لەعل و مەرجانان ب موژگانان حەنا
دیدە ڕەوشەن بوون ب دینا دێم دوڕی سیمین غەبەب
«مەلای جزیری، ٧٤»

٢- ئاسمانی حوسنی مەحبووبەم لە ئەبرۆ و زولف و ڕوو
دوو هیلال و دوو شەو و دوو مانگی تابانی هەیە
«نالی، ٥٧٤»

٣- چاوەکەت وەختێ بەئیما، مەیلی جامی مەی دەکا
هەرچی مەی دەیکا لەگەڵ ئەو، ئەو لەگەڵ ئێمەی دەکا
«سالم، ٢٩»

**١- دڵبەرێ وابێ، کە ئەمڕۆ زوڵفی عەییاری دەکا**
**قوتبی «بەستامی» بەدینێک؛ مەیلی زنناری دەکا**

قوتبی بەستام: مەبەست لە «تەیفوور کوڕی عیسا کوڕی ئادەم کوڕی عیسا کوڕی سروشان»ی «بەستام»ە، کە بە«سلطان العارفین» بەناوبانگە. باپیرەی زەرتوشتی بووە و لەسەر دەستی «ئیمام عەلی کوڕی مووسا»دا بۆتە موسڵمان. جگە لەوەی بەقوتبی بەستامی بەناوبانگە، لە هەمان کاتدا «بایەزیدی گەورە»یشی پێ دەڵێن. ناوبراو ساڵی ٢٦١ یان ٢٦٢ هیجری کۆچی دوایی کردووە. (دهخدا، بەرگی ٣، ل ٤٣٣٣).

«مەولانا خالیدی شارەزووری» بەمجۆرە ناوی «قوتبی بەستام»ی دێنێ:

بسی چون قطب بسطامی و منصوراست در کویش
«أنا الحق» بر زبان هرگز نمیرانند و «سبحانی»
«٥٧١»

واتە: شۆخێکی ئاوا بەمجۆرە بسکەکانی بنوێنێ، دوور نییە ئەگەر قوتبی بەستامی چاوی پێی بکەوێ، لە دین بۆی وەربگەڕێ و شەیدای بسک و زوڵفە وەک «زننار»ەکەی ببێ.

«وەفایی» دەڵێ:

زەمانێ قیبلەم ئەبرۆتە، دەمێ زوننار گێسووتە
بەدەردی بێ دەوا ماوم؛ لەگەڵ کوفر و موسڵمانی
«۲۰۲»

**۲- خەنجەری غەمزەی لە جەرگم داوە، بێحاڵی ئەوەم**
**مەرهەمی زەخمم حەواڵەی زوڵفی خۆنخواری دەکا**

بێحاڵ: نەخۆش، پەرێشان، نائارام.

مەرهەم: هەتوان.

زەخم: زام، برین.

حەواڵە: ناردن.

خۆنخوار: خوێنخۆر، خوێنمژ.

واتە: بەسەیرکردن و غەمزەکانی، کە دەڵێی خەنجەرن، جەرگمیان بریندار کردووە و ئێستا نەخۆش و زامداری ئەو جێگە غەمزانەیم؛ کەچی بۆ چارەی برینەکەم: دەمنێرێتە لای بسکەکانی و بەرەو ڕووی زوڵفەکانیم دەکاتەوە! لە کاتێکدا کە زوڵفەکانیشی کاریان هەر خوێنڕشتن و خوێنمژییە، نەک هەتوان کردنی برینەکانی من!.

**۳- دڵ بەسەد خوێنی جگەر؛ خونچەی گەیاندێ بۆ دڵم**
**ئەو ڕەقیبە گەبرە ئێستا، مەنعی گوڵزاری دەکا**

ڕەقیب: ناحەز، نەیار، دوژمن.

گەبر: لە گاور-ەوە هاتووە و ئەمیش بنەچەکەی ئاییینی زەرتوشتییە و دواتر بە: کافر و ناموسڵمان ناسراوە.

مەنع: ڕێگریی، بەربەست.

واتە: بەهەزار دەردەسەریی و وەک دەڵێن بەخوێنی جگەر، خونچەیەکم پێگەیاند، کەچی ئەو دوژمنە ناموسڵمان و کافرە، وا ئێستاکێ ڕێگریی لە دڵم دەکا و نایەڵێ دڵم بەئارەزووی خۆی سەردانی باخەکەی بکات و سەیری جوانیی گوڵەکەی (یارەکەی) بکات.

«مەحوی» دەڵێ:



نەمامی قامەتی، پەروەردەی ئاوی دیدەکەی من بوو
کەچی گوڵچینی باغی وەسڵی ئەو، ئێستاکە ئەغیارە
«٤٦٣»

**٤- من قەرارم بوو: دەبێ بێ، تا بەسۆزێک بای سەبا**
**بێ قەراری بوو، قەرارە زوڵفی طەڕاری دەکا**

طەڕار: بەملا و لادا خستنی بسک و کاکۆڵ.

قەرار: بڕیار.

بێ قەرار: بێ حاڵ، بێ ئارام، بێ ئۆقرە.

**٥- دڵ بەچاوی موبتەلا بوو؛ زوڵفی زەنگیی حەپسی کرد**
**کافرە، هەردەم بەتەرحێ ڕەنج و ئازاری دەکا**

موبتەلا: گیرۆدە.

زەنگیی: ڕەش. لە هەمان کاتدا ئاماژەشە بۆ سەربازی پێست ڕەشی ئەفریقایی و هیندی، کە ناموسڵمانن.

حەپس: زیندان.

بەتەرحێ: بەجۆرێک، بەشێوەیەک.

ڕەنج: لێرەدا بەمانای ئازاردان دێت.

واتە: دڵم بەچاوی گیرۆدە بوو، کەچی سەربازی پێست ڕەشی بسکەکانی، دڵمیان گرت و زیندانییان کرد... ئای لەم یارە کافرەم! هەر دەمەی بەجۆرێک ئازار و ئەشکەنجەی دڵم دەدات.

**٦- گەر بەقووەت، عەسکەری شاهان جەهانگیریی دەکەن**
**دڵبەرم تەنیا بەیەک غەمزە، جەهانداریی دەکا**

قووەت: هێز، دەسەڵات و توانا.

عەسکەر: سەرباز.

جەهانگیریی: جیهان بەڕێوەبردن.

واتە: ئەگەر فەرمانداران و دەسەڵاتداران، لە ڕێگەی سەرباز و هێزی سوپا و لەشکری

زۆرەوە، دەسەڵاتی بەڕێوەبردن، بەدەستەوە دەگرن، کەچی دڵبەرەکەی من، هەر بەتەنیا یەک نوارینی چاوە ڕووناکەکانی، هەموو جیهان داگیر دەکات؛ واتە: هەموو جیهان بەچاوە وەک هەتاوەکانی ڕووناک دەکاتەوە.

**٧- مەنعی عاشق بۆ دەکا؛ عاقڵ لە عیشقی دڵبەران**
**عاشقی بێچارە چ بکا؟ حوسنە ناچاری دەکا**

بێچارە: بێ دەسەڵات.

حوسن: جوانیی.

واتە: خەڵکی ژیر و هوشیار و زانا، بۆ ڕێگریی و سەرزەنشتی عاشق، لە عەشقێنی دەکەن!؟ کە بۆچی خۆیان گیرۆدەی دەردی دڵداری دەکەن!. بەڵام ئەو خەڵکە ژیر و زانایانە دەبێ لەوە بگەن، کە عاشق بەدەست خۆی نییە، وا تووشی ئەوینداریی دەبێ، بەڵکو جوانیی یار و دڵبەرە، کە بەرامبەرەکەی وا لێ دەکات ناچاری گیرۆدەبوونی ببێ... لەبەرئەوە بەدەست خۆیان نییە، بەڵکو تاوانی ئەو شۆخ و شەنگ و جوانانەن، کە دەسەڵاتی مرۆ، لە دەست خۆیدا ناهێڵن.

«سالم» دەڵێ:

١- قەراری «عاشق» و «قانوون» و «حیکمەت»، ضدی یەک هاتن
کە تەسکینی برینی دڵ، بەنەفحەی زوڵفی مشکین بوو
«١٠٩»

٢- کە سوڵتانی خەیاڵت بێتە خاتر
دەبێ شاهی خیرەد مەیلی سەفەر کا
«٣٠»

**٨- پێم دەڵێن: شیعری «ئەدەب»، یا سیحرە، یا جادوو، بەڵێ**
**شیعری من: جادوو بەیادی چەشمی سەححاری دەکا**

چەشم: چاو.

سەححار: جادووگەر، ئەفسوونگەر.

واتە: خوێنەرانی شیعرم، پێم دەڵێن ئەم شیعرانەی تۆ، یەکجار سەیروسەمەرە و سیحراویی و پڕ لە ئەندێشەن، ئەوە بۆ شیعرەکانت ئەوەندە کاریگەر و ڕاکێشەری هەست



و چێژ و ئارەزوون؟... لە وەڵامدا پێیان دەڵێم: شیعرەکانم چونکە بەیادی چاوی پڕ سیحر و ئەفسانەی دڵبەرەکەمەوە نووسیومن، ئەوا هەر زەبری سیحری چاوەکانی یار، لە شیعرەکانمدا ڕەنگیان داوەتەوە و خۆیان دەنوێنن.

(لێرەشدا «ئەدەب» دیسانەوە ستایشی شیعرەکانی خۆی دەکا و چاوی سیحراویی یارەکەی دەکاتە بیانووی هەڵکشانی پلە و پایەی هونەری شیعرەکانی: کە دیارە لە لایەکەوە لە ڕۆژگاری خۆیدا، شیعرەکانی لای خوێنەران، پەسەند و ڕێز لێ گیراوبوون و لە لایەکی تریشەوە ئەوە دەردەخات، کە هەر ئەو دەمانە، شێوازی شیعرەکانی، لای خوێنەرانی، بابەتێکی نوێ و سەرنج ڕاکێش بوون).

١٤

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلات) وەک نموونەی:

١- پوڕ ب وان جەرحان کو تیرن لەو کو دێ دەرمان دکر
شـەربەت ئابا حـەیاتێ شـەککەر و قـەند و گـولاب
«مەلای جزیری، ٧٨»

٢- لێم حـەرامـە دانە و ئاوی حـەمـامـاتی حـەرەم
من کە بازی دیدە بازم، نەک شـەوارەی دەسـتەمـۆم
«نالی، ٣٠١»

٣- من کە شەهبازی شکار ئەندازی شاهیم پێ دەڵێن
حەیفە با ئاهەنگی جەنگی سەرگەڕ و لەقلەق نەکەم
«شێخ ڕەزا، ٧٥»

**١- ڕوومەتت بەدری مونیرە، پەرچەمت وەک مشکی ناب**
**لەو: خەجاڵ مـا ئافتـاب و لەم: شکا قـەدری گوڵاب**

بەدر: مانگ.

مونیر: درەوشاوە، ڕووناک، گەش.

ئافتاب: هەتاو، خۆر.

گوڵاب: گوڵاو.

واتە: ڕوومەت و کوڵمەکانت، هەر دەڵێی مـانگی درەوشاوەن و کاکۆڵەکانیشت پڕن لە بۆنی خۆشی میسک. لەبەرئەوە هەتاو لە بەرامبەر ڕوومەت و کوڵمەکانتدا شەرمەزارە و خۆی دەشارێتـەوە و گـوڵاویش لە شـەرمی بۆنی خۆشی میـسکی کـاکۆڵەکـانت، ڕەـێن و برەوی نەماوە.

**٢- عیـشقی تۆ، دەمسـازە بۆمە، گەر فیـراقە، گەر ویسـاڵ**
**نوتقی تۆ: جان بەخشە بۆمە، گەر خیتابە، گەر عیتاب**

دەمساز: هاوڕاز، هاوڕێ.

فیراق: لێکدابڕان و دووریی.

ویساڵ: پێچەوانەی فیراقە و بەمانای بەیەک گەیشتن و دیدار و یەکتر بینین.



نوتق: قسە، گفتوگۆ، ئاخاوتن.

جان بەخش: مایەی زیندووکەرەوەی گیان و ڕۆح.

خیتاب: قسە و وتووێژ.

عیتاب: گلەیی، سەرکۆنە.

واتە: مـادام عـیشقی تۆ، هەمـیشە لەتەکمدایە، ئیتر بەلامەوە گرنگ نییـە لێم دوور بیت، یان لێم نزیک بیت و قـسـە و ئاخـاوتنیـشت چونکە گـیـانبـەخشن، ئیـتر ئەگـەر قسـەکانت، هەر قسەی ئاسایی بن، یان گلەیی و سـەرکۆنە، بەلامەوە گرنگ و شیـرینن و وەک یەکن و ئەوانیش هەر هی تۆن... هەرچیش هی تۆ بێ، هەر خۆش و شیرین و پیرۆزن.

«مەحوی» دەڵێ:

خیـتابت هەر عیـتابە، ئەو لەبە بێتە قسـە، هەر کەس
مـوخـاتەبتـە، دەکـا دەردم: زوبانی گـفـتـوگـۆ غـایب
«٥٢»

**٣- گەر حیـجابی عیـسمەتە، یا حەسرەتە بۆ منی هەژار**
**مەعجەرت لادە لە ڕوو تۆ، وەختە هەڵگیرێ حیجاب**

حیجاب: چارشێو، سەرپۆش.

مەعجەر: (پێشتر وتمان) ڕووبەند، سەرپۆش.

واتە: ئەگـەر لەبـەرئەوە چارشـێـوت پۆشـیـوە، کـە نیـشـانەی پاکیـتـە، یان بۆ زیاتر شەیدابوونی من و زیاتر بوونی حەسرەتم، تکا دەکەم کە چارشێوەکەت هەڵگریت، چونکە ئیتر وەختی ئەوە هاتووە چارشێوەکەت هەڵگریت.

هەڵبـەتە ڕسـتـەی «وەخـتـە هەڵگـیـرێ حـیـجـاب» دەکـرێ بەچەند خوێندنەوەیەک لێک بدرێتەوە:

١- نێوانی من و تۆ، گەیوەتە ئەوەی لای خەڵکی ئاشکرا بووین و بەنێوانی دڵداریمانیـان زانیوە.

٢- سـەرەتای ئەوەش دەرکـەوتـووە، بیـروباوەڕی کـۆن پارێزیی نەمـێنێ و خـەریکە باوی چارشێوش نامێنێ.

٣- نێوانی من و تۆ، گەیوەتە ئەو نزیکییەی ئیتر بەبێ «چارشێو» بەیەکەوە دانیشین.

**٤- با غەریقی بەحری هیجرت بم، وەکو نیلوفەریش**
**دوور بەدوور خۆ هەم بەرابەر: بەو جەمالی ئافتاب**

غەریق: خنکاو، نقوم بوو.

بەحری هیجر: زەریای دووری و لێک دابڕان.

نیلوفەر: لاولاو ئاویی.

واتە: لێکدابڕانی من و تۆ، وەکو لە یەکتر دووربوونی نیلوفەر و هەتاوە؛ چونکە نیلوفەر سەرەڕای ئەوەی لە ئاودا نقوم بووە، کەچی لە مەودای دووریی نێوان خۆی و هەتاوەوە، هەر چاوی لە خۆرە و هەر بەتیشکی خۆریش دەژی... منیش ئەگەرچی لە تۆ دوورم، وا هەست دەکەم، خەریکم لە زەریای دووریتدا نقوم دەبم، بەڵام هەر چاوێکیشم لە هەتاوی ڕووی تۆیە و هەر بەهیوای ڕووی گەش و بژوێنەری تۆ دەژیم.

**٥- بێ حسابن کوشتەیی پەیکانی غەمزەی چاوەکەت**
**گەر وەکو ئەمثالی ئێمە، بێنە سەر حەد و حیساب**

بێ حسابن: لە ژمارە و ئەژمار نایەن (ئەوەندە زۆرن).

کوشتە: کوژراو.

واتە: ئەوانەی کەوتوونەتە بەر تیری تیلەی چاوەکانت و بەو تیلانەی چاوت زامدار بوون، لە ژمارە نایەن، بەتایبەتی ئەگەر ئەوانەیان ئەژمار بکەین، کە وەک ئێمەمانان پێکراو ئەنگێوراون.

**٦- تەوسەنی خۆت ڕامە بۆ ئەغیار؛ چی بێ، ئەی عەجەب!**
**گەر دەگاتە بەختی مە، سەرکەشێکە، بەد ڕیکاب**

تەوسەن: سلۆک، سەرکێش (بۆ مایین و ئەسپی تۆڕ و هێشتا نەگیراو بەکار دەبرێ).

ڕام: هۆگر، ماڵیی، دەستەمۆ.

ئەغیار: نەیار، نادۆست (دوژمن).

سەرکەش: پێچەوانەی: هۆگر و دەستەمۆ و ماڵیی، تۆڕ.

بەد: خراپ.

ریکاب: ئاوزەنگی.



واتە: ئەو سلۆکیی و سەرکەشیی و دوورەپەرێزییەی بەرامبەر من نیشانی دەدەیت؛ پێم سەیرە، کە بۆ نەیاران وا نیت و لای ئەوان: زۆر هۆگر و ئارام و ڕامیت. کەچی هەرکە من دەمەوێ تاقیت بکەمەوە؛ سلۆک و سەرکێش و تۆڕ-یت و وەک مایینی تۆڕ، نایەڵیت پێ بنرێتە سەر ئاوزەنگیت و ئاوزەنگی نادەیت.

«نالی» دەڵێ:

دەچێ بۆ لای ڕەقیب، خۆشە؛ وەلێ ئەو دەردە کوشتوومی:
لەکن ئەو چەندە مەجبوورە، لە لای من چەند مەغروورە
«٤٠٨»

**٧- هێندە ڕاوێستا لە داوێن: ئاوی فرمێسکی فیراق**
**بۆیە وێستا؛ ئەشکی دیدەم، قەترەیەک و سەد حوباب**

ئەشک: فرمێسک، ئەسرین.

قەترە: دڵۆپ.

حوباب: ئەو بڵقە ئاوەی کە لە ئاکامی دڵۆپە ئاوی ترەوە دروست دەبێ.

واتە: ئاوی ئەسرینی دووریی، ئەوەندە زۆرە، لە کەنارمدا گۆلاوێکی دروست کردووە؛ لەبەرئەوە ئێستا هەر دڵۆپێکی تازە لە چاوانم دادەوەرێن و دەکەونە ئەو گۆلاوەوە، سەد بڵق دروست دەکەن.

«سالم» دەڵێ:

لە ئەشکی سوور و سوێری خۆم؛ دەبینم
گوڵستانێ، لە خاکی شۆرەزارا
«٢٥»

**٨- طورەیی شەوڕەنگ و خەتتی سەبز و زوڵفت کافییە**
**بۆ عەزابی مە، چ لازم: بەند و زنجیر و طەناب**

طوڕە: کاکۆڵ، پەرچەم.

شەوڕەنگ: ڕەش وەک ڕەنگی شەو.

سەبز: سەوز.

کافییە: بەسە.

واتە: ئەگەر هەر مەبەستتە ئازاری من بدەیت؛ خۆ هەر شێوەی پێستی سەوزەت و کاکۆڵی یەکجار ڕەشت، بەسن بۆ ئەوەی ئازاریان پێوە بکێشم، ئیتر چ پێویستت بەکەرەسەی تری وەک زیندان و زنجیر و سێدارە هەیە!؟.

**٩- بۆ نیثاری مەقدەمت، لەکنم عەزیزە: جانی خۆم**
**بۆیە بۆ ئیثاری جانی خۆم هەمە هێندە شەتاب**

نیثار: دیاری، شاباش، پێشکەشی.

مەقدەم: پێشوازیی هاتن.

جان: گیان.

شەتاب: هەڵپە، هەڵەداوان، پڕتاو.

واتە: هیچ شتێکم بەلاوە، ئەوەندەی گیانی خۆم پێ شیرین و پیرۆز نییە. بۆیە بۆ پێشوازیی هاتنت، هەر هەڵپە و هەڵەداوانی ئەوەمە، بەڵکو کە تەشریفت هات، گیانی خۆمت بۆ بەشاباش و دیاری، پێشکەش بکەم.

**١٠- لەو دەمەی هاتوومە دەرگاهت، بەئومێدی نیاز**
**غەیری بارانی سریشکی خۆم نەدی قەت فەتحی باب**

دەرگاه: دەرگا، دەروازە، ئاستانە.

غەیری: بێجگە.

سریشک: فرمێسک، ئەسرین.

فەتحی باب: دەرگا کردنەوە.

واتە: لەو کاتەوەی بەو هەموو هیوا و خۆزگەیەوە، ڕووم لە ئاستانە و دەروازەی بەزەیی تۆ کردووە، هەر دەگریم و دەگریم و سووچێکی دەروازەی هیوام لێ ناکرێتەوە.

**١١- دڵبەرا! بێ میهری تۆ، ڕۆژ و شەوی تارە «ئەدەب»**
**با وجوودی لوتفی تۆ، گەر دۆزەخە: نِعْمَ المآب**

دڵبەرا: ئەرێ دڵبەرەکەم!.

میهر: میهرەبانی، سۆز، دڵنەرمیی.

تار: تاریک، ڕەش.



با وجوودی تۆ: بەهۆی تۆوە، بەتۆوە.

نعم المآب: خۆشترین جێگە.

واتە: ئەرێ گیانەکەم! ئەگەرچی بەسۆنگەی بێ سۆزیی و کەمتەرخەمیی تۆوە «ئەدەب» ڕۆژ و شەوی لێ بۆتە شەو و وەک ئەوە دەژی، کە لە دۆزەخدا بێ، بەڵام مادام ئەم ژیان و دنیایە، تۆی تێدایت، خۆشترین جێگەیە.

## ١٥

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن) وەک نموونەی:

١- جەورێ هیندێ دێ کشینت هەر کەسێ تاووس دڤێت
گەوهەر و دوڕرا یەتیم بێ تەرکێ سەر تێتن طەلەب
«مەلای جزیری، ٧٦»

٢- تۆ ئەگەر هەستی، لە جێ ڕاوەستی، دێو و کافریش
دێن دەڵێن بەخودا قیامەت، ڕاستە هەستانی هەیە
«نالی، ٥٧٧»

٣- راحەتی قەلب و وجوود و عیززەتی نەفسم نەما
وەختی مەرگە، حافظی ئیمان و دینم ڕەحمەتێ
«حەمدی، ١٧»

**١- بۆ حیجابی عیسمەتی چیهرە، لە قورصی ئافتاب**
**پەردەیی گێسوو، لەسەر خورشیدی ڕوو، بۆتە نیقاب**

حیجاب: چارشێو.
عیسمەت: پاکیژەیی.
چیهرە: ڕوخسار.
قورصی ئافتاب: بازنەی خڕی هەتاو.
گێسوو: بسک.
خورشید: خۆر.
نیقاب: ڕووپۆش، سەرپۆش.

واتە: بۆ ئەوەی ڕوخساری وەک هەتاوی، لەگەڵ هەتاودا جوێ بکرێتەوە، بسکەکانی بەڕوخساری پاکیژەیدا داوە و بەمەش پەردەیەک لە نێوان ڕوخساری یار و هەتاودا دروست بووە، تا هەتاوی ڕووی یار و هەتاوی ئاسمان تێکەڵ نەبن و جیاوازیی لە نێوان ڕووناکییاندا بکرێ و بزانرێ کامیان ڕووناکترن.



**٢- کەوتە داوی زوڵفی قوللابت: دڵی ئازادی من**
**.................................................................**

سەرنج: وەک پێشتریش لە جێگەی خۆیدا ئاماژەمان پێ کرد، ئەم نیو بەیتە لە «مس»دا جێگەکەی خاڵییە، بەڵام لای «بم» ئاوا نووسرا بوو: ماسی تی کردە نامە هەڵبێن، وەر نییە طەناب». لای «گم»یش ئاوا بوو: «ماسی پێ گیراوە، نامە هەڵێین وەر نییە طەناب». لای «شج»یش نەبوو. بۆیە لە هەموویان بەگومان بووم و چونکە خۆمیش بۆم ڕاست نەکرایەوە، بۆیە بەچاکم نەزانی بەو شێوە تەماوییە بۆ ئێرەی بگوێزمەوە و شێواندنەکە دووبارە بکەمەوە. بەڵام هەروەکو ئاگادارییەک، بەپێویستم زانی ئاماژە بەبوونی ئەم بەیتە و بەم شێوەیەی بکەم.

**٣- هادیی دڵمە غورابی زوڵفی تۆیە و ڕوومەتت**
**ئاخری خێر، ڕەهڕەوێکی؛ ڕاهنمایی کا: غوراب**

هادیی: ڕێ نیشاندەر.
غوراب: قەلەڕەش.
ڕەهڕەو: ڕاڕەو، ڕێگە.
ڕاهنمایی: ڕێنوێنی.

واتە: کاتێ دەمەوێ سەیری ڕوومەتە گەشەکانت بکەم، بسکە ڕەشەکەت، کە لە ڕەنگی قەلەڕەشە دەچێ، ڕوومەتەکانتی داپۆشیوە، بۆیە دەبێ دەرفەت لە دیتنی کوڵمەکانت بهێنم... ئیتر ئەم پێویستییەم بەم ڕێنوێنی کردنەی بسکەکانت، کە ڕەشایی (قەلەڕەش) ڕێنوێنمە، خوا بەخێری بگێڕێ، نازانین بەرەو کوێمان دەبات!.

**٤- گەر لە لوتفت کۆتەهە: دەستی وەفا، بۆ حاڵی من**
**کۆتەهی ناکا لە من؛ زوڵفی درازی تۆ: عیتاب**

کۆتەه: کۆتایی، درێغی، کەمتەرخەمیی.
دراز: درێژ.
عیتاب: گلەیی و سەرکۆنە.

واتە: من هەرگیز لێت بێ ئومێد نیم، چونکە ئەگەر لوتف و میهرەبانییشت لەگەڵمدا،

دریغی و کەمتەرخەمیی بکەن و وەفاداریم لەگەڵدا نەنوێنن. بەڵام بسکە دریژەکانی تۆ، هەرگیز منیان لە یاد نەکردووە و دریغییان نەکردووە؛ بەوەی هەمیشە گلەییەکانی خۆیان لە شێوەی گرژیی و لوولیی خۆیاندا، بەرامبەرم دەردەبڕن.

وەک سەرنج دەدەین ئەم پڕ هیواییەی «ئەدەب» لە زوڵفە ڕەش و گرژ و لوولەکانی یار، لە هەمان کاتیشدا خۆی گلەییە لە یار، کە هەر شێوەی نیشاندانی زوڵفەکانی یار، بەو چەشنە، ئاماژەیە بەوەی، کە بسکەکانی خۆیان لە شاعیر «ئەدەب» گرژ و لوول کردووە و بوونە سۆنگەی شاردنەوەی ڕوخساری یار و بسکەکانی، وەک شێوەی گلەیی و سەرکۆنە، وێنە کێشاوە.

**٥- گەر مەگەس ڕێی نیشتنی قەندی لەبی تۆی بدەنێ**
**تا بەڕۆژی ڕەستەخێزیی، شەککەر ئالوودە لوعاب**

مەگەس: مێش.

ڕەستەخێز: هەڵسان، هەڵسانەوە، (ڕۆژی قیامەت).

ئالوودە: تێکەڵ بە: خوویەک، بەنەخۆشییەک؛ کە هەمیشە دەبێ لەگەڵ واژەیەکی پێش خۆی، یان دوای خۆیەوە مانای تەواو بدات، وەک ئەوەی لێرەدا لە پێش خۆیەوە واژەی «شەکر» هەیە و پێکەوە مانای: «بەشەکربوو، یان: شەکراویی» دەگەیەنن.

لیعاب: لیبیک.

واتە: ئەگەر هەر بەتەنیا یەک جار، مێشێک بۆی هەڵکەوێ و دەرفەتی پێوە نیشتنی لێوی شەکرینی تۆی دەستگیر ببێ، ئیتر ئەو مێشە، تا ڕۆژی حەشر، هەر لیبیکێک لە دەمی بتکێ، لیبیکێکی شەکراوی و شیرین دەبێ.

«حەریق» دەڵێ:

چۆن دەکەی مەنعی دڵی من، تۆ لە شەهدی لێوی خۆت
لێوی تۆ وەک شەکرستان و دڵی من وەکی مەگەس
«٢٦»

«ئەوڕەحمان بەگی بابان» دەڵێ:

بەجارێ مەستی کردم: بۆسەیێکی ئەو دەم و لێوە
مەگەر لیبیکی دەمی ئەو دڵبەرە، شیلەی ڕەگی مێوە!



**٦- مەرگی تۆ، تا ڕۆژی مردن، زەحمەتە من هەڵگرم**
**دڵ لە: دڵبەر، دەست لە: ساقی، لەب: لەسەر جامی شەراب**

واتە: سوێند بەمەرگی تۆ، زۆر پێم سەختە، تا ئەو ڕۆژەی دەمرم، بتوانم دەستبەرداری ئەم شتانە ببم: دڵبەرم لە دڵمدا نەهێڵم، واز لە مەیگێڕ بهێنم، لێویش لە جامی بادە دوور بخەمەوە.

**٧- هێندە ڕاوەستا لە داوێن؛ ئاوی فرمێسکم بەکوڵ**
**گەر بەخوڕ بێ، ئەشکی دیدەم، قەترەیەکی سەد حوباب**

نموونەی ئەم بەیتەمان لە غەزەلی ژمارە (١٤)، بەیتی (٧)دا شەرح کردووە، کە کوتومت لەیەک دەچن.

**٨- بۆ نەشاطی بەزمی مەستانت، لە لوتفی تۆ: «ئەدەب»**
**چونکە سینە ناڵەزارە، دەنگی دێ هەروەک: ڕوباب**

نەشاط: چالاکیی.

سینە: سنگ.

ناڵەزار: لە دوو بەشی: ناڵە + زار دروست بووە، وەک شێوەی دروستبوونی «گوڵزار، لالەزار، گوڵعوزار...» و بەهەردوو بەشەکەش مانای: ناڵین + زار پێکدێنێ، کە دەبێتە: ناڵگلە، شوێنی ناڵین.

ڕوباب: ئامێری مۆسیقایی.

واتە: «ئەدەب» لەبەر خۆش ڕاگرتنی کۆڕی بەزمی سەرخۆشانی تۆ، خۆی کردۆتە مایەی شادی خۆشیی بەخشین بەئامادەبووانی کۆڕەکەت و ئێستا سنگی خۆی کردۆتە جێگەی ناڵین و ناڵینەکەیشی خۆشە، تا ئامادەبووان پێیان خۆش بێ، بۆ دەنگی ناڵینی سنگی، وەک دەنگی ڕوباب ژەندنە.

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلات) وەک نموونەی:

١- عشق دەردەک بێ طەبیبە    لێ مەفا وەسلا حەبیبە
کوشتمە جەورا ڕەقیبە    پوڕ لەعەینێ ڕووسیایە
«مەلای جزیری، ٥٢٣»

٢- هاتەوە ئاشووبی دەوران مەردی مەیدان هاتەوە
شێری یەزدان، لەندەهووری ئیبنی سەعدان هاتەوە
«شێخ ڕەزا، ١٠٩»

٣- جوملە ئەجرامی سەماوی چاکر و سوڵتانە ڕۆژ
باعیسی بوونی گیاه و کافەیی حەیوانە ڕۆژ
«حەمدی، ٧٤»

**١- چەشمی تۆ؛ مەستی شەراب و حاڵی خەمبارم خراب**
**چیهری تۆ؛ پشکۆی نار و سینەیی زارم کەباب**

چەشمی تۆ: چاوی تۆ.
چیهری تۆ: ڕوخساری تۆ.
زار: گریان، خەم، لاواز.

واتە: زۆر سەیرە! چاوەکانی تۆ بادەیان نۆش کردووە و مەستن، کەچی بادەکەیان منی شێواندووە و ڕوخساریشت ئەوەندە گەرمە، دەڵێی پشکۆی ئاگرە، بۆیە دڵم، کە لە ناو سنگمدایە و بۆ کوڵم و ڕوومەتت دەنواڕێ، دەڵێی کەبابە و لەسەر ئاگر دانراوە.

**٢- جیسمی مە و دوو سونبولت: دوو هەمسەرن مایل بەتاو**
**بەختی مە و دوو نێرگست: دوو تەوئەمن مایل بەخواب**

جیسم: لەش، تەن، جەستە.

سونبول: گوڵەگەنم، لە هەمان کاتدا جۆرە گوڵێکە لە پێش نەورۆزدا پەیدا دەبێ، بەڵام لێرەدا مەبەست لە قژ و پرچی یارە.



هەمسەر: هاوسەر.
مایل: ڕووەو، بەرەو.
نێرگس: مەبەست لە چاوی یارە.
تەوئەم: دووانە، جمکانە.
خواب: خەو.

واتە: جەستەی ئێمە و هەردوو بسکەکانت، دەڵێی جووتە هاوسەرێکن، ئارەزوویان هەر لە ڕووەو خۆر و ڕووناکیی کوڵمەکانتە؛ بەختی ئێمە و چاوەکانیشت، وەک دووانە و جمکانەن، کە هەردوو لایان ئارەزوویان هەر لە خەوە؛ یان دەڵێی هەمیشە مەستن و چاومان خەواڵووە و زەبری مەی بەری نەداون. (هەڵبەتە «ئەدەب» مەبەستی لەوەیە، کە چاوەکانی یارەکەی هەمیشە شێوەیان مەستە).

«نالی» دەڵێ:

بەنەشئەی سستیی و مەستیی، وەها مەستوور و مەخموورە
نزانم خەو لە چاوتدایە، یا چاوت لە خەودایە!
«٥٥٧»

**٣- غەیری چەشمی فیتنەزا، وا خاڵەکەی دونبالەیە**
**ذو ذەنەب؛ کێ دی تلووعی بێ، بەقورصی ئافتاب!**

غەیری: جگە، بێجگە.
فیتنەزا: مایەی فیتنە، کانگای ئاژاوە، پڕ لە فیتنە، پڕ لە دەردەسەریی.
دونبالە: شوێن کەوتوو، بەشوێندا چوو.
ذو ذەنەب: کلکدار. (هێمایە بۆ خاڵ).
تلووع: دەرکەوتن، ئاشکرابوون.
قورصی ئافتاب: بازنەی خۆر، خۆری بازنەیی (مەبەست لە چاوی یارە).

واتە: چاوەکانت هەتاون و خاڵەکەی لای چاویشت ئەستێرەی کلکدارە، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە، کە چاوەکانت هەرا و ئاژاوەیان بەدواوەیە. ئەگینا جگە لە هەتاوی چاوی پڕ لە دەردەسەریی تۆ؛ هیچ ئەستێرەیەکی کلکدار، بەشێوەی دەرکەوتنی هەتاو، ئاوا بازنەییانە هەڵنایەت.

**٤- گەر سەری ڕشتەی، بەدڵ ڕەبتی نییە!، بۆچ ئەی صەنەم**
**تا کەمێ زوڵفت دەشێوێ، من دەکەومە ئیزتیراب!؟**

ڕەبت: پێوەندی، سەروکار.

صەنەم: بت.

ئیزتیراب (اضطراب: عەرەبی): دڵەخورپە و مەترسیی.

واتە: ئەگەر سەرە داوەکانی قژ و بسکی تۆ، پێوەندی و سەروکاریان بەدڵی منەوە نەبێ و جەمسەرەکانیان لە دڵی مندا نەبن، بۆچی هەر ئەوەندەی تۆسقاڵێک، سەروقژی تۆ تێکدەچێ، دڵی من دەکەوێتە دڵەخورپە و هەناسەبڕکێ!؟.

**٥- بێ سەبەب خۆم کوشت ئەمن، بێ تۆ، لە دووریی ڕوویی تۆ**
**نە گوناهی کەوتە سەر تۆ، نە بەخۆمی بوو ثەواب**

سەبەب: هۆ، سۆنگە.

ثەواب: پاداشت، خەڵات، چاکەدانەوە.

واتە: وا دیارە بەهەوانتە و بەخۆڕایی، لەسەر تۆ، خۆم بەکوشتن دا، چونکە لە کاتێکدا لەبەر دووری ڕوخساری تۆ، خۆم بەکوشت دا، کەچی ئاکامی کوشتنەکەم، هیچی تۆی نەگرتەوە و خۆت لێ نەبان و لێ بێ بەریی کردم، بۆیە تۆیان وەک تاوانبار، لە بەرامبەر کوشتنەکەی مندا، نەخستە بەر لێپرسینەوە و منیش هیچم پێ نەبڕا و بەتۆش نەگەیشتم.

**٦- دڵ وەها ئۆگر بەزوڵفە، ساعەتێ بێی ناسرەوێ**
**تا سەرئەنجامی چییە، ئەو سوحبەتەی کەبک و عوقاب**

ئۆگر: هۆگر.

سوحبەت: گفتوگۆ، ئاخاوتن، مشتومڕ.

کەبک: کەو (هێمایە بۆ دڵ).

عەقاب: هەڵۆ (هێمایە بۆ بسکی یار).

واتە: دڵی من، کە هەر دەڵێی کەوە و بسکەکانی تۆش، کە هەر دەڵێی هەڵۆن؛ کەچی سەیر ئەوەیە ئەو دڵەم ئەوەندە هۆگری هەڵۆی بسکەکانتە (مەبەست لە ئەڵقەی سەری زوڵفەکانە، کە وەک چنگ و نینۆکی هەڵۆ، گرژبوونەتەوە)، هەمیشە سەری ڕازی دڵ و



قسە و گفتوگۆی بەردەوام، لەگەڵ هەڵۆی بسکەکانتدا دادەمەزرێنێ و دەربەستی ئەوە نییە ئاکامی ئەو قسە و گفتوگۆیانە بەرەو کوێ دەچن و چۆن دەرەقەتی ئاخاوتنی هەڵۆ دێت! (کە دیارە مەبەست لە ئاکامی ئاخاوتنی کەو و هەڵۆ؛ هەر بەزینی کەو و سەرکەوتنی هەڵۆی لێ دەکەوێتەوە).

**٧- گەر لە بێ میهری خیتابی تۆ، دەگەڵ ئەغیارە، قەت**
**کۆتەهی ناکا لە من، زوڵفی درازی تۆ: عیتاب**

میهر: دڵنەوایی، خۆشەویستی، سۆزداریی.

خیتاب: ئاخاوتن، گفتوگۆ.

ئەغیار: نەیار، نادۆست، بیانیی، دوژمن.

کۆتەهی: درێغی، کەمتەرخەمیی.

دراز: درێژ.

عیتاب: گلەیی، سەرکۆنە.

(ئەم بەیتە نزیکە بەبەیتی ژمارە «٤ی غەزەلی ژمارە ١٥»ی پێشوو، لەوێش شەرحمان کردووە و پێویست بەدووبارە لێکدانەوە ناکات).

**٨- ڕشتەی قەهرت لە مل خستم، دەڵێی بۆ کوێ دەچی!**
**تۆ دەزانی مەقسەدم، جانا، بەدەست تۆیە طەناب**

ڕشتە: داو، دەزوو، پەت، جڵەو، ڕەشمە، ڕەسەن، تەناف، بەش (بەڵام لێرەدا ماناکانی سەرەتای مەبەستە).

مەقسەد: مەبەست، نیاز، ئاوات.

جانا: گیانەکەم.

طەناب: تەناف.

قەهر: ڕق، کینە، دڵڕەقیی.

واتە: خۆت، بەدەستی خۆت، ڕەشمەی دڵڕەقیی خۆتت لە گەردنم خستووە و بەئارەزووی خۆت و بەمەبەستی خۆت، بۆ هەر جێگەیەک، کە خۆت دەتەوێ، ڕامدەکێشیت، کەچی سەیر لەوەدایە هەر خۆشت لێم دەپرسیت: بۆ کوێ دەچیت!؟.

**٩- شۆری عیشقت، کەوتە سەر عوششاقی بێ بەرگ و نەوا**
**بۆیـە بێ پەردە دەناڵـێنن، وەکـــو تـار و روبـاب**

شۆر: هەڵڵا و بگرە، هەرا، هاوار، هەڵچوون، ئاژاوە، پشێویی؛ لە هەمان کاتدا ناوی یەکێکە لە (٧) دەسگاکانی مۆسیقای ئێرانی. بەڵام لێرەدا وەک مانایەکی مەجازیی ئەمیانی مەبەستە.

واتە: هەڵڵا و هەرا و هەڵچوونی عیشقی تۆ، بەسەر دڵدارانی ڕووت و ڕەجاڵی خۆتدا کەوتوون، بۆیە ئێستا ئەویندارن، بەئاشکرا و بێ شاردنەوە، وەک تاری ئامێری روباب، هەر دەناڵێنن. دەشگونجێ مانای دووەمی ئەم نیوە بەیتەی دوایی بەمجۆرەش لێک بدرێتەوە: بۆیە ئەویندارانی خۆت، بێ ئەوەی دەربەستی یاسای ژەندنی ئامێری «تار» و «پەردە»کانی بن، بێ پەروا کەوتوونەتە ژەندنی ئامێری مۆسیقایی روباب.

**١٠- مـــەرگی تۆ، تا وەقـــتی مـــردن؛ زەحـــمـــەتە هەڵگرتنم**
**دڵ: لە عیشق و دەست لە: ساقی، لەب: لەسەر جامی شەراب**

(ئەم بەیتە وەک بەیتی ژمارە «٦ی غەزەلی ١٥»ی پێشوو وایە و لەوێ شەرحمان کردووە و لێرە پێویست بەدووبارە شەرحکردنەوەی ناکات).

**١١- ذایقـەی بۆسـەی لەبم بێ، بۆچمـە جـامی صـبـوح**
**ڕایحەی طوڕەی ئەتۆم بێ، چم لە نافەی مشکی ناب!**

ذایقە: تام، چێژ، کام.

بۆسە: ماچ.

جامی صبوح: پێکی بادەی بەربەیانیان.

ڕایحە: بۆن و بەرامە.

واتە: ئەگەر سەرلەبەیانیان، تامی ماچی لێوی بکەم، ئیتر بۆ تەقەللای پەیداکردن و چەشتنی بادەی بەیانیانم هەبێ!؟ دیسانیش ئەگەر بۆن و بەرامەیەکی پرچ و کاکۆڵەکانی تۆم بگاتێ، بۆنی مسکی نایابم بۆ چییە!؟.



**١٢- شیعری من؛ وەجدی چییە بۆ ئەو کەسەی زەوقی نەبێ**
**نەغـمەی بلبل، چ تەفـریحێکە، بۆ مەغزی غوراب!؟**

وەجد: سۆز، شور. (واژەیەکی عیرفانییە).

تەفریح: خۆشیی، دڵشادیی.

مەغز: مێشک.

غوراب: قەلەڕەش.

واتە: کەسێک ئەگەر خۆی چەژی شیعریی و تێگەیشتنی جوان و باڵای لە چەمکی هونەری شیعر نەبێ، چ خۆشییەک لە شیعری من دەچەژێ!. ئەم نموونەیە، هەروەک بەراوردکردنی دەنگی بلبلە، لەگەڵ مێشکی قەلەڕەشدا؛ کە دەنگی بلبل بەو خۆشییە، بەڵام مێشکی قەلەڕەش، چ لەززەتێکی لێ دەچەژێ!؟.

(دیسانەوە لێرەشدا - ئەدەب - بەجەختەوە داکۆکی لە هونەری باڵای شیعری خۆی دەکات).

**١٣- سەد هەزار ئەفسووس بۆ: ئەهلی بیلادی مە: «ئەدەب»**
**قەت نەبوو فەرقی بکەن: کێ زەڕگەرە؛ کێ گـوورەتاب**

ئەفسووس: مەخابن، بەداخەوە.

ئەهل: خەڵک.

بیلاد: وڵات، نیشتمان.

زەڕگەر: زێڕینکار، زەڕەنگەر.

گۆزەتاب: ئەوانەی پیشەی دروستکردنی کاسە و گۆزەی گڵێنەیان هەیە.

واتە: سەد هەزار مەخابن و داخ، بۆ هاونیشتمانیانی ئێمە، کە ناتوانن بەراورد و جیاوازیی لە نێوان کاری وردەکاریی وەک هونەری زێڕینگەرایەتی و پیشەی دروستکردنی گۆزە و دیزەی گڵێنەدا بکەن!.

«نالی» دەڵێ:

شیعری خەڵکی کەی دەگاتە شیعری من بۆ ناسکیی
کەی لە دیقەتدا: پەتک دەعوا لەگەڵ هەودا دەکا؟!
«١٠٧»

١٧

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن) وەک نموونەی:

١- لەشکری قەهر و غەمان وێن چوون حەصارا دل بکن
کەعبە و بَیتُ الحَرامَە لێ ب نوور بێتن ڕەجەب
«مەلای جزیری، ٧٤»

٢- عاشقی بێ دڵ دەناڵێ، مەیلی گریانی هەیە
بێ شکە هەورەتریشقە، تاوی بارانی هەیە
«نالی، ٥٧٢»

٣- من دەزانم کێ لە خشتەی بردوویی، ئەمما چ سوود
سەییدە، سەیید قسەی سووکی دەبێ دەرهەق نەکەم
«شێخ ڕەزا، ٧٦»

**١- یاری مە، بۆ حەسرەتی مە، مووی لە ڕووی کردە نیقاب**
**بێ خەبەر ئەمما کە: سایە، بوو بەزینی ئافتاب**

نیقاب: ڕووبەند.
بێ خەبەر: بێ ئاگا.
سایە: سێبەر.
زیب: جوانیی، ئارایش.
ئافتاب: هەتاو، خۆر.

واتە: یارم بۆئەوەی زیاتر هەڵوەدای خۆیم بکات و زیاتر بەتاسە و حەسرەتی دیدارییەوە، کڵپەی ئارەزووم هەڵچێنێ و ڕووی خۆیم لێ بشارێتەوە، هاتووە بەمووی بسک و قژی، ڕوخسار و ڕوومەت و کوڵمەکانی داپۆشیوە و بەمەش گوایە ڕووبەند بەڕوخساریدا دەدات، کەچی بەو کارەی، (کە بەمووی قژی، ڕوخساری داپۆشێت) ئەوەندەی تر، جوانیی و شیرینی و دیمەنی دڵفڕێنانەی بەڕوخساری بەخشی و ئەوەندەی تر ڕادەی حەسرەت و پەرۆشی ئێمەی، بۆ سەیری ڕوخساری خروشاند.



**٢- هەر فریشتە تەلعەتێک، فەخری بەنووری خیلقەتە**
**هات و ڕووی تۆی دی؛ دەڵێ: «یا لَیْتَني کُنْتُ تُراب»**

فریشتە تەلعەت: ڕوخسار وەک پەری و فریشتە، ڕوخسار جوان، شۆخ و شەنگ.
فەخر: شانازیی.
نووری خیلقەت: ئەو ڕووناکیی و جوانییەی کە خوا دەینەخشێنێ.
یا لَیْتَني کُنْتُ تُراب: خۆزیا بەخاک ببووایەم، خۆزگە دەمردم.

واتە: هەرچی کچانی جوانی وەک فریشتە و پەری جوان، کە شانازیی بەجوانیی و دەرەوشانەوەی کردگار دەکەن، لە ڕوخساری ئادەمیزاددا، هەر ئەوەندەی تۆسقاڵێکیش چاویان بەجوانیی تۆ بکەوێ، کە کردگار چۆن دەرەوشانەوەی جوانیی خۆی پێ بەخشیویت، یەکسەر حەسرەتی مەرگی خۆیان هەڵدەکێشن و دەڵێن دەک عەمرمان نەمێنێ و ئێمە، لە چاو ئەم جوانییەدا، هەر بۆ مردن چاکین.

**٣- لەو دەمەی عەتری سەری گێسووی تۆ، هاتە مەشام**
**کێیە مننەت هەڵگرێ! ئیدی لە عەنبەر، یا: گوڵاب**

لەو دەمەی: لەو کاتەدا.
گێسوو: بسک، زوڵف.
مەشام: شوێنی بۆنکردن، لووت.
گوڵاب: گوڵاو.

واتە: لەو کاتانەدا، کە بۆنی گوڵاوی بسکەکانی تۆ، بەلووتی خەڵک دەگا، ئیتر هیچ کەسێ مننەتی بۆنی عەنبەر و گوڵاوی ئاسایی هەڵناگرێ و بۆنی خۆشی بسکەکانی تۆی بەسە.

**٤- کۆمەڵێ خاڵن، وەدەرکەوتن لە تەختی سینەدا**
**یا نومایان عیقدی پەروین لە شوعلەی ماهتاب**

نوما (نومایان): ئاشکرا، بەبەرچاوەوە.
عەقدی پەروین: کۆئەستێرە.
شوعلە: بڵێسە، مەشخەڵ.
ماهتاب: مانگ.

واتە: ئەو کۆمەڵە خاڵەی لە تەختایی سنگتدا دەردەکەون، داخۆ ئەوانە کۆمەڵە خاڵن، یا کۆئەستێرەن و لەبەر بلێسە و تریفە و درەوشانەوەی مانگدا خۆیان پیشان دەدەن!؟.

«وەفایی» دەڵێ:

سەبا زوڵفی پەرێشان کرد، بەڕوخساری عەرەقناکی
چە شیرینە لەگەڵ یەکدی، مەهـ و پەروین، کە شەو دایێ
«١٦٥»

**٥- مێش ئەگەر جارێ بنیشێ، لەو لەبی وەک قەندی تۆ**
**تا بەڕۆژی مردنی؛ هەر شەککەر ئالوودە لوعاب**

سەرنج: نموونەی ئەم بەیتەمان لە غەزەلی «١٥، بەیتی ٥»دا لێکدایەوە، پێویست بەدووبارە شەرحکردنەوە ناکات.

**٦- ئەی عەجەب حوققەی دەهەنت و ئەو ددانی گەوهەرین**
**چۆن لە ناو نوقتێکە پەنهان، سی و دوو دوڕی خوشاب**

حوققە: سندوقچەی یەکجار بچووک، کە ئافرەتان زێڕ و خشڵی خۆیانی تێدا دەنێن.

دەهەن: دەم، زار.

نوقتە: خاڵ.

پەنهان: شاردراوە.

دوڕی خوشاب: گەوهەری سپی (مەبەست لە ددانەکانی یارە).

واتە: ئەوە جێی سەرسوڕمانە، کە ئەو سی و دوو ددانەت، کە دەڵێی گەوهەری سپین، چۆن چۆنی لە ناو ئەو سندووقچە یەکجار بچووکەی دەمتدا، جێیان بۆتەوە، لە کاتێکدا کە خودی دەمت، هەر ئەوەندە بچووکە، دیار نییە و دەڵێی نوقتەیە.

شاعیرانی کورد، زۆریان باسی «دەمی بچووک»ی یاری خۆیانیان کردووە، بۆ نموونە:

«نالی» دەڵێ:

١- دەم؛ هەمدەمی خونچێکە، نەپشکووتووە هێشتا
با کەشفی نەکرد: بەرگی عەترپۆشی گوڵی ڕووت
«١٥٢»



٢- وەسفی ڕوخساری؛ لە فیکری بەنی ئادەم بەدەرە
ئیبتیدای مەدحی دەمی، وەک خەبەری بێ ئەثەرە
«٤١١»

«مەحوی» دەڵێ:

١- کە ئەو لێو و ددانەم دی؛ بەجارێ
لە بەرچاوم هەموو لەعل و گوهەر کەوت
«٨٧»

٢- کەی بەلەعل و گەوهەر، ئەو لێو و ددانی دا نیشان؟!
ئەو ڕەهەندەی شاخە، ئەم خۆ شارەوەی ژووری صەدەف
«١٧٥»

«حاجی قادر» دەڵێ:

١- لێی مەپرسە مەسئەلەی نوقتەی دەمی و موویی کەمەر
مووشکافە «بووعەلی» باسی پەری و جن، چی دەکا!
«٤٦»

٢- جەبینی: ماهـ و ڕوخی: میهرە، زوڵفی: شەو، دەهەنی:
سەبەب بەقافیە تەنگیی بوو «حاجی» نەینووسی
«١٦٢»

«وەفایی» دەڵێ:

١- ماچی دەمی؛ خەندەی دەمەکەی سیرڕی بەیان کرد
ئەو جەوهەرە وا فەردە: نە مەوجوودە، نە مەعدووم
«٧٢»

٢- خەندە: بەم شیرینییە، دەم: بەم نموونەی حیکمەتە
قەت«وەفایی» نەبووە وا خۆش بێ: خەبەر، بێ مویەتەدا
«١٣»

**٨- غافڵن ئەورۆ لە خوێنی کوشتەیی هیجرانی خۆت**
**دامەنت دەگرن، بڵا پاکی، بەڕۆژی ئیحتیساب**

غافڵن: بێ ئاگان؛ هەڵبەتە ڕووی دەمی قسەکە بۆ یارە و دەبووایە بڵێ: غافڵیت، بەڵام سروشتی «ئەدەب» بە«کۆ» واتە: بەگەورە و سەردار و ڕێزلێنانێکی زۆرەوە، بەرامبەرەکەی دەدوێنێ، هەروەک کە دەیەوێ بەناوی خودی خۆیشیەوە بدوێ، هەمیشە لەجیاتی «من»، ڕاناوی «کۆ» بەکار دەهێنێ و دەبێژێ «مە» کە ئەمیش هەر خۆ بەگەورە زانینە. هیجرانی خۆت: ئەوانەی لێیان دابڕاویت.

ڕۆژی ئیحتیساب: ڕۆژی لێپرسینەوە، ڕۆژی قیامەت.

واتە: ئەی دڵبەرە بێ ئاگاکەم! ئێوە ئەم ڕۆژانە ئاگاتان لە ژمارەی ئەو ئەویندارانەتان نییە، کە لەتاو دووری و دابڕانتان، سوێی بۆتەوە و مردووە؛ بەڵام ئەو ئەویندارە دڵ پڕ لە حەسرەتانەی، بەتاسەی دیدارتانەوە مردن؛ لە ڕۆژی قیامەتدا، هەموویان داوێنت دەگرن و داوای مافی خۆیان دەکەنەوە.

«سالم» دەڵێ:

هەتا زیندووم، دەچێنم تۆوی هەر خارێ لە دڵ، شایەد:
کە بێی بۆ سەرمەزارم، دامەنت بگرن، ئەگەر مردم
«٨٢»

«مەحوی» دەڵێ:

چقڵی مەزاری من، چەقییە دامەنی، چ سوود
شوومیی بەرۆکی بەختمی بەردا، کە من نەمام
«٢١٤»

**٩- بۆ سەر ئەو چاهی زەقەن، زوڵفی زەغەن بوو: ڕەهبەرم**
**ئاخری چاهە؛ کەسێکی ڕەهبەری ڕێی بێ: غوراب**

سەرنج: نموونەی ئەم بەیتەمان لە غەزەلی ژمارە «١٥، بەیتی ٣»دا لێکداوەتەوە و دووبارەکردنی پێویست نییە.



**١٠- بۆ نیشانی بەزمی مەستانت، لە دووریی تۆ «ئەدەب»**
**چەنگە: سینەی، تار: ناڵەی، زارە دەنگی وەک ڕوباب**

چەنگ و تار و ڕوباب: ئامێری مۆسیقایین.

واتە: بۆ ئەوەی کۆڕی بەزمی بادەخواردنەوەت ڕازاوە و شیرین و ئاهەنگاویی بێت، «ئەدەب» سنگی خۆی کردۆتە: چەنگ و ناڵەی خۆی کردۆتە: تار و دەنگە لاوازەکەیشی کردۆتە: ڕوباب.

## ١٨

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەکفووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلات) وەک نموونەی:

١- هەر دلێ سوهتی ب ئولفێ     یار نە دەرمان کت ب زولفێ
تا ئەبەد ئەو بەند دی قولفی     عـــــشق دەردەک بێ دەوایە
«مەلای جزیری، ٥٢٣»

٢- سەر لە جێگەی پێ ئەنێ؛ کوللی سەحەر مەستانە ڕۆژ
بۆ زیارەت دێتــە کــەعــبــە، ئەو دڵە، ئەو جــانە ڕۆژ
«حەمدی، ٧٤»

٣- لەیلەکەی بێ مەیلەکەی مەحبووبەکەی عەییارەکەم
شۆخەکەی پڕ حەملەکەی بێ ڕەحمەکەی غەددارەکەم
«کوردی»

**١- لەو دەمەی مەستی سوراحی چەشمی دڵدارە ئەدەب**
**قەت نەکەن باوەڕ، بڵێن: یەک لەحزە هوشیارە ئەدەب**

سوراحی: دەفرێکی لە شووشە دروستکراوە، بۆ: مەی، ئاو، شەربەت تێکردن بەکارهاتووە، کە لەوێوە: مەیەکە، یان: شەربەت و ئاوەکە، لە پەرداخ و پیاڵە و دەفری بچووکتر دەکرێ. جاران هەر بۆ مەیخواردنەوە بەکارهاتووە، بەڵام ئێستا بۆ ئاوخواردنەوە و شەربەت بەکار دێت... «پیرەمێرد» واژەی سوراحی بەمجۆرەی بەکار هێناوە:

دەبێ بەخشندە ملکەچ کات لە ڕاستی مووچەخۆری خۆی
سوراحی سەرفرۆ دێنێ، لە بۆ پیاڵە، کە تێکا بۆی

شاعیرانی فارسیش «سوراحی»یان لە شیعردا زۆر بەکاربردووە:

١- آدم چو صــــــراحی بود و روح چو: نی
قــالب چو: نی و روان: صـدائی در: نی
«خیّام،
دهخدا، بەرگی ١٠، ل ١٤٩٠٧»



٢- دراین زمانە رفیقی کە خالی از خلل است
صـراحی می ناب و سـفـینەی غـزل است
«حافظ،
دهخدا، بەرگی ١٠، ل ١٤٩٠٧»

لەحظە: چرکەیەک، دەرفەتێکی زۆر کورت.

واتە: ئەو کاتەی «ئەدەب» مەستی سەیرکردنی سوراحی چاوی دڵدارێتی، ئەوەندە بەڕامان و قوولبوونەوەوە بۆی دەنواڕێ، هەرگیز باوەڕ نەکەن، لەو کاتانەدا بۆ تەنیا چرکەیەکیش هۆشی لای خۆی بێت.

«وەفایی» دەڵێ:

وەرە بنوارە: بەزمی عـــــالەمی دڵ
چ خۆش دەورێکە؛ هوشیاریی خەرابە
«١١٦»

«مەحوی» دەڵێ:

لەبەر حوکمی نیگایا؛ قاتە: هوشیار
هەتا چاوی بکا بڕ؛ مەستە، هەر مەست
«٧٣»

**٢- ڕێم بەگوڵزارت تەڵەب کرد، ئەو شەوە فەرمووت: نەیێ**
**یەک نەفەس بێت و بچێ، لەم باخە موختارە ئەدەب**

تەڵەب کرد: داوا کرد.

موختار: سەرپشک.

واتە: ئەو شەوەی داوای پیاسەی ناو گوڵزاری تەماشاتم کرد، وتت: با نەیێ. چونکە ئەگەر بێتە سەیری ئەو باخەوە، ئەوەندەی پێ سەیروسەمەرە و داچڵەکێن دەبێ، لە خۆشیان و لە سەرسامییدا، دوای یەک چرکەسات، گیانی دەردەچێ.

**٣- دەم بەخەندەی خونچەیەک بوو، ڕەونەقی گوڵزاری مە**
**بۆ گـوڵی گـوڵزاری ڕووی؛ وەک بلبلی زارە ئەدەب**

واتە: باخەکەی ئێمە (من: ئەدەب)، ڕمێن و برەوی بەزەردەخەنەی دەمی خونچەیەکەوە بوو، کە «ئەدەب» بۆ دەمە وەک گوڵێنەکەی ئەو خونچەیە، خۆی کردۆتە بلبلێکی دەم پڕ لە هاوار.

**٤- تووتیی تەبعم، کـە دێتـە مـەدحی لێـوی شـەککەری**
**شەهدی سافێکی عەلاوەی قەندی گوفتـارە ئەدەب**

تووتی: باڵندەیەکی ڕەنگینە، کـە بەخێـرایی دەتوانێ لاسـایی ئەو واژانە بکاتەوە، کە مرۆڤ فێری دەکات.

تەبع: لێرەدا مەبەست لە وتار و شیعر و نووسینە.

مەدح: ستایش.

شەهد: هەنگوینی پاڵاوتە.

ساف: ڕوون و زوڵاڵ و بێ گەرد.

عەلاوە: سەربار.

گوفتار: وتار.

واتە: «ئەدەب» لە ڕێگەی تووتی نووسـینەکانییـەوە، کە ستـایشی لێوی وەک شـەکر شیرینی دەکات، یەکسەر نووسینەکانیشی بەهۆی هەنگوینی زوڵاڵی لێوەکانییەوە، شیرین دەبن.

«حەریق» دەڵێ:

غونچە سەرپۆشی لە ڕوو لادا بەعەزمی دیدەنی
بلبلی تەبعی منیش، بۆیە غـەزەلخـوان هاتەوە
«٥٨»

**٥- شەو لە ناو جێ؛ تا سەحەرگاهان بەیادی ماهی ڕووت**
**سـاتێ ئەختـەر، باری ئەشک و سـاتێ بێـدارە ئەدەب**

سەحەرگاهان: بەرەبەیانان.



ئەختەر: ئەستێرە.

ئەشک: فرمێسک.

واتە: شەوان کە لەسەر پشت لە ناو نوێنی خەوەکەمدا پاڵ دەکەوم، هەر یادی تۆ دەکەم و هەر بەدەم یادی تۆوە دەکەومە ئەستێرە ژماردن، دوای تاوێکی تر دەدەمە پرمەی گریان و دوای ژێربوونەوەشم، ئیـتر تا بەرەبەیان، هەر بەیادی تۆوە بێدارم و نانووم و هەرچی دەکەم خەوم لێ ناکەوێ.

**٦- دڵبـەرا! بۆ خـۆت مـەگـەر ڕەحمێ بەحاڵی من بکەی**
**گەرنە، لەم دنیایە، کێی وا یار و خەمخوارە ئەدەب!**

گەرنە: ئەگینا.

واتە: گیانەکەم! هەر بەتەنیا لەم دنیایەدا، تۆ لێم تێ دەگەیت و تۆ گوێ لە ڕاز و دەردە دڵەکانم دەگریت، ئەگەر تۆم نەبێ، ئیتر کێی ترم هەیە وەک تۆ، گوێ بۆ من شل بکات و خەمخۆرم بێت!.

**٧- تا بەتاری زوڵفی خـاوت، خـامـە بێـتـە ئیرتیـعـاش**
**دەفـتـەری پڕ عـەنبـەر و مـشکی تاتارە ئەدەب**

ئیرتیعاش: موچوڕکە، لەرز، مێروولەکردنی خۆشیی.

«سالم» «مشکی تەتار»ی ئاوا بەکاربردووە:

سـەبا! سـاتێ بەسـەر گـێسـوویی یارا
دەمـاغم وشکە، بێ بۆی مـشکی تـەتار
«٥٩»

**٨- شـەو لەبەر سـۆزی دەروون و ئەشکی دیدەم؛ نازەنین**
**لایـەکـی: ئـاوی ڕەوان و لایـەکـی: نـارە ئـەدەب**

واتە: دڵبـەرەکەم! شـەوان لەبەر کزە و سۆزی دەروون، پیشـەم هەر گریان و فـرمێسـک ڕژانە و هاوکاتیش لەبەر نێڵە نێڵی کڵپە و بڵێسەی دەروونم، هەر هەڵدەقرچێم؛ بۆیە شەوان تا بەیانی؛ لایەکم جۆگەی ئاوە و لایەکەی تریشم هەر ئاگرە.

«نالی» دەڵێ:

١- گـەر نیـیــە ئاور لە سـینەمـدا بەتاو
بۆچ لەبەر قولْقولْ، غـەریقی ئاوم ئەز؟!
«٢٢١»

٢- سـریشکم ئاب و دانەی نارە، کێ دی:
بەگـەرمیی داوەڕێ، بەم تەرزە، تەرزە!؟
«٤٤٨»

«وەفایی» دەڵێ:

١- گـا دەسـووتێم، گـا دەگـریێم، غـەرقی ئاو و ئاورم
ئاخ لەبەر بەخـتی سـیـا! نازانم ئەز بۆچ نامـرم؟
«٥٩»

٢- ئاب و تابی ڕووتە مـایەی سـۆزش و گـریانی من
گا غەریق و گا حەریقی میهری ڕووت وەک نیلوفەڕ
«٤٢»

**٩- دڵ بریـنداری خـەدەنگی غـەمـزەکـەی دڵدۆزتە**
**جـارێ ناپرسی؛ بزانی: چۆن بریندارە ئەدەب!**

خەدەنگ: تیر.

دڵدۆز (یان: دڵدوز): دڵ ئازاردەر.

**١٠- گەر سزاواری خیتابت نیم، قبووڵە ئەی ئەدەب**
**بۆ عیتابیشت مەگەر هەر: نا سزاوارە ئەدەب؟!**

سزاوار: شایان، شایستە.

خیتاب: گفتوگۆ، ئاخاوتن، قسەکردن.

عیتاب: گلەیی، سەرکۆنە، سەرزەنشت.

واتە: ئەگەر شایانی ئەوە نیم بمدوێنیت، قەیناکە و ئەمەیانم پەسەندە و لەسەر سەرم؛ بەڵام ئەی بۆ هەر تەنیا گلەییەکیشم بەرامبەر دەرنابڕیت!؟ ئاخۆ بۆ ئەمەشیان (گلەیی)،



ئەدەب هەر بێ شایانە!؟. بەمانایەکی تر: بەهەر جۆرێکە: قسەی خۆش و ناخۆشت، بۆ من هەر گرنگن و حەز دەکەم گوێم لە دەنگت بێ و لە بەرامبەرمدا بێ دەنگ نەبیت.

«وەفایی» دەڵێ:

ئاخر ئەی سوڵتانی خوبان، تا بەکەی نامیهرەبانیی
چاکە مەحروومم نەفەرمووی، یا خیتابێ، یا عیتابێ
«١٧١»

**١١- گـەر بەقـانوونی وەفـاداریی دەپرسی حـاڵی زار**
**ڕەنگی زەرد ئاهی و سەرد و ئەشکی گوڵنارە ئەدەب**

حاڵی زار: حاڵی لاوازیی و گریانم.

سەرد: سارد.

گوڵنار: فرمێسکی دانە دانەی وەک دەنکی هەنار، سوور و ئاڵ.

**١٢- چەشمی بیمارت: طەبیبی ئەو دڵەی بیماری مە**
**سەیری بیـماری کە، بیـماری پەرستـارە ئەدەب**

چەشم: چاو.

طەبیب: پزیشک.

بیمار: نەخۆش.

پەرستار: ئەو ئافرەتانەی بەتایبەتی لە نەخۆشخانە، بۆ چاودێری و ڕاپەڕاندنی کاروباری نەخۆش، لە نەخۆشخانەدا کار دەکەن.

واتە: چاوەکـانت، کـە هەمـیـشـە ئەوەندە مـەستن، هەر دەڵێی نەخـۆشن، دڵم نەخـۆشی دەسـتی ئەوانە؛ تکایە بەو چاوە نەخـۆشـانەت بفـەرمـوو ببنە پزیشکم (یان چاوە نەخۆشەکانت بوونەتە پزیشکی من)! دەیسا سەیری ئەم سەمەرەیە بکەن؛ کە نەخۆشێک، نەخۆشێک چارەسەر و چاودێریی دەکات!.

**١٣- شەو بەیادی زوڵفی پڕ نێشی هەتاکو صوبحدەم**
**هەمنشینی عەقرەب و هەمصوحبەتی مارە ئەدەب**

نێش: چزووی دووپشک و گەزەندە.

صوبحدەم: بەرەبەیان.

هەمنشین: هاونشین.

عەقرەب: دووپشک.

هەمصوحبەت: هاوقسە، هاوڕاز.

واتە: سەری زوڵفەکانت، کە وەکو چنگی دووپشک و پەپکەخواردنی مار وان، تا بەرەبەیان هەر بەیادی ئەو سەری زوڵفانەتەوەم، بۆیە وەکو ئەوانە خۆم دەبینم، کە شەو تا بەیانی لەگەڵ مار و دووپشکدا ڕۆژ بکەمەوە.

**١٤- زاهیدا! زەحمەت مەکێشە بۆ ثبوتی وەرعی من**
**زوڵفی ساقی خۆی گەواهە، ئەهلی زنناره ئەدەب**

زاهیدا: بانگەوازە بۆ موسڵمانی ڕیاکاری درۆزن.

ثبوت: سەلماندن.

وەرع: خواپەرستیی.

گەواه: بەڵگە.

واتە: ئەی موسڵمانە درۆزن و ڕیاکارەکان، زۆر تەقەللای بەڵگەهێنانەوە مەدەن لەسەر خواپەرستیی و بەکافربوونی من، چونکە هەر خۆشەویستیم بۆ زوڵفی یار، ئیتر باشترین بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە بوومەتە خاچپەرست و خاچپەرستیش چونکە خاوەنی کتێبی ئاسمانیین، بەکافر دانانرێن.

«وەفایی» دەڵێ:

ئیشارەی چاو و عیشوەی زوڵفەکەت بوون مورشیدی ڕێگام
ئەگەر دەیری موغان قیبلەم، ئەگەر زنناره بەرماڵم
«٦١»

**١٥- دڵ کە کەوتە دامی زوڵفت، من گوتم ئاسوودە بووم**
**وەک ئەوێستا تێدەفکرم، خۆی گرفتاره ئەدەب**

دام: داو.

ئەوێستا: ئێستا.



واتە: لە سەرەتادا کە دڵم گیرۆدەی داوی بسکەکانت بوو، دڵم خۆش بوو، کە گوایە ئیتر دڵم لە یار نزیک بۆتەوە. کەچی دوایی کە بیرم کردەوە، تێگەیشتم، کە بەڕاستی و بەتەواوەتی تووشی دەردی بێ دەرمان بووم و ئیتر دەربازبوونم بۆ نییە.

**١٦- زاهیدان تەزویری بێجایانە، بۆ تەکفیری ئەدەب**
**زوڵفی یارم خۆی گەواهە؛ ئەهلی زنناره ئەدەب**

تەزویر: درۆودەلەسە هەڵبەستن.

بێجا: بێ جێگە، بێ نرخ، بێ سەروبەر.

تەکفیر: بەکافر حسابکردن.

(ئەم بەیتە و بەیتی ١٤ لەیەک دەچن و شەرحکردنی دەبێتە دووبارەبوونەوەی بەیتی ١٤).

**١٧- وا نییە واعیز بەتەنها بێ لەمە، بێزار و بەس**
**سەد ئەوەندەی وەی لەوی بیللاهی بێزاره ئەدەب**

واعیز: ڕاوێژکار.

واتە: کێشەکە لەوەدا نەماوە، کە واعیز بەتەنیا لە من بێزار بێ، بەڵکو سەد ئەوەندەی بێزاریی ئەو، لە من، منیش لەو بێزار و وەڕس و بەقینم.

١٩

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن) وەک نموونەی:

١- خدمەتا پیرێ موغان دێ کت کەسێ مەقسوودە مەی
شیشە و وجاما زوجاجێ ئێ د ڤێت دێ رەت حەلەب
«مەلای جزیری، ٧٥»

٢- دڵ موشەببەک بوو لەبەر ئێشانی نیشانی موژەت
حەیفە قوربان! ئاخر ئەم نیشانەیی شانی هەیە
«نالی، ٥٧٦»

٣- تا بەسەر باغی دلاّ بێ، بای خەزانی فیرقەتت
عارزم بۆ سێوی ڕوخسارت، لە ڕەنگی بەی دەکا
«سالم، ٢٩»

**سەرنج:** وەک پێشتریش لە جێی خۆیدا وتمان: ئەو غەزەلە، لەگەڵ غەزەلی پێشوودا هاووێنە و تێکەڵوپێکەڵە.

**١- خەستە حاڵی غەمزەیی شۆخێکی عەییارە «ئەدەب»**
**هەر مەپرسە چۆن نزار و زار و بیمارە «ئەدەب»**

خەستەحاڵ: حاڵی نەخۆش.

نزار: لاواز، بێ هێز.

زار: گریاو.

**٢- لەو دەمەی مەستی مەیی چەشمی خوماری دڵبەرە**
**قەت مەکەن باوەڕ، بڵێن: یەک لەحظە هوشیارە «ئەدەب»**

(نموونەی ئەم بەیتەمان لە غەزەلی پێشوو، بەیتی یەکەمدا لێکدایەوە).



**٣- شەو بەیادی زوڵفی مشکینی، هەتاکو صوبحدەم**
**بەستەری پڕ عەنبەر و پڕ مشکی تاتارە «ئەدەب»**

بەستەر: جێی خەو.

(نموونەی ئەمجۆرە بەیتەمان لە غەزەلی پێشوو، بەیتی حەوتەمدا لێکدایەوە).

**٤- چی جەفای باری ملم کرد، وەم نەکرد ئازوردە بێ**
**تا بزانێ تا چ ئەندازە، وەفـــادارە «ئەدەب»**

ئازوردە: ئازار بەخش، ئازار پێگەیو.

واتە: ئەگەرچی دڵبەرم زۆری ناڕەوایی بەرامبەرم نواند. بەڵام کاردانەوەیەکی وام لە بەرامبەریدا نەکرد، تا دڵی گەرد بگرێ، چونکە مەبەستمە تێی گەیینم کە «ئەدەب» بەهیچ جۆرێ لێی ناڕەنجێ و هەر پابەندی وەفای خۆی دەمێنێتەوە.

**٥- شەشپەڕی غەمزەت بەچەندین جێ، لە سینەم کارییە**
**وەم نەکرد کەس پێ بزانێ، چۆن بریندارە «ئەدەب»**

شەشپەڕ: تیر، خەدەنگ.

(نموونەی ئەمجۆرە بەیتەمان لە غەزەلی پێشوو، بەیتی نۆیەمدا لێکدایەوە).

**٦- ئەی بتی ڕەعنا؛ لەسەر چی هێندە ئازارم دەکەی!**
**کامەیە جورمی؟ کە موستەوجیب بەئازارە «ئەدەب»**

جورم: تاوان، خراپە.

موستەوجیب: پێویست، شایان.

واتە: ئەی وەک بت، ڕێک و باڵا جوانەکەم، چیم کردووە و سەبارەت بەچی ئەوەندە ئازارم دەدەیت، ئاخر«ئەدەب» چ تاوانێکی کردووە، کە شایانی ئەو ئازار و سزایە بێت؟!.

**٧- هەرچی کردی، عیشقی تۆ کردی، دەگەڵ مە؛ گەرنە بۆچ:**
**بێ سەبەب ڕسوایی کووچە و شار و بازاڕە «ئەدەب» ؟!**

گەرنە: ئەگینا.

بێ سەبەب: بێ هۆ.

کووچە: کۆڵان.

واتە: هەرچیم بەسەرهاتبێ، هەر بەهۆی عەشقێنی تۆوە بەسەرم هاتووە، چونکە هیچ کارێکی دیکەم نییە، جگە لە عەشقێنی تۆ؛ کەچی دیارە هەر لەسەر عەشقێنی تۆ، لە هەموو شەقام و کۆڵان و شار و بازاڕەکاندا، ناوبانگی ڕسواییم دنیای لێ پڕ کردووم.

**٨- ئاشنایی تۆم بەسە، عالەم هەموو بێگانە بێ**
**یار ئەگەر تۆ بی؛ چ باکی یار و ئەغیارە «ئەدەب»!**

واتە: هەر ئەوەندەم بەسە، کە تۆ یاری من بیت، ئیتر هیچ دەربەستی دنیا و تانە و تەشەری دۆست و بێگانە نیم. چونکە من پێم وایە ئەم دنیا بەرینە، هەر تۆی تێدایت.

«نالی» دەڵێ:

لە لای من، با وجوودی ناس و ئەجناس
کەسی تێدا نییە ئەم شارە بێ تۆ
«٣٨٣»

**٩- تۆ، گوڵی خونچە دەهان، تا بوویە زیبی باغی مە**
**شێتییە هەرکەس بڵێ: مایل بەگوڵزارە «ئەدەب»**

دەهان: زار، دەم.

زیب: ئارایش، ڕازانەوە، جوانیی.

مایل: ئارەزوومەند.

واتە: تۆ، گوڵێکیت، زارت وەک زاری خونچە، بچووک و نەکراوەیە و بوویتە مایە و سەرمایەی ڕازاندنەوەی باخی ژیانم. ئیتر هەرکەسێ لای خۆیەوە قسەی ئەوە بکات، کە «ئەدەب» ئارەزوومەندی سەیری باخ و گوڵزاری ترە، شێت و نەفامە و لە خۆیەوە قسەی وا دەکات.

**١٠- وا دەزانی هەر ڕەقیبت، لێمە بێزاریی دەکا!**
**سەد ئەوەندەی وی، لەوی بیللاهی بێزارە «ئەدەب»**

(نموونەی ئەمجۆرە بەیتەمان لە غەزەلی پێشوو، بەیتی «١٧»دا لێکدایەوە).



**١١- بۆ دەپرسێ پیری مە، ئەمڕۆ لە ئایینی ئەمە**
**زوڵفی تۆ، بۆ خۆی گەواهە، ئەهلی زوننارە «ئەدەب»**

پیری مە: ڕابەری ئایینی ئێمە (من – ئەدەب).

ئایینی ئەمە: ئایینی ئێمە (ئەدەب).

گەواه: بەڵگە، نیشانە.

(نموونەی ئەمجۆرە بەیتەمان لە غەزەلی پێشوو، بەیتی «١٦» لێکدایەوە).

**١٢- هەرکەسێ وەک من، ئەسیری چەنبەری زوڵفت نەبێ**
**کوا دەزانێ دوور بەدوور، چۆنت گرفتارە «ئەدەب»**

چەنبەر: بازنە، حەلقە.

(نموونەی ئەمجۆرە بەیتەمان لە غەزەلی پێشوو، بەیتی «١٥» لێکدایەوە).

٢٠

کێش: بەحری هەزەج ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)
وەک نموونەی:

١- تەفتیشێ ب مومموو بکە، ئەر ئەم ب خەتایین
هنجانەکە بێتن ت وەلاتی ت جەهێ من
«مەلای جزیری، ٤٥٤»

٢- هێند مونتەزیری تۆ بوو، هەتا چاوی سپی بوو
نەرگس؛ کە لەسەر یەک قەدەم و دیدە چەقی بوو
«نالی، ٣٧٧»

٣- ئەی مورسەلی حەق، تاجی سەری جوملە پەیەمبەر
ئەی نووری دڵی ئەرز و سەما؛ سەییدی سەروەر
«حەمدی، ٧٠»

**١- گەر مەتڵەعە بۆ ماهی موقەننەع، چەهی نەخشەب**
**ماهی مە، تلووعی لە چەهی غەبغەبە هەر شەب**

مەتلەع: بەرایی، سەرەتا.

ماهی میقنەع: مانگی میقنەع؛ کە مەبەستیش لە میقنەع: هاشمی کوڕی عەتا، یان: حەکیمی کوڕی عەتایە، کە لە سەردەمی خەلافەتی «مەهدی»دا دەرکەوتووە و داوای پێغەمبەرایەتی کردووە و بە«پێشەوای جل چەرمووەکان»یش دەناسرێ. ئەم «میقنەع»ە، مانگێکی بەسیحر و تەڵەکەبازیی لە جیوە و شتی تر، لە چاڵێکی بناری کێوی نزیک شاری «نەخشەب» دروست کردووە. ئەم مانگە دەستکردە هەموو شەوێک لەو چاڵەوە دەرکەوتووە و لە ئاسۆی شاری «نەخشەب»دا درەوشاوەتەوە و لە مەودای چوار فرسەنگ (٢٤ کیلۆمەتر)دا بینراوە... شاری «نەخشەب»یش لە نێوان شارەکانی «جەیحوون» و «سەمەرقەند»دا بووە؛ بۆیە ناوی ئەم مانگە، بەمانگی «نەخشەب»یش دەوترێ، جگە لەوەی هەر ئەم مانگە، بەمانگی: «سیام»، «نەسەف»، «درۆزنە»، «کاشغەر»، «چاڵ کێش» و...یش دەناسرێ. بۆ زیاتر ئاگاداری لەم بارەیەوە، بنوارە: فەرهەنگەکانی «عمید، ل ١٠٣٤، دهخدا، بەرگی ١٣، ل ٢٠٠٥١، بەرگی ١٤، ل ٢١٣٥٨».



«حەمدی» دەڵێ:

بەماهی نەخشەب و باڵی هومایی دەوڵەتی دانێ
لە هەر لایێ، کە یەک ڕوویی بێ، یا بێ ڕیا دەستی[1]
«٦٥»

شاعیرانی فارسیش سەبارەت بەم مانگە دەستکردەی «میقنەع» زۆر شیعریان وتووە، بۆ نموونە:

«خاقانی» دەڵێ:

١- مقنعە ماە غبغب تو
صد ماە مقنعم نمودە

٢-چو خورشید آوازەی او بر آمد
همانگاە ماە مقنع فروشد

اگر جای تو را بگرفت بدخواە
مقنع نیز داند ساختن ماە
«نظامی»
«دهخدا، جلد١٤، ص٢١٣٥٨»

چەهـ: چاڵ.
غەبغەب: ژێر چەناگە.
شەب: شەو.

واتە: ئەگەر مانگەکەی «موقەننەع» هەموو شەوێک، لە چاڵایی شاری «نەخشەب»دا دەردەکەوت، ئەوا مانگەکەی من، هەموو شەوێ لە چاڵی چەناگەی یاردا دەردەکەوێ.

«سالم» «چاهی غەبغەب»ی بەمجۆرە بەکاربردووە:

(١) لە کێومالکردنی شیعری کلاسیکی کوردیدا، هەر تەنیا ئەم نموونەیەی «حەمدی»م بەرچاو کەوتووە؛ کە ئەم نموونەیەش لە دیوانی «حەمدی»دا لێکدانەوەیەکی هەڵە و بێ سەروبەریان لە پەراوێزدا بۆ نووسیوە و پەیوەندی بەم لێکدانەوەیەی ئێمەوە نییە. (بنوارە: دیوانی حەمدی، چاپی یەکەم ل ٢١ و چاپی دووەم ل ٦٥).

له مەهتابا، کە دڵ دی پەرچەمی وەک عەقرەبت ئەمشەو
گوریزی دا له عەقرەب، کەوتە چاهی غەبغەبت ئەمشەو
«١١٨»

**٢- گوڵزاری جەماله، موتەشەکیل بەدوو سونبول**
**یا بەدری درەخشندە، لە مابەینی دوو عەقرەب!**

موتەشەکیل: پێکهاتوو.

دوو سونبول: دوو گوڵەگەنم (مەبەست لە هەردوو بسکەکانی یارە).

بەدر: مانگ.

درەخشندە: درەوشاوە، تریفەدار.

مابەین: نێوان.

عەقرەب: دووپشک.

واتە: ئاخۆ ئەوە گوڵزاری جوانییە، وا بەدوو گوڵەگەنم (دوو بسک) ڕازاوەتەوە؛ یان: مانگی درەوشاوە و تریفەدارە، لە نێوان دوو دووپشکدا (بسکەکانی)؟! (هەڵبەتە دووپشک، کەلووی دووپشکیش دەگەیەنێ).

**٣- ئەی سەرو چەمانی قەمەریی، نووری قەمەر ڕوو**
**ئەی خونچە دەهانی شەکەری نوتق، شەککەر لەب**

سەرو چەمانی: داری سەرووی ناو چیمەن.

قەمەریی: وەک مانگ.

نووری قەمەر ڕوو: ڕووناکی مانگی ڕوخسارت.

خونچە دەهان: دەم خونچەیی.

شەکەری نوتق: قسە شیرین.

شەککەر لەب: لێو وەک شەکر.

(مانای ئەم بەیتە و بەیتی دواتر پێکەوەن).



**٤- تاکەی بەجەفا، ئێمە خەتابار و گونەهکار**
**تاکەی بەستەم، ئێمە گرفتار و موعەززەب؟**

گونەهکار: تاوانکار.

موعەززەب: ئازاراویی.

واتە: وا دیارە تۆ لای خۆتەوە، ئێمەت بەتاوانبار و سەرپێچی کار داناوە، بۆیە بەشمان لای تۆوە، بۆتە ئازاردان و ئازار چەشتن. بەڵام ئەم ئاکارەت هەتاکەی درێژە دەکێشێ و هەتاکەی ئێمە بەتاوانبار دەزانیت؟.

**٥- گەر لوتفە؛ هەتاکەی دەگەڵ ئەغیارە خیتابت؟**
**گەر قەهرە، هەتاکەی منی بێچارە موخاتەب؟**

ئەغیار: بیانی و ناحەز.

خیتاب: ئاخاوتن.

قەهر: قین و ڕق هەڵگرتن.

واتە: ئەگەر مەبەستت میهرەبانیی نواندنە، بۆچی دەبێ ئەو سۆز و دڵنەرمییەت لەگەڵ ناحەزانی مندا بنوێنیت؟ و ئەگەریش قین و ڕق نواندنە، بۆ هەر دەبێ ئەو قین و ڕقە، بەمن برێژیت؟.

**٦- سەد حەیفێ کە بۆ دەردی دڵی مە، دەمی وەسڵت**
**شەو کورتە و فرسەت کەم و تووڵانییە مەتڵەب**

تووڵانیی: درێژ.

مەتڵەب: مەبەست، نیاز، ڕاز، قسە.

واتە: داخەکەم ئەوەندەم قسە و دەردە دڵ پێیە و بەردەوام دەمەوێ بۆتی هەڵڕێژم، کەچی کاتێ پێک دەگەین، دەرفەتمان ئەوەندە کەمە و شەویش کورتە، بۆیە هەرگیز ناتوانم ڕازەکانی دڵمت بۆ هەڵبڕێژم.

**٧- گەر بادە فەرەحبەخشە، بەیادی لەبی تۆیە**
**نەشئەی چییە، بێ شەهدی لەبت: جامی لەبالەب!**

بادە: مەی.

فەرەحبەخش: شادی بەخش، خۆشیی بەخش.

جامی لەبالەب: پیاڵە و پەرداخی پڕ.

واتە: مەی، ئەگەر بتوانێ خۆشیی و شادیم بداتێ، هونەرەکە هی مەیەکە نییە، بەڵکو هونەرەکەی هی لێوی تۆیە، چونکە کاتێ لێوم بەلێوی پەرداخی مەیەکەوە دەنێم، لێوی تۆم لە خەیاڵە و لای خۆمەوە وا هەست دەکەم لێوم لەسەر لێوی تۆیە. لەبەرئەوە هەرگیز هیچ مـەیەک، با لە پەرداخی پڕیشــدا بێ، بەڵام بەبێ هەنگوینی لێـوی تۆ، هیچ هەسـتـێکم ناوروژێنێ. بەمانایەکی تر: هیچ مەیەک، ئەگەر لەتەکیدا ماچی لێوی شرینیت نەکەم، چ خۆشییەکم ناداتێ.

(هەڵبـەتە دەبێ بڵێین چونکە مەی خـۆی تامی تاڵە، بۆیە ئەگەر مـاچی شیـرین، تامی تاڵیی مەیەکە نەڕەوێنێتەوە، مەیەکە هەر بەتاڵیی لە دەم و قوڕگدا دەمێنێتەوە).

«نالی» دەڵێ:

شـــەرابی لەعلی ڕوممانی، لە (نالی)
حەرامە، بێ مـەزەی مـاچێکی لێـوان
«٣٢٢»

**٨- گەر لۆمەیە، گەر مەنعە، ئەگەر کفرە، گەر ئیسلام**
**گـەر تابعی قـانوونە، ئەگـەر خـاریجی مـەزهەب**

لۆمە: سەرزەنشت، سەرکۆنە.

مەنع: ڕێگریی، قەدەغەکردن.

تابعی قانوون: پەیڕەویکردنی یاسا.

خاریج: دەرەوە، لاڕێ.

مەزهەب: ئایین، ڕێبازگەی ئایینی.

(مانای ئەم بەیتە و بەیتی دواتر پێکەوەن).

**٩- تا جـان لە بەدەندایە، «ئەدەب» تۆ دەپەرسـتێ**
**زوونناری ملم: زوڵفی خەمت؛ قیبلەمە: غەبغەب**

تا جان لە بەدەندایە: تا ئەو کاتەی گیان لە لەشمدایە.

زوڵفی خەم: زوڵفی لوول و پێچ خواردوو.



واتە: ئەگـەر هەرچیم بۆ ڕێگریی لە ئەوینی تۆ، لە بەرامبـەردا بکەن، بەوەی پێم بڵێن: ئەم کـارەت لە ڕێبـازی ئـاییـنی ئیـســلام لادان و دەرچوون و لە یاسـا پەیڕەوی نەکـردن و هەرچی شتێ لەم بابەتەیە، هیچیان ناتوانن ڕێگریی ئەوینی تۆم بکەن، چونکە بڕیارێکە و پەشـیـمـان نابمەوە و وتوومـە: تا گـیـان لە جەسـتـەمـدا بێ، دەتپـەرسـتم و ئەگـەریش ئەو پەرستنەم دەمکاتە مەسیحی، ئەوا پێی ڕازیم و ئەوسا زوڵف و بسکە لوولەکەت، لە جێی زننار، لە ملم دەکەم و لەجیـاتی ڕووکردنە قـیبلەی ڕاسـتـەقـینەش، لەمـەودوا، ڕوو لە ژێر چەناگەت دەکەم و ئەوێ بەقیبلەی ڕاستەقینەم دادەنێم.

٢١

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن) وەک نموونەی:

١- بۆچی نەگریم سەد کەڕەتم دڵ دەشکێنی
مەی بۆ نەڕژێ، شووشە لە سەد لاوە شکاوە؟
«نالی، ٥٣٥»

٢- پێم خۆشە کە عومرم بەجەفا سەرفی غەمت بێ
بەو شەرتە کە مایەی ئەمەلم: ماچی دەمت بێ
«سالم، ١٤٣»

٣- جانا! وەرە ئەم جەژنە، بەقوربانی سەرت بم
بۆ تیری قەزا، چاوی حەسوودان، سوپەرت بم
«کوردی»

**١- ئەو زوڵفی سەمەن سا، کە سەراپایە لە باڵات**
**چەشمی بەدی لێ دوور بێ؛ چە زیبایە لە باڵات**

سەمەن: گوڵی یاسەمین.

سەمەن سا: وەک گوڵی یاسەمین، یاسەمین ئاسا.

واتە: بسکەکانت؛ کە دەڵێی گوڵی یاسەمینی بۆن خۆشن و بەسەرتاپای باڵاتدا پەخش بوونەتەوە، ئەوەندەت لێ جوانە، هەر لە خۆت دێت، یاخودا چاوی بەدیان لێ دوور بێ.

**٢- گەه دەستە، گەهێ بەستە، گەهێ کرژ و گەهێ خاو**
**هەر تەرزێ کە مەطبوعە، بەدڵ وایە لە باڵات**

گەه: جار، کەڕەت، یا.

تەرز: جۆر، شێوە.

مەطبوع: پەیڕەوکراو، پەسەندکراو.

واتە: بسکەکانت؛ هەر جارەی بەجۆرێکن: جارێ وەک گوڵ، چەپکە کراوە، جارێ بەستراوە، جارێ کرژ و خاوە، هەمیشەش بەو جۆرەیە، کە لە بەردڵان پەسەندە.



**٣- شوعلەی روخت و تیرەگیی زوڵفی سیەهفام**
**مەهتابە، کە تێکەڵ شەوی یەڵدایە لە باڵات**

شوعلە: بڵێسە، کڵپە.

روخ: ڕوخسار.

تیرەگیی: تاریکیی.

سیەهفام: لە دوو بەشی (سیەه + فام) پێکهاتووە، کە واژەی:

سیەه: بەمانای ڕەش دێت و «فام»یش بەمانای «وەک»، یان «مەیلەو» دێت، کە بەهەردوو بەشی واژەکە، دەبێتە: مەیلەو ڕەش.

مەهتابە: مانگ.

شەوی یەڵدا: درێژترین شەوێکە لە نێوان دوایین شەوی پاییز و یەکەمین ڕۆژی زستاندا...

واتە: بڵێسەی ڕووناکیی دەموچاوت و تاریکایی زولفە مەیلەو ڕەشەکانت، هەر دەڵێی «مانگ»ێکە و لە ئاسمانی شەوی یەڵدادایە.

«نالی» دەڵێ:

پەچەیی پەرچەمی و زوڵفی سیا
هەر دەڵێی مانگەشەوە، کولمی تیا
«١٢٤»

«سالم» دەڵێ:

دەوری ڕووی داوە: خەمی سونبولی موو
هەروەکو: هالە، لە دەوری قەمەردا
«٢٢»

«وەفایی» دەڵێ:

سەری کولمت لە نێو زوڵفی سیادا
ئیشارێکە لە نووری شەوچرادا
«٤»

**٤- ڕوخساری فروزەندە، طەڕازی قەدی نەخلت**
**نووریکە تەقـازایی تەجـەللایە لە باڵات**

فروزندە: ڕووناککەرەوە، گەشکەرەوە، ڕۆشنکەرەوە.

طەڕاز: ئەو نەخش و نیگارەی لە پەراویز و دامێنی جلوبەرگدا دەکرێ.

قەدی نەخل: بەژنی ڕێک و بەرزی وەک دارخورما.

تەقازا: داواکاریی.

تەجەللا: خۆنواندن، خۆدەرخستن.

واتە: ڕوخساری گەش و درەوشاوەت و ئەو نەخش و نیگارەی لە داوێنی بەژن ڕێک و بەرز و جوان هەڵچووی وەک دارخورماتدا، ڕووناکییەکە، داوای خۆدەرخستن و خۆنواندنی زیاتر لە بەژن و باڵات دەکات.

لێرەدا دەبێ بڵێین، کە باسکردن و هێنانی ناوی دارخورما و نووری تەجەللا، لە هەمان کاتیشدا ئاماژەن بۆ ڕووداوی حەزرەتی مووسا و کێوی طوور و ئەو دارخورمایەی لە بناری کێوی طووردا، پرشنگی خوداوەندی بەرکەوت.

**٥- باخی ئیـرەمـە؛ سـینە و گـوڵزاری جـەمـالت**
**حەسرەت بەدوو سەد جەننەتی مەئوایە لە باڵات**

باخی ئیرەم: باغی بەهەشت. بەڵام وەک لاساییکردنەوەی ئەو باغە، «شەدداد»ی خوای بەنی ئیسرائیلییەکان دروستی کردبوو.

جەننەتی مەئوایە: بەهەشتی ئاوەدان.

واتە: سنگ و بەرۆک و گوڵزاری ڕازاوە و جوانت، وەک باخی بەهەشتە و خودی باخی بەهەشت، حەسرەت بۆ قەد و باڵا و جوانیت هەڵدەکێشێ.

**٦- خونچەی دەهەنی تۆیە، گەهی خەندە و گوفتار**
**دورجێکی شەکەرخێز و گوهەر زایە لە باڵات**

خونچەی دەهەن: خونچەی دەم.

دورج: سندووقچە.

دورجی شەکەرخێز: سندووقچەیەکی وا، کە شەکری تێدا هەڵقوڵێ؛ یان: کانی شەکر.



بەڵام لە بنەڕەتدا دورج بەو سندووقـچـەیە دەڵێن، کـە جـاران ئافـرەتان زێڕ و خـشڵ و گەوهەریان تێدا دادەنا.

گوهەر: گەوهەر.

گوهەر زایە: کانی گەوهەر، یان گەوهەری لێ هەڵدەقوڵێ.

واتە: ئەو کـاتانەی زەردەخـەنە دەکـەیت، دەمت هەر لە خـونچـە دەچێ. یان لەو سندووقچانە دەچێ؛ کە شەکر، یان گەوهەری لێ هەڵدەقوڵێ. هەڵبەتە لێرەدا مەبەست لە گەوهەر، ددانەکانی یارە و سندووقچەکەش، دەمی بچووکی یارە، کە: گەوهەر «ددانەکانی یار»ی تێدا هەڵگیراون.

**٧- قامەت نییە بیللاهی، قیـامەت بوو هەڵسـتا**
**لەو شـۆڕش و غـەوغـایە، کە پەیدایە لە باڵات**

واتە: سوێند بەخودا، ئەم بەژن و باڵایەی بەتۆوەیە، هەر بەتەنیا بریتی نییـە لە بەژن و باڵا، بەڵکو بریتییە لە هەڵستانی ڕۆژی قیامەت، چونکە هەرکە دەردەکەویت، وەک ڕۆژی قیامەتی لێ دێت و هەرا و هەڵڵایەکی وەک ڕۆژی قیامەتی لێ پەیدا دەبێ.

«نالی» دەڵێ:

تۆ ئەگەر هەستی، لە جێ ڕاوەستی، دێو و کافریش
دێن دەڵێن: بەخودا قیامەت ڕاستە هەستانی هەیە
«٥٧٧»

«مەحوی» دەڵێ:

هەسـتـانت ئەر قـیـامی قـیـامەت نیـیـە، چییـە
بێ دەخڵی چەنگ و نەی و مەی، لە مەست ئەچم!
«٣٤٢»

«وەفایی» دەڵێ:

١- هات و ڕووی وا کرد و دنیای کردە ناڵەی عاشقان
دا نەڵێن: نایێ قـیـامـەت، ڕۆژی واوەیلا نییـە
«١٦٠»

٢- تۆ هەڵستای بەو دەمە، ڕۆحی «وەفایی»ت زیندە کرد
با قیامەت کەس نەڵێ: هەر یێکە توخودا هەستەوە
«١٥٨»

**٨- جانا! مەکە مەنعی «ئەدەب»ی زار، لە زاریی**
**شێتی گوڵی دیداری تۆ؛ شەیدایە لە باڵات**

واتە: گیانەکەم! ڕێگریی گریانم مەکە، چونکە باڵات ئەوەندە جوانە، بۆتە مایەی شەیداییم و شەیداییش گریان و شیوەنی بەدواوەیە.



## ٢٢

کێش: بەحری موزاریع موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن) وەک نموونەی:

١- دەستم لە گەردنی خۆت هەڵمەگرە ئەی حەبیبە
وەبزانە خوێنی خۆمە، یا مننەتی ڕەقیبە
«نالی، ٣٩٤»
٢- بلبل بەخەندە دێت و دەڵێ: «دەی» بڕایەوە
شاخەی درەختی عومری شکۆفە ژیایەوە
«حەمدی، ٨٤»
٣- ئەی بی نەزیر و هەمتا، هەر تۆی کە بەرقەراری
بێ یار و بێ دیاری، بێدار و پایەداری
«حاجی قادر، ١٤٣»

**١- ئەی شەککەرین دەهانی شەکەر نوتقی، لێو نەبات**
**شیرین هەموو شەمایل و شیرین هەموو ئەدات**

شەککەرین دەهان: دەم وەک شەکر شیرین.
شەکەر نوتق: قسە و ئاخاوتن شیرین.
نەبات: جۆرە کلۆیەکی وردی ڕەنگ ئاویی سپات و تام شیرینە، لە وشککردنەوە و پەروەردەکردنی لیمۆی ترش دروست دەکرێ، کە جاران لەجیاتی شەکر بەکارهاتووە.
شەمایل: ڕەوشت و خوو.
ئەدا: ئاکار.

**٢- جارێ لە حاڵی خەستە دڵانت بەلوتف و ناز**
**بۆچی دەبێ نەپرسی؛ کە چۆنن لە خاکی پات!**

خەستە: نەخۆش، ماندوو.

**٣- جان و سەرم بەبادی فەنادا بەخاکی ڕێت**
**نەمزانی تا سەرت نییە؛ ئەی بێ بەقا: وەفات**

جان: گیان.

بادی فەنا: بای هەدەر، بای لەناوچوون و فەوتان.

بێ بەقا: نەگیرسانەوە بەشتێک.

وەک لە جێی خۆیدا ئاماژەمان پێ کردووە، ئەم بەیتە لای «ئا» بەمجۆرەیە:

جان و سەرم بەبادی فەنادا، بەخاکی ڕێت
نەمزانی باسەرِت بەنەوای بێ ئیجازە هات

واتە: نیوە بەیتی دووەم، سەروبەر مانای بەیتەکە دەگۆڕێ و دەبێتە ئەوەی کە: من گیان و سەریشم لە خاکی ڕێتدا دانا بوو، بەلام بای «باسەر» هات و گیان و سەرمی لەگەڵ خۆیدا برد. لە کاتێکدا ئەوەی ئێمە نووسیومانە:

نەمزانی تا سەرت نییە، ئەی بێ بەقا، وەفات

ئەوسا، ئاوا دەگەیەنێ: گیان و سەرم خستە بەرپێت، بۆ ئەوەی بۆ هەمیشەی عومرت، لە بەرپێتدا بن، کەچی گیان و سەرمت وەلانان و بۆ کەمێکیش پێت پێدا نەنان.

هەڵبەتە بەوجۆرە «ئا»ش دەخوێندرێتەوە، بەلام کە دوای ئەم بەیتە، بەیتی دوایی دێت، ماناکەی لەگەڵ ئەوەی لای ئێمەدا دەگونجێ، چونکە دەڵێ: دوای ئەوەی لە سەرەتای ڕێگادا، گیان و سەری منت وەلانا، ئیتر عومری منیش، بەبێ هاوڕێکردنی تۆ، تێپەڕی.

**٤- عومرێکی بێ لەبت گوزەرا؛ بۆمە مردنە**
**وەک مردنی بەرابەری تۆ، بۆمەیە حەیات**

واتە: ئەو تەمەنەی کە بەبێ ماچکردنی لێوت تێپەڕی، بۆ من وەک مردن وابوو. هەروەک ئەوەی ئەگەر لە پێناوی تۆدا بمرم، وەک ئەوە وایە ژیانێکی تازە و سەرلەنوێم دەست بکەوێ.

**٥- یاڕەب! دەبێ هەر ئەمن و ئەتۆ بین، بەبێ ڕەقیب**
**بگرم؛ لە گەردنی بخەم، ئەو زوڵفی تا بەتات**

یاڕەب: یاخوا، خوا بکات.



واتە: تۆ بڵێی خوا وا بکات ڕۆژێک بێت؛ هەر من و تۆ بین و ناحەزان ئاگایان لێمان نەبێ و دەست بخەمە ئەو سەروبسک و قژەتەوە و تاڵ تاڵ قژەکەت یاری پێ بکەم و لە گەردنی خۆمیان بهاڵێنم!؟.

**٦- وەعدەت بەوەسڵ بێنییە جێ، هات و دەوڵەتە**
**چ بکەم ئەگەر نەهاتی! چ دەکرێ لەگەڵ نەهات؟**

وەعدە: پەیمان، بەڵێن.

وەسڵ: دیدار.

هات: پیت و فەڕ و خۆشی و بەرەکەت و دەسەڵات، تەنانەت تا ئاستی ئەوەی لە دەسەڵاتی «دەوڵەت»یش نزیک بێتەوە، کە پێچەوانەکەی «نەهات»ە.

واتە: ئەگەر بەڵێنەکەت بەجێ بگەیەنیت، کە وتت یەکتر دەبینین، ئەوا بەختم باشە و فەڕ و بەرەکەت ڕووم تێدەکات. خۆ ئەگەر بەڵێنەکەت بەجێ نەگەیەنیت، دەسەڵاتم چییە و لەگەڵ «نەهاتیی» و بێ بەختیدا چ دەکرێ!؟.

**٧- بۆ ئیمتیازی بەینی من و عاشقانی تۆ**
**یەک بۆسە کافییە، کە کەرەم کەی بەئیلتیفات**

واتە: بۆ ئەوەی جیاوازییەک لە نێوان من و عاشقانی ترتدا هەبێ و دیاری بکرێ، دەخوازم بەبەخشندەیی خۆت، ماچێکم پێ ببەخشیت.

**٨- خوێنی منت حەڵاڵە، بەشەرتێکی خۆت بڵێی:**
**ماچێ لە کونجی دوو لەبی خوێنیمە؛ خوێن بەهات**

کونج: لێواری لێو.

خوێن بەهات: خوێن بایی.

واتە: بۆ ئەم ماچ بەخشینەش (کە لە بەیتی پێشوودا ئاماژەمان پێ کرد) بەو مەرجەی خۆت بەدەمی خۆت بیڵێی کە نرخی ماچی لێوی ئاڵم، خوێن بەهاتە، ئەوا بفەرموو ئەو ماچەم بدەرێ، تا منیش خوێنمت حەڵاڵ بکەم. یان: تا دوای ماچکردنەکەت و لەسەر ماچکردنەکەت: بمکوژن.

**٩- شام و سەحەر، دوعاتە «ئەدەب» بۆ ویساڵی یار**
**جـارێکی وا نەبوو، بەئیـجـابەت بگا: دوعـات**

شام: شەو، ئێوارە.

سەحەر: بەربەیانیان.

ئیجابەت: بەجێهێنان، بەجێ گەیاندن، مەبەست گەیشتن، گیرابوون.

واتە: شەوان تا بەرەبەیان، هەر پاڕانەوە و دوعای زۆرم لە خودا ئەوەیە، کە دیداری یارم بەنسیب بێ، کەچی هەموو دوعاکانم، گیرا نەبوون.



## ٢٣

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن مەکفووف ئەخرەب مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن) وەک نموونەی:

١- ما یەک نەفەسەک من دیتن سەبر و قەرارەک
قـەد بێ تەوبێ تە دیتن مـثلی سـەهێ من
«مەلای جزیری، ٤٥٦»

٢- تا پێنەکـەنێ گـوڵ؛ بەدەمی بادی سـەباوە
نەمگوت: کە شەوێ بلبلی بێچارە هەقی بوو
«نالی، ٣٧٨»

٣- ئەو گەوهەری بەحری کەرەم و ڕەحمەتی خالق
لوتف و کەرەمت بەحرە؛ ئەدا مەوجی منەووەر
«حەمدی، ٧٠»

**١- بەو خیلقەتە شیرینە، کە خولقا قەدی ڕەعنات**
**هەر من بەتەنێ شیفتە نیم، عالەمە شەیدات**

خیلقەت: پێکهاتوو، دروستکراو، شێوە.

بەو خلیقەتە شیرینە: بەو شێوە جوان و شیرینە.

ڕەعنا: شۆخ و شەنگ.

شیفتە: سەودا؛ پەرێشان، شەیدا.

واتە: ئەو بەژن و باڵا بەرز و ڕێک و ڕاستـەت، کە بەو شیرینییە پێکهاتووە و دروستکراوە، هەر بەتەنیا من شەیدای نیم، بەڵکو خەڵکێکی زۆر، شەیدا و سەراسیمەت بووە.

**٢- گەر قیبلەیی ئیسلامە، ئەگەر موعجیزی زەردەشت**
**قـیبلەی مەیە ئەمڕۆکە، فـروغی روخی زیبـات**

فروغ: پرشنگ، ڕووناکیی.

روخ: ڕوخسار.

زیبا: جوان.

واتە: ئەو ڕووناکییەی کە لە ڕوخساری تۆدا تیشک دەداتەوە و دەدرەوشێتەوە، بۆ من بۆتە جێی قیبلە؛ ئیتر نازانم درەوشانەوەکەی ڕوخسارت وەک درەوشانەوەی کامە ڕەمز و کامە مەڵبەندی ئایینەکانە، ئەوەیان گرنگ نییە، تا بزانم «ڕووناکیی» تایبەتە بەئایینی زەرتوشت، یان بە: نووری قیبلەی ئیسلام.

**٣- مەخمووری سوراحی شەوە، مینایە لەبەر خەو**

**من بم بەفیدای غەمزەیی ئەو نێرگسی شەهلات**

مەخموور: سەرئێشەی دوای خواردنەوەی مەی.

مینا: مانای گەلێک زۆرە: ناوی باڵندەیەکە، ناوی گوڵێکە، چین و توێکڵی دیوی دەرەوەی دندانە، شووشەی بلوورینی سپی ئاوە، پەرداخ و دەفری مەیە، خواردنەوەی مەیە بەیەک قومی پڕ تاسە و ئارەزووەوە، بەندەر، هێمایە بۆ ئاسمان، هێمایە بۆ چاوی سپی، شووشە و ئاوێنەی ڕەنگاوڕەنگە... (دهخدا، بەرگی ١٤، ل ٢٢٠١٠) و (المعجم الذهبی، ص ٥٥٤). بەڵام لێرەدا هێمایە بۆ ڕەنگی سپی بوونی چاو، کە بەهۆی مەی خواردنەوەوە، ڕەنگی سپی و خەواڵوو دەنوێنێ.

نێرگسی شەهلا: نێرگس مەبەست لە چاوە و شەهلاش بەمانای کەژاڵ. بەڵام «نێرگسی شەهلا»: ناوی جۆرە گوڵێکی بۆن خۆشیشە، کە نزیکە و بەهاران دەڕوێ؛ کە لێرەدا هەر هێمایە بۆ: چاو.

واتە: چاوەکانت؛ کە خەواڵوون، هۆی ئەوەن کە شەوی ڕابووردوو مەستی مەیخواردنەوە بوویت و ئێستا ئەوەندەت لێ جوانە، حەز دەکەم، خۆم بەقوربانی ئەو چاوە کەژاڵانەت بکەم.

«نالی» دەڵێ:

بەنەشئەی سستیی و مەستیی، وەها مەستوور و مەخموورە
نزانم خەو لە چاوتدایە، یا چاوت لە خەودایە!
«٥٥٧»



**٤- سەودایی برانی سەری خۆیە دەسەریدا**

**هەرکەس وەکو زوڵفت دە سەریدا هەیە: سەودات**

واتە: هەرکەس ئەوینی تۆی لە سەردا بێ، دەبێ بۆ هەمیشە ئەوەی لە سەردا بێ، کە چۆن ئەوەی زۆر لە سەری تۆ نزیکە (کە مەبەست قژە سەرە و قژە سەریش دەبڕدرێ و دەقرتێنرێ) ئاواش سەریان دەقرتێنرێ.

**٥- ئەمرۆکە ئەگەر لێمە، کەنارە، قەدی سەروت**

**هەر شەو، لە کەناری منی زاری، بەخەیاڵات**

واتە: قەد و باڵای وەک سەرووی بەرز و زراڤت، ئەگەر ئەمڕۆ لە من دوورەپەرێزە، یان لات وا بێ بەهۆی زیزبوونتەوە، لێم دوور بێ، بەڵام هەموو شەو، بەخەیاڵ تا بەیانی، شێوەی باڵات دەهێنمە پێش چاوی خۆم و بۆت دەگریم و فرمێسکت بۆ دەڕێژم و بەو فرمێسکانەم، چەم و ڕووبارێک بۆ پاراوکردنی سەرووی قەدت ساز دەکەم و هەموو شەو لە کەنار و لەتەکمدایت.

**٦- طورەت بەدەمێ دەکا زیندە، سەد دڵی مردە**

**ئیعجازی مەسیحێکە؛ دەکا: زوڵفی چەلیپات**

واتە: بسکەکانت و کاکۆڵەکانت، بەلەرینەوە و جووڵانەوەیەکیان، سەد دڵی مردوو زیندوو دەکەنەوە؛ لەوە دەچێ ئەم کاکۆڵانەت، کە بەیەکداچوون و شێوەی چوار مێخ «چەلیپا = سەلیب» یان پێکهێناوە، موعجیزەی مەسیحیان هەیە، بۆیە گیان بەمردووان دەبەخشن.

«حەمدی» دەڵێ:

بەزونار و چەلیپا؛ بۆچی مل نادەم، کە وەک زوڵفە
لە سەبحە و طەیلەسانم چی؟ ژنانە موور و بەرموورێ!
«٣٧٤»

**٧- بۆیەم بەدەستی خۆ، بەسەری زوڵفەوە بەستی**
**تا ماچی کەم ئەعزات؛ لەسەر دوشەوە تا پات**

ئەعزات: ئەندامەکانی جەستەت.

دوش: شان، سەردوش: سەرشان.

واتە: هەمیشە حەزم دەکرد لە تەوقی سەرتەوە تا بەرپێت ماچ بکەم، بۆیە بەدەستی خۆم، خۆم لە تەوقی سەرتەوە بەزوڵفەکانتەوە بەستەوە، تا زوڵفە شۆڕەکانت، کە بەسەرتاپای باڵاتدا، تا بەری پێت شۆڕبوونەتەوە، خۆم بەهەڵواسراوی بەشانتدا داگەڕێم و لە سەرەوە، تا خواری بەرپێت، هەموو ئەندامەکانی جەستەت ماچ بکەم.

«سالم» وێنەیەکی نزیک ئەم مەبەستەی «ئەدەب»ی هەیە:

تەمام بوو حەلقەکەم دەستم لە قەددت، زوڵفت ئاڵۆزا
نیهان بوو مەتڵەبم، وا کەوتە سەریەک، موو بەسەر موودا
«٢٠»

**٨- بەو جیلوەوە صەخرەی صەمما، دەخەیە ڕەقس**
**لۆمەی نییە: زاهید؛ کە ئەتۆی دی، بەسەما هات**

صەخرەی صەمما: بەردی زۆر سەخت و ڕەق، خارا.

ڕەقس: سەما.

واتە: تۆ هەر ئەوەندەی دەرکەویت و خۆت نیشان بدەیت، ئیتر کەس خۆی لە جێی خۆی پێ ناگیرێ و بەردی ڕەق و بێ زمانیش دەخەیە جموجووڵ و سەما، بۆیە «زاهید»ی داماویش، کە لە دەمێکەوە دەیویست دان بەخۆیدا بگرێ و نەبزوێ، کەچی هەر ئەوەندەی چاوی پێت کەوت، بەجووڵە و سەما هات.

«نالی» دەڵێ:

سوفیی خەڵوەنشین، بۆ نەزەرێکی گوڵی رووت
ڕەنگە وەک نەرگسی تەڕ، چاوی سپی بێت و دەرێ
«٦٥١»



«وەفایی» دەڵێ:

ئەو غەمزە؛ کە چاوی بەشەهیدان دەفرۆشێ
چی زاهیدە، ئەو زوو: دڵ و ئیمان دەفرۆشێ
«١٩٨»

**٩- سەرمایەیی عیشقت صەنەما! دڵ بوو، ئەویش چوو**
**عوززا سیفەتان عیشوە فرۆشن؛ ئەمنیش: لات**

صەنەما: بانگەوازە بۆ: ئەی بتەکەم.

عوززا و لات: دوو بتی سەردەمی پێش ئیسلامن، بەڵام مانای واژەی «لات» لە کوردی و لە فارسیشدا «هەژار» دەگەیەنێ، بۆیە ڕازاندنەوەی وێنە شیعرییەکە، لە هەڵبژاردنی هێمای هەژارییەکەیدایە. جگە لەوەی لە هەڵبژاردنی «بت»دا، کە لە بەرد دروست دەکرێن، ئەگەر بتەکان جوانیش بن، بەڵام چونکە نامیهرەبان و دڵڕەقن و هەمیشەش پێویستیان بەقوربانیی و شاباشە، کە من «ئەدەب» بۆ ئەم قوربانییە، هەر دڵم هەبوو، ئەویشم لە پێناوتدا دانا و ئیتر سەرمایەیەکی تر شک نابەم.

**١٠- شیرینە ئەگەر گوفتەی من، وەک لەبی قەندت**
**مەوزونە وەکو شیعری «ئەدەب»، قامەت و باڵات**

واتە: ئەگەر قسەکانم شیرین بن، ئەوە هی ئەوەیە کە لێوە شیرینەکانی تۆم ماچ کردووە و کامی ماچەکەت گەییوەتە ناخم و ئەم شیعرانەش چونکە لە ناخمەوە هەڵدەقوڵێن، بۆیە شیرینی لێوی تۆیان پێوەیە. شیعرەکانم ئەگەر «کێش و سەروا»یان ڕێک و ڕاست بێ، ئەوە هۆی ئەوەیە، کە دوای سەیرکردنی بەژن و باڵای ڕێک و ڕاستت، شیعر دەنووسم و ڕەنگدانەوەی باڵای ڕاستی تۆیە، وا شیعرەکانیشم مۆسیقایان ڕێک و تەواوە.

## ٢٤

کێش: بەحری هەزەج: (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن) وەک نموونەی:

١- حەبیبێ بێ خەتا کوشتم ب دەربا فورقەتێ ئاخر
ژ وێ رۆژێ دزانی من کو یار ئەو تیر ل جەرگیدا
«مەلای جزیری، ٣٩»

٢- بەمیعراجی سولووکی سالیکاندا تا نەچی ڕۆژێ
لە ناو جەهلی مورەککەبدا دەمێنی، هەروەکو ماوی
«نالی، ٦٨٥»

٣- زەمانی بەزمی ڕەندانە، بدە ساقی بەپەیمانە
لەبەر تەعزیمی مەیخانە، بلێن پیری موغان بابێ
«کوردی»

**١- سەحەرگاهان شکۆفەی دا، گوڵی نازت لە گوڵزارت**
**لە سەد جێ کەوتنە ناڵین هەزاران عاشقی زارت**

سەحەرگاهان: بەربەیانان.

شکۆفە: چرۆ.

واتە: بەرەبەیانان، کە نازە وەک گوڵینەکانت، لە باخی جوانیتا، چرۆی دەرکرد، ئەوانەی دڵیان لاتە و ئەویندارى تۆن، لە سەد جێگەوە کەوتنە ئاخ و ئۆف و حەسرەت هەڵکێشان بۆت.

**٢- خوداوەندا! چ جانبەخشن دوو گوڵبەرگی تەڕ و تازەت**
**تعالی الله چ ڕەنگینن دوو نەورەس؛ گوڵبەدەم نارت**

خوداوەندا!: بانگەوازە بۆ ڕامان و سەراسیمەبوون لە بەرامبەر جوانیدا.

جانبەخش: گیانبەخش.

گوڵبەرگ: گەڵای گوڵ، کە لێرەدا مەبەست لە ڕوومەت و لاجانگە وەک گوڵینەکانی یارن.

تعالی الله: دیسانەوە سەراسیمە دەربڕینە لە بەرامبەر جوانیدا.



نەورەس: تازەپێگەیشتوو.

نار: هەنار؛ گوڵبەدەم نار: گوڵە هەنار، کە لێرەدا هێمایە بۆ گۆی مەمک.

واتە: ئای لە گەورەیی خوا! ئەو دوو ڕوومەتەت چەند ڕەنگینن، هەر دەڵێی دوو پەڕە و دوو گەڵای گوڵی تەڕ و تازەن و سەیرکردنیان، گیانی تازە زیندووکردنەوە بەبەرجەستەدا دەکەن – ئەی ئەو دوو گۆی مەمکانەت! خودایە! چ ڕەنگیان جوانە، هەر دەڵێی گوڵە هەنارن.

**٣- بەغەمزێکت لەسەر کوڵمت وەلاچوو زوڵمەتی گێسوو**
**یەدی بەیزای هەیە قوربان، دەڵێی ئەو چەشمی بیمارت**

زوڵمەت: تاریکایی.

گێسوو: بسک و قژ.

یەدی بەیزا: دەستی سپی.

واتە: کە تیلەی چاوە گەشەکانت، درەوشایەوە، تاریکایی بسکەکانت لەسەر کوڵمەکانت نەما؛ زۆر سەیر بوو! دەڵێی چاوە هەمیشە مەستەکانت، وەک دەستە سپییەکانی حەزرەتی مووسا، کە دەدرەوشانەوە؛ چاوی تۆش هەمان درەوشانەوە و هەمان موعجیزەیان تێدایە، کە ئێمەی ئەویندارت، هەرکە سەیری چاوت دەکەین، ئازار و نەخۆشیی لە گیانماندا نامێنێ.

«سالم» دەڵێ:

سەهلە گەر مووسا، عەسای کردە حەیی و سەهمی نواند
موعجیزەی دا دڵبەرم، هەردەم بەمووی گێسوو دەکا
«٣١»

«مەحوی» دەڵێ:

تەرسا بەدینی ئەو، یەدی بەیضایە بوونە جووی
بۆ کوشتنم؛ کە دەستی دەرێنا لە باخەڵی
«٣٠٧»

**٤- خەدەنگی غەمزەکەت: ئەڵماس و دڵ وەک: شیشەیە، نازک**
**کەسێ دێوانەیە وەک من؛ ئەگەر بووبێتە پەیکارت**

پەیکار: بەرەنگاریی، بەرهەڵستی، مشتومڕی قسە. بەڵام لێرەدا هەر مەبەستی بەرەنگاریی و ڕووبەڕووبوونەوەیە.

واتە: تیری تیلەی چاوی تۆ، وەک ئەڵماسە و دڵی منیش شووشەیەکی ناسک و تەنکە؛ دەشێ هەر کەسێکی داماوی شێتی وەک من مەبەستی ڕووبەڕووبوونەوەتی هەبێ، ئەگینا کێ بەرگەی ئەڵماسی غەمزەکانت دەگرێ!؟.

**٥- دەزانم جانی شیرینم، بەهای لەعلی لەبت نابێ**
**بەڵێ، ناچارییە مایە، کە بێمایەم خەریدارت**

بەها: نرخ.

خەریدار: کڕیار.

واتە: دەزانم گیانی من نرخی ماچی لێوە ئاڵەکانتی تێدا نابێ؛ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چبکەم! من هەر یەک تاقە گیانم هەیە و لەوە دەچێ کڕیارێکی کەم سەرمایە بم.

**٦- ئەگەر باری خەمی تۆیە، ئەگەر جەوری ڕەقیبی تۆ**
**بەشەرتێ تۆ نەڕەنجی لێم؛ ئەمن ڕازیم بەهەر بارت**

واتە: تۆ هەرچۆنێکت پێ خۆشە و هەر بەو مەرجەی لێم نەڕەنجیت و زویر نەبیت، ئامادەم بەدکارییەکانی ناحەزانیشمان لە ئەستۆ بگرم و تۆش، خۆت، هەر جۆرە ئازار و خەمێکم پێ دەچێژیت، هەمووی پەسەند دەکەم و بەهەموو شتێکت ڕازیم.

**٧- مەکە باوەڕ بەدیدارێ، لە تۆ تێر بێ: دڵ و دیدەم**
**بەدیدارت، هەتا مردن، ئەگەر تێر بم لە دیدارت**

واتە: تۆ لای خۆتەوە ئەگەر بەو یەکتر دیتنانە، ئۆخژنت دەگاتێ و پێی دڵشاد دەبیت، من هەرگیز بەدەیان دیدار و دیدارت تێر نابم و ئەگەر هەتا ڕۆژی مردنیشم، لە دیدارتدا بم، سوێند بەڕوخسار و دیدارت، لێت تێر نابم.



**٨- گرفتارم بەدامی تۆ، وەفادارم بەعەهدی تۆ**
**دەبێ تۆ بی و وەفای عەهدت نەبێ قەت بۆ گرفتارت**

واتە: من کە گیرۆدەی داوی پەیمانت بووم و بڕیاری تا سەرم لەتەکتدا داوە، ئیتر بەلامەوە مەرج و گرنگ نییە، هەرچی پەیمان و بەڵێنێکت داوە؛ دەبێ هەمووی جێبەجێ بکرێت، چونکە تۆ بەوەوە لای من جوانیت، کە پابەند و دڵبەستەی پەیمان و بڕیاری خۆت نەبیت.

**٩- عیتابت وەک خیتابت، تۆ گەوارایە بەمە گیانە**
**کە حەنزەل شەهدی شیرینە، بەئەلفازی شەکەر بارت**

عیتاب: گلەیی و سەرکۆنە.

خیتاب: ئاخاوتن، دواندن، گفتوگۆ.

گەوارا: زوڵاڵ، سازگار، ڕەوان.

حەنزەل (حنظل): گوژاڵک، حوشترخۆر، ڕووەکێکی ژەهرین و یەکجار تاڵە، لە بیاباندا دەڕوێ و حوشترخۆری پێ دەڵێن.

ئەلفاز (الفاظ): قسە، دواندن.

واتە: هەموو شتەکانی تۆ؛ چ گلەیی و چ سەرکۆنە و چ گفتوگۆی ئاساییت، هەموویان سازگار و زوڵاڵ و ڕەوانن بەگیانم، تەنانەت کە واژەی «حەنزەل» بەدەمتا دێت، چونکە قسەکردنەکانت شیرینن، ئەویش لەگەڵیاندا وەک هەنگوینی لێ دێت.

«مەولانا خالیدی شارەزووری» دەڵێ:

پاسخ تلخت بلب وه که چه شیرین بود
لذت شکر گرفت زهر ز آمیختن
«٥٥٢»

**١٠- سەر و سامانەکەم تابوو، نەبوو کەس بۆ سەروکارت**
**لە بێ سامانیی وێستا، دەگەڵ غەیرە، سەروکارت**

واتە: تا من دەمتوانی سەروسامانی دڵ و گیانمت بخەمە پێناو، کەسی تری وەک من نەبوو، بەڵام ئێستا، کە دڵ و ڕۆح و سەرم لە پێناوتدا تیاچوون و ئیتر لەوجۆرە سامانانە

شک نابەم تا بەردەوام پێشکەشتی بکەم، ئەوا تۆ مەیلی منت بەلاوە ناوە و ڕووت لە من وەرگێڕاوە و هەمان ئەو سەودایەی لەگەڵ مندا دەتکرد، لەگەڵ خەڵکانی تردا دەیکەیت؛ بۆیە لەبەر ئەم بەرنامە تازەیەت، سەری منت ناپەرژێ.

«نالی» دەڵێ:

ئەگـەر سـەر بوو، ئەگـەر دڵ بوو، ئەگـەر ڕۆح
هەمـــوو ڕۆیین، چیـــیـــە ئیـــتـــر تەمـــاتان؟

**١١- لەبەر تازە گـرفـتـاران، دەزانم مـەیلی مـەت ناوە**
**بلا جارێ لەمەش پرسە، کە ئێمەش بووین گرفتارت**

مەیلی مەت ناوە: مەیلی منت بەلاوە ناوە و منت لەبیر چۆتەوە.

بلا: با.

واتە: دەزانم دوای ئەمەی هەموو سامانەکەمت کردە پێناوی خۆت و چونکە ئیتر هیچی ترم لا شک نابەیت، بۆیە ڕووت لە خەڵکی تر کردووە و منت لەبیر چۆتەوە، بەڵام تکا دەکەم تا ئەو ئاست و ڕادەیەم لەگەڵدا مەکە و لە منی گرفتاری پێشووشت بپرسەرەوە.

**١٢- «ئەدەب» بەو غایەتەش یارت نەبوو، نامیهرەبان، ئەمما**
**لە ئاهی ئاتەشینی تۆ، خودا گـیر بێ سەبەب کارت**

غایەت: مەبەست، نیاز، ئاست، ئەندازە.

ئاهی ئاتەشین: ئاهی ئاگراویی.

واتە: «ئەدەب» لە هەموو دڵییەوە و بەهەموو میهرەبانیی خۆیەوە، دڵدارت بوو، بەڵام سۆنگەی ئەم خۆ نەبانکردنەت، دەدەمە ئاهی ئاگرینی خۆت، تا هۆکار بسووتێنێ.

لە فۆلکلۆری کوردیدا دەوترێ:

مـــاڵی باوکت ســـەربەژێر بێ
ئیـــزرائیل بەمـــاڵتـــان فـێـــر بێ
کێ تۆی ڕەنجاند، قورئان گیر بێ



**٢٥**

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن) وەک نموونەی:

١- گەر دوو سەد پەیکان دنێڤا دل ب وان دێ خوەش بووان
هەردەمێ کـەوکـەب بدینا نەجم و پەروین بێ حـیـجاب
«مەلای جزیری، ٧٩»

٢- لێم حـــەرامـــە: دانەو و ئاوی حـــەمـــامـــاتی حـــەرەم
من کـــە بازی دیدە بازم، نەک شـەوارەی دەســتـــەمـــۆم
«نالی، ٣٠١»

٣- دای لە قـافـڵـەی عـەقڵ و بردی ڕەهزەنی عـیـشـقت بەتاو
تا حـــەشـــر ناگـــەم بەگـــەردی، من پیـــادە و ئەو ســـووار
«سالم، ٦٠»

٤- دادخـــواهی مـــەحـــشـــەر و پشت و پەناهی مـــوئمـــینان
هەمنشـــــینی زاتی دنیـــــا، ئافـــەرینم ڕەحـــــمـــــەتێ
«حەمدی، ٦٠»

**١- لەو دەمەی سەر ڕشتەیی زوڵفی خەمی تۆم کەوتە دەست**
**بۆ خەمی زوڵفت، سەری ڕشتەم هەموو دەرچوو لە دەست**

ڕشتە: دەزووی بادراو، پەت، هەوسار، هەر شتێ کە چەند شتێکی تریش پێکەوە کۆ بکاتەوە، وەک دەنکە دەنکەی تەسبیح.

سەری ڕشتەم هەموو دەرچوو لە دەست: هەموو کاروبارەکانم لێ شێواوە.

واتە: لەو دەمـــەوەی گـــیـــرۆدەی زوڵفی لوول و پڕچین و ئەڵقـــەی تۆ بووم، هەمـــوو کاروبارەکانم لە دەست دەرچوون؛ یان: هەموو کاروبارەکانم لە پێناویدا بەخشیوە.

«مەولانا خالیدی شارەزووری» دەڵێ:

بازم از سودای مهر وی درون پر ماتم است
رشتەی کارم ز زلف درهمش خم در خم است
«٤٨٦»

«نالی» دەڵێ:

سەری زوڵفت، کە ڕشتەی عومری خضرە، نیوە هەودایە
چ هەودایە؟ کە هەر حەلقەی دوو سەد زنجیری سەودایە
«٥٥٦»

«وەفایی» دەڵێ:

بەڵێنی ڕاستە، گەردەن کەچم، بێ ڕستی دەستی وی
قەللادە و ڕستە، بۆ من؛ پەرچەمی ئەم سەروە نەورەستە
«١١٧»

**٢- ساقیی مەستان ئەتۆ بی و چاوی مەستت: جامی مەی**
**زاهیدی سەد ساڵە، تا دێنێ، دەبێتە مەی پەرست**

واتە: ئەگەر لە کۆڕی بەزمی مەیخواردنەوەدا، تۆ ببیتە مەیگێڕ و چاوە مەستەکانیشت بینە پەرداخی مەی، بێ گومانم زاهیدی پیری تەمەن سەد ساڵەش، گیانی دەکەوێتە سەر ئەرەق دەرکردن و دەبێتە مەیخۆر.

«مەحوی» دەڵێ:

١- وەرنە سەیری سەرخۆشان! ئەو شۆخی مینا گەردنە
بوو بەساقی،دەم بەشەککەر خەندە دێ، مینا بەکەف[1]
«١٧٤»

٢- چاوی مەیگوونت وەها مەیخانەی ئاوا کردەوە
چۆڵی کرد ئاخر بەزاهید: خەڵوەخانەی شەعبەدە
«٢٧٣»

«وەفایی» دەڵێ:

شکا پشت و دڵی من، بۆ وەفاتی پیری مەیخانە
بەچەرخێکی فەلەک وای کرد؛ نە جامم ما، نە میناکەم
«٧٦»

(١) مینا بەکەف: مینا: مەی، بادە. یان: شووشەی مەی. بەکەف: بەدەستەوە و بەسەریەکەوە دەبێتە: شووشەی بادە بەدەستەوە.



**٣- بۆ شکستی قەسری دینم، جووتە ئەبرۆی تاقی تۆ**
**چونکە نووری ئەحمەدیی بوو، تاقی کیسرا بوو شکەست**

شکست: شکان، ڕووخان، بەزین.

نووری ئەحمەدیی: نووری ئایینی محەمەد (ئاییینی ئیسلام).

واتە: نووری ئاییینی ئیسلام، چی بەسەر چارەنووس و تێکشکانی «ئەنەوشیروان» و «تاقی کیسرا» هێناوە، تاقی برۆی تۆش هەمان کاری بەکۆشک و تەلاری من هێناوە.

لە کۆکردنەوەی «تاقی برۆ» و «تاقی کیسرا»دا، وردەکاریی زۆر شاعیرانە هەیە.

«مەولانا خالید» «تاقی کیسرا»ی بۆ مەبەستێکی تر ئاوا بەکاربردووە:

چشم عبرت بگشا و طاق کسری را ببین
پردەدارش عنکبوت وجغد نوبت زن بود
«٥٠٠»

**٤- غەمزە؛ چی کردی دەگەڵ مە، ئیسمی مەستی خستە سەر**
**چونکە زانی دەستی ئاخر؛ جورمێ ناگیرێ لە مەست**[1]

غەمزە: نوارین بەتیلەی چاوی پڕ ناز.

ئیسمی «مەست»ی خستە سەر: ناوی «سەرخۆش»ی لێ نا.

دەستی ئاخر: ئەنجام، ئاکام.

جورم: تاوان.

واتە: ئەوەی بووە سۆنگەی ئەم چارەنووسەمان، هەر لە ئەنجامی ئەو نوارین و سەیرکردنەوە بوو، کە ئەم هەموو کارەساتەی بەسەر هێنایین. چونکە هەر بەهۆی ئەو نوارین و نیگاکردنەیەوە بوو، ئێمەی شەیدا و سەودای خۆی کرد و کارەساتی زۆری بەسەر هێنایین، بەڵام (یار)، کە خۆی پێشەکی دەیزانی ئەم هۆی نیگاکردنەی دەبێتە سۆنگەی

(١) جێی سەرنج و سەرسوڕمانە، کە دکتۆر مارف خەزنەدار ئەم ڕستەی: «غەمزە، چی کردی دەگەڵ مە»، بە«غەمزەچی کردی دەگەڵ مە»ی خوێندۆتەوە و پێی وابووە: «غەمزەچی» بەمانای ڕەقیب و ڕەخنەگر دێت!... لە کاتێکدا واژەی «غەمزە» بەجیا و سەربەخۆیە و لەگەڵ ڕستەی «چی کردی دەگەڵ مەدا» تێکەڵ ناکرێ. هەر لەبەر ئەمەشە؛ مانایەکی تری بۆ ئەم بەیتە دروست کردووە؛ کە ناڕاستە. (بنوارە: عەبدوڵڵا بەگی میسباح دیوان، شاعیری گەورەی خاکی موکریان، ل ٢٨).

زۆر تاوان، بۆیە گردەبڕ و لە پێشدا و بۆ ئەوەی هیچ تاوانێکی لێ نەگیرێ و سزا نەدرێ، هات ئەوەی ڕاگەیاند، کە مەست و سەرخۆشە و سەرخۆش و مەستیش لە بەرامبەر یاسا و دادگادا، سزایان کەمە و بەمجۆرە خۆی لەو هەموو تاوانە دەرباز کرد، کە دەبووایە سزاکەی لە ئەستۆ بگرێ.

«مستەفا بەگی کوردی» دەڵێ:

١- چاوی خوێنخۆری بەخوێنم، فێرە وەک: لێوی؛ بەمەی
لێی گەڕێن توبی خودا، ئەو «مەستە» ، با بیخواتەوە
٢- چاوەکەت بۆ قەتڵی من، هیچ ڕەحم و ئەندێشەی نییە
حاکمێ مەست بێ، هەمیشە مەیلی غەدداریی دەکا

«سالم» دەڵێ:

چاوەکەت وەختێ بەئیما مەیلی جامی مەی دەکا
هەرچی مەی دەیکا لەگەڵ ئەو، ئەو لەگەڵ ئێمەی دەکا
«٢٩»

**٥- دوێ شەوێ فەرمووت: عەهد بێ، بێ وەفایی قەت نەکەم**
**کامە شەو بوو چاوەکەم، سەد وەعدەی وا سەختت نەبەست؟!**

واتە: گیانەکەم! دوێنێ شەو بەڵێنت دامێ، کە ئیتر هەموو مەرجەکان بەجێ بگەیەنیت و لەمەودوا بەڵێن نەشکێنیت؛ کەچی هەموو شەوێ پەیمانی لەو جۆرە دەبەستیت و دوایی لێی پەشیمان دەبیتەوە و هیچی نابەیتە سەر.

«نالی» دەڵێ:

مەکە ئیخلافی ئەو وەعدەی کە فەرمووت
دەخیلت بم، کە خانەی سەبرەکەم سووت
«١٤٨»

«تاهیر بەگی جاف» دەڵێ:

هەر لەحزە ئەدەی وەعدەی وەسڵ و نییە ئەسڵی
کارت وەکو دنیایە، هەر ئەمڕۆیە بەفەردا
«٧»



**٦- ساغەری مەی، چونکە وەک جامی دەهانی تۆ دەچێ**
**دەم بەدەم بۆیێ لە مەجلیسدا دەسووڕێ دەست بەدەست**

ساغەر: دەفر و لێوان و پیاڵەی مەیخواردنەوە، دڵی عارف و خواناس، تاسە و خولیا. بەڵام «ساغەر» لێرەدا بەمانای دەفر و پەرداخی مەیخواردنەوەیە.

واتە: وەک چۆن لێوان و پەرداخی مەی، کە مەیخواران لە کاتی خواردنەوەیدا، بەتام و تاسەوە، پیاڵە و پەرداخەکە ماچ دەکەن، دەم و لێوی تۆش، هەر لە لێوان و پیاڵەی پڕ لە مەی دەچێ، بۆیە مەیخۆران لە کۆڕی خۆیاندا ماچی دەکەن و دەستا و دەست دەیگێڕن.

**٧- کامە جارە بێینە سەر دیداری ماهی تەلعەتت**
**زوڵفی عەقرەب نێشەکەت، لێمان نەبێتە بەرهەڵست؟!**

ماهی تەلعەت: مانگی ڕوخسار.
عەقرەب: دووپشک.
نێش: چزوو.
عەقرەب نێش: چزووی وەک دووپشک ئاسا.

واتە: هەر کاتێ ویستوومە بێمە سەیری دیدەنی مانگی ڕوخسارت، زوڵف و بسکەکانت، کە وەک دووپشکی چزوودار وان، لێم بوونەتە ڕێگر و بەرهەڵست.

«سالم» دەڵێ:

لە مەهتابا، کە دڵ دی پەرچەمی وەک عەقرەبت ئەمشەو
گورێزی دا لە عەقرەب، کەوتە چاهی غەبغەبت ئیمشەو
«١١٨»

**٨- چاوەکەم! قەدرم بزانە، تا لە دەستت دەرنەچووم**
**چونکە وەک ئەمنت غوڵامی باوەفا، کەم دێتە دەست**

غوڵام: ئەو جۆرە کەسانە بوون، کە لە بازاڕدا دەفرۆشران و کاسبیان پێوە دەکرا و دەبرانە ماڵە گەورە و دەسەڵاتدار و دەوڵەمەند و وەک نۆکەر و خزمەتکار، ڕادەگیران. «ئەدەب»یش خۆی لەو جۆرە نۆکەرانە لە بەرامبەر یاردا دەبینێ.

**٩- وە نییە هەر تەنیا «ئەدەب» بێ، خەستەیی پەیکانی تۆ**
**لەو خەدەنگی ئابداری غەمزەکەت، کێ بوو خەلەست؟**

خەستە: نەخۆش، ماندوو، شەکەت.

پەیکان: تیر، قەمە.

خەدەنگ: ڕم.

خەلەست: ڕزگار بوو، دەرباز بوو، قورتار بوو.

واتە: هەر تەنیا من «ئەدەب» نیم، کە ئەنگێوراو و پێکراوی تیر و ڕمی تۆ بووبم، بەڵکو هەرچی شەیدای سەیرکردنت بووە، گیرۆدەت بووە و بۆ هەمیشە، نەیتوانیوە لە دەستت دەرباز بێ.

واژەی «خەلەست»، داڕشتنەوەیەکی کوردانەی واژەی «خەلاص»ی عەرەبییە، کە کورد لە دەمێکەوە ئەم واژەیەی بەمجۆرە کوردانەیەی خۆی، لەم پەندەدا بەکار هێناوە: «هەرچی بترسێ، ناخەلەسێ».



**٢٦**

کێش: بەحری موزاریع موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن) وەک نموونەی:

١- دەستم لە گەردەنی خۆت هەڵمەگرە ئەی حەبیبە
وەبزانە خوێنی خۆمە، یا میننەتی ڕەقیبە
«نالی، ٣٩٤»

٢- کوردینە بێنە شوکری عەطییەی زەمانمان
کردی بەنۆبەرەی ژیانەوە، ناوی ژیانمان
«حەمدی، ٩٥»

٣- هەر ئەمری تۆ مەدارە بۆ کاروباری عالەم
هەرچەندە بێ وەزیر و بێ سەدر و کاروباری
«حاجی قادر، ١٤٤»

**١- لەو خۆشییەی کە قاسیدی مە، ناگەهان گەیشت**
**پەیغامی عاشقانە، بەلای ناگەهان گەیشت**

قاسید: نامەبەر، پەیامبەر، ڕاسپێردراو.

ناگەهان: ناکاو، لەپڕ، بێ پێشەکی و بێ ئاگاداریی.

پەیغام: پەیام، هەواڵ، مەبەست.

واتە: ئای لەو خۆشییەی کە ئەم نامەهێنەرە، ئاوا لەناکاودا گەیشت و پەیامی عاشقانەشی هەر لەناکاودا گەیاند.

**٢- شیرین سیفارشی جانانە؛ یا شەکەر؟**
**دوو سەد هەزار لنگە، بەیەک کاروان گەیشت**

سیفارش: ڕاسپاردە، ڕادان، ڕاسپێردراو، فەرمان، یاسا. بەڵام لێرەدا هەر مەبەست لە ڕاسپاردەیە.

لنگ: ڕاکردنی خێرا. لە فۆلکلۆری کوردیدا، کە ستایشی چوست و چالاکیی و خێرایی یار کراوە، وەک ئاکاری ماین و ئەسپی مەشق پێکراو چوێنراوە:

وێنەی مـاییـنی خـۆش تەعـلیم
فـــێـــری تەقلە و لنگدانی

مەبەستی «ئەدەب»یش لێرەدا هەر خێرا ڕۆیشتنی نامە و هەواڵهێنەرەکەیە.

«مەحوی» دەڵێ:

حەزەر لەم حەشری بێ وادەی لە قەبر هەڵسانی مردوو
بەسەر قەبری شەهیدانا، بەشۆخی لنگ ئەدا مەرکەب
«٥٠»

«حەریق» دەڵێ:

بێرە مەیدانی فەساحەت، ئەسپی خۆت لنگ دە «حەریق»
تا بزانم کێ بەشیعرت؛ سوحبەت و بازیی دەکا!؟
«١٠»

یەک کاروان: یەک قۆناغە ڕێ.

**٣- یاڕەب! چ خێر مەقدەمە ئەو قاسیدە، دەڵێی:**
**ڕۆحی ڕەوان بەپەیکەری مە، ئەرمەغان گەیشت**

خێر مەقدەم: پێ و قەدەم موبارەک.

پەیکەر: هەیکەل (کە ئەدەب مەبەستی لە جەستەی خۆیەتی).

ئەرمەغان: دیاری.

واتە: خودایە! ئەو ڕاسپێردراوە، پێ و قەدەمی چەند موبارەک و بەخێرە؛ هەر دەڵێی «گیان»ە و بەدیاری بۆ جەستەوتەنی منی بێ گیان، بەدیاری نێردراوە.

**٤- قاسید مەگەر خوجەستە قەدەمی خدری بوو، کەوا**
**مژدەی حەیات و زیندەگیی جاویدان گەیشت!**

خوجەستە: موبارەک، پیرۆز، باش، چاک. ناوی جۆرە گوڵێکیشە، بەڵام ئەمیان مەبەست نییە.

خدر: مەبەست لە خدری زیندەیە.

زیندەگی: ژیان.



جاویدان: نەمر، هەرمان، هەمیشە، هەتا هەتایی.

واتە: وا دیارە ئەم نامەهێنەر و ڕاسپێردراوە، دەشێ پێ و قەدوومی خدری زیندە ئاسا بێ، بۆیە مزگێنی زیندووبوونەوەی بۆ هەمیشە و هەتا هەتایی ئێمەی بێ گیان و مردوو هێنا بوو.

**٥- ئەی پەیکچی! کەوا لە قەدوومی موبارەکت**
**گیانی عەزیزی مە، بەبەر ئێمە، عیان گەیشت**

پەیکچی: نامەبەر، تەتەر.

عیان: ئاشکرا. واژەی «عەیان» لە بنەچەدا عەرەبییە، بەڵام فارس و لەم بەیتەشدا «عیان» فۆنەتیک دەکرێ.

**٦- سوبحانە! لەو پەیام ڕەوانپەروەرە، دەڵێی:**
**ئەنفاسی عیسەویی بەمنی ناتەوان گەیشت**

سوبحانە: خودایە، نامەخوا، پەککو، ماشەڵڵا.

ڕەوانپەروەر: گیانپەروەر.

ئەنفاسی عیسەوی: حەزرەتی عیسا، کە وتەیەکی لە زار هاتە دەرێ، مردووی پێ زیندوو دەبووەوە.

واتە: ماشەڵڵا لەو پەیامی گیانپەروەرە، کە وەک وتە و هەناسەی عیسا، بەو پەیامەی ئەم ڕاسپێردراوە، گیانم تێهاتەوە و زیندوو بوومەوە.

**٧- ئەو ساعەتە، چ ساعەتی سەعدە؛ کە پێکەوە**
**ئیقباڵ و عیزز و یوسر، عەنان دەر، عەنان گەیشت**

سەعد: خۆشیی و بەختەوەریی.

ئیقباڵ: بەخت، چارە، شانس.

عیزز: شکۆ، بەرزیی.

یوسر: خۆشیی، ئاسوودەیی، پێچەوانەی تەنگانە و نەبوونی و چەڵەمەیە.

عەنان: مانای گەلێ زۆرە، وەک: بەرەنگاریی و بەرهەڵستی و بەربەرەکانیی. هاوبەشبوونی دوو کەس لە بەشێکی تایبەتی سەرمایەکەیاندا (نەک هەموو

سەرمایەکەیان). ڕەشمە، جڵەو، هەوسار. مرۆڤی چوست و چالاک و کارامە. دوو کەس لە شتی چاکدا بەرامبەر بن. ئەوپەڕی خۆ ماندووکردن و تەقەللا بەکاربردن. ئامانج و مەبەست. لەم بوارەدا عەرەب دەڵێن «جری الفرس عِناناً». واتە: ئەسپەکە تا شوێنی مەبەستەکە، غار و تاوی دا. یان دەڵێن: «کبا الفرس عَنانه»، واتە: ئەسپەکە نەگەیشتە مەبەست و هەڵدێرا و خزا. ئەسپ، یان: ئەسپ سوار.

لەم بوارەشدا لە فارسیدا دەوترێ: «بەپێنج هەزار عەنان گەیشتە هەمەدان». یان بەپێنج هەزار عەنان لە فلانە جێگەوە تێپەڕی. ئاگری عەنان، هێمایە لە زەبر و کاردانەوەی سووتان. بەهەڵپە و هەڵمەت، چوست و بەدەستوبرد. هاوڕێیەتیکردنی یار و یاوەر. دەسەڵات پێ بەخشین و سەرپشککردن لە دەسەڵاتدا. بۆ ئەمەش دەوترێ: عەنانیان داوەتە دەست. یان: پێچەوانەکەی. ئەسپ و سوارە و پیادە و تەتەری خێرا و توند و تیژڕەو. ڕووکردنە جێگەیەک و کەسێک. غارپێکردنی ئەسپ، بەهاوشانیی و هاوتەریبی سوارێکی تر. خۆ ئامادە و تەیارکردن بۆ سواربوونی ئەسپ.

بەکورتی، لە سەرومڕی ئەم مانایانەدا مانای «عەنان» زۆرتر بەلای: ئەسپ؛ سوار، هەوسار...دا چووە و زۆرترین نموونەکانی فەرهەنگی «دهخدا»ش، کە لە تێکستی شیعری شاعیرانی فارس و قسەی نەستەق و پەنددا بەرچاوی خستوون، هەر لە بارەی ئەسپ و ڕەشمە و سوارەوەیە. (دهخدا، بەرگی ١١، ل ١٦٣٨٦ - ١٦٣٩١).

عەنان دەر: ئەگەرچی لە دەستخەتەکەی لای منیشدا هەر بەو جۆرە نووسرا بوو و منیش هەر وام ڕوونووس کردووە، بەڵام من پێم وایە کە دەبێ لە بنەڕەتدا «عەنان دار» بووبێ؛ کە لە سەرومڕی ماناکانی سەرەوە نزیکتر دەبێتەوە و ئەم زاراوەیەش دیسان هەر لە «دهخدا»دا، ماناکانی: جڵەودار، سوارچاک، شۆڕەسوار، چاپووک سوار و مانای نزیکی بەم مانایانە لێکداوەتەوە. (هەمان سەرچاوە، ل ١٦٣٩١)، کە مانای ئەم بەیتە ئاوای لێ دێت:

ئەو کاتە، چ کاتێکی بەختەوەرییە، کە ئەو شۆڕەسوار و چاپووک سوارە، سەربەرزیی و عیززەت و خۆشیی بەسەریەکەوە و پێکەوە بۆ هێناین!.

خۆ ئەگەریش «عەنان دەر» بێت، ئەوا هەر مانای نزیک بەم مانایە؛ واتە: چاپووکیی بەخشین و ژیانەوە و بووژێنەرەوە دەبەخشێ.



**٨- ساقی! بدە شەراب، بەجامی لەبالەبت**
**پێش ئەز ئەوەی کە: جامی ئەجەل بۆ مەمان گەیشت**

جام: دەفر و پیاڵە و پەرداخی مەیخواردنەوە؛ کە لە سەرەتادا ئەم دەفرە لە تەختەدار دروست دەکرا. بەڵام لە دێرزەمانەوە جووەکان خوویان بەدەفری شووشەوە گرتووە و جام و پەرداخی مەیخواردنەوەیان ڕەنگاوڕەنگ کردووە و نەخش و نیگاری جۆراوجۆریان تێدا نەخشاندوون.

جامی لەبالەب: مانای زۆری هەیە، وەک: جامی شەرابی پڕ؛ کە تا سەر لێوی دەفرەکە پڕ لە مەی بێت. یان: ئەو دەفری مەیەی لە کۆڕی مەیخۆراندا دەستا و دەست دەگەڕێ و هەموو بەشداربووان لێوی پێوە دەنێن. یان: ئەو جۆرە مەیخواردنەوەیەی، کە لە دوای هەر قوومێک، ماچێکی یاریش بکرێ، وەک «نالی» کە وتوویەتی:

شەرابی لەعلی ڕوممانی لە «نالی»
حەرامە، بێ مەزەی ماچێکی لێوان
«٣٢٢»

کە لەم بەیتەی «نالی»دا، «لێوان» بەمانای: کۆی پیاڵە و جامی مەی و لە هەمان کاتیشدا بەمانای: کۆی «لێو»یش دێت.

پێش ئەز ئەوەی: پێش ئەوەی.

جامی ئەجەل: پیاڵەی مەرگ؛ کە مەبەست لە سەروەختی مەرگە.

واتە: ئەی ڕاسپێردراو! گەیشتنی لەناکاوی تۆ، بۆ ئێمە و مانانی گیان تێدا نەماوی نزیکە و مەرگ، وەک ئەو مەیگێڕە وابوو، کە شەرابی زیندووبوونەوە و گیان بەبەردا هێنانەوەی داینێ.

**٩- یاران! مەکەن مەلامەتی بێ تابیی دڵان**
**بیللا کە تیغی شەوقی ویساڵی بەجان گەیشت**

مەلامەت: سەرکۆنە، بناشت، گلەیی، سەرزەنشت.

بێ تابیی: بێ ئارامیی، بێ قەراریی.

واتە: هاوڕێیان! دۆستان! سەرکۆنەی خاوەن دڵانی بێ ئارام و بێ قەراران مەکەن، کە ئەوەندە بەتاسە و شەوقەوە، چاوەنواڕی شمشێری حەسرەتی دیداری بووم، تا بەگیانم بگات.

**١٠- سەد خۆزگە بەو دەمەی، کە لەپڕ بێن بڵێن: «ئەدەب**
**لێت مـژدە بێ؛ کـە دڵبـەرەکـەی مـیـهـرەبان گـەیشت**

واتە: چەندیش خۆش دەبوو، ئەگەر لە دوای هاتنی ئەم پەیامەی یار، مزگێنی ئەوەشیان بدامـایەتێ، کـە هەروەک چۆن لەناکـاوێکدا ئەم پەیام و ڕاسپـاردە بووژێنەرەوە چاوەنوارِ نەکراوەی گەیشت، ئاواش مزگێنی ئەوەیان بدامایەتێ، کە ئەوا خودی یاری مـیـهـرەبان، خۆی لەناکاوێکدا گەیشت.



## ٢٧

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعـیل مفاعیل فعولن) وەک نموونەی:

١- گـەر شوبهـەتی پەروانە د بەزمێ تە چ سەد گـەڕ
سەد نالە هەزار ڕەنگ وەکی چەنگ و ژەهێ من
«مەلای جزیری، ٤٥٦»

٢- بێ فـائیـدەیە مـەنعی من، ئێـسـتـاکـە لە گـریان
بۆ عـــاشـــقی بێـــچـــارە، زووەم ئاوە ڕژاوە
«نالی، ٥٣٦»

٣- تـاکـــو لەپڕا کـــەوتمە ناو دۆزەخی غـــوربەت
کەم کەم سپی بوو، یادت لەسەر لەوحی خەیاڵم
«گۆران، ٤١»

**١- بەو نەقشی بەشیشەی دڵەکەم، عەکسی مەهی ڕووت**
**لاتداوە لەسەر قورصی قەمەر، مەعجەری گێسووت**

نەقشی بەشیشە: ئەو نەخش و وێنەیەی لەسەر شووشە نەخشێنراوە.

عەکس: وێنە.

مەهی ڕووت: مانگی ڕوخسارت.

قورصی قەمەر: مانگی بازنەیی (هێمایە لە ڕوخساری یار).

مەعجەر: سەرپۆش، ڕووپۆش.

واتە: ئەی ئەو کـەسـەی لەو وێنەیەتدا، کـە لەسـەر شـووشـەی دڵم بۆتم کـێـشـاوە، بەجۆرێکتم وێنە کێشاویت، کە لە وێنەکەتدا سەرپۆش و ڕووپۆشت بەسەرەوە نییە و پرچ و قژیشت لەسەر ڕووت، لاچوون و مانگی ڕوخسارت دەرکەوتووە.

(وا دیارە ئەمـجـۆرە خـۆزگـانەی شـاعـیـر، بۆ دیتنی یار، بەوجـۆرەی کـە ڕووپۆش و سـەرپۆشی بەسـەرەوە نەبێ، هەر بەخـەیاڵ لەسـەر شـووشـە و ئاوێنەی دڵی خـۆیدا نەخشـاندوویەتی... یان ڕەنگە ئەوەی لە پێشـەکـیدا، سەبارەت بەهونەری نیگارکێشانی

«ئەدەب» ئاماژەمان پێ کرد، شتێک بێت لەو بابەتە و هەر بەڕاستی «ئەدەب» وێنەی «نوسرەت خانم»ی بەمجۆرەی ئەم بەیتە، لە ژوورەکەی خۆیدا کێشا بێ).

**٢- ئاڵۆزە جیهانێ لە خەمی سونبولی خاوت**
**ئاشووبە دوو دنیا، لە شەڕی نێرگسی جادووت**

واتە: جیهانی ئێستامان، لە چین و پێچی قژ و پرچی خاوتدا گیرۆدەیە و تووشی پەشێویی و هەرا و بگرە و بەردە بووە و خەڵکیشت بەخۆتەوە دڵبەستە و خەریک کردووە و بەجارێ دەستبەرداری خواپەرستیی بوون، بۆیە بەم هۆیەتەوە، خەڵکی لەو دنیا؛ واتە: لە ڕۆژی قیامەت و لێپرسینەوەدا، بەهۆی شەڕ و فیتنەی چاوە جادوویی و نێرگسەکانتەوە، سزا دەدرێن.

**٣- قیبلەی ئەمەلی ئەهلی وەفا؛ تاقی برۆتە**
**هەرچەندە لە خوێنڕێژیی عاشق، نییەتی جووت**

واتە: بەو هۆیەوە کە خەڵکیت گیرۆدە کردووە و بوویتە قیبلەی هیوای خەڵکی و خەڵکی لەسەر تۆ؛ لە ناو خۆیاندا شەڕیانە، کەچی لەسەر ئەمەشەوە، هێشتا هەر قیبلەی هیوای هەمووکەسیت.

**٤- چینی سەری زوڵفت، کە گوتم: نافە؛ خەتا بوو**
**سەد (چین) و (خەتا)؛ بێ بەفیدای یەک ڕەمی ئاهووت**

نافە: ناووک. مەبەست لەبەر ناووکی ئاسکی ناوچەکانی «خەتا» و «خوتەن» و «چین»ە، کە بۆنێکی خۆشیان پێوەیە.

خەتا:ی یەکەم مەبەست لە «هەڵە»یە و «خەتا»ی دووەم و «چین» مەبەست لەو هەرێمانەن، کە ئەو جۆرە ئاسکە تایبەت و خاوەن بۆن خۆشانەیان تێدایە.

«حەریق» دەڵێ:

هەوای نافەی غەزالەی ڕێی «خوتەن» تووشی خەتای کردم
بەیادی میشکی زوڵفی، ڕووم لە چینی پەرچەمی ناوە
«٦٠»



**٥- وەک جیلوەیی قەدت، نییە سەروێ لە چەمەندا**
**وەک خەندەیی زارت، بەخودا خونچە نەپشکووت**

واتە: تۆ تاقانەترین کەسێکیت کە وێنەت لەم دنیایەدا نییە. چونکە ئەوەتەی سەروی قەد و باڵای تۆ، ئەم باخی ژیانەی ڕازاندۆتەوە، ئیتر دار سەرویەکی تر لەم باخە بەرینەدا بەوێنەی تۆ نییە و وەک ئەو زەردەخەنەیەشت، کە دەڵێی خونچەیە و تازە دەپشکوێ، ئیتر هیچ خونچەیەک، وەک شێوەی زارکردنەوەی تۆ، زار ناکاتەوە و ناپشکوێ.

**٦- شام و سەحەر و نیوەشەوم؛ کاری دڵی زار**
**ناڵینە لەبەر نێشی سیەهـ ماری خەمی مووت**

نێش: چزوو، پێوەدانی ددانەکانی مار.

سیەهـ مار: ڕەش مار.

خەمی موو: چین و پێچی مووی لوول.

**٧- بەو حوسن و لەتافەت؛ کە هەتە، ئەی شەهی خوبان**
**بۆ هێندە لەسەر قەتڵی گەدایە، ڕەوش و خووت!؟**

حوسن و لەتافەت: ناسک و نازداریی.

شەهـ: شاهەنشا.

خوبان: کۆی «خوب»ە، کە بەمانای: چاک و باش دێت. بەم پێیە «شەهی خوبان» دەبێتە: شای چاکان.

«حەریق» واژەی «خوبان»ی بەمجۆرە بەکاربردووە:

ئەم خوسرەوی خوبانە، کەوا دێتە نەزارەت
شیرینە ئەگەر دڵ برفێنێ بەئیشارەت
«١٤»

واتە: تۆ، بەو هەموو ناسکیی و نازدارییەتەوە، کە دەبێ یەکجار دڵنەرم و میهرەبان بیت، کەچی سەیرە! ئەوەندە ئارەزووت لە کوشتنی هەژاران و بێ دەسەڵاتانە.

**٨- ئەو ڕۆژە، کە تیرت لە دڵی مە گوزەری کرد**
**عالەم موتەحەییر بوو؛ لە ئەو قووەت و بازووت**

واتە: ئەو ڕۆژەی کە بەتیلایی چاوەکانت، تا ناخی هەستم نیگاکانت ڕۆچوون و منت گیرۆدەی خۆت کرد، هەموو خەڵک سەریان سووڕما؛ چونکە پێیان وابوو هیچ ئافرەتێکی جوان ناتوانێ دڵم بۆ لای خۆی ڕابکێشێ و خۆشم بوێ. دیارە ئەمەش نیشانەی دەسەڵاتی جوانیتە.

«هێمن» لە وێنەیەکی نزیک بەم وێنەیە، دەڵێ:

ئەمن دەمگوت لە دنیا تا دەمێنم
لەبەر کەس ئەستەمە سەر دانەوێنم
کەچی ئێستا لە داوی بسکی تۆدا
گرفتارم، گوڵم، موو ناپسێنم

**٩- صەیدی نیگەهی تۆیە «ئەدەب»، قەدری بزانە**
**عەنقایە، گرفتارە؛ بەسەر پەنجەیی تەیهووت**

صەید: نێچیر، ڕاو.

نیگەهی تۆ: نواڕین و سەرنج و تیلەی چاوی تۆ.

عەنقا: باڵندەیەکی ئەفسانەییە.

تەیهوو: باڵندەیەکی جوان و لە «کەو» بچووکترە و بەکوردی «قەتێ»، یان «هەوێردە»ی پێ دەڵێن. (بۆ زیاتر زانیاریی، بنواڕە: دهخدا، بەرگی ٥، ل ٧٢٤٧ - ٧٢٤٨).

واتە: «ئەدەب» کە خۆی بە«عەنقا» دەزانی، ئەوا ئێستا بۆتە نێچیری بەردەستی وەک شێوەی «قەتێ»ی تۆ؛ بۆیە دەبێ هەمیشە ئەوەت لە یاد بێ، کە باڵندەیەکی ئەفسانەییت ڕاو کردووە.

«مەحوی» دەڵێ:

١- بەئەفسوون و دوعا تەسخیری ئەو شۆخە چ ئیمکانە
خەیاڵی خاوە «عەنقا» ناکەوێتە داوی ئەفسانە
«٢٧٧»



٢- ڕامی عاشق بوونی ئەو وەحشی نیگارە موشکیلە
مەبیە هەرگیز ئەم قسە: «عەنقا» دەبێ وەک کەو، کەوی
«٣١٩»

٣- ئەدەب وایە کە لەم گوستاخییانەش تۆبەکەی «مەحوی»
خەیاڵی خاوە «عەنقا» ناکەوێتە داوی ئەفسانە
«٤٥٦»

«وەفایی» واژەی «عەنقا»ی لە بۆنەی مەرگی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهریدا، بەمجۆرە بەکاربردووە:

سەدای یا حەیی دەروێشان، نەوای یاهوویی دڵڕێشان
لە دەوری خانەقادا بوو بەئیسم و جیسمی «عەنقا»کەم
«٧٦»

کێش: بەحری موزاریع موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول فاعلات مفاعیل فاعلات) وەک نموونەی:

١- شوکری خودا دەکەم کە گەیشتینە وەختی چاک
تا شەو نەڕۆیی، بانگی نەدا، نەبووە ڕۆی ڕووناک
«ئەحمەد حەمدی، ١٧١»

٢- دیسان نەسیمی بەهار و کزەی شەماڵ
دیسان بەبەرگی تازەیەوە تازەبۆوە ساڵ
«حەقیقی»

٣- ئەی یاری خۆشەویستی وەفاکار و ڕاست ڕەو
وەی جێی ئومێدی موخلیسی خەمباری تیرە شەو
«شاهۆ، ٣٧٩»

**١- لەو دەم دڵی مە، چاوی بەشەمعی ڕوخت کەوت**
**تا جانی ڕۆ نەنا؛ وەکو پەروانە، نەسرەوت**

شەمع: مۆم، شەم.

ڕوخ: ڕوخسار.

تا جانی ڕۆ نەنا: تا گیانی بەخشی.

پەروانە: پەپوولە.

**٢- یەغمایی دڵ و دین بەسە، ئەی دین و دڵ فیدای:**
**غەمزێکی نازی نێرگسی مەخمووری پڕ خەوت**

یەغما: تالان، فڕاندن، دزین، زەوتکردن؛ هاوکات ناوی شارێکیشە لە تورکستان، کە بەئافرەتی شەنگ و شۆخ و جوان بەناوبانگە.

واتە: تالانیی دڵ و دین بەسە ئیتر؛ هەرچەندە هەردووکیان (دڵ و دین) دەکەم بەقوربانی تاقە نیگایەکی پڕ نازی چاوە خومارەکانی پڕ خەوت.

«حەمدی» واژەی «یەغما»ی بەمجۆرە بەکاربردووە:



دەکا یەغما بکا جانان، لەگەڵ فەردی بەشەردا شەڕ
لە دڵ: شەوق و لە دەم: زەوق و لە مل: تەوق و لە ئەفسەر: سەر
«٢٥٠»

**٣- گوڵزاری کاینات سەروبن بکەم تەمام**
**یەک تۆ، سنەوبەرێکی تەڕ و تازە هەڵکەوت**

واتە: هەموو باخ و دارستان و پارکەکانی جیهان، هەمووی بگەڕێی، لە هیچیاندا دار کاژێکی تەڕ و هەمیشە سەوزی وەک قەد و باڵای تۆی تێدا نابینرێ. بۆیە دەبێ تۆ تاقانەی ناو هەموو باخ و دارستانی دنیا بیت.

**٤- شەوڕەنگە زوڵفەکەت، لە قەد ئەو گەردنی سپی**
**ئامێزشی عەبیرە، بەکافووری جەوجەوت**

شەوڕەنگ: وەک ڕەنگی شەو، ڕەش.

ئامێزش: تێکەڵ، هاوڕێیەتی، هاموشۆ، هاونشینی، دەست تێکەڵکردن، ڕاستەوخۆ، ئاوێتەبوون. بەڵام لە نێوان ئەم مانایانەدا مەبەستی «ئەدەب» لێرەدا، تێکەڵبوون و ئاوێتەبوونە.

عەبیر: جۆرە بۆنێکی خۆشە، کە بەشێوەی گوڵاو، لە مسکی خەتا دەگیرێ و لەگەڵ زەعفەراندا تێکەڵ دەکرێن. (دهخدا، بەرگی ١٠، ل ١٥٧٤٤).

کافوور: گیایەکی بۆن خۆشە و گوڵەکەی لە گوڵە قەوان دەچێ. هەندێکی تر دەڵێن سرێشێکی بۆن خۆشە، لە قەدی هەندێ درەخت دەچۆڕێ و بەشێوەی دەنکی خوێ؛ یان وردە سەهۆڵی بریسکەدار و بەڕەنگی زەرد، یان: ڕەش، یان بەهۆی چەندایەتی «خوێ»یەکەیەوە ڕەنگەکەی دەگۆڕێ. ئەم سرێشە لە هەندێ دارستان و درەختی زۆر گەورە و زەبەللاحی قەدپاڵی چیاکانی کەنار زەریاکانی خۆرهەڵاتی ئاسیا و بەتایبەتیش لە «هیند، چین، ژاپۆن، جاوە، تایوان، سۆماترا» هەن. داری کافوور یەکجار بەرز و جوان و هەمیشە سەوزە. چاکترین جۆری کافوور، کافووری «جودانە»یە، کە لەم درەختە سرووشتییانە دەردەهێنرێن و جگە لە بۆنە خۆشەکەی، بۆ زۆر نەخۆشیی جیا جیاش بەکاردەبرێ. (دهخدا، بەرگی ١٠، ل ١٨٠٥٦ - ١٨٠٥٧).

جەوجەو: ئەمیش چەند مانایەکی هەیە:

– هێمایە بۆ وردوخاش و لەت لەت و گەرد گەرد بوون.
– ناوی شارێکە لە وڵاتی «خەتا»، کە «مسک»ی زۆر چاک و «کافوور»ی نایاب و جلوبەرگی هاوریشمینی گرانی تێدا بەرهەم دەهێنرێن.
– جۆرە دەنگ کردنێکە بۆ وشتر لەوەڕاندن. (دهخدا، بەرگی ٥، ل ٧٨٩٦). بەڵام «ئەدەب» ماناکانی یەکەم و دووەمی مەبەست بووە.

واتە: بسکەکەت وەک ڕەنگی شەو ڕەشە و بەجۆرێک بەدەوری (دەرەختی ساف و سپی و لووس و وەک کافوور)ی گەردنی سپیتدا ئاڵاوە، وەک تێکەڵبوونی عەبیر لەگەڵ کافووری بریسکەداری بۆن خۆشدا.

**٥- شیرین شەمایلت، بەهەموو شێوە دڵبەرن**
**خاسسە بەوەقتی خەندەیی وەک قەهقەهی «کەو»ت**

شەمایل: ئاکاری جوان، ڕەوشتی چاک، هەموو هەڵسوکەوتێکی پەسەند.

«سەعدی» شاعیری فارس دەڵێ:

بهوش بودم کە از اول دل بەکس نسپارم
شمایل تو بدیدم نە صبر ماند و نە هوشم
«دهخدا، بەرگی ٩، ل ١٤٤٥٦»

خاسسە (خاصّة): بەتایبەتی.

قەهقەه: قاقا و تریقانەوە.

واتە: هەموو هەمووی شتەکانت شیرین و جوانن، بەتایبەتی ئەو کاتانەی کە پێدەکەنی و قاقای پێکەنینەکەت لە قاسپەی کەو دەچێ.

**٦- دڵبەند و شەککەرینە، بەهەردەم کەلامەکەت**
**یەکجارە ئەم کەلامی شەکەرباری ئەمشەوت**

دڵبەند: بەدڵەوە دەچەسپێ، لە بەردڵانە.

هەردەم: هەمیشە.

کەلام: قسە و گفتوگۆ.



**٧- هەرکەس جەمالی تۆی وەکو مەه گوت، خیلافی گوت**
**جیلوەی چییە قەمەر، لەکن ئەو میهری پڕتەوت!؟**

مەه: مانگ.

خیلافی گوت: پێچەوانەی گوت، نەیزانی، ڕاستی نەکرد.

پڕتەو: درەوشانەوە.

قەمەر: مانگ.

میهر: خۆر، هەتاو، حەوتەمین مانگی ساڵی هەتاوی و ناوی شازدەهەمین ڕۆژی هەموو مانگێکی «هەتاوی»یشە. بەڵام لێرەدا مەبەست لە: خۆر و هەتاوە.

واتە: هەرکەس جوانیی تۆی وەک مانگ چوواند، نەیزانی؛ چونکە تۆ هەتاویت و مانگیش لەحاند هەتاودا تریفە و درەوشانەوەی کوا بەئەندازەی هەتاوە!؟ (کە مەبەست هەتاوی ڕووی یارە).

**٨- هاواری من، لە دەستی دڵی خۆمە؛ نا لە کەس**
**هەرچی دەکەم، هەچەندێ دەکەم، ناکرێ زەوت**

واتە: هەر گلەییم لە دەست ئەم دڵە عاشقەی خۆمە، کە بۆم دابین ناکرێ. لێرەدا حەرفی «ر»ی (هەرچەندێ)ی لەبەر وەزنی شیعر نەنووسیوە.

**٩- دوێنێ گوتم: جەفا بەسە، جانا مرووەتێک**
**فەرمووت: چ وەقتی مەوعیزەیە! مەیکە مزگەوت**

مەوعیزە: ئامۆژگاریی، ڕێنوێنی.

مرووە (مروة): بەزەیی، دڵنەرمیی، مرۆیایەتی.

**١٠- فەرمووت: لە ماچی کوڵمە و لەب، کامە خۆش مەزەن؟**
**چ بڵێم! «ئەدەب» فیداتە، لە نێوان ئەم و ئەوت**

واتە: خۆت لێمت پرسی: ماچی ڕوومەتەکانت، یان دەمت؛ کامیان خۆشن!؟ من دەڵێم: هەردووکیان.

## ٢٩

کێش: بەحری موتەقاریب موسەممەن ئەسلەم: (فەعلەن فەعوولەن فەعلەن فەعوولەن):

**١- فـیـدای باڵاکـەی تـوولە نەمـامت**
**ڕەواقی شەهدی شیرین کـەلامت**

ڕەواق: مانای جیا جیا و زۆری هەیە و یەکێکیان بریتییە لە نوای پێشەوەی خانووبەرە، کە دەبێـتـە هۆی دروستکردنی سێبـەر بۆ ژێرەوەی خۆی. مـانایەکی تری بەمـانای «ڕاڕەو» دێت. «نالی» ئەم مانایەیانی بەمجۆرە بەکاربردووە:

سـووتا ڕەواقی خـانەیی سـەبرم، دڵ و دەروون
نەیماوە غـەیری گـۆشەیی زیکرێکی: یا صەبوور
«١٧٧»

بەڵام لێـرەدا مـەبەست لە پاڵاوتە و زوڵاڵ و بێ گـەرد و سـافـە چونکە بۆتە سیـفـەتی «شـەهد» کـە مـەبەست لە هەنگوینی پاڵاوتەیە. (دهخـدا، بەرگی ٨، ل ١٢٢٨٣)، کـە ستایشی هەنگوینە پاڵاوتەکەی قسە و ئاخاوتنی وەک هەنگوین شیرینی یاری پێ دەکات.

**٢- مەگەر چی ڕابوو، لێـمان ناپرسی!**
**نە ڕۆژت پەیغام، نە شەو سەلامت**

مەگەر چی ڕابوو؟: گوایە چی ڕوویداوە؟، چما چ بووە؟.
پەیغام: پەیام، ڕاسپاردە.

**٣- قـەسـەم بەو تاقی ئەبرۆی تـەمـامت**
**کە نەقشن بەجووت، لەو ماهی تامت**

ماهی تام: مانگی تەواو، مانگی چواردە.

**٤- بێ دیـدارەکـــەی، وەک ڕۆژت؛ تارە**
**سوبحی عوشرەتم، وەک زوڵفی شامت**

تار: تاریک.
سوبحی عوشرەتم: ڕۆژی ژیان و ڕابواردنم.
زوڵفی شام: زوڵفی ڕەش.



**٥- بێ قـــامـــەتی تۆم، باڵای وەک «ئەلف»**
**چەنگە؛ وەک حەلقـەی دوو زوڵفی «لام»ت**

واتە: کە بـاڵای ڕێک و ڕاستی وەک پیـتی «ئەلف»ی تۆم لێ دوور دەبێ، بـاڵای منیش وەک ئەڵقەی زوڵفە لوولەکەت، دەچەمێتەوە.

**٦- نە خەو، نە خۆراک، نە ڕاحەتم ما**
**حـەیاتێ کـە بێ، زیندەم بەنامت**

زیندەم بەنامت: هەر بەهۆی ناوی تۆوە زیندووم.

**٧- شەوم کوا تاقەت! گەر هەمدەم نەبێ**
**یادی طوڕەکـەی حـەریری خـامت**

هەمدەم: هاودەم، هاوڕاز.
حەریری خام: ئاوریشمی خاو (مەبەست لە سەر و قژی یارە).

**٨- لەســەر چی زیزی! کــەوا ناپرسی**
**جارێ لە حاڵی خەستـەی غـوڵامت**

غوڵام: خزمەتکار، نۆکەر، کۆیلەی بەردەست و بەپارە کڕدراو.

**٩- ڕەنجووریی «ئەدەب»، هیجرانە و دووریی**
**لەو گـوڵ قـەندەکـەی لێـوی گـوڵ فـامت**

ڕەنجووریی: نەخۆشیی.
گوڵ فام؛ یان: گوڵفام: وەک گوڵ، گوڵ ڕەنگ.
«مەحوی» دەڵێ:

بەدەفـعی سیـخنی کردن لـە زاهیـد ڕاغیـبی مـەی بوو
کەچی ساقی وتی: نادەم بەکەم فـام ئەز مەیی گوڵ فام
«٢١٥»

واتە: نەخـۆش کـەوتنی من، هەر بەهۆی ئەو دووریی و دابڕانەوەیە، کـە لە دەمـێکەوە ماچی گوڵی دەم و لێوە گوڵێنەکەتم نەکردووە.

## ٣٠

کێش: بەحری موزاریع موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن) وەک نموونەی:

١- سەر: بەردەبازی ڕێتە، تەن: تەختەبەندی جێتە
دڵ: مەیلی خاکی پێتە، ڕۆح: ماڵی خۆتە، بیبە
«نالی،٣٩٥»

٢- تەقلیدی دیدەکانی منی کردووە زەمین
هەر کوێرە شیوە، چەشمەیی تێدا ژیایەوە
«حەمدی، ٨٤»

٣- مەعلوومە بۆچی «حاجی» مەدحت دەکا بەکوردی
تا کەس نەڵێ: بەکوردی نەکراوە مەدحی باری
«حاجی قادر، ١٤٤»

**١- نامی خودا، لە دوو نێرگسی غەممازی ئەمشەوت**
**لەم ڕایحەی دوو طورەیی طەننازی ئەمشەوت**

نامی خودا: پەنا بەخوا، خوایە هاوار.

غەمماز: چاوی پڕ ناز و سەرنج و سیحراویی، ئاماژە و هێماکردن بەبرۆ و چاوی پڕ لە ڕاز و ڕەمز.

ڕایحە: بۆن و بەرامە.

طەنناز: ئەو مەبەستانەی لە دوو توێی ڕەمز و ڕازی شاراوەتردا دەدرکێنرێن، ئەو جۆرە تەفرە جادووییانەی پڕن لە تەشەر و لاقرتی.

واتە: خوا هاوار، لە دەست دوو نێرگسی چاوە پڕ لە سیحر و ڕاز و هێما و ئیشارەتە شیرینەکانت و لە بۆن و بەرامەی هەردوو کاکۆڵی پڕ لە نهێنی شاراوە و مەبەستی نادیار.

«تاهیر بەگی جاف»؛ کە هاوڕۆژگاری «ئەدەب»ە، ئەویش ئەمجۆرە دەستپێکردنانەی سەرەتای غەزەلی بە«نامی خودا» هەیە:



سەد نامی خودا بێ لە دوو پستانی ئەنارت
گرد و شلک و نازک و پڕ چنگ و قەشەنگە
«٢٤»

**٢- سەرفی نەزەر لە شەوقی دڵ و حەسرەتی قەدیم**
**قووتی ڕەوانە: نوتقی شەککەرسازی ئەمشەوت**

سەرفی نەزەر: جیا لەوەش، سەرەڕای ئەوەش، جگە لەوەش.

قووتی ڕەوان: خۆراکی گیان.

نوتقی شەککەرساز: قسە و ئاخاوتنی شیرین و هەوێنی شیرینایەتی.

واتە: جیا لەوەش کە لە دەمێکەوە بەدڵ حەسرەتی دیدارتم دەخواست، کەچی ئەمشەو، هەم دیدارتم بینی و هەم ئاخاوتنە شیرینەکەت، وەک خۆراکی گیانە بێ خۆراکەکەی تۆ بووم.

**٣- غەنج و دەلال و عیشوەی تۆ، دڵبەرن مودام**
**ئەمما جودایە دڵبەریی و نازی ئەمشەوت**

غەنج و دەلال: لار و لەنجە و نێسکەی پڕ ناز و عیشوە و غەمزە، کە هەموویان بەهۆی هێماکانی چاو و برۆوە ئەنجام دەدرێن.

واتە: سەرەڕای ئەوەش کە ناز و عیشوە و تەفرە و جوانیی نواندنت، هەمیشە و هەمیشە دڵفرێنن، بەڵام ناز و عیشوە و جوانیی دەرخستنی ئەمشەوت، پێشینەی نەبووە و شتێکی جیاواز و تاقانە بوو.

**٤- بۆ صەیدی دڵ، ئەگەر چە، شەهێنن نیگاهی تۆ**
**ئەمما شتێکی دیکەیە، شەهبازی ئەمشەوت**

واتە: هەرچەندە نیگا و نواڕینەکانی تۆ، هەمیشە دڵ تەفرە دەدەن و دەیخەنە داوەوە و ڕاوی دەکەن، بەڵام ئەگەر نواڕینەکانی پێشترت شەهێن بووبن؛ ئەوا سەرنج و نواڕینەکانی ئەمشەوت، شابازبوون و لە نواڕینەکانی جارانت جیاوازتر بوون.

«سالم» دەڵێ:

دەزانم چۆنە، تا دڵ صەیدی عیشقە
لە ژێر چەنگاڵی بازا، حاڵی عەصفور
«٦٣»

**٥- خونچەی سەحەر؛ ئەگەر چە چەمەن ئارایە، قەت نەبوون**
**بەو نیم خەندە نازی؛ گوڵی نازی ئەمشەوت**

واتە: گوڵێلکە و خونچەی کازیوە و بەرەبەیان، کە دەبنە مایەی ڕازاندنەوە و ئارایشی باخ و چیمەن، بەڵام دەمی تازەکراوەی خونچە و خونچە و گوڵێلک، ناگەنە ئەو تۆزە زەردەخەنە پڕ لە نازەی، کە لە گوڵی نازی ئەمشەوتدا نیشانتدام.

«سالم» دەڵێ:

لە باخا، خونچە: مەشقی لێوی تۆی کرد
نخوستین گوڵ؛ لە خەندەی تۆوە پشکووت
«٥٠»

**٦- حەددی چییە؛ کە دەعوای هەمصورەتی بێ**
**باخی ئیرەم؛ بەسینەی سەروازی ئەمشەوت**

دەعوا: بانگاشە، داوا، هەرا.

هەمصورەت: هاووێنە، هاوشێوە.

باخی ئیرەم: باخی بەهەشت. هەڵبەتە «شەددادی کوڕی عاد»یش بۆ لاساییکردنەوەی باخی بەهەشت، باخێکی بەناوی باخی ئیرەم دروست کردووە و دەڵێن دوای تەواوکردنی، کە ویستوویەتی بچێتە ناوی، بۆ دیدەنی، گیانی دەرچووە.

سەرواز: سەر ئاوەڵا، سەر کراوە (مەبەست لە یەخەی کراوەی یارە).

واتە: باخی ئیرەم ڕایەی ئەوەی ناکەوێ بانگاشەی هاوشێوەیی و هاووێنەیی سنگ و بەرۆکە ئاوالاکەی ئەمشەوت بکات.



**٧- سەد جەور و ستەم؛ کە لە تۆی دی دڵی زار**
**قوربانی ئەو دەمەی بووە هەمڕازی ئەمشەوت**

واتە: سەرەڕای ئەو هەموو دڵڕەقییی و سزا و ئازار چەشتنەش، کە دڵم لە دەست تۆی دیوە، بەڵام هەمووی دەکەم بەقوربانی ئەو تۆزە دیدەنی و ئەو کەمە قسە و ئاخاوتنەی، کە ئەمشەو هاوڕازت بووم.

**٨- ئەمڕۆ «ئەدەب» کە مردبوو، زیندووت کردەوە**
**فەرمووی: بەچی؟ بەماچی وەک ئیعجازی ئەمشەوت**

واتە: «ئەدەب» پێش ئەم دیدەنییەی ئەمشەوت، بەتەواوی مردبوو؛ تۆ زیندووت کردەوە. بەڵام لێم بپرسە: بەچی زیندووت کردۆتەوە؟ لە وەڵامدا دەڵێم: بەڕەخساندنی ئەو هەل و دەرفەتەی کە توانیم دەمم بگاتە دەمت و دەمیشت، وەک دەمی حەزرەتی مەسیح و مەسیح ئاسا، ئیعجازی زیندووکردنەوەی تێدایە؛ کە حەزرەتی مەسیح، هەر هەناسەیەکی؛ دەبووە مایەی زیندووکردنەوەی مردووان و ماچیشت چونکە هەر لە ڕێگەی دەمەوە دەبێ، بۆیە هەر ئەو دەرفەتەی لە ماچکردنتدا چنگم کەوت، خۆی ئیعجازی هەل و دەرفەت بوو.

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن) وەک نموونەی:

١- لێ لتـــولێ ئاســـتـــانێ چخ ب وان لەعـــلان کـــرین
دەرگـەهێ فـەتحێ ڤـەبوو ئیـرۆ لی مەهجـووران عـەجـەب
«مەلای جزیری، ٧٣»

٢- کـــائینات (الحـــمــــدلله) پڕ لە نووری ڕوویی تۆ
ئەی حـــەبیب و یاری (رب العـــالمین)م ڕەحـــمـــەتێ
«حەمدی، ٦٠»

٣- گـەر لە ڕێگەی دین و قـەومت لـەت لەتت کـەن بتکوژن
ئەی «ئەســـیـــری» ناوی چاکت، تا ئەبەد زاهیـــر دەبێ
«ئەسیری»

**١- ساقیا! جانم فیدای جیلوەی قەد و ئەندامەکەت**
**تا سەحەرگاهان پەیاپەی بێو لەبالەب جامەکەت**

ساقیا: بانگکردنی مەیگێڕ.
پەیاپەی: پەیتا پەیتا، یەک لەسەریەک، یەک لە دوای یەک.
لەبالەب: پەرداخی پڕ لە بادە، سەرڕێژ.

**٢- چاوەکـەت جـامی شـەراب و مـاچی لەب: بادام و قـەند**
**جامەکەت دا؛ یەک مەزەش لەو: گوڵشەکەر بادامەکەت**

گوڵشەکەر: گوڵی شیرین؛ مەبەست دەم و لێوی یارە.

واتە: چاوەکانت وەک پێکی بادە و ماچی لێوەکانیشت، تامیان وەک تام و چێژی بادام و شەکرە. کە مەبەست لە بادام، هەر شێوەی دەم و زاری بچووکی یارە، کە لە بادام دەچێ؛ بێ گومان تامی بادامیش بەجیا، هەر خۆشە و خۆ ئەگەر زاری یار، وەک شەکریش شیرین بێ، ئەوا سەد بار خۆشترە. هەر کاتێکیش بادەیەکم دەدەیە دەست، یەکسەریش ماچێکم لەو دەمە بادامییە و وەک شەکر شیرینەت بدەرێ.



«نالی» دەڵێ:

شـەرابی لەعلی ڕوممانی لە «نالی»
حەرامە، بێ مەزەی ماچێکی لێوان
«٣٢٢»

«وەفایی» دەڵێ:

من وەها زوو مەستی مەی نابم، بەنەشئەی چاوەکەت
مەرگی من؛ ساقی! لەگەڵ ئەو جامە، لێـوت بێنەوە
«١٥٨»

**٣- جامی مـەی لەبڕێژ کە، با تێی کەوێ عـەکسی هیـلال**
**تا ببینی، چۆن لە هەنیەت، جەمعە: سوبح و شامەکەت**

لەبڕێز: لێوڕێژ، سەرڕێژ، پڕ پڕ.
عەکسی هیلال: وێنەی مانگ.
هەنیە: ناوچەوان، تەوێڵ.
سوبح و شام: بەیانی و ئێوارە.

واتە: پەرداخێکم بۆ پڕ پڕ بکە، با وێنەی مانگی ڕوخساری خۆتی تێدا دەربکەوێ و بەچاوی خـۆت ببـینی، کـە چۆن بەیانی و ئێـوارە، لەسـەر کـوڵـمـەکـانت کـۆبوونـەتەوە، کە مـەبەست لە «بـەیانی»، ڕووناکـیی ڕوخســارێتی و «شـام»یش، واتە: ئێــوارە و شـەو، مـەبەست لە قـژ و بسکەکـانێـتی؛ کـە ڕووناکی و تاریکی پێکەوە، لەسـەر ڕوومـەت و هەنیەت کۆ دەبنەوە.

«حافظ» دەڵێ:

مـا در پیـاله عکس رخ یار دیدەایم
ای بی خبـر ز لذت شـرب مدام مـا
«١٤»

**٤- خاڵەکەت مەحوە لە تیشکی تەلعەتی مەه، ئەلعەجەب**
**ئیختیراقی زوهرە واقیع بوو، لە ماهی تامەکەت**

خاڵەکەت مەحوە: خاڵەکەت دیار نەماوە، تەواو بووە، بێ سەروشوێنە، تواوەتەوە، تێداچووە.

تەلعەتی مەه: دەرکەوتنی مانگ.

ئەلعەجەب: چ سەیرە!.

ئیختیراق: دەربازبوون، بەزاندن، تێپەڕبوون.

زوهرە: ئەستێرەیەکی گەشی گەڕۆکە، نزیکەی (١٠٨) ملیۆن کیلۆمەتر لە خۆرەوە دوورە و نزیکەی (٤١٨٠٠٠٠٠) کیلۆمەتریش لە ئەستێرەی زەوییەوە دوورە. هەندێ جار بەیانیان و هەندێ جار ئێواران دەردەکەوێ. لە سەردەمانی دێریندا لای هەندێ عەرەبی شام و عێراق پەرستراوە و پێیان وتووە (العزّی)، لە دێرتریشدا خواوەندی جوانیی بووە (المنجد، ص ٣٠٨). بەفارسیش پێی دەوترێ «ناهید» و لە ئەفسانەی ئێرانیشدا وا باوە کە ئافرەتێکی جوان بووە و (هاروت و ماروت) شەیدای بوون. ئەم ئەستێرەیە دەکەوێتە نێوان زەوی و مەریخەوە و شێوەیشی زۆر لە زەوی نزیکە، هەر بۆیە لەگەڵ زەویدا بەخوشک و دووانە دادەنرێن، چونکە نزیکترین ئەستێرەیە لە زەوییەوە (دهخدا، بەرگی ٩، ل ١٣٠٣٨).

واتە: چەند سەیرە! خاڵەکەی ڕوخسارت لە ناو پڕشنگ و جریوە و تریفە و ڕووناکیی مانگی ڕوخسارتدا ون بووە، وا دیارە کە ڕوخسارت بەتەواوی دەربکەوێ، وەک ئەو کاتانەیە، کە مانگیش دەگاتە چواردەیەمین شەوی دەرکەوتنی، بۆیە لەم کاتانەدا ئەستێرەکانی دەوری مانگ، لە ناو پڕشنگی مانگدا ون دەبن. بەڵام کە زانیمان خاڵەکەت وەک ئەستێرەی زوهرەیە و ئەم ئەستێرەیەش گەڕۆکە، ئەوا خاڵەکەت لە بەرامبەر هەڵاتنی مانگی چواردەی ڕوخسارتدا، کاتی گەڕان و تێپەڕبوونی ئاسایی خۆی دێت و دەسووڕێ و دیار نامێنێ.



**٥- کەی دەبێ شەو تا سەحەر، هەمبەستەری من بی و ئەمن**
**بیکەمە باڵین: شەدەی زوڵفی حەریری خامەکەت؟!**

بەستەر: نوێن، جێگەی خەو.

هەمبەستەر: هاونوێن، هاوجێی خەو، هاوسەرین.

باڵین: سەرین، بالیف.

واتە: ئاخۆ ئەو کاتە، کەی بێت، کە بەتەنیا هەر من و تۆ، لە نوێنێکدا پێکەوە جووت بین و زوڵفە وەک هاوریشم خاوەکەت بکەمە سەرین!؟.

**٦- مەوددەتێکە مەیلی جارانت نییە جانا بەمە**
**گەرنە، جارێکم دەدی؛ یا نامە، یا پەیغامەکەت**

بەمە: بەرامبەر ئێمە (من = ئەدەب).

گەرنە: ئەگینا.

پەیغام: پەیام.

**٧- خاڵی تۆ؛ دانەی فەریب و زوڵفەکەت: دامی بەڵا**
**مورغی دڵ، چوو دانە بچنێ؛ کەوتە حەلقەی دامەکەت**

دانەی فەریب: گەنم و جۆ و هەر جۆرە خۆراکێکی لەو جۆرانە، کە بۆ تەفرە و چەشەکردنی باڵندەی کێوی داویان بۆ دەنێتەوە.

دامی بەڵا: داوی بەڵا.

مورغ: باڵندە، مەل.

حەلقەی دام: ئەڵقەی داو.

واتە: هەرکەس بەخەیاڵی سەیری خاڵەکەت، لێت نزیک بکەوێتەوە، ئیتر تووشی داوی تاڵەکانی زوڵفت دەبێ و گیرۆدەی ئەوینت دەبێ.

«وەفایی» دەڵێ:

هاتم بۆ دانەی خاڵت، تووشی داوی زوڵفت بووم
تەیرێکی نابەڵەد بووم، نەمزانی دانە و داوە
«١٥٢»

**٨- گەرچی بێ شیرینیی نامت، مەززەیی نابێ کەلام**
**هەر لەبەر تەعنەی ڕەقیبانە، کە نابەم نامەکەت**

تەعنە: تانە، تەشەر، پلار، توانج.
نامەکەت: ناوەکەت.

**٩- پێش ئەوەی بمرم، وەرە دیداری ئاخـــر لێت بکەم**
**مەیخە دیدار ئاخیرەت، ئەو بەندەیی ناکامەکەت**

دیداری ئاخر: دوا دیدەنی پێش گیان دەرچوون.
دیداری ئاخیرەت: دیداری ڕۆژی زیندووبوونەوە، دیداری ڕۆژی قیامەت.

**١٠- بۆ بەتیری غەمزەکانت، زەخمی دیکەم لێ دەدەی؟!**
**خەستەیە وێستا «ئەدەب»، سەرتۆژی نەبووە زامەکەت**

زەخم: زام، برین.
خەستە: نەخۆش.
وێستا: ئێستا.
سەرتۆژ: قەتماغەی سەر برین و زام.



٣٢

**سەرنج:** لە بەسەرکردنەوەی ئەم شیعرەدا، دەبێ ئەوەمان لە یاد بێ، کە ئەم شیعرەی «ئەدەب»، بەدواداچوونێکی ئەو شیعرە ناودارەی «نالی»یە، کە سەرەتاکەی بەم بەیتە دەست پێ دەکات:

عیشقت کە مەجازیی بێ، خواهیش مەکە ئیللا کچ
«شیرین» کچ و «لەیلا» کچ و «سەلما» کچ و «عەزرا» کچ
«١٥٧ - ١٦٣»

هەردوو شیعرەکەش لەسەر یەک کێشن، بەڵام شیعرەکەی «نالی» «١٧» بەیتە و ئەم شیعرەی «ئەدەب» «٢٣» بەیتە.

وەک دەردەکەوێ دەبێ شیعرەکەی «نالی» لە باری ناوەڕۆکەوە، واتە: لە باری بیروبۆچوونی کۆمەڵایەتییەوە، لە سەردەمی «نالی»یەوە تا سەردەمی «ئەدەب»، کە نزیکەی (٤٠ - ٥٠) ساڵێکیان نێوان بووە، جێی سەرنج و بیروڕا گۆڕینەوە بووبێ، بۆیە «ئەدەب»یش بەهەمان مشتومڕەوە و لەسەر هەمان مەبەست دەدوێ، کە بێ گومان شیعرەکەی «نالی» و دواتریش ئەم شیعرەی «ئەدەب» ڕەنگدانەوەی باری کۆمەڵایەتی ڕۆژگاری خۆیانن؛[1]

هەرچەندە دەبێ لە سەردەمی «نالی»دا زۆرتر ئەو ڕەوشتە نادروستە لە کاروباری جنسیدا، وەک دیاردەیەک لە ناو کۆمەڵگای عوسمانیدا هەستی پێ کرابێ، هەر لەبەرئەمەشە «نالی» وەک بەرهەڵستیی؛ لە گرتنەبەری ڕێگای نادروست، هەڵوێستی لە دژی ئەم ڕەوشتە نادروستە دەربڕیوە و لە ڕوانگەی شەرع و کۆمەڵناسییەوە، بەناپەسەندی دادەنێ و هەموو عیشقێکی مەجازیی و حەقیقی، لە نێوان ئافرەت و پیاودا، ڕەوا و پەسەند دەکات، نەک لە نێوان نێر بۆ نێردا... بەڵام ئەم شیعرەی «ئەدەب» لەم لایەنەوە،

(١) هەڵبەتە بۆ بەیاد هێنانەوەی خوێنەران، دەڵێین هەر هەمان شیعری «نالی»، شاعیرێکی تری هاوڕۆژگار و هاوڕێی «ئەدەب»، واتە: «حەریق»، بەجۆرێکی تر، بەشوێن ڕێچکەی «نالی»دا چووە و ئەویش شیعرێکی «١٩» بەیتی وتووە، کە ئەمە سەرەتاکەیەتی:

عیشقت کە حەقیقی بێ، تالب مە ئیللا کوڕ
هەم حەزرەتی لەولا کوڕ هەم یوسفی والا کوڕ
«٢٢»

واته لە باری ناوەڕۆکەوە، لەگەڵ شیعرەکەی «نالی» و ناوەڕۆکەکەی و دیدی شیعرەکەی «نالی»یەوە جیاوازە.

کێش: بەحری هەزەج ئەخرەب موسەممەن: (مفعول مفاعیل مفعول مفاعیلن) وەک نموونەی:

١- سینەی دڵی بێ کینە، سافە وەکو ئاییینە
مەستوورە بەپەشمینە، ئەسراری لەکن پەشمە
«نالی، ٤٧٥»

٢- گەهـ شادیی و گەهـ شینە، گەهـ خەندە و ناڵینە
جوملەی ڕەگ و پۆپی دڵ، هەر لەحظە هەواییێکە
«صافی، ٣٩»

**٣- بۆ عیشقی مەجازیی تۆ، بۆ مەحرەمی ڕازی تۆ**
**شەوگاری درازی تۆ، ئەعلا کوڕ و ئەحلا کچ**

شەوگاری دراز: شەوگاری درێژ.

ئەعلا: باڵا، بڵند.

ئەحلا: شیرین.

**٤- کوڕ، یا کچی سیمین تەن، هەردوو گوڵی یەک گوڵشەن**
**هەردوو صەنەمی ئێمەن: «لات»ە کوڕ و «عوززا» کچ**

سیمین: زیوین.

تەن: لەش، جەستە، لەشولار.

«مستەفا بەگی کوردی» واژەی «تەن»ی بەمجۆرە بەکاربردووە:

دەروون: زامدار و دڵ: خەمگینە بێ تۆ
سەرم: گێژ وتەنم: بێ تینە بێ تۆ

صەنەم: بت.

صەنەمی ئێمەن: بتی ئێمەن. هەرچەندە ئەگەر ئەوە لە بەرچاو بگرین کە ئەگەر «صەنەمی ئێمەن» بەگوێرەی ڕوونووسی کۆن بخوێنینەوە، دەبێتە «صەنەمی ایمن»؛ کە لەم



بارەدا واژەی «ایمن» چەند مانایەکی جیاواز دەدات: موبارەک، سوێند، ناوی ئەو بیابانەیە، کە حەزرەتی مووسا مێگەلی تێدا دەلەوەڕاند. پرسیارە؛ ئەو کێیە؟ (دهخدا، بەرگی ٣، ل ٣٧٣٠). بەم پێیە نزیکایەتیی ئەم مانایانە تێکڕایان بۆ ئەوە دەشێن ئەم نیوە بەیتە، بەوجۆرە مانایانە بخوێندرێتەوە.

لات: یەکێکە لەو دوو بتەی تا پێش هاتنی ئایینی ئیسلام، لە لایەن هۆزی «ثقیف»ەوە لە «تائیف» وەک خواوەندێک دەپەرسترا.

عوززا: ئەمیش لەگەڵ بتی «لات»دا، یەکێکە لەو دوو بتەی تا پێش هاتنی ئایینی ئیسلام، لە لایەن هۆزی «قورەیش»ەوە وەک خواوەندێک دەپەرسترا. شاعیرانی فارس، لە زۆر شیعریاندا ناوی ئەم دوو بتەیان هێناوە:

این دعا بسیار کردیم و صلات
پیش لات و پیش عزّی ومنات
«مولوی رومی،
دهخدا، بەرگی ١٣، ل ١٣٥٠٨»

اینکه می بینی بتانند ای پسر
کرد باید نامشان: عزّی و لات
«ناصر خسرو،
دهخدا، بەرگی ١١، ل ١٦٣٩٦»

واتە: کوڕ و کچی لەش زیوین، هەردووکیان گوڵی یەک باخن و لە دێرزەمانەوە وەک دوو بتی پەرستراو، یان دوو بتی موبارەک و سوێند پێ خوراو، یان: وەک دوو هۆی ئارامیی و ئاسایش سەیریان کراوە.

**٥- کوڕ، یا کچی لەب نۆشین، هەردوو بەڕوخ و ڕەنگین**
**هەردوو بەمەزەن؛ شیرین، قەندە: کوڕ و حەلوا: کچ**

لەب نۆشین: ئەو لێوانەی بۆ هەڵمژین خۆشن.

**٦- کوڕ، یا کچی سیمین بەر، هەردوو بەخەتن عەنبەر**
**هەردوو وەکو یەک: دڵبەر، ڕەعنا: کوڕ و زیبا: کچ**

سیمین بەر: لەشولار زیوین.

(عەنبەر و ڕەعنا و زیبا)مان پێشتر مانا لێکداوەتەوە.

«نالی» و «سالم» «عەنبەر»یان بەمجۆرە بەکاربردووە:

داخل نەبی بەعەنبەری سارایی «خاک و خۆڵ»
هەتا نەکەی بەخاکی «سولەیمانی»یا عووبوور
«نالی، ۱۸۱»

سەوادی قیرگونی شەو، لە نوسخەی عەنبەرین مووتە
سەراسەر ڕەونەقی دنیا لە عەکسی خاڵی هیندووتە
«سالم، ۱۲۱»

**٧- کوڕ، یا کچی لالە ڕوو، شیرینە بەمە هەردوو**
**وەک نوقڵی موهەننا: کوڕ، وەک: شەهدی موصەففا کچ**

لالە ڕوو: ڕوومەت و کوڵم و ڕوخساریان، وەک گوڵاڵە سوورە.

موهەننا: سازگار و ڕەوان و خۆش (وا دیارە لەو ڕۆژگارەدا نوقڵێکیش بەناوی نوقڵی «موهەننا» هەبووبێ.

شەهدی موصەففا: هەنگوینی پاڵاوتە و قاڵکراو.

**٨- کوڕ، یا کچی خۆش مەنزەر، یەک پرتەو و دوو پەیکەر**
**وەک عەقدی ثورەییا: کوڕ، وەک ئەختەری صەڕا: کچ**

یەک پرتەو و دوو پەیکەر: کوڕ و کچ هەردووکیان درەوشانەوەیان وەک یەکە، بەڵام جەستە و پەیکەریان جیاوازە.

عەقدی ثورەییا: کۆ ئەستێرەی پێروو.

ئەختەر: ئەستێرە.

سەڕا: بەختەوەریی: (سَرّاء)، ئەختەری سەڕا: ئەستێرەی بەختەوەریی و شادمانیی.

**٩- کوڕ، یا کچی مشکین موو، هەردوو بەڕەمن؛ ئاهوو**
**تیری نیگەهی هەردوو: دڵدوزە، کوڕ، یا کچ**

مشکین موو: مووی وەک مسک بۆندار و بۆن خۆش.

هەردوو بەڕەمن: هەردووکیان سڵۆک و بەپارێزن.



ئاهوو: ئاسک، مامز.

تیری نیگەهی هەردوو: تیری سەیرکردنی هەردووکیان.

دڵدوز: دڵفڕین، دڵ دز.

واتە: کوڕ و کچی موو بۆن خۆشی وەک مسک و وەک ئاسک، بەسڵۆک و بەپارێز؛ ڕێگە نادەن لێیان نزیک ببیتەوە، یان ڕاویان بکەیت... زەبری سەرنج و نواڕینییان، دڵ دەدزێ.

**١٠- کوڕ، یا کچی خۆش صورەت، یەک جەننەتە، یەک لەززەت**
**کوڕ؛ بۆیی وەکو: کەوسەر، قەد: شاخەیی تووبا: کچ**

خۆش صورەت: ڕەنگ و ڕوخسار و شێوە جوان و دڵگیر.

کەوسەر (کوثر): ڕووباری کەوسەری بەهەشت.

قەد: بەژن و باڵا.

شاخە: لق، پەلک.

تووبا: دارێکە لە بەهەشت.

**١١- کوڕ، یا کچە تەنناز، هەردوو بەمە ئیعجازن**
**لەب: وەک دەمی عیسا کوڕ، ڕوو وەک کەفی مووسا: کچ**

تەنناز: بەتەشەر و توانج و پلار.

لەب وەک دەمی عیسا: دەم و لێویان وەک دەم و لێوی حەزرەتی عیسا، مایەی زیندووکەرەوەی گیانی مردوون.

کەفی مووسا: ئیعجازی حەزرەتی مووسا لەوەدا بوو: کاتێ دەستی لە بەرباخەڵی دەردەهێنا، بەری دەستی سپی دەبوو.

**١٢- کوڕ، شەهدی لەبی مەعلووم، کچ وەک: عەسەلی بێ مووم**
**یەک لازمە، یەک مەزلووم؛ نەشئە: کوڕ و صەهبا: کچ**

شەهدی لەبی: هەنگوینی پاڵاوتەی لێوی.

عەسەل: هەنگوین.

مووم: مێوی ناو هەنگوین.

لازم و مەزلووم: دوو شتی تەواوکەری یەکتری. یان: دوو شتی پێویستی یەکتر.

نەشئە: شوور و شەوق.

صەهبا: مەی، بادە، شەرابی نایاب.

**١٣- بێ هەردوو، حەرامە عەیش، بێ ڕوکن و قەوامە عەیش**
**ئەو وەقتە تەمامە عەیش؛ یومنا کوڕ و یوسرا کچ**

ڕوکن: بنچینە، بناغە، بنەڕەت.

قەوام: پایەداریی.

عەیش: ژیان.

یومنا (یمنی): ڕاست.

یوسرا (یسری): چەپ. هەردوو واژەکەش عەرەبین.

**١٤- وا خۆشە بەهەر ئانت، پڕ بێ بەشەبوستانت**
**سەد حۆریی و غیلمانت، غیلمان: کوڕ و حەورا: کچ**

بەهەر ئانت: بۆ هەمیشەت.

شەبوستان: جێگە خەوی ناو ماڵ و تەلار و کۆشکی دەسەڵاتداران.

غیلمان: کوڕی بەهەشتیی؛ واتە: ئەو کوڕە پاک و تەمیزانەن، کە لە بەهەشتدا، خزمەتگوزاریی بەهەشتییەکانن.

حەورا: حۆری، کچی بەهەشتیی؛ ئەمانیش خزمەتگوزاری بەهەشتییانن.

**١٥- کوڕ: لالەیی گوڵزارە، کچ: لوعبەتی فەرخارە**
**بۆ هەمدەمی سەحرا: کوڕ، بۆ صوحبەتی ناوا: کچ**

لالەیی گوڵزار: گوڵاڵە سوورەی ناو باخ و گوڵشەن.

لوعبەت: بووکی ڕازاوە و ئارایشکراو.

فەرخار: ناوی شارێکی تورکستانە، کە بەناوبانگە لە ئافرەتی جواندا. شاعیرانی فارس بەهەمان بۆنەوە شیعری زۆریان دەربارەی وتووە:



فرخار بزرگ نیک جایی است
گر معدن آن بت نوایی است
«رودکی»

هنگام بهاراست وجهان چون بت فرخار
خیز ای بت فرخار و بیار آن گل بیخار
«منوچهری، دهخدا،
بەرگی ١١، ل ١٧٠٤٤»

هەمدەم: هاودەم.

سەحرا: بیابان.

صوحبەتی ناوا: قسە و ئاخاوتن و ڕازی تایبەتی.

**١٦- کوڕ: سەروی گوڵستانە، کچ: عوشرەتی مەستانە**
**بۆ وەقتی تەماشا: کوڕ، بۆ هەنگامی تەوانا: کچ**

کچ: عوشرەتی مەستانە: واتە: بۆ کۆڕی بەزمی مەیخواردنەوە، ئامادەبوونی کچ، زۆر پێویستە.

هەنگام: کات، سەروەخت.

**١٧- کوڕ: شاهیدی سەیرانی، کچ: دڵبەری پەنهانی**
**بۆ بەزمی موهەییا: کوڕ، بۆ عەیشی مەحەللا: کچ**

شاهید: کوڕی جوان.

بەزمی موهەییا: بەزمی پێویست بەئامادەکردنی شتێک بکات، کوڕەکە دەتوانێ هاوکاری و یارمەتی ئامادەکردنەکە بکات.

عەیشی مەحەللا: ژیانی شیرین.

**١٨- کوڕ: ساقیی صەهبایە، کچ عوزری پەزیرایە**
**بۆ مەجلیسی مەستان: کوڕ، بۆ: مەسنەدی تەنها کچ**

ساقیی صەهبا: مەیگێڕی شەراب و بادەی نایاب.

عوزر: پۆزشی بەڕێ و جێ.

پەزیرا: پەسەند، پێشوازکراو.
مەسنەدی تەنها: جێگە و شوێنێکی تایبەت و تەنیا.

**١٩- کوڕ، ڕوویە وەکو: مەهتاب، کچ: موویە وەکو سەنجاب**
**بۆ پرتەوی ئەیوان: کـــوڕ، بۆ بەســـتـــەری دیبـــا: کچ**

مەهتاب: تریفەی مانگ.
سەنجاب: سمۆرە، کە تووکەکەی زۆر نەرمە.
پرتەوی ئەیوان: درەوشانەوەی ناو هەیوان.
بەستەر: نوێن و جێگەی خەو.
دیبا: جوان و ڕازاوە.

**٢٠- ئاغـــازی صـــبـــوحی: کـــوڕ، ئەنجـــامی صـــوراحی: کچ**
**مەعشووقەی «اضحی» کوڕ، مەحبووبەی «ظەلما» کچ**

ئاغاز: سەرەتا، دەستپێک، بەرایی.
صبوحی: بەربەیانان.
ئەنجامی صوراحی: دوایین پاشماوەی بادەی ناو سوراحی.
مەعشووقەی «اضحی»: دڵبەری کاتی ڕووناکی (واتە: ڕۆژ).
مەحبووبەی «ظەلما»: دڵبەری کاتی تاریکی (شەو). هەردوو واژەکەش: «اضحی» و «ظلما» عەرەبین.

**٢١- کـــوڕ بۆ دەمی «فـــەروەردین»، کچ بۆ چلەیی هاوین**
**کچ: بەهمەن و کچ: تشرین، گەرما: کوڕ و سەرما: کچ**

فەروەردین: مانگی مارت (مارس) زایینی، نەورۆز.
بەهمەن: کانوونی دووەم - شوبات (زستان).

**٢٢- بۆ عەیشی «ئەدەب» هەردەم، کوڕ: ماچی مەیی دەرغەم**
**خـەندەی کـچـە؛ جامی جەم، بادە: کـوڕ و مـینا: کچ**

مەیی دەرغەم: جۆرە بادەیەکی بەناوبانگ بووە.
جامی جەم: جامی بەناوبانگی «جەمشید»، کە هەموو دنیای تێدا دیار بووە.



**٢٣- «نالی» کـــە ئەوی دیبـــا، ئەڵبـــەتە دەبوو وتبـــای:**
**عـەشـقێ کـە مـەجـازیی بێ، تالب مـەبە ئیللا: کچ**

واتە: ئەگەر «ئەدەب» تا ئێرەی ئەم شیعرە، پێچەوانەی دید و بۆچوونی «نالی»ش بووبێ، بەڵام ئیتر لێرە بەدواوە و چونکە خودی شیعرەکە بەدواداچوون و چاولێکەریی «نالی»یە، ئەوا لەم ئاستەدا، کە ئەم بەیتەی دوایی شیعرەکەیە، «ئەدەب» دەڵێ: ئەگەر «نالی» ئەم شیعرەی منی چاو پێ بکەوتایە، دەهاتە دەنگ و داوای لێ دەکردم؛ کە ئەی «ئەدەب»! دەستبەرداری ئەو بیر و بۆچوون و ڕەوشتە ببە و ئەوەی من «نالی» لە سەرەتای نیوە بەیتی یەکەمدا وتوومە:

عیشقێ کە مەجازیی بێ، خواهیش مەکە، ئیللا کچ

تۆش وەک من بە.

بەمجۆرە «ئەدەب» جوانکاریی ئەم شیعرەی لەم بەیتەی دواییدا ڕازاندۆتەوە، کە لە لایەکەوە ئەم شیعرەی لە ژێر زەبری شیعری ناوبراوی «نالی»دا وتووە و لە لایەکی تریشەوە تەقەللای ململانێ و سەرکەشیی نواندن لەگەڵ «نالی»دا ناکات، تا بڵێ: من عیشقی نێر، بۆ نێر پەسەند دەکەم. بەڵکو دەیەوێ بڵێ: من هەر مەبەستم بزواندن و جووڵاندنی «نالی»یە و هیچی تر.

**٣٣**

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن) وەک نموونەی:

١- شاه ب قەسدا کوشتینا من ڕم هەژاندن بی سەبەب
دامە چەشمێ قەهر و خەشمێ ڕم ل دلدا کو ئەدەب
«مەلای جزیری، ٧٠»

٢- مژدە بێ یاران! ئەڵێن تەشریفی جانان دێتەوە
وەک هیلالە قامەتم، تا بەدری تابان دێتەوە
«حەمدی، ٣٥٩»

٣- وەختی بەخشش بۆ بنووسم داستانی هیممەتت
مەردی دانا؛ وەسفی جودی حاتەمی تەی، کەی دەکا!
«سالم، ٣٠»

**١- عومر گەییە ئاخر و ماچێکی جانانم نەکرد**
**یەک نەزەر تێرم تەماشای ماهی تابانم نەکرد**

یەک نەزەر: یەک جار سەیرکردن و نواڕین.

ماهی تابان: مانگی چواردە.

«تاهیر بەگی جاف» دەڵێ:

نە من ماچی لەبی تۆم بوو بەقیسمەت
نە ئەسکەندەر گەیشتە ئاوی حەیوان
«١٢»

«مەحوی» دەڵێ:

نەگەیە ئەو جوانە و گەیە پیریی
مەدەد یا پیری پیرانی بوخارا
«٨»



«وەفایی» دەڵێ:

مردم و نەمزانی ئەو ئاورەی منی سووتاند، چ بوو
حاصڵی سەیر و سلووکی عاشقان هەر: حیرەتە
«١١٩»

**٢- دامەنم پڕ خونچەیی فرمێسکی گریانە و قەتم**
**خونچەیێ لەو گوڵشەنی خەندان، لە دامانم نەکرد**

واتە: من چونکە هەر فێرە گریان بووم، بۆیە داوێن و ئامێزم هەر پڕی خونچەی فرمێسک و ئەسرینی خۆم بوو، لەبەرئەوەی بیرم لای بەختەوەریی و شادیی نەبوو. ئەگینا ئەگەر ئەوەندەی هۆگری گریان بووم، کەمێکیش دڵم لای خۆشیی ببوایە، ئەو کاتە بیرم لای ئەوەش دەبوو، کە هیچ نەبێ ئارەزووی سەیری باخ و گوڵشەن بکەم و تاقە خونچەیەکیش بچنم.

**٣- نەشئەبەخشی ڕۆحە: بادەی لەعلی جانان، ئەی عەجەب**
**بۆچ ئەمن قەت لەو مەیەم، قەترێک لە فنجانم نەکرد!**

واتە: بادەی ئاڵ و ڕەنگ هەناریی، کە لە ماچی لێوی یار وەردەگیرێ، مایەی درەوشانەوە و گەشانەوەی گیانە. کەچی سەیرە! نازانم بۆچی من هەرگیز بۆم نەلواوە دڵۆپێک لەو جۆرە بادەیە، لە پەرداخەکەم بکەم! واتە: هێشتا لێوی یارم ماچ نەکردووە.

«سالم» دەڵێ:

حەلاوەت تا قیامەت نابڕێ «سالم» لە ناو دەمما
ئەگەر نەخلی مرادم دەفعەیێ یەک بۆسە، نەوبەردا
«٢٢»

**٤- کێ شەوێکی هەمدەمی ئەمنی نزاری خەستە بوو**
**تا بەئاه و ناڵەوە، تا ڕۆژ هەراسانم نەکرد؟!**

هەمدەم: هاوڕاز.

نزار: گریاو.

خەستە: نەخۆش، شەکەت، ماندوو.

**٥- ئەی نیگاری بێ وەفا، چەندم جەفای تۆ دی و ئەمن**
**یەک سەری موو، قەت خیلافی عەهد و پەیمانم نەکرد**

نیگار: یار، مەعشووق.
یەک سەری موو: یەک تۆسقاڵ.

**٦- تا لەبی لەعلی ئەتۆم دی، بەو لەبی لەعلت قەسەم**
**قەت چ جاران، یادی یاقووتی بەدەخشانم نەکرد**

لەعل: لە بنەڕەتدا واژەیەکی هیندی و فارسییە و عەرەبەکان پیتی «ئەلف»ەکەیان بە«ع» گۆڕیوە و بۆتە: لەعل. لەعلیش لە بەردە پیرۆزەکانی هەرێمی «بەدەخشان» دەردێت، کە دەکەوێتە خۆرهەڵاتی ئەفغانستان و سنووری لەگەڵ تورکستانی خۆرهەڵاتدایە و ناوەندەکەی «فەیزئاوا»ی ئێستایە، کە مەڵبەندێکی بازرگانیی گرنگە و کانی زۆری زێڕ و زیو و بەردی پیرۆزەی گرانبەهای تێدایە، کە بەردە پیرۆزەکانی بە: لەعلی بەدەخشان، یاقووتی بەدەخشان بەناوبانگن. لەعل، ڕەنگی جیا جیای وەک: ئاڵ، پیازیی، هەناریی، وەنەوشەیی، دووپشکی... هەیە. بەردە پیرۆزەی لەعل دەهاڕدرێ و گەلێ دەرمانی پزیشکی بۆ زۆر نەخۆشیی لێ دروست دەکرێ. (دهخدا، بەرگی ٣، ١٣، لاپەڕەکانی: ١٩٧١١، ٤٤٤٣).

واتە: لەو ساوەی کە لەعلی لێوی تۆم دیوە، ئیتر هەرگیز یادی یاقووت و بەدەخشانم نەکردووە.

**٧- سوبحدەم هاتم بەشانەی کەم، سەری زوڵفی سیات**
**چونکە «با» نامەحرەمی تۆ بوو، پەرێشانم نەکرد**

سوبحدەم: بەربەیانی.
زوڵفی سیات: زوڵفی ڕەشت.
پەرێشان: پەرش و بڵاو. شاعیرانی تر واژەی «پەرێشان»یان بەمجۆرە بەکارهێناوە:

باڵی هوما، سێبەری زوڵفی پەرێشانی ژن
نافەیی خەتا، پەرچەمی ئەفشانی ژن
«ناری»



زوڵفی شەبڕەنگت وەکو ڕۆژە، پەرێشان بانەبێ
وا سەحاب ئاسا لە ڕووتا، قەسدی مەهپۆشیی دەکا
«سالم، ٣١»

کە هەستا قامەتی بەرزی، لە فەرقی تاوەکو ئەرزی
پەرێشان زوڵفی سەد تەرزی، بەسەریەکدا ڕژا و لەرزی
«حاجی قادر، ١٥٩»

لە غەفڵەتدا بەزایع چوو هەموو عومری عەزیزت
پەرێشانی؛ کەوا زوڵفی پەرێشانت نەدیوە
«خادیم»

واتە: بەربەیان ویستم زوڵف و قژەکەت شانە بکەم، بەڵام دوایی کە بیرم لەوە کردەوە زوڵف و قژەکەت پڕن لە نهێنی و خۆزگە و ئەوینی دڵدارانی زۆر، بۆیە نەمویست ئەو نهێنی و ناوی ئەو دڵدارانە بکەونە بەر گوێ و چاوی «با» و وازم لەم مەبەستەم هێنا و شانەم نەکرد.

«وەفایی» دەڵێ:

ئەی سەبا، تێک مەدە تۆ، پەرچەم و کاکۆڵی گوڵە
زوڵف و کاکۆڵی گوڵە، مەسکەنی سەد پارە دڵە
«١٣٢»

**٨- تیری موژگانت لە دڵدا، غەمزەکەی تۆیە؛ دەوای**
**ئینتیزاری مەرهەمی تۆ بوو، چ دەرمانم نەکرد**

واتە: زامی دڵم، کە بەهۆی غەمزەکەی خۆتەوەیە و دەرمانەکەیشی هەر لای غەمزەکانتە، بۆیە دەرمانم نەکرد و چاوەنواڕی ئەوەم هەر خۆت دڵت نەرم بێ و جارێک لە جاران بەزەییت پیامدا بێتەوە و ئاوڕێکم لێ بدەیتەوە. یان جارێک بەتیلەی چاوێکت، سەرنجێکم بدەیت.

وەفایی دەڵێ:

بۆچی نەگریم! کوشتەیی سەد غەمزە خەدەنگم
من یێک و نیزامیی حەبەشی زادە، هەزارە
«١٢٢»

**٩- لەو دەمەی چاوم بەگوڵزاری جەمالی تۆ کەوت**
**قەت خەیاڵی گوڵشەن و یادی گوڵستانم نەکرد**

واتە: لەو کاتەوەی کە گوڵزاری جوانیی تۆم دیوە، ئیتر پێویستم بەوە نەبووە بیر لە سەیرکردنی باخ و گوڵشەن بکەمەوە، یان خەیاڵی سەیرکردنی بکەم.

«نالی» دەڵێ:

سەوداسەرەکەی زوڵفت، ئەزهاری لەکن پەشمە
دوور لەو گوڵە بێ خارە، گوڵزاری لەکن پەشمە
«٤٧٤»

«سالم» دەڵێ:

١- بەخوێن بێ دڵ، بەگەرمیی بێتە سەر جەرگ
ئەگەر بێتو دڵم شا بێ بەگوڵزار
«٥٩»

٢- دڵ، چ حاجەت ئارەزووی گوڵشەن بکات، وەختی بەهار؟
تۆ، لە هەر فەسڵا، لە بەرچاوم بەعاریز گوڵشەنی
«١٥٠»

«حەریق» دەڵێ:

چاوەکەم دوێنێ لە گوڵشەن، گوڵ بەعیشوە خۆی نواند
نەمەک گیر بم، بەمەرگی تۆ قەسەم، هیچ نەمدواند
«١١٣»



**١٠- وەسڵی تۆم ئەووەڵ کە دی، ئەمزانی هیجرانی لە دوون**
**لەززەتی خولدی بەرین بوو، یادی نیرانم نەکرد**

هیجرانی لە دوون: دابڕانی لە دوایە.

خولدی بەرین: بەهەشتی بەرین.

یادی نیران: یادی ئاگر، کە لێرەدا مەبەست لە ئاگری دۆزەخە.

واتە: لە سەرەتای دیدەنی و دیدارتدا، ئەوەندەم خۆشیی و بەختەوەریی گەیشتێ، وام هەست کرد لە بەهەشتی بەریندام و ئیتر دەردی دووریی و ژانی لێکدابڕانم لە بیر نەما، وەک ئەو موسڵمانەی لە کاتی خۆشیی و خۆ لە بیرکردنیدا، ڕۆژی زیندووبوونەوە و سزادان ئاگری دۆزەخی لە یاد دەچێ.

«حاجی قادر» دەڵێ:

من لە غەمت ڕێگەیەکم کەوتە بەر
خوانی بەهەشت و سەفەری هەشت خوان
«٩٤»

**١١- ئەو دەمەی ماچی لەبت، خەوفی عیتابی تۆم نەبوو**
**خاتەمم پێ بوو، کە من یادی «سلێمان»م نەکرد**

خاتەم: کلکەوانە، ئەموستیلە.

سلێمان: حەزرەتی سلێمان پێغەمبەر.

واتە: ئەو دەمەی پێت گەیشتم و دەرفەتم هێنا و هەر چۆنێ بوو لێوتم ماچ کرد، ئەوەندەم لە خۆشییاندا خۆ لە بیر کردبوو، بیرم لە مەترسیی گلەیی تۆ نەبوو، کە بۆچی بەبێ ڕازی بوونی خۆت، ماچم کردوویت! چونکە لەو کاتەدا هەستم دەکرد خۆم موستیلەی خۆمم پێیە و هەرچیم بوێ، دەتوانم بیکەم و خۆمیش لە حەزرەتی سلێمان بالاتر دەزانی و پێویستم پێیی نەبوو. یان بەواتەیەکی تر: ئەو کاتەی بەتۆ گەیشتم، وام هەست کرد بوومەتە خاوەنی موستیلەی سلێمان و ئەو کەسەش کە موستیلەی «سلێمان»ی پێ بێ، دەتوانێ هەرچی مەبەست و ئارەزووی بێت، بیکات؛ کەچی دواتر دەسەڵاتی تۆ، لە دەسەڵاتی موستیلەکەی لای من، بالاتر بوو. چونکە ئیتر بڕیاری ڕوو وەرگێڕان کەوتە لای تۆ و موستیلەکەی لای من هیچی بۆ ڕازیکردنی تۆ، پێ نەکرا.

«وەفایی» و «پیرەمێرد» ناوی «سولەیمان و خاتەم»یان ئاوا بەکاربردووە:

عوشرەت و عەیشی جیهان خەتمە لەسەر ماچی دەمت
هەر سولەیمانە، ئەو دەستی بگا بەو: خاتەمە
«وەفایی، ١٣٨»

شەوێک دەست ئەهرەمەن کەوت «خاتەم»ی مولکی «سلێمان»ی
کەچی میر و گزیری پێ دەکرد، قەدری وەها زانی!
«پیرەمێرد»

«نالی» دەڵێ:

١- ئەی واعیزی بارید! چییە؟ هەروەک هەرەسی کێو
بەو وەعزە؛ کە بایە هەموو، هاتوویی بەسەرما!
«١١٩»

٢- ئەی تەلەفی گفتوگۆ، جامیعی کیذب و درۆ
واعیزییە ئیشی تۆ، عاشقییە کاری من
«٣٣٥»

**١٢- تۆ گوتت: مەرجانە لێوم، من گوتم: جانا! بەهای!**
**غەیری ئەم سەودایە جانا، من چ تاوانم نەکرد**

مەرجان: بەردی پیرۆزەی گرانبەها.

بەها: نرخ، ڕمێن.

**١٣- چەندە واعیز، وەعزی دا و فەرمووی کە: «العشق جنون»**
**عاقڵیم کرد، ئەی «ئەدەب» بەو پەندی نادانم نەکرد**

العشق جنون: ئەویندارییی شێتییە.



### ٣٤

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن) وەک نموونەی:

١- نوورین قەدەحا خەمر و حەیاتا مە ب سەردان
گەر وێ بدەتن دەست ب دەست موشتەرەهی من
«مەلای جزیری، ٤٥٧»

٢- ئەی جیلوەدەری حوسن و جلەوکێشی تەماشا
سەرڕشتەیی دین، بێ مەدەدی تۆ، نییە، حاشا
«نالی، ٧٥»

٣- تالان و برۆ و کوشتن و حەپسە لە هەموو لا
ساحێب عەلەم و تەپڵە، ئەڵێی دێوە؛ ستەمگەر
«حەمدی، ٧٠»

**١- کێ بوو شەوەکی، بەو گوزەرەیدا گوزەری کرد؟**
**تیری نیگەهی، وا لە دڵی مە، ئەسەری کرد!**

شەوەکی: بەیانی.

بەو گوزەرەیدا: بەو ناوەدا، بەو گەڕەکەدا.

گوزەری کرد: تێپەڕی.

تیری نیگەهی: تیری نیگای، نواڕینەکانی.

ئەسەری کرد: کاری کرد، زەبری نواند.

واتە: ئەوە کێ بوو بەو بەیانییە، بەو ناوەدا تێپەڕی و بەنواڕینەکانی، کاری لە دڵم کرد؟.

**٢- بێدار نەبوو فیتنەیی ئەو نێرگسی جادووت**
**ئاهی سەحەری ئێمە، دڵی باخەبەری کرد**

بێدار نەبوو: هێشتا خەو بەری نەدابوو.

واتە: چونکە هێشتا بەیانی زوو بوو، بۆیە هێشتا چاوە نێرگسییەکانی (کە مایەی بەڵا

و هەران) خەوالّوو بوون، بەلاّم بەتێپەڕبوونی بەلاماندا و سەرسامیی من، لە دیتنی و هەناسە و ئاهی حەسرەتم بۆی، بەئاگای هێنایەوە و خەو بەری دا.

**٣- باوەڕ مەکە جانا! بەکەسی دیکە نەزەر کا**
**هەر دیدە، کە جارێ بەجەمالت نەزەری کرد**

واتە: گیانەکەم! هەر کەسێ هەر تاقە یەک جار، چاوی پێت بکەوێ، ئیتر تا هەتا هەتایە، سەیری هیچ شۆخێکی تر ناکاتەوە؛ چونکە تۆ لە هەموو کەس شەنگ و شۆختر و هەڵبژاردەتریت.

«ئەدەب» هەر خۆی لە غەزەلی پێشوودا دەڵێ:

لەو دەمەی چاوم بەگوڵزاری جەمالی تۆ کەوت
قەت خەیاڵی گوڵشەن و یادی گوڵستانم نەکرد

**٤- قەسدی هەدەفی سینە بوو، پەیکانی مژۆڵت**
**نەمزانی لەبەرچی بوو؛ کە عەمدەن خەتەری کرد!**

واتە: نواڕین و تیلەی چاوەکانت، کە هەمیشە بۆ ئەنگاوتن و پێکانی دڵی دڵدارانتە و ئەوەی مەبەستتە، لە ڕێگەی تیلەی چاوەکانتەوە ئەنجامی دەدەیت، کەچی ئەمجارە چونکە مەبەستت نەبوو، بەدەستی ئەنقەست ئێمەت لێ بوارد و پاراستت.

«نالی» دەڵێ:

«نالی» ئەو وەحشی غەزالە، کەس ئەبەر داوی نەکەوت
چونکە شاهێنی دوو چاوی تیژە؛ دائیم سەر دەکا
«١١١»

**٥- یا ڕەب! چییە شیرینیی ئەو دوو لەبی گوڵنار؟!**
**پستێکە، خوداوەند عەجینی شەکەری کرد**

لەبی گوڵنار: لێوی ئاڵی وەک گوڵە هەنار.
پستێکە: بستە-یەکە.
عەجینی شەکەری کرد: لەگەڵ شەکردا ئاوێتەی کردن.



**٦- ئیعجازی هەرچی بووبێ، مەسیحا لە کەم و زۆر**
**ئەمرۆ لە: لەبی تۆ؛ بەچە تەرساوە، سەری کرد**

واتە: حەزرەتی مەسیح، هەر موعجیزەیەکی هەبووبێ؛ کە بریتی بوو لەوەی هەر وتەیەکی لە زار دابکەوتایە، مردووی پێ زیندوو دەبوونەوە، ئەوا هەموو ئەو موعجیزانەی، لە نێوان لێوەکانی بەچکە مەسیحاوە، ئاشکرابوون. واتە: پێش ئەو دیتنەت، منیش شتێکی تر بووم، بەلاّم بەهەناسەکانی نێوان لێوەکانت، گیانێکی ترم بەبەردا کرا و بوومە گیانلەبەرێکی جیاواز: عاشق.

**٧- گێسوویی دلاّرامم؛ هەموو وەقت دلاّران**
**خاسسە بەگوڵی جیلوە؛ کە زیبی کەمەری کرد**

گێسوو: پەلک و زوڵف.
دلاّرام: لە دوو بەشی (دڵ + ئارام) پێکهاتووە، کە مانای: ئارامی دڵە.
خاسسە: بەتایبەتی.

واتە: قژ و پەلکی یارم، هەمیشە شیرین و مایەی ئۆخژن و ئارامی دڵن، بەتایبەتیش ئەو کاتانەی کە تا سەر کەمەری بەریاندەداتەوە و خۆیشی لەنجەولار و نێسکەی پێوە تێکەڵ دەکات، ئەوەندەی تر دەبێتە هۆی جوانترکردن و ڕازاندنەوەی یار.

«مەحوی» «دڵ ئارام» و «دڵ ئارا»ی بەمجۆرە بەکاربردوون:

دڵم بێ تابە، ئەحواڵم خراپە
هەتا تۆمی دڵ ئارام و دڵ ئارا
«٣٦١»

**٨- هەر کەس کە تەوانای نەززارەیی مە، بەڕووی بێ**
**حەققا بەنەزەر موعجیزەی «شەقولقەمەر»ی کرد**

تەوانا: توانا، توانین.
نەززارە (نَظّارة: عەرەبی): نواڕین، سەرنج، وردبوونەوە، چاودێریی.
شەققولقەمەر: ئەنجامدانی کاری زۆر سەخت و دژوار و لە توانا بەدەر، کە «شق القمر» کاری موعجیزەی محەممەدی پێغەمبەریشە، کە «میعراج»ی کرد.

واتە: هەموو کەس توانای سەیرکردن و لێ وردبوونەوەی تۆی نییە، چونکە تۆ ئەوەندە پڕشنگدار و ڕووناکیت، بۆیە ئەوەی بتوانێ لێت بنواڕێ، بەڕاستی وەک ئەوە وایە «شق القمر»ی کردبێ.

«سالم» دەڵێ:

ویساڵت: پایەیی میعراجە بۆ من
لە ڕووتا؛ گەر لەبم «شەققولقەمەر» کا
«٣٠»

**٩- تا بەڵکە وەک ئەبرۆ و ڕوخی تۆی بنوێنی**
**گەردوون؛ مەهی وەک: قەوس و دەمێ وەک سوپەری کرد**

واتە: گەردوون و کردگاریش وەک تەقەللای دووبارە وێنەکێشانەوەی وێنەی تۆبە لە ئاسماندا و بەتایبەتیش وێنەی چاوت و ڕوخسارت، جارێک وێنەی مانگی وەک نیوە بازنەیەک و جارێکیش وەک سوپەر و قەڵغانی کێشاوە.

**١٠- هەر سوبحدەمم وەک شەوی دەیجوورە، لە وەقتێ**
**ماهی حەزەری ئێمە، لە لای مە، سەفەری کرد**

واتە: بۆیە منیش کە مانگی ئاسمان دەبینم، تا بەرەبەیان بەیادی ئەوەی لە ڕوخساری تۆ دەچێ، بەدیاریەوە ئێشک دەگرم و شەونخوونیی دەکێشم، بەڵام کە لە خۆرکەوتندا، مانگ ئاوا دەبێ، بەپێچەوانەوە ڕۆژی من، وەک شەوی تاریک، تاریک دادێت، چونکە تۆ جێم دەهێڵێت و سەفەر دەکەیت.

**١١- توولانییە شەرحی ستەمی؛ وەک سەری زوڵفی**
**تا ڕەنجە نەبێ لێمە «ئەدەب»، موختەسەری کرد**

توولانییە: درێژە.

تا ڕەنجە نەبێ: تا زویر نەبێ؛ یان: تا ماندوو نەبێ.

موختەسەری کرد: لە کورتی بڕییەوە.

واتە: بۆ ئەوەی لە درێژەپێدانی باسی ستەمی یار، یار نەڕەنجێ (یان: ماندوو نەبێ) و لە درێژەپێدانەکەشم ماندوو نەبێ، بەچاکم زانی باسی زوڵم و ستەمی یار، بەکورتی بکەم.

«نالی» و «مەحوی» و «وەفایی» «ڕەنجە»یان بەمجۆرە بەکاربردووە:



لەم ڕێگە سەریشی کە بچێ، یەعنی کوژا بێ
گەردن کەچی بەر پێتە، قەدەم ڕەنجەکە، سابێ
«نالی، ٦٢٩»

١- لە غەمزەی چاوت، ئەبرۆ داگرە و بەس
مەکە بۆ قەتڵی عاشق ڕەنجە: بازووت
«مەحوی، ٨١»

٢- لەو ناصیحانی ئێمە: کە بۆ دڵ دەدەن بەدز
دڵ ڕەنجە کە بوو نیگارم و دینی لەوان دزی
«مەحوی، ٣٠١»

تۆ ڕەنجە مەبە، کوشتنی ئاسانە «وەفایی»
بەو غەمزە ئیشارەت بکە؛ بەو چاوە بفەرموو
«وەفایی، ١١٠»

٣٥

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن) وەک نموونەی:

١- تا پێنەکەنی گوڵ، بەدەمی بادی سەباوە
نەمگوت: کە شەوێ بولبولی بێچارە هەقی بوو
«نالی، ٣٧٨»

٢- پەنجەت لە حەنا مەگرە سوورێکی تەڵخ ڕەنگە
خوێنی دڵی من ئاڵە، بۆ پەنجەیی شمشاڵت
«سالم، ٥٢»

٣- لەوساوە حکوومەت نییە، بەربوونەتە میللەت
جاف و هەمەوەند، بانەیی و مەنگوڕ و پشدەر
«حەمدی، ٧٢»

**١- نازک بەدەنا، لەعل لەبا، جەور و جەفا چەند؟**
**بۆ ئەم دڵی زارم، بەجەفا تیری بەلا چەند؟**

نازک بەدەنا: ناسک جەستە، ناسک لەش، ئەندام ناسک. پیتی «ئەلف»ی «بەدەنا»؛ لەعل لەبا: ئامرازی بانگەوازن.

لەعل لەبا: لێو وەک لەعل.

**٢- شیرین سوخەنی، خونچە دەهەن؛ توندیی و تەڵخیی**
**بەم تەرزە، دەگەڵ بەختی منی نامە سیا چەند؟**

شیرین سوخەن: گفتوگۆ و قسە شیرین و خۆش.

خونچە دەهەن: دەم وەک خونچە.

تەڵخیی: تاڵیی و گرژ و توورە.

بەم تەرزە: بەم جۆرە، بەم شێوەیە.

منی نامە سیا: منی کار و کردەوە ڕەش و خراپ.



**٣- تا چەند بەمیهر و ستەم، ئەو بیم و ئومێدە؟**
**یا: بمکوژە، یا: ڕووم بدەرێ، خەوف و ڕەجا چەند؟**

میهر: دڵنەرمیی، میهرەبانیی.

ستەم: پێچەوانەی میهرە.

بیم: مەترسیی و دژواریی.

ئومێد: خۆزگە، پێچەوانەی: بیم.

خەوف: مەترسیی.

ڕجا (رجاء): خۆزگە و ئومێد، پێچەوانەی: خەوف.

واتە: ئاکارت بەرامبەرم؛ نادیار و تاو ناتاوە، تاوێک بەرامبەرم میهرەبان و دڵنەرمیت و تاوێکی تریش ترس و دژواریی و چەوساندنەوەم لەگەڵدا دەنوێنیت؛ لەبەرئەوە پێم خۆشە ئەم دوو هەڵوێستەم بۆ یەکلایی بکەیتەوە، چونکە ئەگەر دەتەوێ لەگەڵمدا دڵڕەق و زاڵم بیت؛ ئەوە وا باشە هەر بەیەکجاریی و لە ئێستاوە بمکوژیت. ئەگەریش دەتەوێ میهرەبانی و دڵنەرمیم لەگەڵدا بکەیت، ئەوا: ڕوویەکی خۆشم بدەرێ.

هەڵبەتە بۆ بەیاد هێنانەوە، لێرەدا دەبێ سەبارەت بەهەردوو واژەی خەوف و ڕەجا، بڵێم: کە «خەوف» و «ڕەجا» دوو بار و دوو حاڵەتی تایبەتین، لە موسڵمانی ڕاستەقینەدا کۆ دەبنەوە، لە لایەکەوە «خەوف = ترس»ی خودای لە دڵ دەرناچێ و لە لایەکی دیکەوە؛ هەمیشە هیوا «ڕەجا»ی خودای لە دڵدایە و لە بەزەیی خودا نائومێد نابێ.

«نالی» دەڵێ:

١- شەربەتی خەوف و ڕەجای ئەغیار و یار
ترش و شیرین، هەم دەچێژم، هەم دەخۆم
«٢٩٧»

٢- ئەگەر خوێنم دەڕێژی تۆ، ئەوە: تیغ و ئەمیش: گەردن
ئەگەر: بونیادی پەیمان، دەستی من دامێنتە، بازا
«٩٦»

«وەفایی» هەردوو واژەی «ئومێد» و «بیم»ی بەمجۆرە بەکاربردووە:

چیم لە ئومێـدی بەهەشت و بیـمی دۆزەخ داوە من؟
دۆزەخی من هەر فــیــراقــە؛ جــەننەتی من هەر ئەوە
«١٥٨»

**٤- لەو جەعدی موعەتتەر، کە لە ڕووی شەرمەوە لارە**
**مننەت لە گوڵاب و گوڵ و ڕەیحان و سەبا؛ چەند!**

جەعد: قژی لوول، یان: قژی لوول کراو.

موعەتتەر: عەتراویی، بۆندار.

واتە: ئەو قـژە لوولە بۆندارە، کـە لە شـەرمی ئەوەی لەسـەر ڕوخـسـاری ڕووناک و پرشنگدارتە، ملکەچ و لار وەستـاوە و تۆی خـاوەنیت؛ بۆچی نـایەڵێت تێر بۆنی بکەم؟ چونکە ئەگەر بیەڵێت بۆنی قژە لوولەکەت بکەم، ئیتر پێویستم بەوە نییە لەجیاتی بۆنی قژی تۆ، بۆنی گوڵ و ڕێحان و سروە و گوڵاو بکەم.

**٥- تۆ: خـوسـرەوی؛ هەمـوو ئێـمـە: گـەدای ڕووت**
**ئەی پادشەهم! جەور دەگەڵ ئێمە گەدا، چەند؟**

خوبان: کۆی «خوب» و واتە: چاک، چاکان.

خوسرەوی خوبان: باشترین پاشا.

گەدا: هەژار، نەدار.

«نالی» و «وەفایی» و «شاهۆ» واژەی «خوبان»یان بەمجۆرە بەکاربردووە:

مـــومکین نیــیـــە جــەلبی دڵی خـــوبان بەمن و تۆ
نەمــبـیـســتـووە تەسـخـیـری مـەلایک، بەمـەلایەک
«نالی، ٧٠٥»

ئاخری ئەی سوڵتانی خوبان، تا بەکەی نامیهرەبانیی
چاکە مەحروومم نەفەرمووی؛ یا خیتابێ، یا عیتابێ
«وەفایی، ١٧١»

ئەی خوسرەوی خوبانی من، تۆی دەرد و هەم دەرمانمی
وەی مـــاهەکـــەی تابانی مـن، فـــێنکی دڵی بریانمی
«شاهۆ»



**٦- تا تارێ لە چین و خـەمی مـووت، عـەتر فـشـانە**
**کەس ناڵێ: من و نافە و تای مشکی خەتا، چەند!**

خەمی مووت: قژی لوول و پێچ پێچت.

عەتر فشان: عەتر پژێن، عەتر بڵاوکەرەوە، عەتر پەخشان.

تای مشک: نیوەی «بار»ی مـشک، چونکە هەر بارێک کە لە ولاخ بکرێ، لە دوو «تا» بێت؛ کـە بەهەردوو تایەکـە بەسـەریەکـەوە دەوترێ «بار»ی ولاخـێک. واتە: مـشک؛ یان «مسک»یش کـە نرخی زۆر گرانە، ئەگـەر بەخۆڕاییش چنگم بکەوێت و لە بەرامبـەریشدا ئەگەر سەرپشک بکرێم، تا لە نێوان تاڵێک لە زوڵفی تۆ و ئەو «تایە» مسکەدا، ئەوا بێ سێ و دوو، هەر «تا»یەک لە زوڵفی تۆ پەسـەند دەکەم و چەندوچوون لەگەڵ تای مـسکدا ناکەم.

«سالم» دەڵێ:

حسـابی نەفحـەیی زوڵفت، لەگەڵ مـشکی خەتا ناکەم
خـەتا ناکـەم، سـەبا شـاهیدمـە، تەشـبـیـهی وەها ناکـەم
«٨٥»

**٧- دائیم لە دڵم بیم و ئومـێـدی مـوو و ڕووتە**
**یا بیکوژە، یا ڕووی بدەرێ، خۆف و ڕەجا چەند؟**

بیم و ئومێد: مەترسیی و خۆزگە.

واتە: هەمیشە دڵم خۆزگەی دیتنی ڕوخسارتی هەیە، بەڵام کە مەترسیی ڕەنگی ڕەش و داوی زوڵفـتم دێتـە یاد، ترسم لێ دەنیـشێ، بۆیە هەمـیـشـە دڵم پڕێتی لە مـەترسـیی و خۆزگە؛ کـە تکا دەکەم یا: بیکوژە، یان: مووی قژ و پەرچەمت لەسـەر ڕوخسارت لادە و ڕێگەم بدە تێـر سـەیرت بکەم... هەڵبـەتە دەگـونجێ «یا بیکوژە» مـەبەسـتـیش بێت لە قرتاندنی ئەو بەشە قژ و کاکۆڵەی ڕوخساریان داپۆشیوە.

**٨- ئەم عـەهدە کـە مـەعـدوومـە: وەفـاداریی یاران**
**لەم دەرگەهە دامان؛ بەئومێدی: وەفا، چەند؟**

عەهد: پەیمان، بەڵێن.

مەعدووم: نەبوون.

عەهدی مەعدووم: ئەو پەیمانەی کە نییە و ئومێدی بەجێهێنانی لێ ناکرێ.

دەرگەه: دەرگا.

دامان: دۆش دامان، چاوەنواڕیی.

واتە: ئەو بەڵێن و پەیمانەی، کە یاران دەڵێن گوایە وەفادار دەبن و هەرگیز بەجێی ناهێنن و دەربەستی وەفا نابن، ئیتر بەئومێدی بەجێهێنانی ئەو پەیمانی وەفادارییەوە، بەچ هیوایەکەوە، لە بەردەرگەدا دۆش دامان و چاوەنواڕیی؟.

«نالی» دەڵێ:

لە ئەشکەنجەی شکەنجی زوڵفی ئەو بێ وەعدە، مورغی دڵ
دەناڵێنێ وەکو بلبل لە سوبحی کازیبی شەودا
«٨٨»

**٩- بۆ شەئنی شەهان، عارە تەطاول بەگەدایان**
**ئەی پادشەهم! جەور دەگەڵ ئێمە گەدا، چەند؟**

شەئن: کاروبار.

شەهان: کۆی شەه-ە، واتە: شاهانە.

عار: نەنگ و شوورەیی.

تەطاول: دەستدرێژیی، زوڵم و زۆر، چەوساندنەوە.

واتە: بۆ پادشایان نەنگ و شوورەیییە، ئەگەر زوڵم لە هەژاران بکات، لەبەرئەوە تۆ؛ ئەی پادشاهم! لەبەرچی حەز بەچەوساندنەوەمان دەکەیت؟.

«نالی» دەڵێ:

ئەتۆ: شا، من: گەدا، دادم بپرسە
لە زوڵمی چاوی بیمارت کوژراوم
«٢٩٣»



**١٠- دەردێ نییە دەردی مە، کە چارەی بەدەوا بێ**
**دەردێکە؛ عیلاجی نییە، دەرمان و دەوا چەند؟**

واتە: دەردی ئێمەی دڵدار، دەردێکی یەکجار تایبەتی و جیاوازە، بەدەرمان و پزیشک چارە ناکرێ، ئیتر ڕێنوێنی بۆ پەیداکردنی دەرمان، هەتا کەی؟.

حاجی قادر دەڵێ:

تەبیبم هاتە باڵینم، وەهای گوت:
دریغا! دەردی عیشقە، بێ دەوایە
«١١٦»

لە فۆلکلۆری کوردیشدا هاتووە:

دەردێکم گرتووە، نییە دەرمانی
عیشقی چاوت بووم، ناشێ نەیزانی

**١١- دەردێ نییە دەردم، کە ئەوا چارە قبووڵ کا**
**بێ وەجهە لە لام، ڕەنجی طەبیب، سەبر و دەوا چەند؟**

بێ وەجهە: بێ مانایە.

**١٢- بەحرێکە غەمی عیشق، هەزارانی وەکو تۆی**
**غەرقابی فەنا کرد، «ئەدەب» فیکری شەنا، چەند؟**

غەرقاب: نقوم کردن، خنکاندن.

فەنا: لەناوچوون، لەناوبردن.

شەنا: مەلەکردن.

کێش: بەحری هەزەج موسەددەس مەقسوور: (مفاعیلن مفاعیلن فعولن)، وەک نموونەی:

١- ژ ڕەعنا نێرگیزێن تەی مەست و خون ڕیز
زەمان بوو عەهدێ جەنگ ئەنگیزێ جەنگیز
«مەلای جزیری، ٢٧٠»

٢- لەبت: میم و قەدت: ئەلف و زوڵف: چیم
دەزانی بەم سیانە، تالیبی چیم؟
«نالی، ٣١٢»

٣- دەبێتە باغی جەننەت، دەفعەیێ بێ
بەکولبەی «سالم»ا، گەر مەقدەمی یار
«سالم، ٥٧»

**١- ئەگەر زیندانە، گەر دارە، ئەگەر بەند**
**بەسە جانا! عەزابی مە، هەتا چەند؟**

واتە: ئەگەر عیشقت ئێمەی بەخۆیەوە گیر کردووە و لە ناو زیندانی سزا و چەوساندنەوەدا ڕاتگرتووین و دڵنەوایی و میهرەبانیمان لەگەڵدا نانوێنیت؛ هەتا کەی؟. پێم خۆشە بزانم لەگەڵمدا هەروا دەبیت، یان چی؟ چونکە ئەگەر زیندانیکردنمە، یان: لە سێدارەدانمە، یان: لە بەندیخانەکردن، ئیتر هەموویت پێ تاقی کردمەوە. ئەی ئیتر ئەم ئازارەم هەتا کەی؟.

«کوردی» دەڵێ:

حەیرەتم لەم مەستە چاوە، بۆ لەگەڵ من وا دەکا؟
ئەم هەموو دەرد و جەخارەم[1]، بۆ؟ لە کوێی پەیدا دەکا؟

(١) دەبێ بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم بەیتەی «کوردی» ئەوە بڵێم کە واژەی «جەخار» هیچ مانایەکی نییە و لە هیچ فەرهەنگێکی فارسیدا نییە. بۆیە دەبێ واژەکە لە (چە + خار) پێکهاتبێ، کە بەهەردووکیان مانای (چ + دڕکێک) دەدەن، ئەوسا مانای نیوە بەیتەی «کوردی» ئاوای لێ دێت: ئەم هەموو دەرد و دڕک ئاژنە بۆ؟.



**٢- بەخەندێکت ئەگەر دڵ خستە پەرواز**
**بەگریانت؛ دووبارە، بەستە ناو بەند**

پەرواز: فڕین، باڵگرتن.

واتە: لە سەرەتای کار و ئاشنابوونمانەوە، بەبزەیەکت، دڵمت خستە خۆشی و شادیی و باڵەفڕەی گەشکە. بەڵام دوایی، کە سزا و چەوساندنەوەم لە لایەن تۆوە دەستی پێ کرد و دابڕان و دووریی، سەریان هەڵدا و کەوتمە گریان بۆت، ئیتر دووبارە خۆشیی و بەختەوەریت لە دڵم سەندەوە و کەوتەوە گۆشەگیریی و گرتووخانەی تەنیایی.

هەڵبەتە «خستە پەرواز» و «بەستە ناوبەند» لەبەر باری «کێش» سووککراون، ئەگینا هەریەکەیان دەبێ بە«خستتە پەرواز» و «بەستتە ناوبەند» بنووسرێن.

**٣- ئەگەر غەمباری جەوری زوڵفەکەی تۆم**
**بەمیهری تەلعەتم، سەد هێندە خورسەند**

میهری تەلعەت: هەتاوی ڕوخسار.

خورسەند: قانع، ڕازی، دڵشاد.

واتە: ئەگەر خەمباری ئەوەم کە زوڵفت ڕوخسارتی داپۆشیوە و ڕێی سەیرکردنی ڕوخسارتم نادات، بەڵام جار جار کە هەتاوی ڕوخسارت دەردەکەوێ، سەد ئەوەندەی خەمبارییەکەی پێشووم، دڵشاد و ڕازیم.

**٤- دڵێکی غەمزەدەم بوو، مەحرەمی ڕاز**
**ئەویشت لێم بەسەد شین و ئەذا سەند**

غەمزەدە: بەخەم ئەنگێوراو، بەخەم پێکراو، بەخەم کەوتە.

مەحرەمی ڕاز: نهێنی پۆشی ڕازەکانم بوو.

شین: شیوەن و گریان.

ئەذا (اذی): ئازار و ستەم... هەرچەندە ئەوەی لە جێی خۆی لە کاتی بەراوردی تێکستەکاندا ئاماژەمان پێ کرد و وتمان لە هەندێ تێکستی تردا، لەباتی «شین و ئەذا»؛ «شێوە و ئەدا» و «شین و ئەدا» نووسراون؛ کە دەشێ ئەم نیوە بەیتە بەو شێوەش بخوێندرێتەوە، بەتایبەتی بە«شێوە و ئەدا»، کە «ئا» نووسیوێتی و مانای «ئەدا»ش: مەکر و فرتوفێڵ دەگەیەنێ؛ کە سەرومڕی مانا و مەبەستی «ئەدەب»یش دەگەیەنێ.

**٥- بەرەغبەت دڵ نەکەوتە دامی گێسووت**
**وەرای تەدبیرە؛ تەقدیری خوداوەند**

ڕەغبەت: مەیل و ئارەزوو.

وەرای تەدبیر: لە سەروو توانای تەگبیرەوە.

واتە: چارەنووسی عەشقێنی من و تۆ، بەدەست خۆمان و بەئارەزووی خۆمان نەبوو، بەڵکو چارەنووسێکی گردەبڕی خودایی بوو، دەبووایە من و تۆ، لە هەر جێیەکی تری دنیا و هەرچۆنێک بووایە، هەر یەکتریمان خۆش ویستبایە.

**٦- لە وەختێکی بەعیشقت سەر بڵندم**
**تەمم لێ نارەوێ قەت، وەک: «دەماوەند»**

دەماوەند: کێوێکی زۆر بەرزی باکووری خۆرهەڵاتی «تاران»ە.

«سالم»یش کێوی «دەماوەند»ی بەمجۆرە ئاماژە پێ کردووە:

بەتەم کەللەی «دەماوەند» بوو، لە ئاهم گەردەنەی «ئەلبوورز»
بەڕێی «ڕەی»دا، کە قیسمەت ڕۆژی ئەووەڵ بوو «٤٦»

واتە: هەرچەندە بەعیشقی تۆوە زۆر سەر بڵند و دڵشادم، بەڵام ئەم خۆشحاڵیی و سەربەرزییەم، بەردەوام بەزۆر دژواریی و سەختییدا لێ تێدەپەڕێ و عیشقت بۆ من، هەمیشە مایەی سزا و ئازار و دەردەسەریی زۆرە.

لە کۆکردنەوەی سەربڵندیی و تەمدا، جوانکارییەکی هونەرمەندانە و شارەزایانە هەیە، چونکە ئەوەی بییەوێ سەر بڵند بژی، دەبێ زۆر دژواریش تێپەڕێنێ؛ هەر بۆیە کێوی زۆر بەرزیش، هەمیشە سەر بەتەمە.

لە فۆلکلۆری کوردیشدا هاتووە:

هەر جێیەک بەرزە، تەم لێی ساکنە
ئەوە تەم نییە، هەناسەی منە



**٧- شکۆهی گەردنت، لیمۆیی غەبغەب**
**بەنوقرەی خامەوە؛ سێوێکی پێوەند**

شکۆهی گەردنت: گەردنی بەرز و دەماخت.

لیمۆیی غەبغەب: بەرگەردن و ژێر چەناگەی وەک ڕەنگی لیمۆ. یان: ژێر چەناگە و بەرگەردنیشت، هەر دەڵێی لیمۆیە.

نوقرە: زیو.

خام: خاو.

پێوەند: موتوربە.

واتە: گەردنی بەرزت، بەو دیمەنی ژێر چەناگە و بەر گەردنە لیمۆییەتەوە، هەر دەڵێی لە زیوی خاوە و سێوێکیان پێوە موتوربە کردووە.

وەک لە جێی خۆی و لە بەراوردی تێسکتەکاندا ئاماژەمان پێ کردووە، ئەم بەیتە لای «ئا» ئاوایە:

شکۆهی گەردنی تۆ و سێوی غەبغەب
بەشاخی نوقرەوە؛ سێوێکە پەیوەند

**٨- بەتەنها هەر ئەمن نیم پایی بەندت**
**جیهانێکت بەتاری زوڵفە، پابەند**

واتە: هەر بەتەنیا من گیرۆدەت نیم، بەڵکو جیهانێکت بەتاری زوڵفێکتەوە، بەخۆتەوە بەستۆتەوە.

**٩- محاڵە گەر «ئەدەب» بێ و زیندەگی کا**
**بەبێ ماچی لەبی شیرین، وەکو قەند**

واتە: هەرگیز «ئەدەب» بەبێ ماچی لێوی وەک قەند شیرینی تۆ، ناتوانێ بژی.

٣٧

کێش: بەحری موجتەس موسەممەن مەخبوون ئەسلەم: (مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلن)
وەک نموونەی:[1]

١- وەتەن عەزیزە، دەخیلە مەڵێ گڵی خاکە
گڵی: کلێکە، کە سوورمەیی عیوونی ئیدراکە
«حەمدی، ٣٥٨»

٢- لەسەر تەنافی، کە لەرزی هەتیوی سندووسی
شکا مەتاعی زەریفی و قیمەتی لووسیی
«حاجی قادر، ١٦١»

٣- زەمانە بەعزە کەسانێ لەپڕ، کە هەڵدەبڕێ
ئەوەندەی هەڵدەبڕێتن، هەتا لە کەل دەبڕێ
«مەحوی، ٣٥٧»

٤- لە بورجی سینە، کە ئەو زوهرە چاوە پێدەکەنێ
فریشتە نییە، کە لە عەرشی خوداوە پێئەکەنێ
«بێخود، ١٢٤»

**١- چ ڕادە بێ، کە بپرسی دەمێ لە حاڵی نزار**
**فیدایی خونچەیی ڕازت، هەزاری وەک منی زار**

چ ڕادە بێ؟: چ ڕوو دەدات؟، چ دەبێ؟، چ دەقەومێ؟.
نزار: لاواز، دڵتەنگ.
منی زار: منی گریاو، منی دڵتەنگ، منی بێ هێز.
واتە: ئەگەر جارێک دەم بکەیتەوە و لە ئەحواڵی منی بێ هێز و دڵتەنگ و بۆ تۆ گریاو بپرسیت؛ چ دەقەومێ؟، خۆ دنیا خراپ نابێ ئەگەر بەزاری خۆت هەواڵم بپرسیت، ئەی هەزارانی وەک منی دڵتەنگ، بەقوربانی خونچەی ئەو دەمەت بێ، کە ئەو باسەی منی پێ دەدرکێنیت.

(١) ئەم کێشە لای: «ئا» بە: «بەحری موزاریع موسەممەن مەقبووز مەخبوون» پێناسە کرابوو (بنوارە:



**٢- دڵی من و سەری زوڵفت، دوو تەوئەمن هەمزاد**
**نە ئەو دەمێکیە سکوون و نە ئەم دەمێکیە قەرار**

تەوئەم: دووانە، جمکانە.
هەمزاد: هاوزا، پێکەوە لە دایک بوو، پێکەوە زاو، ئاوەڵدووانە.
سکوون: ئارام و ئۆقرە.
واتە: دڵی من و کاکۆڵی، زۆر لەیەک دەچن، هەر دەڵێی دوو منداڵی دووانەن و پێکەوە بەسکێک زاون، کە منداڵی جمکانە و دووانە؛ هەمیشە ئاکار و ئارەزووەکانیان لەیەک دەچێ. بۆیە نە قژ و بسکی تۆ، لە شەکاندنەوە و شنینەوە دەکەوێ، نە دڵی منیش ئارام و ئۆقرە دەگرێ.

**٣- چ ڕەونەقێکی هەیە گوڵ، بەپێنج ڕۆژە دەوام!**
**بەهاری تەلعەتی تۆیە، گوڵی هەمیشە بەهار**

ڕەونەق: گەشانەوە، بریسکە.
ڕۆز: ڕۆژ.
بەهاری تەلعەت: بەهاری ڕوخسار.
هەمیشە بەهار: هەمیشە سەوز و گەش، هاوکات ناوی گوڵێکیشە، کە لە چاو زۆری گوڵی تردا، هەمیشە سەوزە و هەمیشە گوڵی گەڵا پانی ڕەنگ زەردی زۆر جوانن.
واتە: گوڵی سرووشتیی؛ کە زۆرتر هەر لە بەهاردا دەگەشێنەوە، تەمەنی ئەو گەشانەوەیەیان هەر نزیکەی (٥ - ٦) ڕۆژێکە، بەڵام بەهاری گەشانەوە و درەوشانەوەی تۆ، بۆ هەمیشە وەک بەهار، سەوز و گەش و درەوشاوەیت.

**٤- بەدەوری گوڵشەنی حوسنت؛ دوو خاڵ و دوو گێسوو**
**دوو زەنگبار غوڵامن و دوو عەنبەر، نییە حەسار**

زەنگبار: لە دوو بەش (زەنگ + بار) پێکهاتووە؛ کە (زەنگ) چەند مانایەکی هەیە:
١- ڕەش، پێست ڕەش (بەتایبەتیش سەربازی پێست ڕەش)، مەرەکەبی ڕەش (وەک هێمایەک ئاماژەی پێ دەکرێ).
٢- زەنگوڵە، زەنگ. جۆرە کەتیرەیەک، کە لە داری کاژ بەرهەم دێت.
٣- ژەنگ، بەڵام مەبەستی ئەم بەیتە بریتییە لە سەربازی پێست ڕەش.

«بار» ئاوەڵناوی جێگەیە و مەبەست لە وڵاتی: «زەنگبار»، یان: «زەنجبار»ە، کە عەرەب وای پێ دەڵێن و دەکەوێتە کەناری ئۆقیانووسی هیند، لە خۆرهەڵاتی ئەفریقا و پێتەختەکەیشی هەر ناوی زەنگبارە، وڵاتی زەنگباریش مەڵبەندێکی بازرگانی و زەمینێکی بەبرشتی بۆ کشتوکاڵ هەیە، کە تیایدا: برنج، گوێزی هیندی، زێڕ، عاج، مێخەک...ی تێدا بەرهەم دێت. بەو بۆنەیەشەوە کە هەڵکەوتی لە کەنار زەریادا بووە، لە دێرزەمانەوە بازرگانیی لەگەڵ ئێران و هیند و وڵاتانی کەنداودا هەبووە. لە هەمان کاتیشدا بەو بۆنەیەوە کە لە دەمێکەوە لە ژێر چاودێریی بەریتانیادا بووە، بۆیە لەگەڵ لەشکرکێشییەکانی ئینگلیزدا، خەڵکی زەنگباریشیان وەک ئەو لەشکرانەی پشتیان پێیانەوە نایەشێ و دەبنە پێشەنگی سوپا، هەمیشە دەوڵەتی ئینگلیز لە هێرشەکانی خۆیدا بۆ داگیرکردنی وڵاتان، سەربازەکانی زەنگباریان پێش قەرەوڵ بوون. لە سەرەتاکانی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلامدا، زەنگبار جێی سەرنج و ئاوڕ لێدانەوە بووە. لە ساڵی ١٥٥٣ز-دا، لە لایەن پورتوگالەوە داگیر کراوە. ساڵی ١٦٩٨ز-، لە لایەن پاشای عومانەوە داگیر کراوە و لە پورتوگال سەندراوەتەوە. ساڵی ١٨٦٥ز-، لە عومان جیا بۆتەوە و لە ساڵی ١٨٩٠ز-دا، فەرەنسا، ئەڵمانیا ڕازی بوون زەنگبار لە ژێر چاودێریی بەریتانیادا بێ. ساڵی ١٩٦٣ز-، سەربەخۆیی بەدەستهێنا و هەر لەو ساڵەشدا بەئەندامەتی نەتەوە یەکگرتووەکان وەرگیرا (دهخدا، بەرگی ٩، ل ١٢٩٧٩ - ١٢٩٨٠).

حەسار: پەرژین، دیوار.

کەواتە ئەوەی «ئەدەب» لێرەدا مەبەستێتی، خاڵی ڕەش، یان سەربازی پێست ڕەشە و بەم مانایەش دەڵێ: بەئاقاری باخی جوانیتا، واتە: بەسەر ڕوخسارتدا دوو خاڵ و دوو پەلک، یان دوو زوڵف هەن، کە هەر چواریان (هەردوو خاڵەکەت و هەردوو زوڵفەکەت، کە هەر چواریان ڕەشن)، بەڵام پەلکەکانت دوو سەربازی پێست ڕەش، پاسەوان و پارێزەری خاڵە ڕەشە بێ پەرژینەکانت دەکەن، بۆیە سەرەڕای ئەوەش کە خاڵەکانت پەرژینیان نییە، بەڵام بەهۆی پەلکە ڕەشەکانتەوە، کە وتمان پاسەوان و دوو سەربازن، کەس ناوێرێ لە ئاقاری خاڵە عەنبەرینەکانت نزیک بکەوێتەوە.

### ٥- بەخاکی پات؛ مەگەر ئەو دەمە بگات: سەری مە
### غوباری پەیکەری خاکی، بگاتە چەرخی چەهار

واتە: تۆ ئەوەندە جێگەت بەرزە، تا ئاسمانی چوارەمین هەڵکشاویت، بۆیە ئێمەمانان



ئەگەر بمانەوێ پێت بگەین، دەبێ ئەو ئاواتەمان بەرینە ژێر گڵەوە، چونکە دوای ئەوەی دەمرین و جەستەمان دەبێتە خاک، ئەوسا مەگەر بەرێکەوت جەستەی بەتۆز و گەردبوومان بگاتە ئاستی بەرپێت.

### ٦- مەماتی دەرگەهی تۆ؛ دۆزەخە ئەگەر! ئاسان
### حەیاتی بێ لەبی تۆ؛ جەننەتە ئەگەر! دشوار

مەمات: مردن.

دەرگەه: دەرگا، دەروازە.

دشوار: دژوار، سەخت.

واتە: هەر ئەوەندەی لە تۆ نزیک بم، ئیتر ئەگەر تا سنووری مەرگیش، یان وەک دۆزەخیشم لێ تێپەڕێ، هەر پێم خۆشە، چونکە هەست دەکەم لە دەرگای تۆ نزیکم، بەڵام دووریی لە تۆ، ئەگەر وەک بەهەشتیشم لێ بەسەر بچێ، هەر بۆم سەختە، لەبەرئەوە ئەگەر لە نێوان هەڵبژاردنی دۆزەخ و بەهەشتدا سەرپشکم بکەن، ئەوا من دۆزەخ هەڵدەبژێرم، چونکە بەوجۆرە هەست دەکەم لە لێوی تۆ نزیکم.

«سالم» دەڵێ:

تەریقی عیشقت ئەر ون کەم، تەریقی دەشتی مەحشەر بم
قیامەت؛ نامەوێ جەننەت، بەبێ تۆ، گەر موخەییەر بم «٨٠»

«مەحوی» دەڵێ:

من: وەسڵی ئەو، بەرابەری جەننەت دەگرم و ئەو:
دۆزەخ بەئاهی سینەیی من؛ ڕووبەڕوو دەکا «٢٥»

### ٧- ئەوەندەی وا، کە ڕەقیبت لە ئێمە دڵگیرە
### هەزار ئەوەندە، بەدیداری تۆ؛ لەوم بێزار

واتە: دەزانم ناحەزانی من، لەسەر ئەوە لێم بەڕقن؛ کە تۆم خۆش دەوێ، بۆیە سوێند بەگیانی تۆ دەخۆم، منیش هەزار ئەوەندەی ڕقەکەی ئەوان لە من، من ڕقم لێیانە و لێیان بێزارم.

**۸- لیـقـایی یاری مـوافـیق غـەزاییەکە بۆ ڕۆح**
**هەرا، لە سوحبەتی ناکەس، ڕەفیقی ناهەموار**

لیقا: دیدار، بەیەک گەیشتن.

موافیق: ساز، ڕازی، ساز و سازگار و تەبا.

هەرا: پەنا بەخوا.

سوحبەتی ناکەس: هاوڕێیەتی کەسانی نالەبار و ناڕێک.

ناهەموار: درشت، زبر، ناڕێک، نالەبار.

واتە: دۆستـایەتی کردنی کـەسـانی پاک و جـێی دڵنیـایی، خـۆراکـێکە بـۆ گـیـان. بەڵام بەپێچەوانەوە هاوڕێیەتی کەسانی نالەبار، هەر مایەی سەر ئێشە و دەرد و چەڵەمەیە.

**۹- لە نێـشی ئەفـعی و ئێـشی مـوسـاحـەبەیی نادان**
**موخەییەری کەن «ئەدەب» گەر، بەسەر دەچێ بۆ مار**

نێش: چزوو، پێوەدان.

ئەفـعی: مـار، کـە خـوێنەرانی ئێـران، لەباتی «ئەفـعـا» بە«ئەفـعی» دەخـوێننەوە و «ئەدەب»یش هەر وای نووسیوە.

موساحەبە: هاوڕێیەتی، هاونشینی.

موخەییەر: سەرپشک.

واتە: ئەگـەر «ئەدەب» لە نێـوان پێـوەدانی مـار و دۆسـتـایەتی کردنی کـەسـانی ناداندا، دەسـەڵاتی سـەرپشـککردنی بدرێتێ، ئەوا بێ سێ و دوو بەسـەر، بەرەو ڕووی مـارەکـە دەچێ، تا پێوەی بدات، چونکە مەرگی خۆی لە دۆستایەتی کردنی کەسانی نەخوێندەوار و نادان، پێ خۆشترە.

لە دێرزەمانیشەوە لە پەندی کوردەواریدا وتراوە: هەزار دۆستی نادانت هەبێ، نەک یەک دوژمنی عـاقڵ. یان وتراوە: خۆشە ئەگەر دوژمنەکەشت عاقڵ بێ.





کێش: بەحری هەزەجی مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن) وەک نموونەی:

۱- دڵ شـیـشـەیی پڕ خـوێنی فـیـراقی فـەرەقی بوو
مەکسووری ڕقی، بەو دڵی وەک بەردی ڕەقی بوو
«نالی، ۳۷۵»

۲- چینی سـەری زوڵفت، بووەتە فـیـتنە لە چینا
غـارەت گـەرە چاوت لە بیـلادی دڵ و دینا
«حەمدی، ۱۹۸»

۳- ئەم خەیمە، کە شەمسییەیی شاهەنشەهی ئەرزە
تا چادری نیلیی سـەری سـەر، تەپلـەکی بەرزە
«حاجی قادر، ۱۰۸»

**۱- زوڵفت صـەنەمـا! لەو گـوڵی ڕوخسـارە نموودار**
**یا نافەیی «چین» چینە، لەسەر خەرمەنی گوڵزار**

صەنەما: ئەی بتەکە (پیتی ئەلفی واژەکە، ئامرازی بانگەوازە).

نموودار: ئاشکرا، بەرجەستە، بەرچاو، دیار، دەرەوشاوە، بینراو (دهخدا، بەرگی ١٤، ل ٢٢٧٥٣).

نافـە: واژەیەکی ئاڤێستاییە و بەپەهلەوی و فـارسی «ناف» و «نافـە» و «نەوادە» و «نەبیرە» و بەکوردی «ناو»، یان «ناووک»، واتە: ناوەوە-یە و بەئەفغـانی: نۆ، توم و بە بلوجی: نابەگ و بەئاڤێستاییش: نەبا، ناف، نەپات، نەپتەر و بەپارسی کـۆن و سانسکریتی: نەپات و بەلاتینی: نیپۆس و بەئەڵمانی: نەبیل و بەئینگلیزی: نیویل و بەعـەرەبی «سُرّە» و... بەهەمـووشـیـان مـەبەست لە «ناووک»ە. (دهخـدا، بەرگی ١٤، ل ٢٢١٩٩). بەڵام لێـرەدا مـەبەست لە نـاووکی ئاسکی وڵاتانی چین و خـەتایە؛ کـە وەک پێشتر وتمان ئەو جۆرە ئاسکانە، خاوەنی بۆنێکی خۆشن.

گوڵنار: گوڵە هەنار.

واتە: ئەی بتـەکە! زوڵـف و پەلکت، کە بەمجـۆرە جوان و بەرجـەستـە و بەرچاوە، هۆی

ئەوەیە ئاوا ئاشکرا و دیارە، کە لەتەک گوڵی ڕوخساری ڕووناکتدا هاوڕێیە؟!. یان بەهۆی ئەوەوەیە، کە بۆنی «ناف»ەی چینە و بەسەر گوڵە هەناردا پژێنراوە؟!.

**٢- گێسووتە ئەگەر، بۆچی وەکو سونبولە تاتا!**
**گەر سونبولە، بۆ پڕ شکەن و حەلقەیە وەک مار؟**

واتە: ئەگەر ئەمە زوڵف و پەلکی تۆیە، ئەی بۆچی وەک گوڵەگەنم، ئاوا تاڵ تاڵ بوونەتەوە؟!. ئەی ئەگەر چڵە گوڵی گەنمن، بۆچی ئاوا لوول و ئەڵقە ئەڵقە و وەک مار پەپکە خواردوون؟!.

**٣- گەر ئەفعییە، بۆ نێشی وەکو عەقرەبە، جەڕاڕ**
**گەر عەقرەبە، بۆ صورەتی مانەندە بەجەدوار؟**

ئەفعی: مار.

عەقرەب: دووپشک، یان: بورجی عەقرەب (لە زانستی ئەستێرەناسیدا).

جەڕاڕ: ئەوەی شتێک بەدووی خۆیدا ڕابکێشێ.

مانەند: هاوشێوە، وەکو.

جەدوار: واژەکە لە بنەڕەتدا بەفارسی «ژەدوار» بووە و دواتر عەرەبەکان کردوویانە بە«جەڕاڕ» و گەلێک مانای جیا جیای هەیە، بەڵام لێرەدا بەمانای: مانگ و پەروین هاتووە (دهخدا، بەرگی ٥، ل ٧٥٦٤).

واتە: ئەی ئەگەر مارە، بۆچی چزووی وەک دووپشکێک وایە، کە شتێک بەدووی خۆیدا ڕابکێشێ و (مەبەستی لە بورجی دووپشکە) و ئەگەر بورجی دووپشکیشە، بۆچی وەک مانگ و پەروینە؟!.

**٤- گا زولفە، دەمێ سونبولی گوڵزارە، دەمێ مار**
**گا عەقرەبی جەڕارە، گەهێ هەیئەتی جەدوار**

واتە: کەوابێ ئەم زوڵف و پەلکانەی تۆ، جارێک زوڵفن و جارێک گوڵەگەنمی ناو گوڵزارن و جارێک مار و جارێک بورجی دووپشک و جارێکیش وەک مانگ و پەروینن.



**٥- گا دەستەیێ ڕەیحان و گەهێ بەستەیێ شەوبۆ**
**گا عەنبەری لەرزان و دەمێ نافەیی تاتار**

واتە: دەمێک چەپکە ڕێحانە و دەمێکی تر چەپکێ شەوبۆ و دەمێک عەنبەری پڕ لە شنینە و دەمێکیش عەنبەری تاتار-ن.

**٦- گا شاپەڕی شاهێن و دەمێ باڵی سیەهـ زاغ**
**گا پەنجەیی تورکان و دەمێ نافەیی تاتار**

سیەهـ زاغ: قەلەڕەش.

پەنجەیی تورکان: مەبەست لە قامک و پەنجەی ناسک و جوانی کچە نازدارەکانی تورکن، کە لە جوانیدا، بەنموونە دەهێنرانەوە.

**٧- گا جەوشەنی ڕووین و دەمێ مەغفەری ئاهن**
**گا شۆخی کەمەند ئاوەر و گا تورکی کەماندار**

جەوشەن: زرێ، سوپەر، قەڵغان.

«سالم» واژەی «جەوشەن»ی بەمجۆرە بەکار هێناوە:

ڕووبەڕووی دڵ، دڵبەرم کێشاویە شمشێری برۆ
حەڵقە حەڵقە سیلسیلەی زوڵفی، بەمیثلی جەوشەنە
«١٣٢»

ڕووین: زۆری بۆ گەڕام، بزانم مانای چییە و بۆ ئەوەش بەهەمان شێوە بەدوایدا نەگەڕێم، نەک لە ڕوونووسکردنەوەی خەتەکەدا ئاڵوگۆڕێک بەسەر پیت و نوقتەیەکیدا هاتبێ؛ کردمە: ڕووبێن و هەندێ شێوەی تریش. کەچی هەر نەمزانی مانای چییە. بەڵام ئەگەر «ڕویوانە» بێت، ئەوا مانای: «ڕووپۆش» و «دەمامک» دەدات، (دهخدا، بەرگی ٨، ل ١٢٤٢٦) و ئەمەش بۆرە نزیکایەتییەکی لەگەڵ سەرومڕی مانای بەیتەکەدا هەیە.(١)

مەغفەر: کڵاو.

(١) «مخ» لە بەرامبەر «ڕووین»دا نووسیویەتی: «بەگوێرەی شانامەی فیردەوسی، ناوی سوارێکی تورانییە...) بەڵام لە دووتوێی شانامەدا ناوی وەها نییە!.

ئاهن: ئاسن.

کەمەند ئاوەر: کەمەندکێش.

تورکی کەماندار: کچە تورکی کەماندار، کە مەبەست لە زەبر و توانای جوانیی ئافرەتانی تورکە؛ بەوەی: چاویان ئەوەندە سیحراوییە، ئەگەر سەرنج بدەنە هەر کەسێک، وەک ئەوەی «کەمەند»یان بێت، بۆ لای خۆیانی بەکێش دەکەن. لە هەمان کاتدا ئاماژەشە بۆ پێشینەی تورک، کە تیرهاوێژ و شەڕانیی بوون.

**٨- گا خەرمەنی نەسرین و دەمێ گوڵشەنی سەوسەن**
**گا خیتتەیی فەڕخار و دەمێ دەککەیی عەتتار**

خەرمەنی نەسرین: خەرمانی نەسرین.

خیتتە: هەرێم، وڵات، ناوچە.

فەڕخار: پێشتر وتمان ناوی شارێکە لە تورکستان، کە بەئافرەتی جوان و میسکی چاک و بۆن خۆشدا بەناوبانگە.

دەککە: سەکۆ، دوکان.

**٩- گا حەڵقە و گا عوقدە، دەمێ خام و دەمێ خەم**
**گا پێچ و دەمێ کونج و دەمێ ڕشتە، دەمێ تار**

گا حەڵقە: جارێک حەڵقە و گا عوقدە: جارێک گرێ و دەمێ خام: جارێکیش خاو و «دەمێ خەم»: جارێک لوول و پێچ.

کونج: لێوار، کەنار، درێژ.

ڕشتە: بادراوە، هۆنراوە.

دەمێ تار: جارێکیش تاڵ تاڵە.

**١٠- گا زیبی زەنەخدان و دەمێ زینەتی غەبغەب**
**گا زینەتی بێستان و دەمێ شەوکەتی دیدار**

زیب: جوان، ڕازاوە، ئارایش.

زەنەخدان: چاڵی چەناگە.

«مەحوی» «زەنەخدان»ی بەمجۆرە بەکاربردووە:



ناوی زەنەخدانت لە ناو باخی بەهەشتا بێتە نێو
سەر وەردەگێڕێ باخەوان، هەر جێبەجێ بۆ: تف لە سێو
«٣٦٣»

غەبغەب: ژێر چەناگە.

**١١- گا ساکینی فیردەوس و دەمێ خاریجی جەننات**
**گاهێ لە لەبی کەوسەر و کونجی دوو لەبی یار**

ساکینی فیردەوس: دانیشتوو، جێگیربووی بەهەشت.

خاریجی جەننات: دەرەوەی بەهەشت.

لەبی کەوسەر: کەنار و لێوی ئاوی کەوثەر.

واتە: دەمێک وەک باوکە ئادەم لە بەهەشتدایە و دەمێکیش لە بەهەشت دەرکراوە؛ بەڵام کە لە بەهەشتدا بێ، ئەوا لە گوێ ئاوی کەوثەردایە و کە لە بەهەشتیش دەرکرا بێ، ئەوا لە کەناری هەردوو لێوەکانی یاردا دانیشتووە و کەناری لێوی یاریش، وەک دانیشتن وایە لە کەناری ئاوی کەوثەر.

**١٢- گا سیلسلەی پامە، گەهێ تەوقە لە گەردن**
**گا بەندی دڵازارە، دەمێ بەندی دڵی زار**

سیلسیلەی پا: زنجیری پێ.

بەندی دڵازار: ئەو زیندانییەی دەردەسەری و کێشە بۆ زیندانەکە و دەوروبەری دروست دەکات.

بەندی دڵی زار: زیندانی ناو دڵی مات و لاواز و گریاوی من؛ یان: بەندی دڵ، بەمانای ڕەگ و ڕیشەی دڵمن، بێخی دڵی مات و مەلوولمن. یان: بەندی گۆرانییمن.

واتە: زوڵفەکانت هەندێ جار زنجیری پێمن و هەندێ جاری تر: تەوقی گەردنمن و هەندێ جاری تریش خۆیان لە دڵمدا زیندانی دەکەن و لە ناو دڵیشمدا دەبنە مایەی دەردەسەریی و هەندێ جاری تریش ڕەگی دڵی گریاومن؛ یان: بەندی گۆرانییە و بۆ دڵنەواییم، گۆرانیم بۆ دەڵێین.

**١٣- سەد خۆزگە، کەس ئەو هیندوویی سەححارە نەبینێ**
**بشبینێ ئەگەر، وەک «ئەدەب»ی نەبووە گرفتار**

واتە: هەزار خۆزگە، کەس، هیچ کەس، ئەو یارەی من نەبینێ، کە دەڵێی هیندوویی جادووگەرە. چونکە هەر کەس بیبینێ، یەکسەر گیرۆدەی دەبێ و لە دەستی دەرباز نابێ. بەتایبەتیش بەوجۆرەی لە دید و خەیاڵی مندا، ڕەنگی ڕشتووە، زۆر جیاوازترە لەو دیتنانەی خەڵکانی تر و ئەوەی من دیومە، یاخوا، کەس وای نەبینێ.

لە فۆلکلۆری کوردیدا هاتووە:

چاوت: چرای سەحرای چینێ
کوڵمت: گوڵی ناو پەرژینێ
وەک من دیومە، کەس نەیبینێ



٣٩

کێش: بەحری هەزەج ئەخرەب موسەممەن ئەشتەر: (مفعول مفاعیل مفعول فاعلن) وەک نموونەی:

١- گەر بازی نەظەربازی، لەم دەست و نیگارەت چی
بۆ بازی یو دەسبازیی، لەم ڕاو و دیارەت چی!
«نالی، ٦٤٢»

٢- ڕەنگ دۆمی فەرەنگی زەند، هەم لێت دەم و هەم بەند کەم
کشتەک لە کونی لووتت؛ مشتەت لە دەفەی ڕانت
«سالم، ٥١»

**١- ئەی قامەت سنەوبەر، وەی تەلعەتت بەهار**
**کوڵمەت: وەکو شەقایق و ڕوخسارە: لالەزار**

قامەت: بەژن و باڵا.
سنەوبەر: کاژ.
شەقایق: گوڵاڵەسوورە.
لالەزار: باخی گوڵاڵەسوورە.

**٢- ئەی خونچەیی نەزاکەتی گوڵزاری دڵبەریی**
**ئەی گوڵشەنی طەراوەتی فیردەوسی کردگار**

گوڵزاری دڵبەریی: باخی ئەوین، باخی عیشق.
طەراوەت: تەڕ و تازە.

**٣- ئەی سەرووی ناز، کە لێمە بەدایم کەنارەجۆی**
**ساتێ وەرە کەنارەکەم، مردم لە ئینتیزار**[1]

(١) لە دەقەکەدا «کەنارم» نووسرا بوو، بەڵام کاتێ لەگەڵ نووسەری هێژا و هاوڕێی بەڕێز: مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداخیدا، بەمەبەستی بەسەرکردنەوەی «کێش»ی ئەم غەزەلە، چووینە لای مامۆستا نوری فارس کاکەخان، فەرموویان دەبێ لەبەر «کێش»ەکەی بەوجۆرە بنووسرێ. بەڵام نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە، هاوڕێم کاک «ئاسۆ» بەوجۆرەی پێ تەواوتر بوو.

کەنارەجۆ: چەند مانایەکی هەیە: کەنارگرتوو، دوورەپەرێز، تەریک. لە هەمان کاتیشدا پێچەوانەکەیشی هەر تەواوە و دەبێ داری سەرو لە کەنار جۆگە و ئاودا بێ. بەڵام لەم بارەیاندا دەبێ: کەنارجۆ، واتە: حەرفی واوەکە، حەوتی لەسەر بێ، تا مانای: جۆگە بدات.

**٤- لەم فەسڵی گوڵ، جەمالی گوڵستان، شکۆهی باخ[٢]**
**وەقتی مەحەببەتە بەدڵئازوردەگانی پار**

فەسڵی گوڵ: وەرزی بەهار، یان مەبەست لەو تەمەنەی مرۆڤە، کە دەگاتە هەرەتی لاوێتی.

جەمالی گوڵستان: جوانیی گوڵجار.

شکۆهی باخ: تاف و هەرەتی ڕازانەوەی گوڵ و باخ.

وەقتی مەحەببەتە: کاتی دڵڕاگرتنی ئەویندارا و دڵدانەوەی ئەویندارانە.

دڵئازوردەگان: کۆی «دڵئازوردە»یە و بەمانای دڵڕەنجاوان دێت.

**٥- پارت جەفا، ئەگەر لەگەڵ ئێمە بەجەبر دەکرد**
**ئەمساڵەکەت وەفا، بەمە بووبێ بەئیختیار**

جەبر: بەزۆرەملێ، بەتۆپزیی.

ئیختیار: پێچەوانەی «جەبرە» و بەمانای کاری ئارەزوومەندانەیە.

ئیختیبار: تاقیکردنەوە، ئەزموون.

واتە: ساڵی پار ئەگەر بەدەست خۆت نەبووبێ و دەبووایە سزا و تاڵاومان پێ بچێژیت، بەڵکو ئەمساڵ، خوا بکات لەگەڵماندا وەفا بنوێنیت و ئەم کارەشت لە ڕووی ناچارییەوە نەبێ، بەڵکو لە ڕووی ڕەزامەندیی و ئارەزوومەندانەوە بێ. هەڵبەتە دەشێ «ئیختیار» «ئیختیبار»یش بێ؛ چونکە ئەو کاتە مانای ئەوە دەگەیەنێ؛ کە ئەگەر پار، لە ڕووی ناچارییەوە و بۆ تاقیکردنەوەمان، دەبووایە جەفامان بدەیت، ئەوا ماوەی تاقیکردنەوەکەمان تێپەڕی و ئێمەی ئەویندارانیشت لەو ئەزموونەماندا بەسەرکەوتوویی

(٢) لە هەمان دیداردا مامۆستا نوری فارس سەبارەت بەواژەی «گوڵستان»ی ئەم بەیتە، فەرموویان دەبێ لەبەر ڕاگرتنی کێشەکەی، بە«گوڵ ستان» بنووسرێ.



دەرچووین و ملکەچی هەموو سزا و چەوساندنەوەیەکت بووین. لەبەرئەوە بەدڵنیاییەوە من لەگەڵ ئەوەدام کە دەبێ «ئیختیبار» بێ و لەم بارەشدا مانای ئەم نیوە بەیتە، لەگەڵ نیوە بەیتی یەکەمدا دەبنە تەواوکەری یەکتری.

**٦- خۆشە ستەم، لە جانیبی یاران؛ بەعاشقان**
**ئەمما نەبەو قەرارە لەگەڵ ئەمنی بێ قەرار**

لە جانیبی یاران: لە لایەن یارانەوە.

قەرار (ی یەکەم): پەیمان، بڕیار، بەڵێن.

قەرار (ی دووەم): بێ ئارام، پەژارە، بێ حاڵ.

**٧- بێ ڕوویی تۆ، بەتایی سەری طوڕەکەت قەسەم**
**دایم دڵم وەکو سەری گێسووتە تابدار**

تابدار: مانای زۆری هەیە: گەشاوە، بریسکەدار، چریسکەدار، لوول، هەڵپێچراو، قژی پەلکەکراو، قوماشی چنراو، گەرم، سووتاو، تەنک. بەڵام ئەوەی «ئەدەب» لێرەدا مەبەستێتی، مانای «سووتاو»ە.

واتە: سوێند بەتاڵ تاڵی سەری کاکۆڵەکانت، ئەو دەمەی کە ڕووی تۆم لێ دیار نابێ و لە تۆ دوور دەبم، دڵم وەک چریسکە و بریسکەی پەلکەکانت، هەر لە گرشە گرشی سووتان و بڵێسەی هەڵقرچاندایە.

ئەم وێنە شیعرییەی ئەدەب، جوانییەکەی لەوەدایە، کە لە کاتێکدا «ئەدەب» هەمیشە ڕووی دڵبەرەکەی وەک هەتاو و ئاگر و ڕووناکیی و گەرمایی دەچوێنێ، کەچی لەم وێنەیەدا، زەبری دووریی لە ڕوخساری دڵبەرەکەی، بۆتە ئاگر و بڵێسە و هۆی سووتاندنی «ئەدەب».

**٨- ئەو یەک دەمە نیشاتە، بەسەدا ڕەنج و دەردی سەر**
**یەک عالەمە حەیاتی، بەبێ زەحمەتی خومار**

واتە: ئەو تاوە شیرینەی (سەرەڕای ئەوەش زۆر بەگران و بەسەد دەردی سەر، بەدەستی دێنم) بەدیدارت شاد دەبم و دەبووژێمەوە، پڕاوپڕی هەموو کاتەکانی ئەم جیهانەمە، کە دوور لە تۆ، بەسەرخۆشیی بەسەری دەبەم.

**٩- با موودەعی لە نەزمی «ئەدەب»دا نیشان بدات**
**کامی وەدیعەیە لە کەس و کامی موستەعار!**

موددەعی: مانای زۆری هەیە، بەڵام ئەوەی لێرەدا مەبەستە، مانای «ڕەخنەگر»ە.

وەدیعە: شتی لە خەڵکی تر وەرگیراو، خوازراو، خواستەمەنی.

واتە: با ڕەخنەگری شیعری «ئەدەب» ئەگەر دەتوانێ؛ بیسەلمێنێ کە کێ شیعری تازە داهێنراو دەئافرێنێ و کێ شیعری خۆی لەملاولا وەردەگرێ و دەخوازێ!. بەواتەیەکی تر: شیعری «ئەدەب» ئەفراندنێکی تایبەتی و هونەریی خۆیەتی و چاوی لە کەس نەکردووە و شوێن پێی هیچ شاعیرێک نەکەوتووە و دەستەچیلەیشی بۆ شیعر نووسین، لە هیچ شاعیرێکی تر وەرنەگرتووە.

ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە، کە شیعری «ئەدەب» لە ڕۆژگاری خۆیدا، جێی مشتومڕی زۆری خوێنەران و شیعردۆستان و شاعیران بووە و «ئەدەب» شانازیی بەشیعر و شاعیرێتی خۆیەوە دەکات، کە بەرهەمی سەلیقە و دەسەڵاتی شاعیرانەی خۆیەتی.



٤٠.

کێش: بەحری موجتەس موسەممەن مەخبوون مەقسوور: (مفاع لن فعلاتن مفاع لن فعلن) وەک نموونەی:

١- وەکـــو نەهاری بەهاری درێژ و پاییـــزی کـــورت
ئەمەل گەلێک و تەویل و عەمەل کەمێک و قەسیر
«نالی، ٢٠٧»

٢- جەنابی موفتی ئەفەندی! ڕشێنەیەک لە باران
لە دڵتی ششتەوە نەقشی مەحەببەتی جاران
«مەحوی، ٣٤٦»

**١- بەهار و گۆشەیی باغ و سەباح و زنجی خەممار**
**چی خۆشە! جامی سەبووحیی، لە دەستی نازکی یار**

زنج: کۆڵێت، کوخت.

جامی سەبووحی (صبوحی: عەرەبی): بادەی بەربەیانی.

واتە: چی لەوە خۆشترە لە بەرەبەیانێکی وەرزی بەهاردا، لە باخێکدا پەنایەکت چنگ بکەوێ و پەرداخێکی پڕ لە بادەی بەیانیانە، لە دەستی ناسکی یار وەربگریت!.

**٢- کەناری گوڵ بی و هەمدەم بەگوڵ، بەرابەر گوڵ**
**چی خۆشە! خونچە چنینت، بەبێ مەشەققەتی خار**

هەمدەم: هاودەم، هاوڕێ.

خونچە چنین: مەبەست لە ماچکردنی لێوی یارە.

خار: دڕک، خەس.

واتە: لەو باخەدا، گوڵی سرووشتیی لە تەنیشتت بێ و یاریش هاودەمت بێ، کە یار هەر خۆی، لە گوڵ دەچێ و لەو باخەشدا لە بەرابەر گوڵدا دانیشتووە و جار جارەش خونچەیەکی دەمی بچنیت؛ واتە جار جارە ماچی بکەیت، کە ئەمجۆرە گوڵچنینە، بەپێچەوانەی گوڵچنینی سرووشتییەوەیە، چونکە لەم گوڵچنینەیاندا، دڕک و داڵ ئازارت نادەن.

**٣- چی خۆشە! مەجلیسی عەیش و بیساتی سەبزە و باغ**
**بەشـەرتێ سـەبزە، لە دەمی جـۆبیـار و پای چنار**

بیساتی سەبزە: ڕایەخی سەوز، کە مەبەست لە چیمەنی سەوز و گژوگیایە.

جۆبیار: جۆگە.

پای چنار: لە پاڵ دار چناردا.

**٤- نەدیم و ساقی دیار و دوو سێ ڕەفیقی شەفیق**
**بەدەورە حەڵقە بەیەک کەن، وەکو خەتی پرگار**

نەدیم: هاوڕێی کۆڕی مەیخواردنەوە، هاوپیاڵە، هاوپێک.

دیار: وڵات، نیشتمان.

پرگار: پرگاڵ.

**٦- نیگاری خۆ، بەسەفا جارێ، ساغـەرت دا ساقی**
**لە بەینی جامی مەزەش: یەک دوو بۆسە جار جار**

نیگاری خۆ: دڵدارەکەی خۆت.

ساغەر: دەفری مەی.

بۆسە: ماچ.

«سالم» واژەی «ساغەر»ی بەمجۆرە بەکاربردووە:

١- لێوی تۆ، ئەو وەختە سەر ساغەر دەچوو
لێوی ساغەر، خۆزگە لێوی من دەبوو
«١١١»

٢- ساغەری تۆ: لە بادە دائیم پڕ
خاتری من: هەمیشە پڕ ئەلەمە

واتە: دڵدارەکەی خۆت، بەڕووخۆشییەوە خۆی مەیگێڕ بێ و مەییت بۆ لە دەفر بکات و لە نێوان هەر پێکێکی بادەشدا، لەجیاتی مەزە، ماچێکت بداتێ... «نالی» دەڵێ:



شـەرابی لەعلی ڕوممانی لە «نالی»
حەرامە، بێ مەزەی ماچێکی لێوان
«٣٢٢»

**٧- لە جامی بادە، کە مەستانە بووی، بەسەرخۆشیی**
**بەهەردوو دەست، دڵارامی خـۆت بگریە کـەنار**

بگریە کەنار: ببەیتە تەنیشت خۆتەوە؛ یان: ببەیتە پەنا و سووچێکەوە.

**٨- دەمێ لە مشکی دەمی ڕامـژی گوڵاو و شەکەر**
**دەمێ لە لەعلی لەبی، ناری دانە، شەربەتی نار**

ڕامـژی: لە دوو بەشی (ڕا + مـژین) پێکهاتووە، کە هەر «ئەدەب» ئەم بەکارهێنانە جوانە کوردی و پەتییانە دەکات و مانای «هەڵمژین» دەدات و بەپێودانی وشەگەلی وەک: ڕامووسان و ڕاخوشین و... هتدی موکریانییە.

واتە: کە یارت بردە پەسێویێکی نەدیوی باخەکەوە، ئەوسا بکەویتە ماچکردنی و بەدەم ماچکردنییەوە، لە ڕێگەی بۆن و بەرامەی وەک مسک بۆن خۆشی دەمییەوە، گوڵاو و شەکراوی بمژیت و لەو لێوە وەک لەعل ئاڵانەیشی، کە هەر دەڵێی ڕەنگی دەنکە هەنارن، ئەوەندەی بمژیت، تا ئەو دەنکە هەنارانە، دەبنە شەربەت و ئەوسا وەک شەربەتی هەنار، بیخۆیتەوە.

**٩- فیدای عوزو بەعوزوی بی، سەد کەڕەت، هەر یەک**
**خوسوسی: غەبغەبی سێوی، هەزار بەهەزار**

فیدای عوز و بەعوزوی بی: بەقوربانی یەکە یەکەی ئەندامەکانی لەشی بێت.

سەد کەڕەت هەر یەک: هەر ئەندامەی سەد کەڕەت بەقوربانی بێ.

خوسوسی: بەتایبەت.

غەبغەب: ژێر چەناگە.

هەزار بەهەزار: هەزاران جار.

**١٠- «ئەدەب» مەنازە بەگوفتاری وا شەکەربارت**
**کە تۆی لە ماچی لەبی شەهدی وی، شەکەر گوفتار**

واتە: «ئەدەب»! بەم شیعرە شیرینانەتەوە مەنازە، چونکە هەموویان و هەموو بەهرەیەکت، هەوێن و دەستەچیلەی ماچی دڵبەرەکەتە... لەم شیعرەشدا (وەک شیعری پێشوو) ئەدەب شانازیی بەشاعیرێتی خۆیەوە دەکات.





کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن) وەک نموونەی:

١- شاه بەقەسدا کوشتنا من ڕم هەژاندن بێ سەبەب
دامە چەشمێ قەهر و خەشمێ ڕم ل دلدا کو ئەدەب
«مەلای جزیری، ٧٠»

٢- ئاسمانی حوسنی مەحبووبم لە ئەبرۆ و زولف و ڕوو
دوو هیلال و دوو شەو و دوو ماهی تابانی هەیە
«نالی، ٥٧٤»

٣- چاوەکەت وەختێ بەئیما، مەیلی جامی مەی دەکا
هەرچی مەی دەیکا لەگەڵ ئەو، ئەو لەگەڵ ئێمەی دەکا
«سالم، ٢٩»

٤- بێ سەر و سامان عەجەب دەریایەکی قەترانە شەو
ڕۆژی ڕەش بێ دۆزەخێکی موددەتی هیجرانە شەو
«حەمدی، ٧٧»

**١- زوڵفی شەوڕەنگت تەرازی گەردنی تەرزی بلوور**
**زوڵمەتێکە، فیترەتەن تێکەڵ دەگەڵ کۆمای نوور**

شەوڕەنگ: ڕەش وەک ڕەنگی شەو.

تەراز: بەرابەر؛ یان: نەخش و چنین و نیگاری داوێن و پەراوێزی قوماش و جلوبەرگ.

تەرز: جۆر، شێوە، چەشن.

فیترەتەن: زگماک.

کۆما: ناوەند، جغر، کۆمەڵە، مەڵبەند (فەرهەنگی کوردستان، گیوی موکریانی، ل ٧٨٢).

واتە: زوڵفت، وەک ڕەنگی شەو ڕەشە و ئەم ڕەشیی زوڵفەت بەرابەرە بەسپێتی گەردنت، چونکە زوڵفت، هەر خوداوەند بۆ ئەوەی ئاوا بەو ڕەنگە زۆر ڕەشە خولقاندووە، تا وەک تاریکایی و زوڵمەتێک بێت، تێکەڵ بەپرشنگ و ڕووناکیی و سپێتیی گەردنت.

**٢- خالّی مشكینە لەسەر كولّمە، بەڕەنگی ئاتەشت**
**عوودە؟ یا بۆ چەشمی بیمارت، لەسەر مەجمەر، بخوور؟**

خالّی مشكین: خالّی وەک مسک.

ئاتەش: ئاگر.

عوود: داری عوودی بۆن خۆش.

مەجمەر: ئاگردان، پشكۆدان، مقەلّی.

واتە: خالّە وەک مسكەكەت، لەسەر كولّمت، كە ڕەنگی لە ڕەنگی ئاگر دەچێ، نازانم داری عوودە و بۆ خۆشیی دەیسووتێنێت؟ یان چاو ئێشەتە و خالّەكەشت بخوورە و بۆ چاو ئێشەكەت دەیسووتێنێت؟!. بەواتەیەكی تر: كولّمەكانت ئەوەندە گەش و ئاگراوین، خەلّكی وا دەزانێ خالّەكەی سەر كولّمت تیایدا دەسووتێ و هەست بەدووكەلّ و سووتانی دەكات.

**٣- ئەی عەجایب! زولّفەكەی سەركەش لەسەر ڕوخسارتە**
**با وجوودی سەربڕین، بۆ هێندە خودسەرن و جەسوور؟**

ئەی عەجایب: چ سەیرە!. چەند سەمەرەیە!.

سەركەش: سەربزێو.

خودسەر: یاخی، چاوقایم، بوێر، كەللەڕەق، جەربەزە.

واتە: زۆر سەیرە!. زولّفەكانت، سەرەڕای ئەوەش كە زوو زوو سزایان دەدەیت (واتە: دەیانقرتێنیت)، لەسەر ئەوەی چۆن زات دەكەن، بەو ڕەنگە ڕەشەیانەوە، نزیكی سپێتیی گەردن و ڕوومەتت ببنەوە، كەچی ئەوەندە یاخی و چاوقایم و جەربەزەن، هەر دێنە سەر كولّم و دەوری گەردنت!. كە ئەمە نیشانەی ئەوەیە زولّفەكانیشت شەیدای سپێتی كولّم و گەردنت بوون و سەرەڕای سزادانیشیان، بەلاّم گوێ بەسزادان نادەن و چێژ لە نزیكایەتی كولّم و گەردنت وەردەگرت.

**٤- هەر كەسێ جارێ ئەتۆی دیبێ و بەهەشتی تەلعەتت**
**چەنبەری موو، تەوقی ملیە، تا بەوەقتی نەفخی سوور**

بەهەشتی تەلعەت: بەهەشتی ڕوخسار.

چەنبەری موو: ئەلّقەی پەلک و زولّف.



نەفخی سوور: كەڕەنای ڕۆژی زیندووبوونەوە، ڕۆژی قیامەت.

واتە: ئەوەی بۆ تەنیا جارێكیش چاوی بەبەهەشتی ڕوخسارت بكەوێ، ئیتر ئەلّقەی پەلكەكانتی وەک تەوقێک لە مل دەكرێ و تا دەمرێ و دوای مردنیشی تا ڕۆژی قیامەت، ئەو تەوقی زولّفەتی هەر لە گەردندا دەبێ. چونكە پێی وا دەبێ بەهەشتی ڕاستەقینە تۆیت و هەر بەهیوای تۆوە دەژی و دەمرێ و زیندووش دەبێتەوە.

«سالم» دەلّێ:

زولّفی تاتات، تا ئیحاتەی گەردنی داوی بووە
باری ئەهلی كوللی عالەم، جوملە گەردن گیری تۆ
«١١٤»

**٥- صورەتی بێ میسلی تۆ، كوا دێتە تەصویر و قەلّەم**
**گەر دووبارە «ئازەر» و «مانی» لە «چین» بێنە ظهوور**

صورەت: وێنە.

بێ میسل: بێ هاوتا، بێ وێنە، بێ بەرابەر.

تەصویر: وێنەكێشان.

ئازەر: ئاگر. بەلاّم لێرەدا مەبەست لە «ئازەری پەیكەرتاش»ی بەناوبانگە.

مانی: وێنەكێش و پەیامبەری بەناوبانگ.

واتە: وێنەی بێ وێنە و بێ دووبارە توانای بوونەوەی تۆ، كێ دەتوانێ بەقەلّەم بیكێشێ؟ خۆ ئەگەر دووبارەش «ئازەر»ی پەیكەرتاش و «مانی»ش لە ولاّتی «چین» زیندوو ببنەوە، ناتوانن پەیكەری تۆ، یان وێنەی تۆ بكێشن.

(وەک دەردەكەوێ ئەدەب تەقەللای وێنەكێشانەوەی دلّبەرەكەی دابێ و نەیتوانیبێ؛ چونكە لە پێشەكیدا ئاماژەمان بەوە كرد، كە «ئەدەب» هونەری وێنەكێشانیشی هەبووە).

«نالی»ش لە بەرابەر وێنەی بێ وێنەی «حەبیبە»دا دەلّێ هەر خوا، خۆی دەتوانێ وێنەی تۆ بكێشێ:

«مانی» نییەتی قووەتی تەصویری برۆی تۆ
ئەم قەوسە، بەدەستی موتەننەفیس نەكشاوە
«٥٣٥»

«سالم»یش هەر لەم بوارەدا دەڵێ:

بۆ خەیاڵی نەقشی تۆ، «مانی» لە من کەودەنترە
ڕەنگی خامەی کردگارە، سەنعەتی تەصویری تۆ
«١١٤»

**٦- گەر لە «ئەیمەن»ڕا تەجەللای رووی تۆی دیبا «کەلیم»**
**بۆ بەشەو هێندەی مەسافەت، بۆی دەچووە سەر کێوی «طوور»؟**

ئەیمەن: ئەو شوێنەی کە حەزرەتی مووسا تیایدا قسەی لەگەڵ خودادا کرد.

کەلیم: هەر مەبەست لە حەزرەتی مووسایە، کە «کەلام»ی لەگەڵ خودادا کرد.

واتە: ئەگەر حەزرەتی مووسا پێشتر رووناکایی رووی تۆی دیبا، ئیتر خۆی بەوەوە ماندوو نەدەکرد، تا بچێتە سەر کێوی توور و تکا لە خودا بکات، تا ڕوخساری خۆی نیشان بدات.

**٧- بەس کە یادی تۆ، موجەسسەم بوو لەبەر مەددی نەظەر**
**دوو دەبینم تەلعەتت، وەک ئەحوەلان، وەقتی حوزوور**

موجەسسەم: بەرجەستە، بەرچاو، ئاشکرا.

لەبەر مەددی نەظەر: لەبەر مەودای دیتنی چاودا، تا چاو هەتەر دەکات.

ئەحوەل: خێل.

واتە: چونکە هەمیشە بیرت لێ دەکەمەوە و بەخەیاڵ؛ شێوەت بەبەرچاوی خۆم دەهێنم، وام لێ هاتووە، وەک ئەوەی خۆت لە حوزووردا دەبینم، وەک مرۆڤی خێل، بەدوو کەس دێیتە بەرچاوم: کەسێکیان کە بەخەیاڵ وێنەتم بەبەرچاوی خۆم هێناوە و کەسێکیشیان کە هەر ئاسایی خودی خۆتیت.

**٨- تۆ وەرە؛ ئەی نووری دیدەم، ساعەتێ بتگرمە بەر**
**چاوی لێ بێ موددەعی، کوێر بێ لە حەیفان، دوور بەدوور**

بتگرمە بەر: بتگرمە باوەش، لە ئامێزت بگرم.

موددەعی: ڕەقیب، ناحەز، دوژمن.



**٩- با ڕەقیب بشلێ: فلانی لایقی خیدمەت نییە**
**کەی لە خدمەت تۆ، ئەمە بوومانە یەک زەڕە قسوور؟**

فلانی: مەبەست لە «ئەدەب» خۆیەتی.

ئەمە بوومانە: ئێمە (من) بوومانە.

قسوور: کەمتەرخەمیی، درێغیی.

**١٠- بۆ لە نازی دڵبەران، هێندە دەناڵێنی «ئەدەب»**
**لازمەی خاقانی حوسنە، کەوکەبەی ناز و غروور**

خاقانی حوسن: شای جوانیی.

کەوکەبە: کەژاوە.

واتە: ئەی «ئەدەب» گلەیی لە دەست ناز و غرووری دڵبەران مەکە و بناشتت نەبێ؛ ئاخر نازانی شای جوانان، ئەو کەژاوەیەی کە پاشایان لە نۆکەر و خزمەتکار و قەرەواش و پاسەوانە زۆرەی بەدوای خۆیانیان دەخەن؛ ئەمان (شای جوانان) کەژاوەی ناز و غروور- یان لەگەڵدایە ؟!.

کێش: بەحری موزاریع موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن) وەک نموونەی:

١- تۆ: نەوشگوفە وەردی، من: مایلم بەزەردیی
تۆ، هەمسەرت نەسیمە، من: هەمدەمم لەهیبە
«نالی، ٣٩٥»

٢- نەشئەی خومارە مایەی رۆحی رەوانی رەز
حوزن و مەسارە رەنگی بەهار و خەزانی رەز
«حەمدی، ٢٥٨»

٣- یەک زەرە عەکسی پرتەو، دەرکەوت طوری سووتاند
ئایینە سەخت روو بوو، لەو عەکسە تابی هێنا
«سالم، ٣٥»

٤- بۆ باغی مەردی باغی، سەرمایەکەی خەزانی
بۆ مەزرەعەی فەقیران، سەرمایەکەی بەهاری
«حاجی قادر، ١٤٣»

**١- ئەی بادی سوبحدەم؛ کە بکەی بەو گوزەر، گوزەر**
**جاریێ بدە بەیاری لەمە بێ خەبەر، خەبەر**

بادی سوبحدەم: بای بەربەیانی.

بەو گوزەر، گوزەر: گوزەر (ی یەکەم): بەمانای گەرەک و کۆڵان، گوزەر (ی دووەم): بەمانای سەردان و تێپەڕین، رۆیشتن دێت.

بێ خەبەر، خەبەر: خەبەر (ی یەکەم): بێ ئاگا، بێ هەواڵ، بێ سەروشوێن. خەبەر (ی دووەم): بەمانای هەواڵی بدەرێ.

**٢- لەو حاڵی زاری مە، کە بپرسێ بەئیلتیفات**
**عەرزی بکە: نەماوە لەمەی بێ ئەسەر؛ ئەسەر**

ئیلتیفات: لوتف و سۆز و میهرەبانیی، ئاوڕ لێدانەوە، بەسەرکردنەوە.



ئەسەر (ئەثەر): شوێنەوار، نیشانە، جێگە و شوێن.

واتەی هەردوو بەیتەکە: ئەی سروەی بەربەیانی! ئەگەر رێت لەو گەرەک و کۆڵانەی ماڵی یار کەوت، بەو یارەم بڵێ، کە هیچ هەواڵێکی لە من نییە، ئەگەر لە رووی میهرەبانییەوە، هەواڵێکی ئێمەی پرسی، ئاگاداری بکە، کە شوێنەوار و ناونیشانێکم نەماوە. واتە: لە دووری ئەو، نەماوم.

**٣- وەختە وەکو: شەکر، لە نمی دیدە، بیمە ئاو**
**لەو دەم کە نامژم لە لەبی گوڵشەکەر، شەکەر**

واتە: ئەو کاتانەی کە یار لێم نزیک بوو، بەو هۆیەوە کە ماچی لێوە شیرینەکەیم دەکرد، منیش وەک شەکر شیرین دەبووم، تا وام لێهات لە ئەنجامی زۆر ماچکردنی لێویدا، ببوومە پارچەیەک شەکر. بەڵام ئەوەتەی لێم دوور کەوتۆتەوە (یان: ئەوەتەی لێوی نامژم) و شەکر و شیرینیی لێوی نامژم، ئیتر پیشەم هەر گریانە و لە دڵۆپی فرمێسکەکانی خۆمدا، جەستەی وەک شەکرم، وردە وردە دەتوێتەوە و بەئاو دەبێ.

ئەم دووریی و دابڕانەی «ئەدەب» لە یار، کە لە ئاکامیدا جەستەی وەک پارچەی بەشەکەربووی، بەهۆی فرمێسکەکانییەوە دەتوێتەوە، هێمایەکی نزیک و ڕاستەوخۆمان دەداتێ، تا لە بەیتە شیعرێکی «نالی» نزیک ببینەوە؛ ئەو بەیتەی لە قەسیدە بەناوبانگەکەی لە شامەوە بۆ سالم-ی ناردووە و بە«قوربانی تۆزی رێگەتم...» دەست پێ دەکات و لە باسی خەم و ژانی دووری خۆی و نیشتماندا رۆ دەچێ و دەڵێ:

لەم شەرحی دەردی غوربەتە، لەم سۆزی هیجرەتە
دڵ؛ رەنگە بێ بەئاو و بەچاودا بکا عووبوور
«١٩٧»

ئەگەرچی سەرومڕی تێکستەکانی بەردەستم، هەموویان «نمی دیدە»یان نووسیوە، بەڵام من لای خۆمەوە سووکە گومانێکم هەیە لەوەی «نمی دیدە» لە بنەڕەتدا «یەمی دیدە» بووبێ؛ کە «یەم» بەمانای زەریا دێت و جەستەی بەشەکربووی «ئەدەب»یش رێی زۆرتری تێدەچێت، کە لە ناو زەریادا باشتر و زووتر بتوێتەوە، وەک لەوەی بە«نمی فرمێسک» بتوێتەوە.

«نالی» دەڵێ:

یەمی دیدە پڕ لە مەرجان، وەک یەشمی ئابدارە
شەبەیە، شەبیهی زوڵفی سیاهی وەک زوخاڵی
«٦٥٩»

«سالم»یش دەڵێ:

دڵ لە گێژاوی یەمێکا، بەشەنا مەشغووڵە
تاوەکو مەددی نەظەر، ساحیل و پایانی نییە
«١٣٥»

**٤- لەو گوڵشەنی جەماله؛ کە خۆم باخەوانی بووم**
**باعیس چ بوو، کە بووم لە دەرکی بەدەر، بەدەر!؟**

باعیس (باعث): هۆ، سۆنگە.

واتە: ئەو باخە پڕ لە گوڵەی جوانیی، کە خۆم باخی جوانییەکەیم پەروەردە کرد و هەر خۆمیش باخەوانی بووم، لەسەرچی بوو لێی دەرکرام و ڕێگە نەدرا ڕوو لە دەرگاکەی بکەمەوە؟!.

**٥- عومرێکە من لە سایەی ئەو نەخلی قامەتەم**
**نەمدی قەتم لە سەرووی قەدی پڕ سەمەر، سەمەر**

نەخل: دارخورما.

سەمەر (ثەمەر): بەر، بەروبووم.

واتە: هەموو تەمەنم لە ژێر سێبەری قەد و باڵای بەرزی وەک ئەو دارخورما پڕ بەروبوومەم، کەچی هەرگیز میوەیەکم لە بەری ئەو قەد و باڵا ڕێک و ڕەوانە نەچنی.

**٦- چەندم جەفای تۆ دی و چەندت ستەم کرد**
**نەتنیشتە دڵ قەتت لە منی خاکەدەر، کەدەر**

نەتنیشتە دڵ قەتت: هەرگیز نەتگرتە دڵ. دەبێ لێرەدا ئاماژەش بۆ ئەو گەمە زمانەوانییانەی «ئەدەب» بکەم، کە ئەم دوو حەرفی «ت»ی لێرەدا لە: «نەت + نیشتە» و «قەت + ت»دا بەمجۆرەی ئێرە داڕشتوون.



خاکەدەر: ئەو خۆڵ و خاکەی لە ماڵان و باخدا، لە دوای پاکژکردنەوەیان، فڕێ دەدرێنە دەرەوەی باخ و ماڵ.

کەدەر: نیگەرانی، زیزبوون، تۆران. تۆز و گەرد نیشتنە سەر دڵ، بەهۆی پەژارە و دڵساردیی بەرامبەر کەسێک.

واتە: سەرەڕای ئەوەش کە تۆ هەمیشە سزا و ئازاری منت دەدا و منت دەچەوساندەوە، بەڵام چونکە من هەمیشە وەک گەرد و خاکی بەردەرگاکەت بووم و جار جارەش فڕێت دەدامە دەرەوە، کەچی نەمهێشت گەرد و تۆزی خۆمت لە دڵ بنیشێ و کارێکی وام نەکرد لێم زیز و بێزار بیت و دڵت لێم بڕەنجێ، یان ڕقت لێم هەستێ.

**٧- حاشا؛ من و لە خاکی دەرت عەزمی ئیرتیحال**
**ئەمن و جەلایی مەوتەنی خۆم؛ ئەلحەزەر، حەزەر**

عەزمی ئیرتیحال: تەقەللا و نیازی سەفەر و جێهێشتن.

ئەمن و جەلایی مەوتەن!: (کە مەبەست ئاقاری یارە): من و دوورکەوتنەوە و خۆهەڵکەندن لە نیشتمان!.

ئەلحەزەر (أَلحَذَرْ): وریاکردنەوە و بەئاگا هێنانەوە بۆ نەکردنی کارێک.

واتە: من هەرگیز نیاز و مەبەستم دوورکەوتنەوە و جێهێشتنی تۆ نییە و جێهێشتنی تۆ، وەک جێهێشتنی نیشتمان دەبینم و بۆ هەمیشە شتی وا بەبیرمدا تێناپەڕێ.

**٨- جەوری بتان، بەحوکمی قەزا، بۆمە عاشقان**
**خۆشە؛ بەڵا نەوەک بەهەموو دەم؛ قەدەر، قەدەر**

جەوری بتان: سزا و ئازاری لای دڵبەرانی جوانەوە.

بەحوکمی قەزا: بەگوێرەی چارەنووس.

بۆمە عاشقان: بۆ ئێمەی عاشقان.

واتە: ئەو چارەنووسەی کە خوا لە چارەمانی نووسیوە و دێتە ڕێمان، پێی ڕازین و ئەوەش کە لای دڵبەرانمانەوە ئازارمان دەدەن، هەر ڕازین و پێمان خۆشە. بەڵام نەک ئیتر ئەو سزا و ئازارە، هەدادانی نەبێ و بێ بڕانەوە بێت و دڵبەرانمان پێیان وابێ کە «قەدەر»مان هەر چەوساندنەوەیە. هەڵبەتە دەکرێ مانای «قەدەر قەدەر»یش وا لێک بدرێتەوە، کە ئەگەر سزا و ئازارو لای دڵبەرانی جوانەوە بێت؛ خۆشە و قەیناکە، بەڵام

نەک بەو ئەندازە زۆر و بێ بڕانەوەیە، بەڵکو «قەدەر قەدەر»، واتە: ناوبەناوێک.

**٩- پێوەم «ئەدەب» سەرێ لە هونەر من کەنارەکەم**
**زەرپێکە بێ هونەرە، لە لای بێ هونەر، هونەر**

واتە: پێم چاکە بۆ ماوەیەک لەگەڵ بەهرەی شیعر و هونەردا جیا ببمەوە، چونکە هونەر و بەهرەی بەرز، لای بێ هونەران، نرخ و بایەخی نییە و وەک زێرپێکە، کە هونەری تێدا بەکار نەبرا بێ.

(لەم بەیتەشدا «ئەدەب» بەجەختەوە داکۆکی لە پایەی بەهرەی شیعریی خۆی دەکات و دەیسەلمێنێ کە بەهرەکەی لە ئاستێکی بەرزدایە و هەموو کەس ناتوانێ تێی بگات).



## ٤٣

سەرنج: ئەم شیعرە درێژەی «ئەدەب» شوێن پێهەڵگرتنێکی شیعرە بەناوبانگەکەی «نالی»یە، کە بۆ خاتوو: مەستوورەی کوردستانی و ناسراو بە: ماهشەرەفخانم (١٨٠٣ز - ١٨٤٧ز)ی کچی «ئەبولحەسەن محەمەد بەگ»ی نووسیوە، کە «مەستوورە» نووسەر و مێژوونووس و هاوسەری: خەسرەوخانی میری ئەردەڵان (١٨٠٠ز - ١٨٣٤ز) بووە. شیعرەکەی «نالی» و هۆی نووسینی و هونەری شاعیرانەی «نالی»یش لەو شیعرەیدا، هێشتا جێی باس و خواس و مشتومڕە.

ئەم شیعرەی «ئەدەب»یش سەرەڕای ئەوەی وەک وتمان شوێن پێهەڵگرتنی «نالی»یە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا شێوەیەکی تری سەلیقە و سنعەتسازیی و دەستڕەنگینی شاعیرانەی «ئەدەب»ە، کە وەک خۆیشی لە دوایین بەندا ئاماژەی پێ دەکات، زۆری پێوە ماندوو بووە و هونەری شاعیرانەی نواندووە.

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن) وەک نموونەی:

١- هێند مونتەزیری تۆ بوو، هەتا چاوی سپی بوو
نەرگس؛ کە لەسەر یەک قەدەم و دیدە چەقی بوو
«نالی، ٣٧٧»

٢- سەودایی سەری زولفە، بەدایم لەسەرمدا
ئیمکانی نییە قەطعی خەیاڵە لەسەرمدا
«حەمدی، ٢٠٨»

٣- هەر لێرە هەتا دەشتی بەهەشت: ئایینی «لاجان»
ئاهیستە بڕۆ، نەک وەکو دێوانەیی هەرزە
«حاجی قادر، ١٠٩»

**١- دوێشەو، شەوی شەنبە، کە لە شەمعی مەه و ئەختەر**
**ئاراستە بوو سەتحی سەراپەردەیی ئەخضەر**
**من؛ بەندە لە کاشانەیی تاریک و موحەققەر**
**دوو دیدەیی عیبرەت، بەبەر ئەو سەقفی موجەددەر**
**گەه غەرقی خەیالات و گەهێ واڵە و موضطەر**

شەمعی مەه ئەختەر: پێچواندنی مانگ و ئەستێرە، وەک ئەو کاتانەی لە بۆنەیەکی خۆش و تایبەتیدا، بەڕیز مۆم دادەگیرسێنرێ.

ئاراستە: ئارایشکراو، ڕازاوە.

سەتح: سەروو، میچ، بان.

سەراپەردەیی ئەخضەر: هێمایە بۆ وەسفی ئاسمان.

دیدەیی عیبرەت: سەیرکردنی ئەو جۆرەی کە پەند و دەرسی لێ وەربگیرێ.

سەقف: بنمیچ.

موجەددەر: بنمیچی کون کون.

**٢- گەه مات و سەراسیمەیی ئەو ڕەسم و کەتیبە**
**گەه حیرەیی ئەو قودرەت و ئەو نەقشە عەجیبە**
**ئەو جرمە درەخشندە، بەم ئەشکالە غەریبە**
**بێ زەحمەتی نەققاش و بەبێ ڕەنگی کەتیبە**
**چۆنی بەسەفا خستە سەر ئەو سەفحەیی مەنزەر**

گەه: جارێک، تاوێک، کەڕەتێک.

سەراسیمە: سەرسووڕماو.

کەتیبە: نووسراوی سەر بەرد و گڵێن.

حیرە: ڕامان، سەرسووڕمان.

جرم: ماددە؛ وەک دەوترێت: ئەجرامی سەماوی.

درەخشندە: درەوشاوە.

بێ ڕەنگی کەتیبە: بەبێ جەوهەری نووسین.



**٣- جارێکی خیتابم بەدڵی غەمزەدەیی زار**
**ئەی هەمدەمی خەمخوارم و وەی مەحرەمی ئەسرار**
**تاکەی بەهەوای عیشقی بتان و خەمی دیدار!**
**تاکەی بەجەفای وەسڵی گوڵان و لەبی دڵدار!**
**تاکەی بەدوای وەسوەسەیی نەفسی بەد ئەختەر!**

خیتابم: قسەم، ئاخاوتنم، گفتوگۆم.

غەمزەدە: دڵتەنگ، خەم چەشتوو.

تاکەی؛ تاکەی، تاکەی-یەکانی ئەم بەندە، بانگەوازن بۆ دڵ.

بەد ئەختەر: بەختی ئەستێرە شووم.

**٤- ناگاه وەژوور کەوت؛ یەکێ مەهوەشی تەرسا**
**خۆی لوعبەتی تەرسا و بەسەر چادری تەرسا**
**لەو چادری تەرسایی نمایان، ڕوخی ڕەخشا**
**وەک پرتەوی «شەعرا» لەمیان پەردەیی خەضرا**
**سەد نامی خودا لەو شەوە، لەو ماهی منەووەر**

ناگاه: ناکاو، لەپڕ.

مەهوەش: مانگ ئاسا، وەک مانگ.

تەرسا: فەلە، دیان، مەسیحی؛ کە لێرەدا مەبەست لە کچی جوانی مەسیحییە.

لوعبەت: بووک.

چادری تەرسا: سەرپۆشی مەسیحییانە.

نمایان: ئاشکراکراو، دەرکەوتوو.

ڕوخ: ڕوخسار.

ڕەخشا: درەوشاوە.

پرتەو: پرشنگ، تیشک.

شەعرا: (یان شەعرای یەمانی): ئەستێرەی گەلاوێژ. یان: کاروانکوژە.

پەردەیی خەزرا: پەردەی سەوز ڕەنگ.

ماهی منەووەر: مانگی گەشاوە، تریفەدار.

**٥- پۆشیدە لەبەر مەعجەری دیبای سیەه فام**
**لەو تافتەیی فەردە؛ کە مەشهوورە بەبادام**
**جیلوەی بەمەسەل لەنجەیی تاووسی لەبی بام**
**هەی هەی لەبەر ئەو قەد و قیافە و سەر و ئەندام**
**مەوزوون و تەڕ و تازە، وەکو نەخل و سنەوبەر**

پۆشیدە: داپۆشراو.
مەعجەر: سەرپۆش، ڕووبەند.
دیبا: ئاوریشم.
سیەه فام: ڕەشتاڵە.
تافتەی فەردی بادام: ئەو جۆرە قوماشەی کە ڕووبەند و سەرپۆشەکەی لێ دروستکراوە.
جیلوە: ناز و عیشوە.
بەمەسەل: بەوێنەی.
لەبی بام: گوێسوانە.

**٦- بەه بەه، لەبەر ئەو قامەت و ئەو زوڵفی سەمەن سا**
**دوو ڕشتەیی مشکینی، طەڕازی قەدی ڕەعنا**
**لەو تەرفی بەناگوشەوە، تاکو بەکەفی پا**
**ئاشوفتە و بەرگەشتە و ئاڵۆز و چەلیپا**
**حەلقە و شکەن و پێچ و خەم و چەنگەڵ و چەنبەر**

سەمەن سا: وەک گوڵی یاسەمەن.
دوو ڕشتەیی مشکینی: دوو زوڵف و پەلکی بۆن خۆشی وەک مسک.
طەڕاز: چنینی داوێن و پەراوێزی کراس.
بەناگوش: بناگوێ، لاجانگ.
کەفی پا: بەری پێ.
ئاشوفتە: ئاڵۆز، تێکچوو، ئاڵۆزکاو.
بەرگەشتە: هەڵگەڕاوە.
چەلیپا: خاچ، سەلیبی مەسیحییانە.



حەلقە و شکەن: پێچ و لوول.
چەنگەڵ و چەنبەر: پێچ پێچ و لوول، گرژ.

**٧- عەتری گرێهی زوڵفی شەوەی طوڕەیی شەبڕەنگ**
**ئەڵبەتە دەچوو، تا بەقەریبی دوو و سێ فرسەنگ**
**ڕووی میهری فروزان و خەمی زوڵفی شەوەزەنگ**
**ڕەخشندە لە ناو زوڵفی سیاها ڕوخی گوڵڕەنگ**
**وەک پرتەوی ئیمانە، لە دڵی موظلیم و کافر**

عەتری گرێهی: بۆنی گرێیەکەی.
شەبڕەنگ: ڕەش وەک ڕەنگی شەو، شەو ئاسا.
قەریبی: نزیکیی.
دوو سێ فرسەنگ: دوو سێ قۆناغە ڕێ.
فروزان: ڕۆشن، گەشاوە.
خەمی زوڵفی: پێچی پەلک و زوڵفی.
ڕەخشندە: درەوشاوە.

**٨- من هەر موتەحەییر، کەوە یاڕەب چە کەسێ بێ**
**یا بلبلی شەیدایی چە باخ و قەفەسێ بێ**
**کێ بێت و چە کەس بێت و چە خۆش هەمنەفەسێ بێ**
**یا بۆ منی بێچارە، چە فەریادڕەسێ بێ**
**ئەغیاری دڵئازارمە؛ یا: یاری سەمەن بەر!**

موتەحەییر: ڕاماو، سەرسام.
هەمنەفەس: هاوڕاز.
دڵئازار: ئەو کەسەی ئازاری بۆ دڵ هەیە.
فەریاد ڕەس: بەهاوارەوە هاتوو، بەهاناوە هاتوو.
ئەغیار: بیانیی.
سەمەن بەر: مەبەست لە یارە، کە وەک گوڵی یاسەمەن، گوڵ دەدات.

٩- سەبرێکی هەڵستام و بەسەد فکرەت و ئەندێش
دوو و سێ قـەدەمێ هاتمە نزدیکی کـەم و بێش
حەیران و سەراسیمە، کە بێگانەیە یا خوێش
عـەیشی منە، ئازاری منە، نۆشـە وە یا: نێش
بەم نیـوەشـەوە کێ بوو لە من بوو بەپەلەنگەر؟

ئەندێش: یان: ئەندێشە: بیر، هزر.
کەم و بێش: زۆر و کەم.
پەلەنگەر: پڵنگ ئاسا، وەک پڵنگ.

١٠- من غـەرقی تەفـەککور، کـە لەپڕ دڵبـەری تەنناز
ئاهسـتـە، سـەلامـێکی بەمن دا، بەشـەکـەرناز
یا ڕەب! چە سەلامێک و چە لەهجێک و چە ئاواز
وەک نەفـخـەی سـەمـتـوورە، دەگـەڵ زیروبەمی ساز
بەو نەفـخـە؛ دڵی خـسـتـەوە پەرواز؛ بەبێ: پەڕ

دڵبەری طەنناز: یاری شۆخ و شەنگ و نازەنین.
ئاهستە: لەسەرخۆ، کاوەخۆ، ئارام، هێمن.
نەفخەی سەمتوور: دەنگی ئامێری مۆسیقایی سەمتوور.
پەرواز: فڕین، باڵگرتن.

١١- ئەمـجـار کـەمێ هاتەوە پێـشێ، بەشـەکـەرخـەند
فەرمووی کە: «ئەدەب» حیرەت و نەفرەت لەمە، تا چەند
من ئەو صـەنەمـەم! وا دڵەکـەی تۆم بەجـەفـا سـەند
من ئەو فـەتەنەم گـەردنی تۆم خـسـتـووە ناوبەند
حـازر بەنیـشـانەم: ڕەسـەنی زوڵفی مـوعـەتتـەر

شەکەرخەند: بزەی شیرین.
صەنەم: بت.
فەتەن؛ یان فەتتان (فَتّان): جوانێکی شۆخ و شەنگ و مرۆڤ شەیداکەر.



١٢- هەر ئەو بوتی فـەڕخارە، هەر ئەو دڵبـەری پارەم
هەر ئەو گـوڵ و گـوڵزار و هەر ئەو تازە بەهارەم
هەر خـونچـەیی خـەندان و هەر ئەو لالەعـوزارەم
ئەو میـهری درەخشان و هەر ئەو ماه و هەسارەم
هەر ئەو قـەدی شمشـادەمە، ڕەنگینە بەمەعجەر

خونچەی خەندان: خونچەی دەم بەخەندە: دەم بەبزە و زەردەخەنە. (مەبەست لە مەودای کردنەوەی زۆر کەمی دەمی خونچەییە).
لالەعوزار: ڕوخسار وەک گوڵی گوڵاڵەسوورە.
میهر: هەتاو، خۆر.
ماه: مانگ.
هەسار: ئەستێرە.
مەعجەر: ڕووپۆش، ڕووبەند، سەرپۆش.

١٣- ئەو ساتە کـە ناسـیـمـەوە، ئەو دڵبـەری شـەنگە
ئەو تورکی کەماندارە، هەر ئەو غـەمزە خەدەنگە
ئەو شـاهـیـدی تاتارە، هەر ئەو مـاهی فـەڕەنگە
ئەو یاری جەفاکارە، لەگەڵ مە، سەری جەنگە
هەر دڵبەرەکـەی پارە، هەر ئەو یاری سـتـەمگەر

یاری ستەمگەر: یاری پیشە جەفا و سزا، یاری جەفا و سزاکار.

١٤- کـەوتم لە بەری پێی، وتم: ئەی گـوڵی ڕەعنا
ئەی ڕۆحی ڕەوانم، چە بەصـورەت چە بەمـەعنا
هەرچی کـە بفـەرمـووی؛ «سـمـعنا واطعنا»
«مـا شـئت فـعلت والی الان قنعنا»
ئەمما وەرە فەرموو، لە چی بووی لێمە موکەددەر!

ڕەعنا: شەنگ و شۆخ و نازەنین و دڵفڕێن.
بەصورەت: بەڕواڵەت.
موکەددەر: ڕەنجاو.

**١٥- ئەی لالە ڕوخ و طوڕە وەکو مشکی تەتاری**
**سەد جانی عەزیزت بەفیدای خونچەیی زاری**
**چیت لێمە خەتا دیوە، کە بەینێکە کەناری**
**فەرموو؛ کە لەسەر چی لەگەڵ ئێمە بەقاری**
**ساڵێکە لەسەر چی، لەمە تۆراوی سەراسەر**

بەینێکە کەناری: ماوەیەکە لێمان تەریک و دوور و دوورەپەرێزیت.
لەگەڵ ئێمە بەقاری: لێمان تۆراویت، ڕقەبەرایەتیمان دەکەیت.

**١٦- فەرمووی کە: چە هەنگامی گلە و وەقتی ئەذایە**
**ئەمشەو؛ شەوی عەیش و تەرەب و سوڵح و سەفایە**
**سەیری سەری کوڵمەم، کە دەڵێی نووری چرایە**
**سینەم؛ کە دەڵێی ڕەوزەی ڕیزوانی خودایە**
**شەهدی دەهەنم؛ کە دەدا تەعنە لە کەوسەر**

هەنگام: کات، وەخت.
ئەذا: ئازار و سزا.
ڕەوزەی ڕیزوان: باخی بەهەشت.
شەهدی دەهەن: هەنگوینی دەم و زار.
تەعنە: تەشەر، پلار، توانج.

**١٧- تێفکرە لە خورشیدی جەمالم، بەتەئەممول**
**بگرە سەری گێسووم، وەکو دەستەیی سونبول**
**سونبول عەجەبا بۆچی دەدا بۆنی قورنفول**
**شەوگاری تەواصول نییە هەنگامی تەغافول**
**ئەمشەو؛ شەوی عەیشە، نەحیکایەت لە سکەندەر**

خورشید: هەتاو.
تەئەممول: ڕامان، وردبوونەوە.
قورونفول: گیایەکی بۆن خۆشە و لە ڕەگەزی مێخەکە و بۆنیشی هەروەک مێخەکە.



شەوگاری تەواصول: شەوگاری بەیەک گەیشتن.
هەنگامی تەغافول: کاتی غافڵگیریی و لە دەست چوو.
حیکایەت لە سکەندەر: چیرۆکی ئەسکەندەری مەکدۆنی.
واتە: کاتی ئەوە نییە ئەمشەو بەقسە و باسی لابەلاوە بەسەر ببرێ.

**١٨- هەر وای وت و ڕووبەندی کە لادا بەقەفادا**
**گێسووی بەسەری پەنجە، لەسەر عارزی لادا**
**ئەو تەلعەتە وەک ماهێ؛ لە ناو زوڵفی سیادا**
**ڕۆژێ بوو، تلووعی بوو؛ لە ناو لەیل و دوجادا**
**ڕووناکییەکی خستە، هەموو خیططە و بەندەر**

قەفا: بەرەو پشتەوەی سەر.
عارز (عارض): ڕوو، ڕوخسار.
لەیل و دوجا: تاریکی شەو.
خیططە: هەرێم، نیشتمان، وڵات.
بەندەر: شاری هەڵکەوتەی کەنار و ڕۆخی زەریا.

**١٩- سەر کوڵمی گوڵی دابوو، وەکو لالەیی حەمرا**
**زیبی سەری دوو کوڵمە؛ دوو گێسوویی موططەڕا**
**جارێ خەم و گەه حەلقە و جارێکی دەگۆڕا**
**جارێ بەسەری کوڵمەوە، جارێکی لەسەرڕا**
**وەک پێچ و خەمی دوودە، لەسەر مەجمەری ئازەر**

لالەیی حەمرا: گوڵاڵەسوورە.
زیب (یان زیبا): جوانیی.
موططەڕا: تەڕ و تازە بەتازە ئارایشکراو و داهێنراو.
گێسوویی موططەڕا: پەلکە و زولفی تازە داهێنراو و ئارایشکراو. شاعیرانی فارس ئەم واژەیەیان زۆر بەکار هێناوە، بۆ نموونە:

مستان صبح چهره مطرّا به می کنند
کـاین پیـر طیلسـان مُطرّا برافکنند
«خاقانی، دهخدا، بەرگی ١٣،
ل ٢١٠٥٧»

دوود: دووکەڵ.

مەجمەر: ئاگردان، پشکۆدان، مقەڵی.

ئازەر: دوایین مانگی پاییز لە تەقویمی هەتاویدا، کە دەکەوێتە کۆتایی مانگی (١١) و سەرەتای مانگی (١٢)ی زایینیدا.

واتە: سەری کوڵمەکانی، وەکو ڕەنگی گوڵاڵەسووره، ئاڵ هەڵگەڕابوون و پەلکە و زوڵفە تەڕ و تازە داهێنراو و ئارایشکراوەکانیشی هەندێ جار بەپێچ پێچ و هەندێ جار بەئەڵقە ئەڵقە و هەندێ جاری تریش شێوەیان دەگۆڕدرا و وەک پێچ پێچی دووکەڵی سەر ئاگردانی سەرەتای زستانیـان لێ دەهات. کە مەبەست لە ئاگردانەکە، ڕوخسـاری گەرم و ڕووناکی یارە.

**٢٠- ڕەنگین بەخەت و خاڵەوە، وەک کەبکی مطەووەق**
**جـار جارە کـە دەبزووتەوە بەو جـیلوەی مـوتڵـەق**
**عـەکسی شەفەقی سینە، لە بن مەوجی ستەبرەق**
**هەر تاوە بەڕەنگێ بووە، وەک قـەسری خەوەرنەق**
**سـوبحـانە لە زیبـایی ئەو شـاهدی کـەشـمـەر**

کەبکی مطەووەق: کەوی گەردن بەخاڵ.

جیلوەی موتڵەق: شنینەوەی بێ کۆتایی و هەمیشە.

مەوجی ستەبرەق: شەکانەوەی زوڵف و پەلکی یار.

قـەسری خەوەرنەق: شـوێنێکە لە نزیکی (نەجـەف)ەوەیە، نوعـمـانی کـوڕی مـونذیری لەخمی ئەم کۆشکەی تێدا دروست کردووە. نوعـمـانی کـوڕی مـونذیری لەخـمی، دوایین پاشای لەخمییەکانی «حیرە»، خوسرەوی پەروێزی دوا پادشای بەهێزی ساسانی (٥٩٠ز - ٦٢٨ز) لەسەر تەخت لایبرد و لە تەیسەفون لە زیندانی کرد.

شاهید: کوڕی جوان.

کەشمەر: شاری کشمیر.



**٢١- زوڵفی سیـەهی پەخشی، لەسـەر گـەردنی بللوور**
**وەک سوحبەتی مشکی خوتەن و نیسبەتی کافوور**
**بایەک لە شەوەی طوڕەوە، زەڕێک لە قەمەر نوور**
**هەر بۆیە کـە ئامـێـزیشی مـەهتـابە، بەدەیجـوور**
**هەیهـاتە لە نەیڕەنگی بتی شـوعـبـەدە پەروەر**

سوحبەت: هاوڕێیەتی، نزیکایەتی.

زوڵفی سیەهی: زوڵفی ڕەشی.

پەخش: بڵاو.

مشکی خوتەن: مسکی وڵاتی خەتا و خوتەن.

شەوە: موورووی ڕەشی بریسکەدار.

ئامێزش: باوەش، ئامێز.

ماهتاب: مانگەشەو.

دەیجوور: زۆر تاریک، تاریکە شەو.

نەیڕەنگ: تەڵەکە و فێڵ، جادوو.

شوعبەدە بازیی: قوماربازیی، چاوبەست، تەڕدەستیی.

**٢٢- ئارایشی عـالەم، بەگـوڵسـتـانی جـەمـالی**
**بەو خولقی پەسەندیدە و بەو حوسن و کەمالی**
**هەر جـارە کـەتیلێکی دەدا چاوی غـەزالی**
**پەیکانی خەدەنگی، نیگەهی نێرگسی کاڵی**
**کـاری لە دڵی عـاشقی شەیدا؛ وەکو خەنجەر**

خولقی پەسەندیدە: ڕەوشتی پەسەند.

تیل: تیلەی چاو، سەیرکردنی چاو لە ژێرەوە.

**٢٣- دوو طورەیی مەفتولی، سەرازێری بەڕوخسار**
**یەک عەقرەبی جەراڕ و یەکێ سونبولی گوڵزار**
**یەک شکڵی سیەه مار و یەکێ موهەرەبی مار**
**یەک: نۆشی دڵارام و یەکێ: نێشی دڵئازار**
**یەک مەرهەمی دەردان و یەکێ دەردی مصەووەر**

مەفتول: لوولدراو، بادراو.
سەرازێر: سەروبن، سەرەوژێر، دەمەونخوون.
موهەرەبی مار: مارفریودەر.

**٢٤- لەب؛ لەعلی بەدەخشان و دەهەن: حوققەیی مەرجان**
**مەتبوع و پەسەندیدە، بەهەر تەبع و بەهەر جان**
**ئامێختەیە و نوتقی بەشەکەر، وەک بەشەکەرجان**
**شیرینە وەک ئەو دەم، کە لە دەربێتەوە بەر جان**
**دەبزانە چە خۆشە؛ کە ڕەوان بێتەوە بەر: بەر**

دەهەن: زار، دەم.
حوققەیی مەرجان: سندوقچەی گەوهەر و ئەڵماس و مەرجان.
ئامێختە: ئاوێتە، پەیوەند، موتوربە.

**٢٥- دەم: تازە شکۆفێکی شەقایق لە نساران**
**لەب: پڕ لە تەبەسوم، بەنەسیمێکی بەهاران**
**ئاوونگی بەیانانی بنێشێ لە کەناران**
**دەستی چ کەسی لێ نەدرا بێ، لە چ یاران**
**مەحبووب و تەڕ و تازە و ڕەنگین و موعەتتەر**

شکۆفە: چرۆ، گۆپکە.
شەقایق: گوڵاڵەسوورە.
نسار: جێگەی کوێستان و سەوز.
موعەتتەر: عەتراویی.



**٢٧- ناف و شکەمی؛ وەک چە بڵێم: نافەیی قاقوم**
**نافەی لەمەیان بەستەری قاقم بەمەسەل قوم**
**وەک نافە، کە بوویێ لە غەزالی خوتەنی؛ گوم**
**خۆی بێ ئەسەر و ماوە لە ئاهوو: ئەسەری سم**
**بۆی نافە، بەبێ نافە؛ پەراگەندە لە کیشوەر**

ناف: ناووک.
شکەم: سک، زگ.
قاقم: گیانلەبەرێکی پێست نەرمە.
لەمەیان: لە نێوان.
بەستەری قاقم: ئەو نوێنی خەوتنەی لە پێستی قاقم دروست کراوە.
پەراگەندە: پەرت و بڵاو.
کیشوەر: وڵات.

**٢٨- ئەلقیصصە؛ لە شەوقی دڵی پڕ حەسرەتی موشتاق**
**وا گرتمە ناو باوەشی خۆم، ئەو مەهی ئافاق**
**بووە یەک: زەقەن و گەردن و سینە و کەمەر و لاق**
**جووتێ بوو بەباطن بەدەن، ئەمما بەنەزەر تاق**
**ئەو ساعەتە عەیشم؛ بەدوو سەد عومرە، بەرابەر**

ئەلقیصصە: پوختەکەی (پوختەی ڕووداوەکە).
مەهی ئافاق: مانگی هەموو ئاسمانی جوانیی.
زەقەن: چەناگە.

**٢٩- گەه خیرەیی خورشیدی جەمالی لە تەلەئلوء**
**گەه سایەنشینی خەمی زوڵفی بەتەفەییوء**
**گەه حامیلی ئەو نازە، کە دەیکرد بەتەهەزوء**
**گەه سوڵح و گەهێ جەنگ و گەهی عیجز و تەخەتوء**
**گەه حەزم و گەهێ ڕەزم و گەهێ بەزم و گەهێ شەڕ**

تەلەئلوء: واژەیەکی عەرەبییە، بەمانای درەوشانەوە.

سایەنشین: دانیشتن لە ژێر سێبەردا.

تەفەییوء: واژەیەکی عەرەبییە بەمانای خۆ فێنک کردنەوە.

واتە: بۆ خۆ فێنک کردنەوە، پەنام بۆ ژێر سێبەری زوڵف و پەلکە لوول و پێچ خواردووەکانی دەبرد.

تەهەزوء: واژەیەکی عەرەبییە و بەمانای گاڵتە پێکردن و توانج و لاقرتییە.

تەخەتوء: ئەمیش هەر عەرەبییە و بەمانای پێ لە زیادە ڕاکێشانە.

حەزم: ئەمیش هەر عەرەبییە و بەمانای توند و قایمی دێت.

ڕەزم: شەڕ، جەنگ.

**٣٠- گاهێ لە کەفی مەوهیبەتی چەشمی تەوەقوع**
**گاهێ بەئەتەک، مەرحەمەتی دەستی تەوازوع**
**گاهێ لە گوڵی زاری، بەئومێدی تەمەتوع**
**گەه بادە گوساری لەبی لەعلی بەتەجەڕوع**
**گەه جورعەکەشی ماچی دەمی، وەک مەیی خوللەر**

کەفی مەوهیبەت: دەستی بەخشین.

چەشمی تەوەقوع: چاوی چاوەنواڕیی.

تەمەتوع: واژەیەکی عەرەبییە و بەمانای لەززەت و خۆشیی بەسەربردن.

بادە گوساری: مەیخواردنەوە.

تەجەڕوع: بەقوم خواردنەوە.

**٣١- خونچەم دەچنی جارێ لە گوڵزاری عوزاری**
**جارێ لە تەماشایی شکۆفەی گوڵی زاری**
**ساتێکی خەریکی گرەهی بەندی ئوزاری**
**دەستم لەپڕا کەوتە سەر ئەو مەوزیعی کاری**
**چاوی بەدی لێ دوور بێ، وەکو گەنجی تەوانگەر**

گرەه: گرێ.



بەندی ئوزاری: دوگمەی کراس.

گەنجی تەوانگەر: زێڕ و گەوهەری بەنرخ.

**٣٢- گەنجێ، چە بڵێم گەنجێ: خودا دادی فەرەیدوون**
**دەربەستە و نەشکۆفتە، وەکو مەخزەنی قاروون**
**دورجێکی گوهەر ڕەنگی، گوهەر سەنجی، گوهەر گوون**
**هەر کەس، کە بەسەد گەنجی بدا، هەر ئەوە مەغبوون**
**دەیزانە چ گەنجێکە، بەسەد گەنجە بەرابەر**

گەوهەر سەنج: گەوهەر پێوەر، گەوهەرکێش، بەمانای ئەو ئەندازە گەوهەرەی کە بەگوێرەی پێوانە و کێشانە و تەرازوو تێکراوە.

گەوهەر گوون: گەوهەر ئاسا، وەک گەوهەر (دهخدا، بەرگی ١٢، ل ١٩٤٣٣ – ١٩٤٣٥).

مەغبوون: زیان لێکەوتوو.

**٣٣- گەنجینەیی مەستوورە، بەبێ خازن و گەنجوور**
**ئایینەیی بللوورە، بەبێ سنعەتی مزدوور**
**یاقووتیی نییە، هەر وەکو یاقووتە، جگەر سوور**
**خاسییەتی یاقووتی هەیە؛ وەک هەیە مەشهوور**
**دەفعی خەم و تەفریحی دڵە و قووەتی پەیکەر**

مەستوور: شاراوە، داپۆشراو. لە هەمان کاتیشدا ئاماژەیە بۆ ناوی «مەستوورە خانمی نووسەر و مێژوونووس، کە وەک وتمان «نالی» شیعرە بەناوبانگەکەی دەربارەی وتووە و «ئەدەب»یش بەم شیعرە شوێن پێی «نالی» هەڵگرتووە.

خازن: ئەو کەسەی گەوهەر لە خەزێنەدا دادەنێ، خەزێنەدار.

گەنجوور: پاسەوان و پارێزەری گەوهەر و زێڕ.

مزدوور: ئەو کەسەی لە بەرابەر کرێیەکدا کار دەکات، ڕەنجبەر، بەکرێگیراو.

قووەتی پەیکەر: وزە و هێزی جەستە و بەدەن.

٣٤- وەک شکڵی هوڵوو؛ هەیئەتی، گوڵبەرگی شڵی زەنگ
ئالوودە وەکو شەهدی لە تافەت، وەکو باڵەنگ
حوققێکی خڕی سادە، سیمین و دەهەن تەنگ
ئەندودە نەبووبێ ڕوخی سیمی بەخەتی زەنگ
تەوزیحی بەکوردی، وەکو بەیزێکی موقەشەر

هوڵوو: قۆخ.
گوڵبەرگ: گەڵای گوڵ.
شڵ: پێستی پڕ لە وردە خاڵ.
زەنگ: ڕەش.
باڵەنگ: میوەیەکە وەک نارنج.
حوققە: سندوقچە.
سیمین: زیوین.
دەهەن تەنگ: زار و دەمی تەنگ.
ئەندودە: داپۆشراو، سواخدراو، ئەو قوڕەی لەگەڵ «کا»دا تێکەڵ دەکرێ و سەربانی پێ سواخ دەدرێ. دیسان مانای تریشی: تار و مار و ژێر و زەبەر. بەڵام دیارە مەبەستی «ئەدەب» سواخ دانە. (دهخدا، بەرگی ٣، ل ٣٥٢٩). واتە: ڕوخساری زیوینی بەخەتی ڕەش سواخ نەدرا بێ، یان بەخەتی ڕەش دانەپۆشرا بێ.
بەیزی موقەشەر: هێلکەی پاککراو.

٣٥- ڕەنگین و خڕ و گردەڵە، تەرکیبی هەنارێ
هەروەک کەلەمێ، زوقمێ لەسەر بەرگی بیارێ
هەر جارە کە ڕێکت بکوشیبایە، بەجارێ
سیرەی لە وەتاغی دەچووە دەرکی حەسارێ
وەک خرچەیی تەڕ، درزی دەبرد، ئەمسەر و ئەوسەر

کەلەم: کەلەرم.
سیرە: زیرە، هاوار.
وەتاغ: ژوور.



٣٧- وەک گوڵ، دەمی خەندان و وەکو خونچە، لەبی جووت
خونچێکی لە ناو دووپەڕی گوڵدا، کە نەپشکووت
پەیدا سەری چوچڵەی لەمیان دوو لەبی یاقووت
هەروەک بەدەمی طیفلی سەما هاتەوە شاقووت
نیوێکی پەدیدار و ئەوی دیکە موسەتتەر

چوچڵە: میتکە.
شاتووت: شاتوو، تووە سوورە.
پەدیدار: ئاشکرا، دیار، بەرچاو.
موسەتتەر: داپۆشراو.

٣٨- بەم تەرزە کە هاتە نەزەر، ئەو حوققەیی بللوور
حەمدانە لە سوێیانی کەپووی لێ بوو بەشەیپوور
بەو مێزەر و دەستاڕ و سەر و گەردنی ئەستوور
بێوەی کە «دق الباب»ێ بکا، سەرزەدە چووە ژوور
سوبحانە لە بێعاریی ئەو کوێرەی ئەعوەر

حەمدانە: ئەندامی نێرینەی خۆی «ئەدەب» (کە دیارە بەگاڵتەوە وای ناو دەبات).
کەپوو: لووت.
شەیپوور: کەڕەنا.
دق الباب: لە دەرگا دان (واژەیەکی عەرەبییە).
سەرزەدە: بێ پەروا، هەروا.

٣٩- چووە ژوورەوە بەو شکڵ و هیولاو و قەوارە
دەتگوت کە لە ناووکی بەرەژێر، کردە ئیجارە
کاری بەدوو ساعەت، گەییە چل بەژمارە
ئەڵبەتە هەتا ڕۆژێ؛ دەدا خۆی لە هەزارە
ئەلحەق هونەری کردووە «سلێمان بەگی یاوەر»

هێولا: قەبە و زەبەللاح، کەتە، زرتەبۆز... «نالی» واژەی «هیولا»ی بەمجۆرە بەکار هێناوە:

لە کن ئەو جەوهەری فەردە، لە هەیولا نییە باس
لە حیکەم پەروەریی بو عەلی سینا نییە باس

سلێمان بەگی یاوەر (دیسان بەگاڵتەوە باسی هینەکەی خۆی دەکات).

**٤٠- خەتمی کە «ئەدەب» هێندە مەکە بێ ئەدەبیی دی**
**تا حەملی نەکا واعیزی ئەو شارە، بەچی دی**
**هەرچەندە کە هەڵدەگرێ خەیاڵات، شتی دی**
**ئەمما بەخودا غەیری تەسەووور نییە، چی دی**
**مەقبوولە ئەمیش، خاسە، لە لای مەردی سوخەنوەر**

خەتمی کە: دوایی پێ بێنە، تەواوی بکە.

حەملی نەکا: بەشتی تری حساب نەکات.

سوخەنوەر: قسەزان.

**٤١- گەر هەزلە، ئەگەر طیبەتە؛ گەنجێکە نیهانی**
**مەملوئە سەراسەر لە دوڕ و گەوهەری جانی**
**هەر دانە؛ بەرابەر بەدوو سەد گەوهەری کانی**
**قەدری لەکن ئەو شەخسە، بزانێ لە مەعانی**
**مەعلوومە لە لای گەوهەرییە، قیمەتی گەوهەر**

هەزل: گاڵتە.

طیبەت: خۆشیی، چاکیی.

مەملوء: پڕ.

لە لای گەوهەرییە: لە لای ئەو کەسانەی خەریکن پیشە و هونەرکاریی گەوهەرسازیین.

واتە: ئەگەر ئەم ڕووداوەم هەر بۆ گاڵتە، یان بۆ خۆشیی ساز کردووە، بەڵام شیعرەکە گەوهەرێکی شاراوەیە و سەراسەر پڕە لە دوڕ و گەوهەری گیان و هەر دانەیەک لەو گەوهەرانەش، نرخ و بەهای سەد گەوهەری سروشتیی ناو (کان)یان هەیە و نرخیشیان لای ئەو کەسانەیە،کە مانایان تێدەگەن و دەبێ هەر ئەو کەسانەش نرخیان بزانن، کە خۆیان خەریکی کار و سنعەتی گەوهەرسازیین (واتە: خۆیان خەریکی کاری شیعر نووسینن).

(دیسانەوە ئەدەب لەم قەسیدە درێژەشدا، هەر باسی شاعیرێتی و شیعری خۆی دەکاتەوە).





کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)، وەک نموونەی:

١- وەک گوڵشەنە کوڵخەن، بەگوڵی ڕوویی حەوادیث
وەک کوڵخەنە گوڵشەن، کە نەدا بۆنی حەوادیث
«حەمدی، ٢٣١»

٢- کاری کە فیراق و خەمی دووریت بەمنی کرد
سەرما بەهەتیو، با بەدواڕی شڕی ناکا
«شێخ ڕەزا، ١٧»

٣- نالی نییەتی سیحری بەیان، حیکمەتی شیعرە
ئەمما نییەتی قوودرەتی دڵ، قوودرەتی ئینشا
«نالی، ٧٨»

**١- شەو ناز و سەحەر ناز و هەموو وەقت و دەمت ناز**
**ئەم نازە هەتاکەی؟ بەفیدات، ئەی بتی طەنناز!**

طەنناز: شەنگ و شۆخ و نازەنین و جادووگەر.

واتە: کار و پیشە و هەموو ئاکار و ڕەوشتت، سەرومڕ بۆتە: ناز و نازت کردووە بەناسنامەی خۆت و هەمیشەت هەر نازە و هەر ناز. ئاخر من بم بەقوربانی نازت، ئەم ناز و ڕەوشتی نازە هەتاکەی؟!.

لە نێوان «هەموو وەقت و دەمت ناز»دا، وردەکارییەکی شیرین لە واژەی «دەم»دا هەیە، کە لێرەدا هەم بەمانای «کات» دێت و هەم بەمانای «دەم و زار»یش دێت.

**٢- بەم تەرزە کە شۆری لەبی شەهدت لە جیهان خست**
**زیبەندەیە بەخودا بکەی ئەمڕۆکە بەشەهـ ناز**

بەم تەرزە: بەم شێوەیە، بەمجۆرە.

شۆر: هەڵڵا، هەرا.

زیبەندە: شایان، شیاو.

شەهـ: شاهەنشا.

واتە: بەمجۆرەی کە لێوی وەک هەنگوینی پاڵاوتە و شیرینت، ناوبانگی لە جیهاندا بڵاوە و هەڵڵای لە دنیادا ناوەتەوە؛ بۆ ئەوە دەشێ ئەمڕۆکە ئەم نازەت بەسەر شاهەنشایاندا بکەیت.

**٣- با خولدی بەرین پڕ بێ لە غیلمان و لە حۆری**
**باوەڕ مەکە بیبێ وەکو تۆ: صورەتی مومتاز**

خولدی بەرین: بەهەشتی بەرین.

صورەتی مومتاز: شێوە و جۆری هەڵبژاردە و نایاب و ناوازە، نموونەی تایبەتی و بێ وێنە.

واتە: با بەهەشتی بەرین پڕ بێ لە کوڕ و کچی جوانی بەهەشتیی؛ بەڵام باوەڕ مەکە نموونەی هەڵبژاردە و ناوازەی وەک تۆیان تێدا بێ.

**٤- با وادی «چین» پڕ لە غەزالی «ختەن»ی بێ**
**کێ دیویە وەکو چەشمی سیەهـ ئاهووی غەمماز؟!**

وادی: دۆڵ، شیو.

غەزالی ختەنی: ئەو جۆرە ئاسکە، ناووک بۆن خۆشەی، کە وتمان لەو هەرێمانەدا هەن و بەناوبانگن.

چەشمی سیەهـ: چاوی ڕەش.

ئاهووی غەمماز: ئاسکی چاو پڕ لە تیلەی ناز و عیشوە.

**٥- تا پێدەکەنی، موعجیزەی عیسا دەشکێنی**
**غەیرەز لەبی تۆ؛ کێ بکا: خەندە بەئیعجاز؟!**

موعجیزەی عیسا: حەزرەتی عیسا، کە خاوەنی موعجیزەی ئەوە بوو، کاتێ دەدوا و هەناسەی لە دەم دەردەهات، بەهەناسەکانی مردووی پێ زیندوو دەبوونەوە.

غەیرەز: جگە لە.



**٦- سەیرانی سەری زوڵفی، لەسەر ئەو لەبی شیرین**
**نوقڵ و شەکەرە؛ پەروەرشی عەقرەبی «ئەهواز»**

پەروەرش: پەروەردە.

عەقرەب: دووپشک.

ئەهواز: شاری ئەهواز-ی باشووری خۆرئاوای ئێران، کە دیارە بەو هۆیەوە «ئەهواز» ناوچەیەکی زۆر گەرمێنە؛ دەبێ دووپشکی زۆر کوشندە و ژەهراوی و بەناوبانگیشی هەبووبێ.

واتە: سەری زوڵفەکانت، کە بەسەر ڕووتدا بەردەبنەوە و خۆ لە دەم و لێوت دەسوون، شێوەیان وا دێتە بەرچاوم، وەک ئەوەی دووپشکی ڕەشی شاری «ئەهواز» بن و بەو هۆیەشەوە، کە ئەهواز، کارخانەی «قەند»ی تێدایە و فێری خواردنی شەکر و قەندی ئەو کارخانەیە بووبن، ئەوا چونکە پەروەردەی نوقڵ و شەکەرن، دێن خۆیان بەنوقڵ و شەکر و قەندی لێوت تێر دەکەن. ئای ئەم دووپشکانە (ئەم سەری زوڵف و پەلکانە)، چ سەیران و خۆشییەک، لە خۆ تێهەڵسوونی دەم و لێوت دەکەن!.

**٧- کۆتر؛ کە تەنەفوریە لە «شاهێن» بەتەبیعەت**
**بۆ مورغی دڵی مە، بەتەرەف «باز»یە پەرواز**

تەنەفور: بێزار، وەڕس.

مورغی دڵی مە: باڵندە و مەلی دڵی ئێمە (من = ئەدەب).

تەرەف: لای، بەرەو، ڕووەو.

پەرواز: فڕین، باڵگرتن.

واتە: پێم سەیرە، لەوەی کە «کۆتر» هەمیشە لە «شاهێن» بێزار و وەڕسە؛ کەچی کۆتری دڵی من، هەمیشە ڕووەو چاوە وەک «باز»ەکانی تۆ، هەڵدەفڕێ!.

**٨- لەو ئابی حەیاتی دەمی تۆ، تا دەمی مردن**
**باوەڕ مەکە دەست هەڵبگرم، بمدەنە: بەر گاز**

واتە: دەم و لێوی تۆ، ئاوی ژیانیان تێدایە و باوەڕ مەکە، تا کاتی سەرەمەرگیش دەست لە مژینی ئاوی دەم و لێوی تۆ هەڵبگرم، ئەگەر بە«گاز» ئەشکەنجەشم بدەن و ونجڕ ونجڕم بکەن...

«نالی» دەڵێ:

لێــوی تۆ: ئاوی بەقــاو من: خــضــوم
فەیزی تۆ: ڕەحمەت و من: سەوزە گـیا
«۱۲۵»

**۹- شـایسـتـەیە ئەمـڕۆ بەبەهاری ڕوخی تۆوە**
**مومکینە بدا تەعنە، لە باخی نەوی «شیراز»**

مومکینە: ڕەنگە، دەشێ.

تەعنە: تەشەر، توانج، پلار.

شیراز: شاری شیرازی ئێران، کە شوێنەوارێکی گرنگی مێژوویی و جوان و ڕازاوە و زێدی شاعیری مەزن: «حافظ» و لە کچی جوان و باخی ڕازاوەشدا بەناوبانگە.

واتە: ئەمڕۆکە بەهار، بەڕوخساری جوانی تۆوە جوانە و خۆت ئەوەندە بەهارێکی ڕازاوەیت، ڕەنگە توانج بگریتە باخە تازەکانی شاری شیراز. یان دەبێ بەمجۆرەش بخوێندرێتەوە: بەهاری وڵاتی ئێمە، بەڕوخساری وەک بەهارێکی ترەوە جوانە و دەشێ و دەکرێ ئەم بەهارەی ئێمە، بتوانێ تەشەر و توانج، لە بەهار و لە باخی شاری شیراز بدات... یان: تۆ ئەوەندە جوانیت، دەشێ تەشەر لە دڵبەرەکەی «حافظ»ی شاری «شیراز»یش بدەیت.

ئەگەر لەم خوێندنەوەیەیاندا ئەوەمان لە یاد بێ، کە پێشتر لە بەراوردی تێکستەکانی تری شیعری «ئەدەب»دا، ئاماژەمان بەوە کرد، کە ئەم بەیتەی دوایی، لە دەستخەتەکەی «مس»دا نووسرا بوو:

«موکری» بدا تەعنە، لە مەحبووبەیی «شیراز».

**۱۰- ئەشعاری «ئەدەب» بۆ عورەفا، قووتی ڕەوانن**
**خاسسە، بەسەدای لالەعوزارێکی خۆشئاواز**

عورەفا: شارەزایان، پسپۆڕان، زانایان.

قووتی ڕەوانن: خۆراکی گیانن.

خاسسە: بەتایبەتی.



بەسەدای: بەدەنگی.

لالەعوزار: ڕوخسار وەک گوڵاڵە سوورە.

خۆشئاواز: دەنگخۆش.

واتە: شیعری «ئەدەب» بەلای شیعرناسانەوە، وەک خۆراکی گیانە، بەتایبەتیش ئەگەر ئەم شیعرانە، بەدەنگی کچێکی کوڵمە وەک گوڵاڵەسوورە، ئاڵی دەنگخۆش بوترێن.

لەم دوا بەیتەدا «ئەدەب» دیسانەوە جگە لە خۆنازین بەشیعری خۆیەوە، لە هەمان کاتیشدا نیشانەی ئەوەیشی تێدایە؛ کە لە لایەکەوە «ئەدەب» دۆستایەتی لەگەڵ مۆسیقا و دەنگخۆشیی و گۆرانیدا هەبووە و لە لایەکی تریشەوە بەڵگەی ئەوەیە، کە لە سەرێنی «ئەدەب» خۆیدا، شیعرەکانی لە لایەن دەنگخۆشانەوە بەگۆرانی و مەقام وتراون.

## ٤٥

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)، وەک نموونەی:

١- ئەی مـادەری گـێـتی، تۆ هەتا ئێسـتـە نەزاوی
زاتێکی وەکـو «فـەیزی ئەفـەندیی»ی زەهاوی
«شێخ ڕەزا، ١٦٤»

٢- کـاسـەی کـەل و وێرانەیی دەروێش و قـەلەندەر
بێ فەرقە لەگەڵ جامی جەم و تەختی سکەندەر
«حەمدی، ٢٤٩»

٣- ئەم نەوعە گوڵە، هەڵدەکەوێ ساڵێ لە قەڕنێ
نەک وەک گوڵی بازاڕییە، هەر ساڵە کە سەوزە
«حاجی قادر، ١٠٩»

**١- تاکەی وەکـو تورکـان، بەیەغـمـایی دڵی ناس!**
**ئەبرۆیی کەشیدەت، بەکەفی خەنجەری ئەڵماس!**

یەغما: تالان، هێرش، هەڵمەت، شالاو، پەلامار. لە هەمان کاتیشدا «یەغما» ناوی شارێکی تورکستانە و لە ئافرەتی زۆر جواندا بەناوبانگە و خەڵکەکەیشی بەتالانکار و پەلامارەدەر و هێرشکار ناسراون... لە بەرهەمی شیعریی گەلانی خۆرهەڵات و لە شیعری کلاسیکی کوردیشدا، هەر لە «ئەحمەدی خانی»یەوە، تا شاعیرانی کرمانجی خواروو، خەرمانێکی زۆری شیعری کوردی، پڕیانە لەم ئاماژانە، کە بیرەوەریی گەلی کورد، لە کەشوهەوای ئەم شیعرانەدا، سەبارەت بەتورک؛ شتێکی جیاوازتر و تاڵ و دڵتەزێن و کارەساتاوییترە، لە چاو بیرەوەریی گەلانی خۆرهەڵاتدا، بەرابەر بەتورک و هۆی سەرەکیشی، زوڵم و ستەمی تورک بووە بەرامبەر بەکورد و داگیرکردنی ڕاستەوخۆی کوردستان. کە دەبێ بڵێین لەم نموونە شیعرییانەدا، لەبەر هەمان سۆنگە، ناوی «عەجەم»یش لە ناوی «تورک = ڕۆم» کەمتر نەهاتووە و لەم بوارەشدا ئەم شیعرانەی «ئەدەب» کە نموونەیەکی زۆری لەمجۆرە ئاماژانەی تێدایە؛ بەڵگەیەکی بەرجەستەی هەستی ئەو ڕۆژگارەی خەڵکی کوردستانە، کە بەسۆنگەی ئەو کەشوهەوا پڕ لە زوڵم و



زۆردارییەی تورک و عەجەم لە کوردستاندا سازاندوویانە، شاعیرانی کورد، چ بەئاشکرا و چ لە دوو توێی ڕاز و ڕەمز و نهێنیدا، ئەم ڕاستییەیان لە ڕێگەی شیعرەکانیانەوە دەربڕیوە.

دڵی ناس: دڵی خەڵک.

ئەبرۆیی کەشیدەت: برۆی کشاوت.

کەف: لەپی دەست.

خەنجەری ئەڵماس: مەبەست لە برژانگەکانی یارە.

واتە: تاکەی وەکچە شۆخ و نازەنینەکەی تورک، خەنجەری لە کێلان هەڵکێشراوی برۆ درێژەکانت، داوەتە دەست برژانگەکانت، تا ڕێگریی و تالان و هێرش بۆ سەر خەڵک دەست پێ دەکەیت؟!.

«وەفایی» دەڵێ:

ئیشارێکی بەچاوان کرد، برۆی هەمباشی تورکان کرد
دڵمیان تیرەباران کرد، کەمانداران لە هەر لایێ
«١٦٥»

**٢- هەر حەسرەتە بۆ ئێمە، لە مەحسوولی ئەمەل، بەش**
**تا بۆ درەوی کـشـتی حـەیاتە، دوو برۆ؛ داس**

واتە: لەو ڕۆژەوەی دوو ئەبرۆی وێنەی وەک داسی تۆ، دروێنەی ژیانمان دەکەن، بەشی ئێمە لە ژیاندا، هەر حەسرەت و بێ مایەیە.

**٣- ئەو جەننەتی دوو دانەیی خاڵت، دڵی مەی برد**
**ئەو دانەیە بوو، بولبەشەری خستەوە وەسواس**

بولبەشەر: باوکە گەورەی ئادەمیزاد؛ مەبەست لە حەزرەتی «ئادەم»ە.

وەسواس: دڵەڕاوکە، سێ و دوو.

واتە: ئەو دوو خاڵە بەهەشتییەی سەر کوڵمەی تۆ، کە بوونە دانە و داو، دڵی ئێمەی پێوە گیرۆدە بووە، هەر هەمان ئەو دانە و دەنکە گەنمە بووە، کە بووە سۆنگەی وەدەرنانی ئادەم لە بەهەشت.

«نالی» دەڵێ:

خاڵت چییە؟ دانەی گەنمی جەننەتی ڕووتە
چاوت چییە؟ فیتنەی حەرەمی قیبلەیی ئەبرۆ
«٣٨٦»

**٤- باوەڕ مەکە، یەک دانە لە پیرۆزەیی خاڵت**
**بیدا بەدوو سەد ڕشتە گوهەر؛ عاشقی دوڕناس**

ڕشتەی گوهەر: ملوانکەی مرواری و گەوهەر.

عاشقی دوڕناس: عاشقی گەوهەر و زێڕناس.

واتە: ئەو عاشقانەی نرخ و بەهای پیرۆزەی خاڵ دەزانن و دەیناسن، هەرگیز یەک دانە لە پیرۆزەی خاڵی تۆ، بەیەک ملوانکە گەوهەر ناگۆڕنەوە.

**٥- بۆچیمە: مەی و بادە، لە هەر جێگە، کە تۆ بی**
**لێوت: مەی و ماچت: مەزە، دوو چاوتە: گێلاس**

واتە: ئەگەر لە هەر جێگەیەکدا تۆم لێ نزیک بیت؛ یان: تۆم لە بەرامبەردا بیت، پێویستم بەخواردنەوەی مەی نییە، چونکە لێوەکانت هەر خۆیان «مەی»ن؛ ماچی دەمت: مەزە، هەردوو چاویشت، وەک دوو دەنکە گێلاسن.

**٦- یارەب! چ عەبیرێ بۆ شەوێ دێنێ بەزوڵفت**
**کام سوبحە! لە عەتری سەری زوڵفی شەوەتم کاس!**

واتە: خودایە! شەوانە، یار ئەو هەموو بۆنە خۆشە، لە کوێی شەوگارەوە دێنێ و بەسەر کازیوە و بەرەبەیاندا بڵاوی دەکاتەوە؟. چونکە هەر بەرەبەیانێک لە خەو ڕادەبم، ئەو بۆنە خۆشەم بەسەردا دەپژێ و پێی کاس دەبم و هێشتا ڕووی نەداوە بەرەبەیانێک لە خەو ڕابووبم و ئەو بۆنە خۆشە، کاسی نەکردبم.

**٧- لاقی ئەم و ئەو، بۆیە بەدەم دەگرێ ڕەقیبت**
**زانیویە کە ڕێی دەرکی نییە: سەگ، کە نەکا پاس**

واتە: ناحەز و ڕەقیب، کە دەزانن ئێسکیان گرانە و لای هەموو کەس جێگەیان نابێتەوە، بۆیە ئەو ڕەقیب و ناحەزانە، بۆ ئەوەی بتوانن منت لێ دوور بخەنەوە، دەبێ لای



تۆ؛ فیتنەییم بۆ هەڵبەستن، ئەم کارەشیان؛ وەک کاری ئەو سەگانەیە، کە ئەگەر پاسی خاوەنەکانیان نەکەن، لە بەردەرکەی خاوەنەکانیاندا جێگەیان نابێتەوە.

«نالی» دەڵێ:

گرتوویە سەگت: چاکم و لای تۆمەوە دێنێ
یەعنی: وەرە «نالی»، کە منیش دادڕەسێکم
«٢٨٥»

**٨- شەرتی «ئەدەب»ە، مەکتەبی سەودا، نە قڕوقاڵ**
**توخوا بەرەدەر؛ لێرە فەقێ: دەفتەر و قەرتاس**

مەکتەبی سەودا: ڕێبازی ئەوین.

قەرتاس: قیرتاس (قرطاس).

واتە: بەرنامەی «ئەدەب» لە ئەویندارییدا، هەر سەوداییە، کە سەوداییش کارێکی دەروونییە و پێوەندی بەگیانەوە هەیە، نەک بەزمانەوە، کە بەدەم باس بکرێ و خۆی پێوە هەڵکێشرێ و ڕێسا و ڕێنوێنی و ئامۆژگاریی بۆ بنووسرێ. لەبەرئەوە ئەی ئامۆژگاریکار، ئەگەر دەتەوێ باسی عیشق و ئەوین، بەقسە و ئامۆژگاریی ڕوون بکەیتەوە، واز بێنە و بیبڕێنەوە و دەست لە یەخەم بەردە و لێم دوورەوەکەوە.

«نالی» دەڵێ:

ئەمە جێی ڕەمز و ئیشاراتی دەروونە، لە گەرووی:
تەنگی پڕ غەرغەرەیی واعیزی غەڕا، نییە باس
«٢٣٥»

## ٤٦

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)، وەک نموونەی:

١- یەک عیشوە «مەلایی» بی بوها بیتە ژی لەعلان
سەد جان مە هەبن، هێژ کو موقەصصیر د بەهێ من
«مەلای جزیری، ٤٥٧»

٢- مەربووتە حەیاتم بەسلێمانی و خاکی
خۆزگەم بەسەگی قاپییەکەی ئەحمەدی کاکی
«شێخ ڕەزا، ١٢٠»

٣- شێواوە، پەرێشانم، دڵم حەقییە کە تەنگە
مەحروومە لە دیداری کەسێ شۆخ و قەشەنگە
«حەمدی، ٣٤٢»

سەرنج: ئەم غەزەلە، هەر دووبارەبوونەوەی غەزەلی پێشووە، بەڵام غەزەلی پێشوو (٨) بەیتە و ئەمیان (٦) بەیتە و لەگەڵ ئەم دەقەدا جیاوازییان زۆرە، بۆیە بەچاکم زانی ئەم دەقەش (لەگەڵ جیاوازییەکانیاندا) بنووسمەوە.

**١- ئەبرۆیی کەشیدەت، بەکەفی خەنجەری ئەڵماس**
**جووتێ شەهێنی مەست و دەکەن گوڵشەنی ڕوو: پاس**

واتە: برۆ درێژ و کشاوەکانت، خەنجەری ئەڵماسی لە کێلان دەرهاتووی برژانگەکانتی، بەلەپی دەستی گرتوون و دوو چاومەستییشی کە وەک بازو شەهێنن، پاسەوانیی و پارێزگاریی باخی ڕوخساری دەکەن.

**٢- ئومێد نییە مەحسوولی ئەمەل فائیدە نادا**
**تا بۆ درەو کشتی حەیاتە؛ دوو برۆ: داس**

مەحسوول (محصول): بەرهەمهاتوو.

ئەمەل: ئومێد، هیوا.

فائیدە: کەڵک، قازانج.



کشت: کشتوکاڵ.

پاس: پاسەوانی، ئاگاداریی.

واتە: خەرمانی بەرهەمهاتووی ئێمە، هیوای ئەوەی لێ ناکرێ، کەڵکێکی هەبێ، چونکە هەرچی ئێمە بۆی دەژین (کە یارە)، یاریش هەردوو برۆکانی کردوونەتە داس و درەوی ژیانی ئێمەی پێ دەکات.

بەیتەکانی: ٣ و ٤، لەگەڵ بەیتەکانی غەزەلی پێشوو وەک یەک بوون و پێشتر شەرح کراون.

**٥- ئەو قەتڵی دڵی زاری؛ بەتەحریکی برۆ کرد**
**شەیتانە، دەنێ وەسوەسەیی شەڕ، لە دڵی ناس**

واتە: یار کە دەزانێ دەستبەرداری نابین، دەچێ ڕێگەی یاسایی تر دەدۆزێتەوە، تا ئێمەی پێ سزا بدات؛ ڕێگە یاساییەکەش هەر بەبرۆکانی دەسپێرێ و برۆکانیشی کاری ئەفسانەیی و جادوویی شەیتان ئاسا دەکەن و سێ و دوو بۆ دڵی عاشق دروست دەکەن؛ تا عاشق بیری بۆ ئەوە بچێ، کە ئاخۆ جگە لەم یارە، یارێکی تر هەیە!؟. ئەوسا بەم سێ و دووکردنی هاوبەش پەیداکردنە بۆ یار، ڕێگەی ئەوە لە بەردەم برۆکانیدا خۆش دەبێ، تا بەتاوانی: شەریک و هاوبەش پەیداکردن بۆ خودا (بۆ یار)، تاوانی کافر بوو لەسەر عاشقەکانی دابنێ.

«نالی» وێنەیەکی نزیک بەم بەیتەی هەیە:

وەحشییە لێمان لەبەر تەعنەی ڕەقیبی سەگ سیفەت
ڕاستە هەر دی ڕۆحێ، بۆ وەسواسە، شەیتانی هەیە
«٥٧٥»

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)، وەک نموونەی:

١- بەندەیێ صادق سەحەر ئامانجێ ڕەشتو زێن خوە کر
من ب قەولێ دژمنان دت بەرخەدەنگان بێ سەبەب
«مەلای جزیری، ٧٣»

٢- پەرچەمی ڕوو دادەپۆشێ، پێچی زوڵفی پێچەیە
دا بەڕۆژیش پێی بڵێن: شەمعی شەبوستانی هەیە
«نالی، ٥٧٣»

٣- ئەی وەتەن! ڕۆم و عەجەم موشتاقی کوردستانتە
ئیفتیخاری میللەتی کورد، شەوکەتی عینوانتە
«حەمدی، ٨١»

**سەرنج:** وەک پێشتریش لە دامێنی ئەم قەسیدەیەدا ئاماژەمان پێ کردووە؛ ئەم قەسیدەیە هەرچەندە بەناوی «ئەدەب» و «حەریق»ەوە لە ستایشی «شێخ شەمسەدینی بورهان» دایە، بەڵام بەو بۆنەیەوە کە «حەریق» زۆرتر مریدی «شێخی بورهان» بووە و لە باری ڕۆحییشەوە لێی نزیکتر بووە، بۆیە شەقڵ و جێ پەنجە و بەهرەی شاعیرانەی «حەریق»ی زۆرتر پێوە دیارە و کەمتر جێ پەنجە و کەشوهەوای شیعری «ئەدەب»ی تێدا دەبینرێ.

**١- ئەی عەزیزی حەزرەتی پەروەردگاری بێ ڕەفیق**
**قوتبی عالەم، پیری دانا، یوسفی میسری تەریق**

عەزیز: مەبەست لە «عەزیز»ی پاشای میسرە، لە سەردەمی ژیانی «یوسف»دا و لە هەمان کاتیشدا هەر ئەم «عەزیز»ە، مێردی «زولەیخا»یە، کە دواتر حەزی لە یوسف کرد.

یوسفی میسری تەریق: ئەوەی ڕێبازی وەک «یوسف»ی میسرە؛ ئەوەی هاوڕێبازی «یوسف»ە، کە لێرەدا بۆ بیرخستنەوەی خوێنەران دەڵێم: «شێخی بورهان»یش، کە ئەم شیعرەی بۆ وتراوە، هەر ناوی «یوسف» بووە، بۆیە لەم شیعرەدا ئاماژەی زۆر بەرەمزەکانی داستانی «یوسف» و «عەزیز»ی میسر دەکرێت.



**٢- خوسرەوی دەروێش کیسوەت، سەروەری قەیسەر غوڵام**
**ئەفسەری شاهانی عالەم، مورشیدی خاقان ڕەفیق**

خوسرەو: نازناوی پاشاکانی ساسانییە.

دەروێش کیسوەت: جلوبەرگ و پەڵاسی دەروێشانە. واتە: خۆت وەک پاشایت، بەڵام جلوبەرگی دەروێشانە دەپۆشیت.

قەیسەر غوڵام: ئەوەی ئەوەندە لە قەیسەر (واتە: لە پاشا) گەورەترە، تا «قەیسەر» وەک «نۆکەر» لای خۆی ڕابگرێ.

مورشید: ڕێبەر.

خاقان ڕەفیق: ئەوەی هاوڕێی پاشاکانی «چین»ە.

**٣- دین نەما بوو بێ وجوودت، دین بەتۆوە نەقشی بەست**
**دین نگین، تۆ بووی بەخاتەم، ئەو: موسسەجەع، تۆ: عەقیق**

نگین:ئەو گەوهەرە گرانبەهایانەی کلکەوانە و بازن و زێڕی هەمەجۆرەی پێ دەڕازێننەوە.

خاتەم: دوایین، کۆتایی، لە هەمان کاتیشدا بەمانای موستیلە (کلکەوانە)ش دێت.

موسەجەع: قسە و نووسینی بەقافیە و سەروا.

عەقیق: بەردە پیرۆزەی گرانبەها.

واتە: لەم ڕۆژگارەدا، کە خەریک بوو ڕەنگی ئایین کاڵ دەبۆوە، بەهۆی تۆوە دووبارە ڕەنگی دەرکەوتەوە و سەرلەنوێ گەشایەوە، وەک ئەوەی با نقێم و پیرۆزەش هەبن، بەڵام تا موستیلە خۆی نەبێ؛ نقێم و عەقیقیشی تێناخرێ؛ بۆیە تۆ بووی بەموستیلەکە و ئایینت لای خۆت جێگە کردەوە.

**٤- هەر غەریقێ یادی تۆی بێ، غیرەتت مەللاحە بۆی**
**گومڕەهی ساحیل نشین بێ، یاد و زیکری تۆ غەریق**

غەریق: خنکاو.

مەللاح: کەشتیەوان، پاپۆڕەوان.

گومڕەه: ڕێ ونکردوو.

ساحیل: کەنار، ڕۆخ.

واتە: هەر خنکاوێ یادی تۆی بێ، غـــیـــرەتی تۆ وەک پاپۆڕەوانە بۆی و هەر ڕێ ونکردوویەکی کەنار زەریاش، یاد و زیکری تۆ بکات، تۆش بیری خۆت بۆ دۆزینەوەی دەخەیتە کار.

**٥- حەنزەلە، بێ شەربەتی میهرت لە مینوو سەلسەبیل**
**سەلسەبیلە بێ مەزەی قەهرت، لە مینادا ڕەحیق**

حەنزەل (حنظل): گوژاڵک، ڕووەکێکی یەکجار تاڵ و ژەهراوییە و لە بیاباندا دەڕوێ و تەنیا حوشتر دەیخوات و پێی دەوترێ: حوشترخۆر.

مینوو: بەهەشت.

سەلسەبیل: ئەو ئاوەی بەخۆڕایی و لە ڕێی خوادا بەسەر تینوواندا دەبەخشرێتەوە؛ خێراو.

قەهر: ڕق، کینە، بوغز.

ڕەحیق: بۆنوبەرامەی خۆش.

واتە: ئەو ئاوە خێراوەی لە بەهەشتدا دەبەخشرێتەوە، ئەگەر دڵنەرمیی تۆی تێکەڵ نەبێ، وەک ژەهر تاڵ دەبێ و بەپێچەوانەشەوە هەر شتێ تۆ پێت خۆش بێت، ئەوا وەک بۆنوبەرامەی خۆش، بەسەر هەمووواندا دەبەخشرێتەوە.

**٦- فەیزی تۆ: باران و مونکیر: کوێر و خوبسی دڵ قوڕاو**
**هەڵخلیسکێ پێی ئەگەر، مەسموعە پێم عوزری زەلیق**

فەیز: بەخشین.

مونکیر: پێ نەزان.

خوبس (خبث): ناپاک، ناباش، خراپ.

مەسموع: بیستراو.

زەلیق: هەڵخلیسکاو.

واتە: بەخشینی تۆ ئەوەندە زۆرە، وەک باران وایە و پێ نەزانان و خۆ بەئەنقەست کوێر کردووان و ناپاکانی دڵ پیس، ئەگەر هەڵە و تاوان و هەڵخلیسکانی خۆیان بەتۆ بگەیەنن و داوای بەخشین و لێبووردنیان لای خودا بۆ بکەیت، تۆ دریغیان لێ ناکەیت و بەبەخشینی خۆت، بۆیان دەپاڕێیتەوە و تکای بەخشینیان لای خودا بۆ دەخوازیت.



**٧- دین و ئیرشاد و تەریقەت، هەر بەتۆ شایستەیە**
**وەک بەشانی حەزرەتی سەییدە، ڕیسالەت بوو حەقیق**

واتە: ڕابەرایەتیکردنی ڕێبازی ئایین، هەر شایانی تۆیە، هەروەک چۆن گەیاندنی پەیامی ئیسلام، بە«محەمەد» شایان بوو.

**٨- کەی دەگا قوربان بەپایەی عولوی کاخی هیمەتت**
**وەهم و فکری هەردوو عالەم، گەر ببێتە مەنجەنیق!**

عولوو: باڵا، بڵند.

کاخ: تەلار، کۆشک.

مەنجەنیق: ئەو ئامێرەی لە کۆندا بۆ کاتی جەنگ بەکاریان دەهێنا و مەعدەنی تواوەیان تێدا دادەنا و بەهۆی باروت و دەرمانەوە، لە مەودای دوورەوە، بۆ بەرەی دوژمنیان دەهاویشت.

**٩- وەسفی نووری عەرش گیرت، دێتە تەشریح و بەیان**
**گەر لە هاوەندا بەسەنعەت پرتەوی مەه بێ سەحیق**

هاوەن: دەسک و هاون، کە شتی تێدا ورد دەکەن.

سەحیق: هاڕدراو، هاڕین.

**١٠- «نەقشبەندی» بێ میسال و «قادری»ی قودرت بەدیع**
**تۆی لەسەر پەردەی بەقا، کیشا بەئەخلاقی خەلیق**

واتە: هەردوو ڕێبازی ڕازاوەی «نەقشبەندی» و «قادری» پڕ توانا و شیرین، تۆیان بەرەو ڕەوشتی داهێنەرانە و مانەوە پەلکێش کرد.

**١٣- گەوهەری زاتت، سەنای نایێ بەدەریای فیکرەتم**
**فیکری من: غەوواسی نادان، بەحری جودی تۆ: عەمیق**

سەنا (ثناء): ستایش، مەدح.

غەوواس: ئەوانەی لە ناو زەریا و ئاودا خۆیان نقوم دەکەن.

جود: بەخشین.

عەمیق: قووڵ.

واتە: هزری من لەوە بێ دەسەڵاتترە بتوانێ سوپاس و ستایشی گەوهەری زاتت بکات، چونکە من غەوواسێکی نەشارەزام و زەریای بەخشینی تۆش، قووڵ و بێ بنە.

**١٤- دەم بەدەم شادان و خورەم بی؛ ئیلاهی بێ مەلال**
**وەک لە ئەبری بەهمەنی؛ خەندانە نەسرین و شەقیق**

خورەم: دڵشاد.

مەلال: بێزار، دڵتەنگ.

ئەبر: هەور.

بەهمەن: ناوی مانگی (١١)ی ساڵی هەتاوییە، ناوی دووەمین ڕۆژی هەموو مانگێکیشە، هەرەسی بەفر، یەکەمین هزر، بەڵام لێرەدا هەر مەبەست لە مانگی بەهمەنە.

شەقیق: گوڵاڵەسوورە.

واتە: لە خودا دەخوازم هەمیشە بەختەوەر و دڵشاد بیت و وەک هەوری زستانیش پڕ باران بیت، تا گوڵە نەسرین و گوڵاڵەسوورەت پێ بگەشێنەوە.

**١٥- دوو کەسن قوربان لە مەحشەر بییە شافیعیان ئەگەر**
**یەک: «ئەدەب» بدەی قەدیم و یەک: سەناخوانت «حەریق»**

واتە: لە ڕۆژی زیندووبوونەوەدا دوو کەس چاوەڕێی ئەوەت لێ دەکەن لای خودای مەزن بۆیان بپاڕێیتەوە و تکایان بۆ بکەیت، کە یەکێکیان «ئەدەب»ی بەخشندەی دێرینە و ئەویتریان «حەریق»ە، کە ستایشکار و سوپاسگۆتە... لەم بەیتەی دواییشدا نیشانەی ئەوە دەردەکەوێ، کە ئەم قەسیدەیە جێ پەنجەی «حەریق»ی زۆرتر پێوەیە، چونکە مەبەست لە «سەناخوان»، واتە: ستایشکار و سوپاسگوزارە، کە ئەم هەموو ستایشەی «شێخی بورهان»ی لەم قەسیدەیەدا پێ کراوە. دیسانیش ئاماژەی بۆ دەوڵەمەندیی و بەخشندەیی «ئەدەب»ی تێدایە.



**٤٩**

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن) وەک نموونەی:

١- شەمع و پەروانە ب ذاتێ خوە ژ جالێ مە د دوورن
ئاتەشەک صرفە ژ عشقاتە ڤەوەستامە لەبالەب
«جزیری، ٦٥»

٢- هەر لەبت، یا سینەشت هەردوو بەدەرخە، دا بڵێین:
لەعلی ڕوممانیی هەیە، یا لەعل و ڕوممانی هەیە
«نالی، ٥٧٥»

٣- جورعەنۆشیی تۆ بکەم، ئیتر لە بەزمی مەیکەدە
چاوی مەخموورت بەعاشق؛ کاری بادەی مەی دەکا
«سالم، ٢٩»

٤- وا عەجەب ماوم کە ماوم، بۆ بەبێ تۆ نامرم
وام ئەزانی کەڵکی ئانێ هیجری دڵبەر ناگرم
«ئەحمەد حەمدی، ٣٠٢»

**١- ئەی شەکەر لەب، شاهیدی شیرین کەلامی شۆخ و شەنگ**
**دەم قەشەنگ، پەرچەم قەشەنگ، ئەو خاڵی دەوری دەم قەشەنگ**

شاهید: جوان، لە هەمان کاتیشدا: شاهید و شەهید، بەمانای هەنگوینی قاڵ و پاڵاوتەش دێت، چونکە باس لە شیرینیی قسە و دەم و لێوە.

قەشەنگ: جوان و ڕازاوە.

**٢- ڕوومەتت وەک دوو گوڵی گەش، لەب وەکو یەک خونچە گوڵ**
**گەردەنت بەللوری بێ غەش، دەم دەهانی شەنگی شەنگ**

شەنگ (ی یەکەم): ڕووەکێکی خۆراکییە، لە کەشوهەوای مامناوەندی وەک: ئێران، ئەورووپا، ئەفریقیا دەڕوێ، جۆری زۆرە و بەشێوەیەکی سروشتیی لە پۆلکە بچووکترە و لە دەنکە نیسک گەورەترە. شێوەی جوانە و لە هەندێ ناوچەشدا چونکە لەگەڵ سەوزەی تردا

بۆ خواردن بەکاری دەهێنن، بۆیە بەشێوەی تازە دەیڕوێنن. شەنگ جۆری زۆرە و ناویشی زۆرە: شەنگی چیمەن؛ کە گەڵاکانی لەگەڵ شەنگی ئاسایی باریکترە. بەعەرەبیش پێی دەڵێن: لحیة التیس، واتە: ڕیشی بزن، یان: ذنب الخیل، بەواتا: کلکی وڵاخ و... ناوی تریش. (دهخدا، بەرگی ١٠، ل ١٤٥٢٦).

شەنگ (ی دووەم): جوان و شۆخ.

**٣- بۆ: دوو زوڵفی نافەبار و لێوی لەعلی ئەتڵەست**
**شۆڕشت خستە تەتار و بوویە ئاشووبی فەرەنگ**

زوڵفی نافەبار: پەلکی بۆن خۆشی وەک بۆنی خۆشی ناووکی ئاسکی خوتەن و چین و خەتا.

ئەتڵەس: مانای زۆری هەیە، بەڵام لێرەدا مەبەست ڕەنگی سووری زۆر تێری مەیلەو ڕەش (دهخدا، بەرگی ٢، ل ٢٨٧٧).

شۆڕش: ئەو مانایە ناگرێتەوە، کە مەبەست لە دانانی بەرنامەیەک بێ، بۆ گۆڕینی بارێکی خراپ، بۆ بارێکی باش. بەڵکو لێرەدا بەمەبەستی: هەڵڵا، هەرا، پشێویی، غەوغا... دێت (هەڵبەتە هەر لە زمانی فارسیشدا مانای شۆڕش، بەمانای هەرا و پشێویی دێت):

شۆڕشت خستە تەتار و بوویە ئاشووبی فەرەنگ

واتە: سەرلەبەری خۆرهەڵات و خۆرئاواشت پڕ کردووە لە پشێویی و هەرا و هەڵڵا.

لە سەرەتای نیوەی یەکەمی ئەم بەیتەدا: (بۆ دوو زوڵفی نافەبار و...) دەشێ «بۆ»یەکە، بە«بەدوو زوڵفی نافەبار و...»یش بخوێندرێتەوە.

**٤- جامی زەهری تەڵخی تۆ، بەو شەرتە خۆت بیدەی بەمە**
**کێیە ڕوو ترشیی بکا، ئەم جامە: شەهدە، یا: شەرەنگ؟**

واتە: ئەگەر بادەیەکی ڕەنگ خەستی تێر، بەو مەرجەی بەدەستی خۆت بماندەیتێ، کێ هەیە ڕووی خۆی لەوە گرژ بکات، کە بۆچی ڕەنگی بادەکە وا خەست و تێرە و گومانی ژەهر و شتی وای لێ بکرێ!؟ لەبەرئەوە مادام خۆت پێشکەشمانی دەکەیت، ئیتر ناترسێ و ناپرسێ: هەنگوینە، یان ژەهرە و یەکسەرە فڕی دەکات.

«وەفایی» دەڵێ:



بەو پەنجە، کە ڕەنگی دڵە، ساقی کە ئەتو بی
پەیمانەیی ژەهرم بدەرێ، عەینی شیفامە
«١٣٤»

لە فۆلکلۆری کوردیشدا هاتووە:

عارەقی دەستی دڵبەر بێ
با: ژەهری ماری حەوت سەر بێ
دەیخۆمەوە قەستی سەر بێ

«نالی»ش واژەی «شەهد»ی بەمجۆرە بەکاربردووە:

بەو شەهدی کەلامەت، کە بەئیشرابی لەتافەت
لەززەت دەگەیەنێ بەدڵ و زیهنی موخاتەب
«١٣٤»

**٥- زەخمدارانی خەدەنگت؛ گەر دەفەرمووی: بێ سەدان**
**زەخمیان وا کارییە، ناگاتە سەریان کەس بەدەنگ**

زەخم: زام، برین.

خەدەنگ: تیر.

بێ سەدا: بێ دەنگ.

واتە: گەر دەپرسی زامدارانی تیری نیگات، بۆچی ئەوەندە بێ دەنگن؟! لە وەڵامدا دەڵێم: چونکە تیری نیگای تۆ، ئەوەندە کارییە، هەر کەسێ تیری نیگاتی بەرکەوێ، دەستبەجێ دەمرن و کەس فریای بەهانا چوونیانەوە ناگات.

مەولانا خالید دەڵێ:

تیرهای غمزەات را از دل دل دادگان
هر طرف بینم فتادە بر سر کویت غرض
«٥٣٥»

**٦- نازی دڵ وەک: شیشە و سەختیی دڵت وەک: سەنگی سەخت**
**کێیە غەیری من؛ بەدەستی خۆی بدا: شیشە، لە سەنگ؟!**

واتە: ئەوەندە دڵت ناسکە و ئەوەندەش نازەکانت ناسکن، دەڵێی شووشەن؛ واتە: نازی دڵت ئەوەندە ڕوون و ناسک و ئاشکرا و زوڵاڵ و شەفافە، وەک شووشە، ئاشکرا پێتەوە دیارە؛ بەڵام دڵت خۆی وەک بەرد ڕەقە. لە منیش زیاتر (کە دڵم ناسکە و وەک شووشە وایە) کەسی تر، شووشەی دڵی خۆی بەبەردی دڵتا نادات... یان: تۆ نازت ئەوەندە ناسک و تەنکە، وەک شووشە وایە، لە من زیاتر (کە دڵم لە چاو نازی دڵی تۆدا وەک بەرد وایە)، کەسی تر دڵی نایە و پڕکێشیی ناکات، دڵی خۆی هاوتای دڵی تۆ ڕابگرێ.

«نالی» دەڵێ:

دەخیلت بم، نەخیلی، یا: ڕوطابی
وەها شیرین و سینە نەرم و دڵ: ڕەق!؟
«٢٥٢»

«مەحوی» دەڵێ:

بەحیرەت لەو گوڵئەندامەم، کەوا بادامییە چاوی
دڵی نازک وەکو گوڵ، هەم ڕەقە وەک توێکڵی بادام
«٢١٦»

**٧- ڕاستی، تا زوڵفی بەتاتای چەنگیی تۆ نەگرم بەدەست**
**ڕۆژ و شەو ناڵەی حەزینم، دێتە گوێت؛ وەک دەنگی چەنگ**

زوڵفی بەتاتا: زوڵفی تاڵ تاڵ بووت، زوڵفی هەودا هەودا.
چەنگ (ی یەکەم): چەنگاڵ، چەنگیی، قولاب.
چەنگ (ی دووەم): ئامێری مۆسیقایی.

واتە: تا ئەو کاتەی دەستم دەگاتە سەری زوڵف و پەلکە هەڵگەڕاوەی وەک چەنگاڵەکانت و هەر تاڵێکی زوڵفت، وەک تاڵی ژێی چەنگ، نەژەنم و ئازار و حەسرەتەکانمی پێ دەرنەبڕم، ڕۆژ و شەو ناڵەم، وەک دەنگی ژەنینی چەنگ، هەر دێتە گوێت و هەر بێزارت دەکەم...

یان: هەتا تاڵ تاڵی قژەکەی تۆ، بشنێنەوە و وەک دەنگی ژێی چەنگ، دەنگی خۆشیان



لێوە بێت، من لای خۆمەوە، بەدەم بیستنی دەنگی شنینەوەی تاڵی قژەکەی بەدەم باوە، هەر ناڵە ناڵەم وەک دەنگی ئامێری چەنگ لێوە دێت...

یان: تا ئەو کاتەی ڕازیت دەکەم، ڕێگەم بدەیت، دەست بەسەر قژتا بهێنم، هەر دەگریم و دەگریم.

**٨- ئەی «ئەدەب»! تۆ خۆت بەصەیدێکی شکاریی بگرە تا:**
**دوو برۆی قەوسی کەمان و تیری چاوان بن؛ خەدەنگ**

صەید: نێچیر.
شکار: ڕاو.

واتە: ئەی «ئەدەب» تا خۆت لە بەرابەر قەوسی کەوانی هەردوو برۆ و تیری چاوانی یاردا ڕابگریت، دەبێ ئەوەشت لە یاد بێ کە بوویتە نێچیر و یار ڕاوت دەکات.

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەقسوور: (فعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلان) وەک نموونەی:[1]

١- تو دزانی ب خودێ من تو خەیالی شەب و روز
ب خەیالا خوە مەدام من تو ل بالی شەب و روز
«مەلای جزیری، ٢٧٦»

٢- ڕاستە دڵ چەسپە، وەلێ شادە لە گێسوویی حەبیب
چونکە نەزدیکە بەدایم لە گوڵی ڕوویی حەبیب
«سالم، ٤٥»

سەرنج: ئەم غەزەلە و غەزەلی دوایی، زۆر وێنە و کەرەسەیان تێکەڵ و وێکچووە.

**١- شێت و شەیدایی بتێکە، دڵەکەی پڕ لە خەیاڵ**
**نەورەسە و سادە ڕوخە و سەرو قەدە و چاردە ساڵ**

نەورەس: تازەپێگەیشتوو، فەریک.

سادە ڕوخ: ڕوخسار سادە و ساکار.

**٢- ساحیرە و شێوەزەنە و پیلەگرە و جلوەگەرە**
**بێ وەفا و سیدق و سەفا؛ شەرت و بەقا و عەهدی بەتاڵ**

شێوەزەن: فێڵباز.

پیلەگر: بیانووگر، بەبەهانە، لەسەر بیانوو.

جلوەگەر: خۆنوێن.

**٣- ساقی و بادەخۆر و مونیس و عەییار و لەتیف**
**زیرەک و عاقڵ و دانا و خوداوەندی جەماڵ**

بادەخۆر: مەیخۆر.

مونیس: هاودەم.

(١) کێشی ئەم غەزەلە و غەزەلی دوایی بەمجۆرە لای «ئا» پێناسە کراوە: ڕەمەل موسەممەن مەخبوون مەحزووف. بەڵام مامۆستا هەردی (لەسەر داوای من) بەوجۆرەی سەرەوەی پێناسە کردووە.



**٤- دڵبەری سیمبەری، حیلەگەری وەعدە دەرە**
**لە هەزاران، بەیەکێکی، کە وەفا بووبێ، محاڵ**

سیمبەر: ئەندام و لەشولار زیوین.

حیلەگەر: فێڵباز، تەڵەکەباز.

محاڵ: ئەو شتەی هەرگیز نابێ و سەرناگرێ.

**٥- هەمدەمی زود ڕەمی، خونچە دەمی پڕ ستەمە**
**نە بەسەر ڕازییە لێم و نە بەجان و نە بەماڵ**

زود: خێرا، بەپەلە.

ڕەم: ئەو ڕەونیانەی کە لە ئاکامی سڵ و پارێز و دەستەمۆ نەبوونەوە ڕوو دەدەن؛ بەتایبەتیش ئەم واژەیە بۆ ئاسک و ئەو گیانلەبەرانە بەکار دەبرێن، کە هێشتا ماڵیی نەبوون.

**٦- صەنەمی گوڵبەدەنی خۆش سوخەنی پستە دەهان**
**ماهڕوو، سیلسیلە موو، شیفتە خوو، پڕ خەت و خاڵ**

گوڵبەدەن: ئەندام گوڵین.

خۆش سوخەن: قسە خۆش، قسە شیرین.

پستە دەهان: بستە دەم، دەم وەک بستە (واتە: دەم بچووک بەئەندازەی بستە).

ماهڕوو (ماه ڕوو): مانگ ڕوو، ڕوخسار وەک مانگ.

سیلسیلە موو: موو وەک زنجیر، قژ و زوڵف وەک زنجیرە.

شیفتە خوو: ئاکار ئاڵۆز، هەر دەمەی ئاکاری جۆرێک بێ، حول حولی مەزەب.

**٧- هەم بتی بتگەدە، هەم قیبلەیی ئیسلام و فەرەنگ**
**کە بەهەر مەزهەب و قانوونێ، پەرستیشە حەلاڵ**

بتگەدە: بتخانە.

فەرەنگ: لێرەدا بەمانای ناموسڵمان و مەسیحی هاتووە.

پەرستشیە حەلاڵ: پەرستنی حەلاڵە. پەرستنیشی حەلاڵە.

**٨- جـەوهەری لوتفی پەدیدارە لە ئەندامی بلوور**
**وەک لە بللوورەوە پەیدا: سیفەتی ئاوی زولاڵ**

پەدیدار: ئاشکرا و دیار.

واتە: ئەندام و لەشی وەک بللوور و شـووشـە وایە و تیـایدا «لوتف»ی وەکـو گـەوهەر دیارە، هەروەک چۆن ئەگـەر ئاوێکی ڕوون و زولاڵ، لە دەفـرێکی شـووشـە بـکرێ، دیارە و دەردەکەوێ، کە ئاوەکە زولاڵ و بێ گەردە، یا نا.

**١٠- گەردەنی شووشی مونەققەش، بەدوو خاڵی ڕەش و بەس**
**بێ لەکە و ژەنگ و پەڵە، هەروەکو: شمشی زەڕی قاڵ**

شووش: باریک و ڕێک، زراف.

مونەققەش: نەخشێنراو، ڕازێنراوە.

شمشی زەڕی قاڵ: ئەو پارچە زێڕە هێشتا نەتواوە و هێشتا ورد نەکراوەی؛ کە دواتر و دوای تواندنەوەی، ملوانکە و گوارە و...ی لێ دروست دەکرێ.

**١١- زوڵفی عەقرەب ڕەوش و چیهرەیی هەم ڕەنگی قەمەر**
**طوڕە: ئەفعی سییەر و نێرگسی: هەم شێری مەراڵ**

عەقرەب ڕەوش: ڕەوشت وەک دووپشک.

چیهرە: ڕوخسار.

ڕەنگی قەمەر: ڕەنگی پێستی وەک مانگ.

ئەفعی سییەر: ڕەوشت وەک مار، مار ئاسا.

نێرگسی هەم شێری مەراڵ: چاوی وەک ئەو شێرانەی وێنەی ئاسک دەدەن.

**١٣- هەردەمێ مـەرمـەڕی سـمتی، بەجـەفا سـوور بدا**
**تفڵی تەبعی «ئەدەب» ئەوسا دەکەوێتە گروگاڵ**

تفڵ (طفل): کۆرپە، منداڵ.

تەبع: نووسین، شیعر نووسین.





کێش: بەحری ڕەمـەل مـوسـەممەن مـەقسـوور: (فـعـلاتن فـعـلاتـن فـعـلاتن فـعـلان) وەک نموونەی:

١- مـــثلی گـــۆیین تە ڕەوان نا لە ژ دل مـــسکین تێن
ئـەم نزانـین تـو چـرا هـەروە دنـالـی شـــــەب و ڕوز!
«مەلای جزیری، ٢٧٧»

٢- ئەم سـەگـانەی کـە لە لای ئێـمـە، وەزیر و وکـەلان
بێنە لای تۆ، بەخـــودا نایکەیە گـــاوان و شـــوان
«حاجی قادر، ٨٣»

٣- تۆ، کە دەرکەوتی، مەپرسە چی بەسەر دێ: جان و دڵ
حـاڵەتی شـەونم تەمـاشـاکـە، بەوەقـتی ڕۆژهەڵات
«مەحوی، ٥٧»

٤- من کـە شـەهبـازی شکار ئەندازی شـاهیم پێ دەڵێن
حەیفە با ئاهەنگی جەنگی سەرگەڕ و لەقلەق نەکەم
«شێخ ڕەزا، ٧٥»

**٣- دڵبـەرە، شـۆخ و گـوڵئـەندامـە، بەناز و بەجـەفـا**
**شوهرەیی ئەنجوومەنە و فیتنەیی جان؛ ئافەتی ماڵ**

شوهرەی ئەنجوومەن: ناودار و بەناوبانگی ناو کۆڕ و کۆمەڵ.

«وەفایی» واژەی «شوهرە»ی بەمجۆرە بەکاربردووە:

١- بەئازادی لەکن خـۆی شـوهرەیە، من مـات و حـەیرانم
گـوڵ و نارنجی بەرهێناوە، خـۆ سـەروی خـەرامـانت
«٢٨»

٢- قـســەیە خـاکی بەری پێت شـوهرەیە بۆ چاوی نابینا
هەتا نەمدی بەچاوی خۆم، بەسورمەی دیدە، نەمزانی
«٢٠٢»

**٤- ساقی و بادەخۆر و ڕەند و خۆش ئاواز و حەریف**
**سادەیە، موغ بەچەیە، سەرو قەد و ماە جەماڵ**

ڕەند: قەڵەندەر، بێ دەربەست.
خۆش ئاواز: دەنگخۆش.
حەریف: هاودەم، هاوڕاز، هاوپیاڵەی مەیخواردنەوە.
موغ بەچە: بەچکە زەرتوشتی، یان: کچی جوانی زەرتوشتی.

**٥- موومیان تەنگ، دەهان تاق، جیهان جووت پەری**
**دین کڕ و ناز فرۆش و جەرگبڕ و عەقڵ زەواڵ**

موومیان تەنگ: ناوقەد بەئەندازەی موو باریک، ناوقەد زراڤ.
دەهان تاق: دەمی (لە جوانیی و بچووکیدا) لە دنیادا تاک و ناوازەیە.
جیهان جووت پەری: تاکە کەسێکە کە لەگەڵ پەرییاندا جووت و دەستەخوشکی پەرییە.
عەقڵ زەواڵ: عەقڵ لە بن هێن، عەقڵ لە بەین بەر.
«وەفایی» «کەمەری باریک» و «دەمی بچووک»ی بەمجۆرە وێنە کێشاوە:

خۆش بەناز فەرمووی: «وەفایی» عومری خۆی هیچ ڕابوارد
یا بەقوربانی «دەم»م بوو، یا بەسەرگەردی «کەمەر» «٤٣»

**٦- سیم تەن، سێب زەقەن، غونچە دەهەن، جەبهە کەمەن**
**ماە ڕوو، سیلسیلە موو، شیفتە خوو، پڕ خەت و خاڵ**

جەبهە کەمەن: هەنیە و ناوچەوان پرشنگدار.
(نیو بەیتی دووەممان لەگەڵ غەزەلی پێشوودا لێکدایەوە).

**٧- زاهید و ناسخی تەقوا، شەڕی تاعەت، سەری کوفر**
**دزی دین، ساریقی دڵ، کەسری زەکا، نەقسی کەماڵ**

زاهید و ناسخی تەقوا: ئەگەرچی زاهید و خواپەرستە، کەچی لە هەمان کاتیشدا هەڵتەکێنەر و تێکدەری خواپەرستییە.
شەڕی تاعەت: شەڕی خواپەرستیی دەکات.



سەری کوفر: سەرەتا و بەرایی هەموو کوفرێکە.
ساریقی دڵ: دزی دڵ.
کەسری زەکا: تەقەللای ئەوە دەدات: زیرەکیی بەرامبەرەکەی کەم بکاتەوە.
نەقسی کەماڵ: هەوڵیش دەدات کەماڵی بەرامبەرەکەی کەم بکاتەوە.

**٨- صەنەمی زوڵف بەخەم، عەشقی ستەم، فیرقەتی سەم**
**دەم عەدەم، قوربی عەلەم، هیجری ئەلەم، وەسڵی محاڵ**

زوڵف بەخەم: زوڵف لوول و پێچ خواردوو.
فیرقەتی سەم: دووریی و دابڕانی وەک ژەهر.
دەم عەدەم: دەمی لە بچووکیدا هەر دیار نییە و نەماوە.
قوربی عەلەم: ژیان لە نزیکی ئەودا (یار) بەختەوەرییە.
هیجری ئەلەم: لێدابڕان و دووریشی ئازارکێشان و نەخۆشییە.

**٩- کەبک: خەت، باز: ڕەوش، سەقەر: سەدا، پەنجە: عوقاب**
**چاو: مەراڵ، ئاسک: نیگەهـ، شێر: فکەن، سمت: غەزال**

کەبک خەت: خاڵ و مێڵی وەک خاڵ و مێڵی گەردنی کەو.
باز ڕەوش: ڕەوشت و ئاکار وەک باز.
سەقەر سەدا: دەنگی وەک دەنگی شەهێن.
پەنجە عوقاب: چنگی وەک چنگی هەڵۆ.
چاو مەراڵ: چاوی وەک چاوی ئاسک.
ئاسک نیگەهـ: سەیرکردنی وەک نواڕینی ئاسک.
شێر فکەن: شێر بەزێن و شێر تێک شکێن.

**١٠- دەگەڵ ئەو یارە هەموو شەو، بە«ئەدەب» عەیش و نەشات**
**ڕابوورد؛ چۆن؟ بەشەراب و نەی و غەوغا و قەوال**

عەیش و نەشات (نشاط: عەرەبی): بەخۆشیی و شادی.
غەوغا: هەرا، هەڵڵا.
قەوال: سەرگوزشتە و باس و خواس گێڕانەوە.

**١١- دوێ شەوێ؛ تەوسەنی خەوی: سەرکەشیی کرد و نەهات**
**باری خەم کۆ بووەوە، لەو دەشتە؛ بەلنگە و بەجەواڵ**

تەوسەن: ئەسپی سەرکێش، چەمووش.

لنگە: تا، هۆڕ؛ نیوەی بارێک.

جەواڵ: تێر، دەفری تێکردنی شت.



## ٥٣

کێش: بەحری موجتەس موسەممەن مەخبوون مەحزووف: (مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلاتن فعلن) وەک نموونەی:

١- وەکو نەهاری بەهاری درێژ و پاییزی کورت
ئەمەل گەلێک طەویل و، عەمەل کەمێک قەصیر
«نالی، ٢٠٧»

٢- وەتەن عەزیزە، دەخیلە مەڵێن گڵی خاکە
گڵی: کلێکە سوورمەیی عیونی ئیدراکە
«حەمدی، ٣٥٨»

٣- لە بورجی سینە، کە ئەو زوهرە چاوە پێئەکەنێ
فریشتە نییە؛ کە لە عەرشی خوداوە پێئەکەنێ
«بێخود، ١٢٤»

٤- لە ترسی ئافرەتەکانی؛ ئەمێسە واقی وڕە
حسێن ئەفەندیی دکتۆر، ئەڵێی مریشکی کڕە
«شێخ ڕەزا، ١٩١»

**١- ئەگەرچی لەززەتی ڕۆحە، مودام، ڕەتڵی مودام**
**شتێکی دیکەیە ئەمما؛ لە دەستی دڵبەر: جام**

مودام (ی یەکەم): مەی. مودام (ی دووەم): هەمیشە، بەردەوام.

**٤- هەزار خۆزگە بەپار؛ ئەودەمی کە پێکەوە بووین**
**لە شام تا دەمی سوبح و بەسوبح تا دەمی شام**

لە شام تا دەمی سوبح: لە شەوێوە تا بەرەبەیان.

**٥- دەمێ بەپەنجەی نازی دەدامێ ساغەر**
**دەمێ بەعیشوە و بازی، دەیدا سەبووحی ڕام**

ساغەر: لێوان، پیاڵە، پەرداخی مەیخواردنەوە؛ لای ئەهلی «عیرفان»یش بەمانای دڵی عارف دێت.

بازی: یاری، گەپ، گەمە، گاڵتە.

رام: دەستەمۆ، هۆگر، پێچەوانەی: سڵۆک و تەوسەن و سەرکێش.

واتە: تاوێک بەدەست و پەنجەی پڕ لە نازی خۆی، مەی دەدامێ و تاوێکیش بەعیشوە و هۆگریی و گەپ و گاڵتەوە و دەستەمۆبوونەوە، تا بەرەبەیان بادەی پێشکەش دەکردم.

**٧- نیگاری مە! ئەمە تاکەی بەدەرد و ڕەنج و فیراق؟**
**ویساڵ گەر نییە مومکین؛ موییەسەرە پەیغام**

«سەرنج: وەک دەرکەوت ئەم دیمەنە شاعیرانە و ڕۆمانسییانەی لەو بەیتانەی پێشوودا بوون، تەنیا خەیاڵی شاعیرانە بوون، ئەگینا هێشتا یار سڵۆکەو لە «ئەدەب» دوور و بێ متمانەیە».

واتە: دڵبەرەکەم! ئەم خەیاڵانەی من، تاکەی بەتاسە و ئازار و لێکدابڕانەوە ژیان بەسەر بەرم؟! ئەگەر ئومێدی دیدارمان نارەخسێ و بۆتان نالوێ، بەڵکو نامە، هەواڵ، پەیامێکم بۆ بنێریت.

**٨- خودا! چ ئولفەتە؛ گرتوویە دڵ، بەطوڕەیی تۆ**
**هەتا لە باوەشی نەگرێت، ناگرێ ئارام**

واتە: دڵم ئەوەندە هۆگری کاکۆڵی دڵبەر بووە، گرۆز بووە و هەر بۆی دەگری و ژێر نابێتەوە، مەگەر دڵبەر خۆی دڵی نەرم بێ و ئەم دڵەی من، کە وەک منداڵ و کۆرپە بۆی گرۆز بووە و ئارام و ئۆقرەی بۆی نەماوە، لە باوەش بگرێ و ژێری بکاتەوە.

لە فۆلکلۆری کوردیدا هاتووە:

کۆرپەی دڵەکەم بۆم نانوێ شەوێ
گرووی لێگرتووم، باوەشتی دەوێ

«سالم»یش هەر نزیک بەم وێنەیە وتوویەتی:

١- ڕەها ناکا دڵم طوڕەیی خەمی یار
سەری نەبڕن هەتا وەک پەرچەمی یار
«٥٧»

٢- طوڕەیی هێنا بەڕوودا، ڕووبەڕووی من خۆی نواند
وا موشەخخەص بوو؛ کە نەهیە: دیدەنی ئایینە شەو
«١١٧»



**٩- من و نەسیمی سەحەرگاه و بولبولی شەیدا**
**ئومێدەواری گوڵێ بووین؛ ئەوان دیان، من مام**

واتە: من و سروەی بەربەیانی و بولبول پێکەوە پەیمانێکمان هەبوو، هەرسێکمان بەهیوای گەیشتن بووین بەگوڵی سروەی بەیان؛ بلبل و گوڵەکە بەیەک گەیشتن و هەر من نائومێد مامەوە.

**١٠- بەهەر تەریقێ دەکەم؛ من بەندەگیی ئیقرار**
**قبووڵی بێ شەهی خوبان، ئەگەر «ئەدەب» بە: غولام**

بەهەر تەریقێ دەکەم: هەر ڕێگەیەک دەگرمە بەر.

بەندەگیی ئیقرار: بچووکایەتی و نۆکەرایەتی خۆم دەردەبڕم و دەیسەلمێنم.

شەهی خوبان: شاهەنشای چاکان.

غولام: نۆکەر، خزمەتکار.

واتە: ئەگەر شاهەنشای چاکان (کە مەبەست لە دڵبەرە)، پەسەندی بێ من بەنۆکەری خۆی ڕابگرێ، ئامادەم ئەو، هەر مەرجێکم بەسەردا بسەپێنێ و لێم داوا بکات، جێبەجێی بکەم.

«نالی» دەڵێ:

«نالی» کە غولامی مەدەدی زوڵف و برۆتە
شاهێکە، لە بن سایەیی باڵی دوو هومادا
«٨٦»

«مەحوی» دەڵێ:

١- ڕێی دا لە قاپییا بمرم؛ پێشی سەرسەرم
نا؛ وا گەدا دەبێ بەخوداوەندی تەخت و تاج
«٩٢»

٢- تۆ نەبی مەلجەئی من بی، «أبداً» نیمە مەلاذ
لەو دەرە بێتو دەرم کەی، بەخودا نیمە مەلاذ
«١١٦»

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن) وەک نموونەی:

١- خەشمێ ل فەقیران مەکە زوو پادشەهێ من
پورسێ بکە جارەک ل خەتە ئو گونەهێ من
«مەلای جزیری، ٤٥٤»

٢- بۆچی نەگریم، سەد کەڕەتم دڵ دەشکێنی
مەی بۆ نەڕژێ، شووشە لە سەد لاوە شکاوە!؟
«نالی، ٥٣٥»

٣- پێم خۆشە کە عومرم بەجەفا سەرفی غەمت بێ
بەو شەرتە کە مایەیی ئەمەلم: ماچی دەمت بێ
«سالم، ١٤٣»

٤- جانا! وەرە ئەم جەژنە، بەقوربانی سەرت بم
بۆ تیری قەزا، چاوی حەسوودان: سوپەرت بم
«کوردی»

**١- جانا! بەفیدای غونچەیی نازی دەهەنت بم**
**قوربانی گوڵی گوڵشەنەکەی نەستەرەنت بم**

نازی دەهەن: نازی دەم.

نەستەرەن: جۆرە گوڵەباخێکی تایبەتە، ژمارەی پەڕەی گوڵەکانی کەم و شاشن.

«وەفایی» ناوی گوڵی «نەستەرەن»ی بەمجۆرە هێناوە:

جیلوەی سەبا، لەهجەی شەماڵ؛ بۆی زوڵف و خاڵی یار دەدەن
یا نەوبەهار دێنێ بەبار، مشکی تەتار، بۆی نەستەرەن
«٩٤»



**٢- هەرچەندە کەوا دڵشەکەنیشە، خەمی زوڵفت**
**قوربانی خەمی زوڵفی شکەن، دەر شکەنت بم**

خەمی زوڵف: پێچ و لوولی قژ و بسک.

شکەن دەرشکەن: پێچ و لوولی ناو پێچ و لوولی تر؛ کە مەبەست لە پێچ و لوولی زوڵف و قژە، هەر لە ناو چین و پێچ و زوڵفی کرژ و لوولدا.

**٣- بالآت وەکو نارەوەن و غەبغەبەکەت سێو**
**سەد جار بەفیدای سێوی بەری نارەوەنت بم**

نارەوەن: چەند مانایەکی هەیە: ١- داری هەنار (دهخدا، بەرگی ١٤، ل ٢٢١١١). ٢- دارەبەن، دارەوەن (قەزوان). ٣- جۆرە درەختێکی بالا بەرز و گەورەی لق و پۆپ چڕی گەڵا وردە، لە حەوشە و حەساری زۆر تەکیە و خانەقاکاندا، بەمەبەستی سێبەر ڕووێنراون و بەریان نییە.

«نالی» دەربارەی ئەمجۆرەیان وتوویەتی:

دەس بەندییانە، دێن و دەچن: سەرو و نارەوەن
یا حەلقەیانە، سۆفیی مل خوار و مەندەبوور
«١٩١»

بەڵام ئەو درەختەی «ئەدەب» لێرەدا باسی دەکات، مەبەستی لە «دار هەنار»ە، چونکە هەنار و سێو، وەک شێوە، لە یەکتر نزیکن، بۆیە دەڵێ بەقوربانی بالای وەک دار هەنارت بم، کە لەباتی ئەوەی هەنار بگرێ، سێوی گرتووە.

غەبغەب: ژێر چەناگە.

غەبغەبەکەت سێو: ژێر چەناگەت وەک شێوەی سێو وایە.

«سالم» لەم بارەیەوە دەڵێ:

دڵم؛ دوزدانە بۆ سێبی زەنەخ چوو
لە خەوفا پایی لەغزی، کەوتە ناو چاە
«١٢١»

**٤- فەرمووتە کە: نوتقی منە، وەک نەشئەیی صەهبا**
**قوربانی کەلامی وەکو بادەی کوهەنت بم**

نوتقی من: شیعر و قسەی من.
صەهبا: مەی.
نەشئەیی صەهبا: ئەو کەشوهەوا و ئارەزووە خۆشەی بەهۆی مەیخواردنەوە دروست دەبێ.

بادەی کوهەن: بادە و مەیی کۆن، کە ئەگەر بادەکە «شەراب» بێ، ئەوا تا کۆنتر بێ، چاکترە، بۆیە «ئەدەب» بەدڵبەرەکەی دەڵێ: قوربانی کەلامی وەکو بادەی کوهەنت بم.

واتە: فەرمووبووت کە شیعر و قسەی من، بەلای ئێوەوە ئەوەندە بەتاموچێژ بووە، مەستی کردوویت و بەلاتانەوە وەک کەشوهەوای دوای خواردنەوەی مەی بووە. (لێرەدا دیسانەوە ئەدەب لە زمانی کەسێکی ترەوە، ستایشی شیعری خۆی دەکات).

کەواتە، کە شیعر و قسەی من، وەک بادە مەستت بکەن، ئەوا نیشانەی ئەوەیە تا بادەکەش کۆنتر بێ، ئەندازەی مەستییەکەش خۆشتر و پتر دەبێ؛ کە لەم کاتەدا فەرموودەکەی تۆش، بۆ من، وەک نۆشکردنی بادەی کۆن بوو، کە بەیەکجاریی پێی مەست و سەرخۆش بووم.

**٥- قوربانی جەوابی شەکرئامێزی عیتابت**
**من چم! کە موقابیل بەخیتابی سوخەنت بم!**

شەکرئامێز: ئاوێتە بەشەکر، لەگەڵ شەکردا تێکەڵ.
عیتاب: گلەیی، سەرکۆنە.
موقابیل: بەرابەر، هاوتا، لف (سنە).
سوخەن: قسە و گفتوگۆ.

واتە: قوربانی وەڵامنامەکەت بم، کە گلەییشی تێکەڵ کرابوو و گلەییەکانیشت بۆ من، وەک ئەوە وابوو وەڵامنامەکەت لە شەکر و شیرینیی هەڵکێشرا بێ؛ هەرچەندە من شایانی ئەوە نیم لە بەرابەر هەڵسەنگاندنی تۆدا شتێک بم. (وەک دیارە ئەدەب لەم غەزەلەدا، لەگەڵ شاعیر، یا خوێندەوارێکی گەورەدا بدوێ و باسی شیعری خۆی بەمجۆرە بکات).

«مەحوی» و «وەفایی» هەردوو واژەی «عیتاب» و «خیتاب»یان بەمجۆرە بەکاربردووە:



خیتابت هەر عیتابە، ئەو لەبە بێتە قسە، هەرکەس
موخاتەبتە، دەکا دەر دەم زوبانی گفتوگۆ غایب
«مەحوی، ٥٢»

ئاخر ئەی سوڵتانی خوبان! تا بەکەی نامیهرەبانیی؟!
چاکە مەحرووم نەفەرمووی؛ یا خیتابێ، یا عیتابێ
«وەفایی، ١٧١»

**٦- ئەو ڕۆژە، کە دوو زوڵفی وەکو دوو ڕەسەنم دی**
**زانیم کە دەبێ بەستەیی چاهی زەقەنت بم**

ڕەسەن: ڕەشمە، جڵەو، هەوسار.

واتە: هەر لەو ڕۆژەوەی سەری هەردوو زوڵفەکانتم وەک دوو جڵەو هاتنە پێش چاو، زانیم کە دەبێ ئەسپی ڕۆحم بەجڵەوی هەردوو زوڵفەکانتەوە و لە چاڵی چەناگەتدا ببەسترێتەوە. بەمانایەکی تر: لەو ڕۆژەوە، کە دەزانم سەری زوڵفەکانت، ڕوومەتەکانتیان داپۆشیوە و ڕێی ماچکردنی دەم و لێوتیان لێ گرتووم، بۆم دەرکەوتووە، کە ئەگەر بمەوێ لێت نزیک بکەومەوە و ماچی دەم و لێوت بکەم، دەبێ خۆمیش بۆ ئەوە ئامادە بکەم کە هاوکات گیرۆدەی تاڵی زوڵفەکانیشت دەبم.

«وەفایی» دەڵێ:

گەر تالیبی ماچێکی؛ ئەتۆ لەو دەمە قەندەی
بەو زوڵفە، دەبێ هەروەکو من، خۆت لە ڕەسەن دەی
«١٩٩»

**٧- وەڵلاهی کە بیدەم بەهەموو لەززەتی جەننەت**
**یەکدەم لە سەمەنزاری گوڵ و یاسەمەنت بم**

سەمەن: گوڵی یاسەمین.
سەمەنزار: گوڵجاڕی یاسەمین.

واتە: سوێند بەخودا! کە دەڵێن بەهەشت خۆش و پڕ لە گوڵ و گوڵزارە، من یەک ساتیش لە سەیری گوڵی جوانیت، بەهەموو باخی بەهەشت ناگۆڕمەوە.

**٩- عیشقی «ئەدەب» و تەلعەتی تۆ؛ کاری خودایین**
**تۆ؛ وەک: بتی زیبای و دەبێ من: شەمەنت بم**

شەمەن: بتپەرستانی ئایینی بودایی و بەرەهمەنی.

واتە: دڵداریی من و تۆ، فرمانێکی خودایی و ئاسمانییە، چونکە هەردووکمان پەروەردگاری خودایین و تۆ: بتی بودایی و منیش: بتپەرستم و دەبێ کارم هەر پەرستنی تۆ بێ.



**٥٥**

کێش: بەحری هەزەج موسەددەس مەقبووز: (مفاعیلن مفاعیلن فعولن) وەک نموونەی:

١- وەرە خانم بکوژ بەستە، ب خەنجەر
«مەلێ» ئەمما ب دەستێ خوەی موبارەک
«مەلای جزیری، ٣٧٨»

٢- دەروونم پڕ کەباب و دەردە بێ تۆ
دڵم؛ گەرم و هەناسەم سەردە بێ تۆ
«نالی، ٣٧٩»

٣- دەروون زامدار و دڵ غەمگینە بێ تۆ
سەرم گێژ و تەنم بێ تینە بێ تۆ
«کوردی»

٤- بەسەر گوڵدا، لە شانەت دڵ دەبارێ
قەزا بۆ دڵ، لەسەر سونبول دەبارێ
«سالم، ١٤٤»

**٢- جودایی تۆ، قەراری لێمە هەڵگرت**
**بەدەستی خۆم نەماوە ئیختیارم**

قەراری لێمە هەڵگرت: سەبر و ئارامی لێ سەندم.

ئیختیار: دەسەڵات.

**٣- نە ساتێ غەمڕەوێنی دێتە باوەش**
**نە ساتێ هەمدەمێکی غەمگوسارم**

غەمگوسار: غەمڕەوێن.

**٤- نە ساتێ مەهوەشێکی نازەنینم**
**نە ساتێ دڵبەرێکی نازدارم**

مەهوەش: جوانی وەک مانگ، دڵبەری شۆخ و شەنگی وەک مانگ جوان.

**٥- نیگارا! تاکەی ئەو خەشم و عیتابە**
**نیگاهی ئاخـری، بۆ حـاڵی زارم**

نیگارا: بانگەوازی یارە.

خەشم: قین و ڕق لە دڵدا هەڵگرتن.

نیگاهی ئاخری: دوایین نوارین بۆم بنواڕە، بۆ دوایین جار سەیرم بکە. نوارین و سەرنجی پێش مردن.

**٦- وەرە جارێ بەدیدەن خەستە حاڵان**
**کە یەکجارت بەدیدەن ئینتیزارم**

خەستە حاڵان: ئەو عاشقانەت، کە نەخۆشیی ئەوینی تۆن.

کە یەکجارت بەدیدەن ئینتیزارم: هەر چاوەنوارتم، بۆ تەنیا جارێک چاوم پێت بکەوێ.

**٧- بەدیدارت قەسەم، بەو میهری دیدار**
**وەکـو: زوڵفت پەرێشـان ڕۆژگـارم**

میهری دیدار: هەتاوی دیدەنی.

پەرێشان ڕۆژگارم: ڕۆژەکانی ژیانم وەکو قژە تێک ئاڵاوەکەت، ئاڵۆز و شێواوە.

**٨- نە هەر میهرم لە تۆ مەنزوورە جانا!**
**بە قـەهریشت، ئەمن مننەت گوزارم**

میهر: میهرەبانی، دڵنەوایی، سۆز.

لە تۆ مەنزوورە: لە تۆ چاوەنواڕم، لە تۆم داوایە، لە تۆم هیوایە.

مننەت گوزارم: زۆری پێ دەزانم، زۆر منەتبار دەبم پێیی، زۆر سوپاسگوزارت دەبم.

واتە: بەتەنیا هەر مەبەستم ئەوە نییە؛ تا هەر میهرەبانیی و دڵنەواییم بەرامبەر بنوێنیت، بەڵکو بەڕق و کینە و تووڕەبوونیشت هەر ڕازیم، چونکە بەهەموو شتێکت ڕازیم و هەرچی لای تۆوە بێت، بۆ من شیرینە.

«مەولەوی تاوەگۆزی» دەڵێ:



مەظەننەت چێشەن؛ منیچ بەو تەورە
ئەر مەیلەن مەیلەن؛ ئەر جەورەن جەورە
«٢٢٩»

**٩- ئەگەر جانم؛ بەهای ماچی لەبت دا**
**لە مزجاتی بیزاعەت شەرمەزارم**

مزجات: لە دوو بەشی (مز + جات) پێکهاتووە، کە «مز» بەتەنیا بەمانای نرخ، بەها و «جات»یش کۆی نرخەکانە، وەک دەڵێین: میوە و میوەجات؛ سەوزە و سەوزەجات و...

بیزاعەت (بضاعت): شمەک، کەلوپەل، کەرەسە.

واتە: ئەگەر لە بەرامبەر بەهای ماچێکتدا، هەر ڕۆح شک بەرم، ئەوە زۆر شەرمەزارم، کە سەرمایەکەم شتێکی وا بەنرخ نییە، کە شایانی ئەوە بێت لە بەرامبەر ماچێکتدا بیبەخشم.

«نالی» دەڵێ:

قیمەتی ماچی؛ دوو سەد کیسەیی ساغە و نیمە
غەیری یەک کیسەیی سەد پارە، لە گیرفانمدا[1]
«٩١»

**١٢- ئەتۆی مورغی غەزەلخوانی ڕیازم**
**ئەتۆی کەبکی خەرامانی نسارم**

مورغ: باڵندە، مەل.

غەزەلخوان: غەزەلخوێن، مەلی بەچریکە، مەلی دەنگ خۆش.

ڕیاز: باخ، گوڵشەن.

کەبک: کەو.

خەرامان: سەوڵ، سەروو (مەبەست لە بەرزایی باڵای یارە).

نسار: ئەو شوێنە بەرز و نەدیوانەی هەتاو نایانگرێتەوە.

واتە: تۆ ئەو باڵندەیەی منیت، کە لە باخەکەمدا دەخوێنی و دەچریکێنی و ئەو کەوەیت لە جێگە بەرز و نەدیوەکاندا بۆم دەقاسپێنی.

---

(١) کیسەیی سەد پارە: مەبەست لە «جگەر»ی پارچە پارچە بووی خۆیەتی.

**١٣- ئەتۆی تازە شکۆفەی گوڵشـەنی مە**
**ئەتۆی نەورەسـتە خونچەی لالەزارم**

شکۆفە: گۆپکە، چرۆ.

نەورەستە: تازە پێگەیشتوو، فەریک، ساوا، کۆرپە.

لالەزار: لە دوو بەشی (لالە + زار) پێکهـاتووە، کە «لالـە» بەمـانـای گـوڵاڵەسـوورە و «زار»یش لێرەدا بەمانای «جاڕ» دێت و پێکەوە دەبنە: گوڵجاڕی گوڵاڵەسوورە.

واتە: تۆ؛ چرۆی کۆرپە و تازە دەرهاتووی ناو گوڵجاڕی منیت و هەر تۆش تازە خونچەی ساوای ناو گوڵجاڕی گوڵاڵەسوورەی منیت.

**١٤- ئەتۆی شەمعی شەبستانی بیساتم**
**ئەتۆی ماهی درەخشانی حەسارم**

شەمع: مۆم.

شەبستان (یان: شەبوستان): جێگەی خەوی ماڵانی دەسەڵاتداران، ڕاڕەوی مزگەوتی بنمیچدار... بەڵام مەبەستی «ئەدەب» هەر جێگەی خەو و بەشی حەرەمی ماڵەوەیە.

ماهی درەخشان: مانگی بەتریفە و گەشەدار.

حەسار: حەوشە.

واتە: تۆ، مـۆمی ژووری خـەومی و هەر تۆش مـانگی ڕووناک و تریفـەدار و خەرمانەبەخشی حەوشەی ماڵەکەمی.





کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن) وەک نموونەی:

١- کـە خـاکـی؛ خـاکـی دامـەن بە، وەگـەر نا تۆزی بەربادی
کـە ئاوی؛ ئاوی گـەوهەر بە، وەگەرنا بڵـقی سـەر ئاوی
«نالی، ٦٨٣»

٢- شەهیدی عەشقم و مەمشۆن، کفنم بۆ مەکەن یاران!
گەواهی حەشرە بۆ دەعوای شەهادەت: بەرگی خوێنیم
«کوردی»

٣- لە ترسی قـەهری تۆ، ڕەببی خـەریکی شین و گـریانم
جگەر خوێنین و دڵ غەمگین و شێت و وێت و عوریانم
«حەمدی، ٦٤»

**١- بەتیـری غـەمـزەیی جادووی دڵارامێ بریندارم**
**بەنازی چەشمی غەممازی گوڵئەندامێ گرفتارم**

واتە: زامدار و گیرۆدەی تیری چاوی جادووگەرانەی دڵبەرێکی نازەنینم، کە چاوی پڕ لە نازە و هەموو ئەندامی جەستەشی لە گوڵ دەچێ.

**٢- نە کەس بۆ زەخمی پڕ ئێشم لە فیکری مەرهەمێ دایە**
**نە کەس جارێ بەحاڵی زارمە دەمساز و غەمخوارم**

واتە: کەسێکیش لە بیری ئەوەدا نییە دەرمانێک بۆ ئەم زامە بەسوێیەم پەیدا بکات و نە کەسیش ئاگای لە گریانمە و دەبێتە هاوڕاز و هاوخەمم.

**٣- مەگەر جارێ بەمیهری تەلعەتی، دوو دیدە ڕۆشن کەم**
**شەوێ تا ڕۆژ، وەکو ئەختەر، بەیادی سوبح بێدارم**

واتە: هەر بەم زامەوە، وەک ئەستێرە، چۆن هەموو شەو تا بەیانی، بەیادی دەرکەوتنی هەتاوەوە، بەئاسمانەوە ئێشک دەگرێ و بەهیوایە چاوی بەتیشکی هەتاو ڕۆشن بکاتەوە، منیش هەر چاوەنواڕی دەرکەوتنی هەتاوی ڕوخساری یارم.

**٤- شەو و ڕۆژم نییە یەکدەم، قەرار و سەبر و ئاسایش**
**دەمێ ناڵەم لە دەوران و دەمێ هیــجــرانی دڵدارم**

واتە: شەو و ڕۆژ، ئارام و ئۆقرەم لێبڕاوە و تاوێک لە دەست زوڵم و ستەمی ڕۆژگار و تاوێکیش لەبەر دووریی دڵبەر، هەر دەناڵێنم.

**٥- ئەگەر جارێ بەخەمباریی، شەوێ چاوم لە خەو ڕاچێ**
**سەحەرگاهان، خەمێکی نەو، لە خەو دەمکا خەبەردارم**

لە خەو ڕاچێ: بچێتە خەو.

خەمێکی نەو: خەمێکی تازە، خەمێکی تر.

واتە: هەر بەم داروبارە خەمبارییەوە، ئەگەر تۆسقاڵێک چاوم بچێتە خەو، کەچی دیسانەوە لە بەرەبەیاندا خەمێکی تازەتر لە خەوم دەکا و پەژارەی تازەم بۆ دروست دەکات.

**٦- خودا چبکەم! لە دەست جەوری سپێهیری دەهری بەدگەوهەر**
**نەبوو ساتێ کە فاریغ بێ لە عیشقی، ڕەنج و ئازارم**

سپێهیر: ئاسمان، گەردوون، فەلەک.

دەهر: ڕۆژگار.

بەدگەوهەر: ناڕەسەن.

فارغ: خاڵیی، بۆش، پووچ.

واتە: خودایە! لە دەست ستەمی ئەم ئاسمان و ڕۆژگارە ناڕەسەنە چبکەم؟! کە نایەڵێ ساتێک لەم ئەوینەمدا، بەبێ ئازار و دەردەسەر و چەلەمە، بەسەربەرم!.

**٧- ئەگەرچی شوهرەتە دنیا، سەرای عەدل و موکافاتە**
**بەبێ جورم و گوناهێ بوو، بەهەر جۆرێ سزاوارم**

شوهرەت: بەناوبانگ، ناودار.

سەرا: شوێنی گەورە و فراوان.

عەدل: داد.

موکافات: سزا.



جورم: تاوان.

سزاوار: شایان.

واتە: هەرچەندە بڵاوە؛ کە ئەم دنیایە تاقیگەی داد و سزا و تۆڵەیە، کەچی بێ ئەوەی هیچ تاوانێکم کردبێ، بۆچی شایانی ئەم هەموو سزا و تۆڵە لێکردنەوەیەم!؟.

**٨- جەزای کوفری «انا الحق» بوو، ئەگەر «مەنصوور»ی بێ سەر بوو**
**بەناحەق، بێ «انا الحق»، بۆ لە جێی مەنصوور؛ لەسەردارم!؟**

واتە: ئەگەر تاوانی لە سێدارەدانی «حسەینی کوڕی مەنصوور – کە دواتر بە: حەللاج ناسرا» ئەوە بووبێ خۆی گەیاندبووە پلەی مەزنی خوداوەند و دەیوت: من حەقم، واتە: من خودام! بەڵام خۆ من قسەی وام نەکردووە، کەچی لەجیاتی و لە جێی مەنصوور، من لە سێدارە دەدەن!.

**٩- ئەگەر هەوری قەزا، بەردیش بەسەر مندا ببارێنێ**
**لە وەختی داد خواهیدا، موسەللەم من خەتابارم**

هەوری قەزا: هەوری بەڵا.

دادخواهی: لێپرسینەوە (دهخدا، بەرگی ٧، ل ١٠٢٤٦).

موسەللەم: بێ سێ و دوو، بێ گومان و بێ شک.

واتە: ئەگەر هەوری بەڵا (واتە: قەزاوقەدەری خودا) بەردیش بەسەرمدا ببارێنێ و من هیچ تاوانێکیشم نەکردبێ، کەچی ئەوەندە کڵۆڵم، لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا، لەباتی بەهانامەوە هاتن، هێشتا من بەتاوانبار دادەنرێم.

**١٠- درەخشی گەوهەرم، باعیس بەکەسری گەوهەری زاتە**
**هونەر مایەی خراپیی کاخی هەستی وەک سنێمارم**

درەخش: پڕشنگدانەوە، ڕووناکی بەخشین (دهخدا، بەرگی ٧، ل ١٠٥٧٤).

باعیس (باعث): هۆ، سۆنگە.

کەسر: شکان.

کاخ: تەلار، کۆشک.

سنێمار: تەلارسازێکی ڕۆمی بوو، تەلاری «خەوەرنەق، یان: خۆرنق»ی بۆ: «نەعمان

کوڕی مونذیر» دروست کرد. تەلارەکە زۆر ناوازە و تاک بوو. ڕەنگی تەلارەکە بەپێی سووڕانی ڕۆژ و شەو، بەڕەنگی جیا جیا دەگۆڕدرا: لە بەرەبەیاندا ڕەنگی خۆڵەمێشی و لە نیوەڕۆدا ڕەنگی سپی و لە عەسریشدا ڕەنگی زەرد دەبوو... لە دوای تەواوکردنی نەعمان خەڵات و پاداشێکی گەورەی بەسنیمار بەخشی و نیعمەتی زۆری بەسەردا باراند. لە کاتی ئەم خەڵات پێ بەخشینەدا، سنیمار ئەوەندە دڵخۆش بوو، لەبەر خۆیەوە وتی: ئەگەر بمزانیبایە بەمجۆرە خەڵات دەکرێم، بەجۆرێکم دروست دەکرد، بەگوێرەی سووڕانی هەتاو، تەلارەکەش ڕووەو خۆر بسووڕایەتەوە. نەعمان کە گوێی لەمە بوو، گومانی ئەوەی لا دروست بوو؛ نەوەک ڕۆژێ لە ڕۆژان تەلارێکی لەوجۆرە بۆ کەسێکی تر دروست بکات؛ لەبەرئەوە فرمانی دا: سنیمار لە تەلارەکەوە فڕێ بدەنە خوارەوە و بمرێ... بۆیە خەڵاتەکەی سنیمار لە ناو عەرەبدا بۆتە پەند. (دهخدا، بەرگی ٩، ل ١٣٨١٣).

واتە: درەوشانەوەی گەوهەری بەهرە و هونەرەکەم بوونەتە سۆنگەی دەردەسەریی و کێشە و چەڵەمە بۆم، هەروەک چۆن هونەری باڵای تەلارسازیی سنیمار، بووە سۆنگەی کوشتن و لەناوبردنی خودی سنیمار... منیش کە لەم کۆمەڵگە دواکەوتووەدا هەرچیم بەسەر دێت، ئەنجامی دەسەڵاتی بەهرە و هونەرە باڵاکەمە، کە خەڵکانی دەورووپشتم شتی وایان لە دەست نایەت، بۆیە تەقەللای تەنگ پێ هەڵچنینم و سووکایەتی و لەناوبردنم دەکەن.

«گۆران» لە پەراوێزی ئەمجۆرە خەمانەی بەهرەداراندا دەڵێ:

بەڵێ دیارە، لە ناو قەومی بەسیتا، قەدری سنعەتکار
وەکو عەکسی قەمەر وایە، لە ناو گۆمێکی لیخندا
«١١٩»

**١١- لە مەسجیدیان وەدەرنام و بەکەعبەش دەستڕەسی نابم**
**«ئەدەب»! با بێینەوە بتخانە، خزمەت پیر و زننارم**

واتە: هەر بەهۆی ئەو سەرمایەی بەهرەیەمەوە، تێم نەگەیشتن و بەکافریان، دانام و لە مزگەوتیان دەرکردم و دەستیشم بەکەعبە ڕاناگا؛ لەبەرئەوە پاکانە بۆ ئەم کۆمەڵگە دواکەوتووە ناکەم و ملیان بۆ نادەم، تا لێم ببوورن و بیەڵن سەر بەمزگەوتیاندا بکەمەوە، بۆیە باوەڕم بەخۆمە و ئەگەر بەهرەکەم بەرەو کافربوونیشم ببات، هێشتا پەشیمان نیم و لاریم نییە و بەشانازییەوە بتخانە دەکەمە ڕووگە و پیری دیانیش دەکەمە ڕابەر و زوڵفی یاریش دەکەمە زننارم.



(ئەمجۆرە شیعرانەی ئەدەب، نیشانەی ئەوپەڕی متمانە بەخۆبوون و ئەوپەڕی یاخیبوونی «ئەدەب»ە، کە بڕوای بەهەڵکشانی بەهرەی شیعریی خۆی بووە. بۆیە زۆر سەرکەشانە داکۆکییان لێ دەکات و لە هەمان کاتیشدا نیشانەی ئەو هەڵاڵا و هەرا جوانە ڕەخنەییە بووە، کە لە سەرێنی «ئەدەب»دا، لە بارەی شاعیریێتی و شیعری «ئەدەب»ەوە وتراوە.

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن) وەک نموونەی:

١- جەورێ هندێ دێ کشینت هەر کەسێ تاووس دڤێت
گەوهەر و دورا یەتیم بی تەرکی سەر تێتن طەلەب
«مەلای جزیری، ٧٦»

٢- لەشکری ئاهم لەگەڵ جەیشی حەبەش دەعوا دەکا
حیرەتم ماوە؛ کە چۆن ئەو دڵبەرە دڵمی ڕفاند!
«حەریق، ١١٣»

٣- دەستی زاڵم کەوتم و نەم ما هەوای گوڵ عەنبەرم
گوڵ شکا بازاڕی؛ خوێنی بلبلیش کەوتە سەرم
«حەمدی، ١٢٢»

٤- چەرمی ڕووی هێند قایمە، شمشێری میسری نایبڕێ
گەر بەکەوشی کەی؛ دەمێنێ، تا قیامەت نادڕێ
«شێخ ڕەزا، ٢٠٩»

**١- ئەی غەزالەی بێ سەبەب ڕەم کەردەکەی مەهپەیکەرم**
**شۆخی بێ پەیمانەکەی، بێ شەرتەکەی سەوداسەرم**

ڕەم: سڵ، پارێز.

مەهپەیکەر: لە دوو بەشی (مەه + پەیکەر) پێکهاتووە و مەه: بەمانای مانگ و پەیکەر: بەمانای جەستە، لەشولار، تەن دێت و هەردوو بەشەکەش بەسەریەکەوە بەمانای: لەشولار و جەستە، وەک مانگ.

واتە: ئەی ئاسکەکە؛ کە هەموو ئەندامی لەشت لە مانگ دەچێ و لە خۆتەوە و بەبێ هۆ، لێم دوور و بەپارێز و سڵۆک بوویت؛ ئەی ئەو شۆخ و شەنگە بێ بەڵێن و بێ مەرجەی، کە هەموو سەودا و ئەوینی سەری منیت.



**٢- خۆش مەزەی، ناخۆش ئەدای، شیرین کەلامی ترش ڕوو**
**دڵبەرەی، عیشوەگەرەی، جەور ئاوەرەی جادووگەرم**

خۆش مەزە: تام و چێژ خۆش و بەلەززەت.

ناخۆش ئەدا: ئاکار نابەجێ و نالەبار و ناخۆش.

**٣- کەی من و تۆ، شەرتمان وابوو بەبێ یەک هەڵبکەین؟**
**یا دەبوو، کەی من بەبێ تۆ، سەر کەمە سەر بەستەرم!**

بەستەر: نوێنگە، جێگە خەو، نوێنی خەو.

**٤- بۆ گوڵی، تەلعەت گوڵی، ڕوومەت گوڵی، ڕوخسار گوڵ**
**گوڵعوزاری، نازداری، دڵشکاری خودسەرم**

بۆ گوڵ: بۆن و بەرامە وەک گوڵ.

تەلعەت گوڵ: شێوە و ڕووت وەک گوڵ.

گوڵعوزار: وێنە و دیمەنت وەک گوڵ.

خودسەر: ڕەند و بێ دەربەست و سەرکەس. ئەو کەسەی هەر بەقسەی خۆی دەکا و قسەی خۆی دەباتە سەر و لەسەر قسەی خۆی شێلگێرە.

«وەفایی» دەڵێ:

لەبی گوڵ، زاری گوڵ، ئەندامی گوڵ، ڕوخساری گوڵ، بەر گوڵ
هەتاکەی من بڵێم: سەربەستە؛ جەللادم فلانیی بوو؟
«١٠٥»

**٥- گەر عیتابە هەر بەسە، نازە بەسە، جەورە بەسە**
**وا بکە ئاخر چاوەکەم، ئەمنیش بەباری دەربەرم**

واتە: هەر کارێکی دڵڕەقانەم بەرابەر دەنوێنێت، ئەوەندەی تێدا بهێڵەرەوە، تا بەیەکجاریی لەناو نەچم و ژیانم تێدا بمێنێ. چونکە ئەمە لە هەموو یاسایەکی جەنگدا پەیڕەوی ئەوە دەکرێ، کە دوژمنەکەت تا ئەو ئاستە تێک بشکێنێت، کە توانای بەرگریی نەمێنێ و ئیتر دەبێ وازی لێ بهێنێ، تا چارەیەک بۆ بەزینەکەی خۆی دەدۆزێتەوە. هەر «ئەدەب» خۆی، وێنەی تری نزیک بەم سکاڵایانە هەیە:

ئەگەر زیندانە، ئەگەر دارە، ئەگەر بەند
بەسە جانا! عەزابی مە، هەتا چەند؟
«بەیتی ١، شیعری ژمارە ٣٦»

**٦- من کە کوشتەی دەستی یارم، زەحمەتە ڕۆح دەربەرم**
**تاقی ئەبرۆی چاوەکانی، بوونە قاتڵ بۆ سەرم**

ڕۆح دەربەرم: ڕۆح دەربازکردن، گیان ڕزگارکردن لە بەرامبەر ئازار و مەترسییەکی وادا، ئەگەر هەوڵی بەرەنگاربوونەوەی دوژمنەکەت بدەیت، بەرگە ناگریت و دەکوژرێیت، بەڵام کە زانیت توانای بەرگە گرتنت نییە، ئیتر دەبێ نەیەڵێت بکوژرێیت و تەقەللای سەلامەتیی سەری خۆت و دەربازکردنی ڕۆحی خۆت بدەیت.

**٧- شاهی خوبان! تۆ مەڕەنجە؛ لەو گلەییانەی «ئەدەب»**
**تۆ: هەر ئەو شاهی وەفاداری و منیش: فەرمانبەرم**

واتە: ئەی شای هەموو چاکان، لەو گلەیییانەی «ئەدەب» دڵت هیچ نەکا و زویر مەبە، چونکە هەرچی بڵێم، هەر دەردە دڵن و ئەو گلەییانەم هیچ لە خۆشەویستیی تۆ کەم ناکەنەوە؛ چونکە بەلای منەوە، تۆ: هەر شای وەفادارانی و منیش هەر ژێر فەرمانەکانی تۆم.



### ٥٨

کێش: بەحری هەزەج ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)، وەک نموونەی:

١- «نالی» مەبە عاجز، کە ئەمە دەورە، نەجەورە
ساقی کەرەمی یەک بەیەکە و نەوبە بەنەوبە
«نالی، ٣٩٣»
٢- خواستم لە کوڕی حاجی غەفوور: کۆنە دوکانێ
بۆ تەجرەبە نەیدایە من و دای بەدیانێ
«شێخ ڕەزا، ٢٠٥»
٣- سەودایی سەری زوڵفە، بەدایيم لە سەرمدا
ئیمکانی نییە، قەطعی خەیاڵە لە سەرمدا
«حەمدی، ٢٠٨»

**١- ئەی یادی لەبت، هەمدەمی شەوگاری درازم**
**وەی زوڵفی خەمت، یەک بەیەکی مەحرەمی ڕازم**

واتە: ئەی ئەو کەسەی ویرد و یادی هەمیشەی شەوانی درێژم، هەر خۆت هاودەمی منیت و تاڵ تاڵی زوڵفت و پەلکە لوولەکانت، هاوڕازمن و لەگەڵ هەر تاڵێکیاندا، قسەی تایبەتی و ڕازی جیا جیام هەیە.

**٢- شەوگارە لە خەودا، بەخەیاڵی ڕوح و گێسووت**
**گا مەجمەرە ئەفروز و دەمێ چەنبەرە سازم**

ئەفروز: گەشاندنەوە، گەشکردنەوە، سووتان.

واتە: لەو شەوگارە درێژانەدا، کە بەهوشیاریی هەر یادت دەکەم، خۆ ئەگەریش تاوێک خەو بچێتە چاوم، ئەوا لە خەونیشمدا بۆ ئەوەی شتێکی وەک شێوەی ڕوخسارت دروست بکەم و بیسازێنم، ئەوا مەقەڵی و ئاگردان (کە وەک ڕوومەتەکانت گەرم و گەشە) دەگەشێنمەوە و بەیادی پەلکەکانیشتەوە (کە پێچ پێچ و ئەڵقە ئەڵقەن) هەر شتی وەک بازنەیی و کەوانیی دەسازێنم.

**٣- تیری موژە: دڵدۆز و خەمی هیجرە: جگەرسۆز**
**تۆ خۆت بدە ئینساف، لەگەڵ کێهە بسازم؟**

دڵدۆز: دڵ ئەنگێو، دڵ پێک.

کێهە: کام، کێ، کامیان!.

واتە: تیـری مژۆڵەکانت دڵ دەپێکن و پەژارە و خـەمی دووریشت، جگەر داخ دەکـەن. باشە ئەگەر خۆت سەرپشک بکەم، تا لە نێوان ئەم دوو ئازارەمدا؛ یەکێکیان هەڵبژێرم و بیکەمە هاوڕێم، کامیان هەڵدەبژێریت؟. یان بەلای تۆوە کام ئازاریانت پەسەندە، تا بیکەمە هاوڕێم؟!.

**٤- هەرچەندە برا پایی ئومێدم لە جەنابت**
**دیسان بەسەری زوڵفەوەیە: دەستی نیازم**

واتە: ئەگەرچی ئیتر دەزانم تۆ خۆت هیچ بەهاوارمەوە نایەیت و خۆزگەکانم جێبەجێ ناکەیت و بێ هیوام دەکەیت و وام لێ دەکەیت هیوام پێت نەمێنێ، تا بەهۆیەوە بێم بۆ لات؛ کەچی لەگەڵ ئەمانەشدا دەستی خۆزگە و هیواکانم هەر بۆ سەری زوڵف و پەلکەکانت درێژ دەکەم و هەر ئەوانم لە دەستەکانمەوە ئاڵاندووە.

**٥- میهری ڕوخی زیبات بەئەفسانەیی زاهید**
**دەرناچێ لە دڵ، زەحمەتی بێهوودە؛ چ لازم؟!**

واتە: پرشنگت و ڕووناکایی هەتاوی ڕوخساری جوانت، ئەوەندە قووڵ ڕۆ چۆتە ناخمەوە، بەئامۆژگاریی و ڕێنوێنی و خەریکبوونی زاهید لەگەڵمدا، بۆ وازهێنان و دوورکەوتنەوە لێت و دەست لێ بەرداربوونت، دادێکی زاهید نادات و لە خۆڕاییی خۆی پێمەوە ماندوو کردووە.

**٦- مەحکوومیی بەندە؛ بەشەهان ڕەسمە، بەڵا من**
**مەحموودم و بەندەیی سەری دوو زوڵفی «ئەیاز»م**

واتە: ئەگەرچی ڕێسای ژیان و ڕەوشت و خوو، وا پێویست دەکات کە: «بەندە» و «ڕەعیەت» هەر دەبێ پابەندی شاهانی خۆیان بن، کەچی ئەزموونەکەی من و یار، بەپێچەوانەی ئەم ڕەوشت و ڕێسایەوەیە و من بوومەتە «سوڵتان مەحموودی غەزنەوی» و



هەر خۆمیش بوومەتە «بەندە» و «نۆکەر»ی هەردوو زوڵف و پەلکەکانی «ئەیاز»ی دڵبەرم!... واتە: مادام من خاوەنی زوڵفەکانی دڵبەرم؛ کە زوڵف وەک تاجی سوڵتان و شاهانە، بەتەوقی سەریەوەیە ئەوا من خاوەنی تاجی شاهانە و مادامیش زوڵفەکە، بەسەری یارەوەیە و دەبێ گیرۆدە و پابەندی زوڵفەکانی بم، ئەوا هەر خۆمیش بوومەتە «بەندە» و «نۆکەر»ی ئەیازی دڵبەرم!.

(ئەگەرچی ناوی سوڵتان مەحموودی غەزنەوی و ئەیازی وەزیری، لە شیعر و ئەفسانەی کوردیدا زۆر دووبارە بوونەتەوە، بەڵام ئەمجۆرە بەکارهێنانەی ناوی سوڵتان مەحموود و ئەیازی وەزیری، وێنەی زۆر ناوازە و بیر و سەلیقەی زۆر جیاوازن، کە «ئەدەب» دەیانسازێنێ).

**٧- کەعبەی ئەمەلی ئەهلی وەفا، تۆی بەحەقیقەت**
**بنواڕە من و ڕەنجی بیابانی «حیجاز»م**

واتە: ئەگەر ڕووگەی هەموو موسڵمان و هەموو ئاواتێکیان حەجکردنیان، هەر ڕووەو «حیجاز» بێ و بەچوونیان بۆ «حیجاز» حەجیان جێبەجێ قبووڵ بێ، کەچی کار و پیشەی من، هەر ڕێگە پێوانی «حیجاز»ی ڕووی تۆیە و هیچیشم بۆ قبووڵ ناکەیت! چونکە هەرچی دێمە نزیکت (دەگەمە حیجازی ڕوخسارت) ڕووم نادەیتێ... یان ڕووم لێ وەردەگێڕیت.

«سالم» دەڵێ:

قبووڵ نابێ حەجی کەعبەی ویساڵت
ئەگەر دڵ حەڵقەیی ئەو زوڵفە بەردا
«٢٠»

«گۆران»دەڵێ:

زنجیری زوڵف و چاڵی زەنەخ وا لە ڕێگەیا
کێ لەو حیجازی حوسنە، ئومێدی تەوافیە؟!
«٦٤»

لە فۆلکلۆری کوردیشدا هاتووە:

کابەی حاجییەکان لەولای شامەوە
کابەی من: هەر تۆیت، لە پەنامەوە

**٨- بەم تەرزە، کە تیرت لە دڵی مە گوزەری کرد**
**زیبــەندەیە بەو شــەســتی کــەمــانداره بنازم**

شەست: پەنجەی گەورەی دەست. قولاپی ڕاو، بازنە. بەڵام مەبەستی «ئەدەب» لێرەدا: پەنجە گەورەی دەستە؛ کە بۆ تیر هاویشتن بەکاری دەهێنن.

زیبەندەیە: شایان، لێهاتوو.

واتە: بەوجۆرەی کە ئەوەندە دەست ڕاست و ئەنگێویت و تیرت دڵم ئەمدیو دیو دەکات، شایانی ئەوەیت شانازیی زۆرت پێوە بکەم، چونکە لە سەرێکەوە زۆر ئەنگێویت و لە سەرێکی تریشەوە، ئەوەندە بەناوبانگ و تاقانەیت؛ بۆ من شانازییە ئەگەر شایانی ئەوە بم، بەو قامک و تیرەی دەستی تۆ، بپێکرێم.

**٩- هەر تاوە بەڕەنگێ خـــۆ دەنوێنی**
**هاوارە لە نەیرەنگی بتی شوعبەدەبازم**

نەیرەنگ: فێڵ و تەڵەکە، جادوو، یەکەمین هێڵکاریی سەرەتای نیگارکێش؛ بەڵام «ئەدەب» ئەم مانایەی دواییانی مەبەست نییە.

شوعبەدەباز: قومارباز، تەردەست، فریودەر، چاوبەست.

واتە: ئەم یارە جادووگەر و فریودەر و چاوبەستە، هەر جارەی بەجۆرێک لە بەرچاومدا خۆی دەردەخات، نازانم چۆنی تێبگەم! بۆیە هەر ئەوەم لە دەست دێت: هاوار لە فێڵ و جادووی بکەم.

«وەفایی» دەڵێ:

عالەم هەموو ڕەنگینە، لەبەر عەکسی جەمالت
هەر ڕەنگە بەڕەنگێکی هەزار ڕەنگە نوێنە
«١٤٧»



٥٩

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم: (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)، وەک نموونەی:

١- ب نارێ فورقەتێ سوهتم، ژ فەرقێ سەر حەتا پێ دا
خەدەنگا غەفلەتێ نوهتم، ژ بەرقا لامعا تێدا
«مەلای جزیری، ١٠٧»

٢- ڕەفیقی کونجی میحنەت، عاجزن هەر شەو لە ناڵینم
بزانن گەر لەبەر لێشاوی بەحری مەوجی ئەسرینم
«کوردی»

٣- من و بادی سەحەر، یاران عەجایب بێ قەرارێکین
بەسەرگەردانیا هەردوو، دەڵێی مەشغوولی کارێکین
«سالم، ٩٦»

٤- وەکو ڕۆژێ لە مەغریب یەخە دابدڕێت و سەر دەرخا
قیامەت هەڵدەسێ وەک سوبحی مەحشەر،سینە گەر دەرخا
«حەمدی، ١٨٩»

**١- شکاری چەشمی ئاهووتە، دڵی دایم بریندارم**
**ئەسیری حەلقەیی مووتە، لەشی ڕەنجوور و بیمارم**
**کوژاوی نووکی پەیکانی سەفی موژگانی خونخوارم**
**لە ئێشی زەخمی خۆم دایم، فەغان و ناڵەیە کارم**
**شەوێ تا ڕۆژ لە هیجرانت، بەزاری و گریە بێدارم**

شکار: ڕاو، نێچیر.

کوژاو: کوژراو، «نالی»ش «کوژراو»ی وەک ئەمجۆرەی «ئەدەب» بە«کوژاو» بەکار هێناوە:

ئەتۆ: شا، من: گەدا، دادم بپرسە
لە زوڵمی چاوی بیمارت کوژاوم
«٢٩٣»

سەفی موژگان: ڕیز و پۆلی برژانگ.

خونخوار: خوێنخۆر.

فەغان: ناڵە و هاوار و داد و بێداد.

**٢- دەروون وەک: نەی، دەناڵێنێ، بەزاری خۆی، لە دەستی تۆ**
**مەگەر باتین لە هاوارم دڵێک و چاوی مەستی تۆ**
**دڵی سادە پەرستی من ............. پەرستی تۆ**
**لە سەد جێگە بریندارە، بەتیری شەستی دەستی تۆ**
**لە زەخمی تیری دڵدۆزت؛ هەتاکو حەشرە هاوارم**

باتین: ناوەوە، قووڵایی.

شەست: پەنجە گەورە، لە تیروکەواندا بەو جێیە دەڵێن، کە تیری بۆ هاویشتن تێدەخەن.

دڵدۆزت: دڵ ئەنگێوت، دڵ پێکەرت.

**٣- لە تاوی ڕەنگی گوڵگوونت، بەئاوی ئەشکی گوڵگوونم**
**لە ئاوی دیدەیی تارم، بەدامەن: ڕوودی جەیحوونم**
**ئەگەر گەبرم، ئەگەر تەرسا و گەر گومڕاهـ و مەلعوونم**
**شەمەن ئاسا، بتی زیبا! بەخاکی پات مەفتوونم**
**دوو ئەبرۆت: تاقی میحرابم، خەمی........... نارم**

گوڵگوون: گوڵ ئاسا، وەک گوڵ.

ڕوود: ڕووبار.

جەیحوون: ناوی ڕووباری «بەڵخ»، یان: «ئامووییە»یە، کە لە «پامیر»ەوە سەرچاوە دەگرێ و بەتورکستاندا تێپەڕ دەبێ و دوای پاراوکردنی ناوچەی «خێوە»، لە زەریاچەی «ئاراڵ» دەڕژێ. (دهخدا، بەرگی ٥، ل ٧٩٣٦).

گەبر: گاور، زەرتوشتی (ناموسڵمان).

تەرسا: مەسیحی.

گومڕاهـ: ڕێ لێ ونبوو، سەرلێشێواو.

مەلعوون: نەفرەت لێکراو.



شەمەن: بتپەرست، ئەوانەی بت دەپەرستن؛ ئەم واژەیە لە سەنسکریتیدا لە «سەرمەنە»وە وەرگیراوە و بەو کەسانە دەڵێن کە دەستبەرداری ماڵ و حاڵ و خێزان و کەسوکار دەبن و بەگۆشەگیریی خواپەرستی دەکەن و ژیان بەسەر دەبەن. (دهخدا، بەرگی ١٠، ل ١٤٥٠٠).

مەفتوون: شەیدا، شێت.

**٤- سەراپا غەرق و پاماڵم، لەسەر گێسوویی پاماڵت**
**خەراب و مەست و مەخموورم، لە غەمزەی چاوەکەی کاڵت**
**قەسەم بەو خاڵی مسکینت، لەسەر دوو کوڵمەیی ئاڵت**
**وەکو پەرگارە؛ سەرگەردان، بەدەوری نوقتەکەی خاڵت**
**دڵی حەیران و سەرگەشتەی جەفابەردار و خەمبارم**

پاماڵ: پێشێل، ئەو شتانەی بەپێ دەشێلێنرێن، پێ پەست، واتە: بەپێ بپەسترێتەوە، یان: بەپێ ڕاماڵدرێ.

«پیرەمێرد» دەڵێ:

**چەند ساڵ، گوڵی هیوای ئێمە، پێ پەست بوو تاکو پار**

خاڵی موشکینت: خاڵی وەک مسک بۆن خۆشت، یان: خاڵی جوان وەک دەنکی مسک.

پەرگار: پەرگاڵ.

سەرگەشتە: وێڵ و لانەواز.

**٥- بەنەفشەی پەرچەمی نیلی، کە بەر ڕووی نەستەرەن پەخشە**
**سەوادی زەرگەری ڕووسە، لەسەر سوخمەی تەلا نەقشە**
**لە گەردن نوقرەیی خام و لە گۆشت زێری بێ غەشە**
**وەکو «سیجاب»ە سینەی تۆ، بەلا سیجابی بێ ڕەعشە**
**.................................................. ئاتەشی نارم**

بەنەفشە: وەنەوشە.

نیلی: وەک ڕەنگی خوم.

نەستەرەن: گوڵەباخ.

سەواد: خوێندەواریی.
زەڕگەر: زێڕینگەر.
نوقرە: زیو.
گۆش: گوێچکە.
سیجاب: سنجاب، سمۆرە.
ڕەعشە: موچوڕکە.

**٦- دڵم گریانە بۆ غونچەی دەهانی نیمە خەندانی**
**هەزاران ئەشکی خوێنینم، بەخاری کەوتە دامانی**
**بەدایم ئەشک ئەفشانم، لە طوڕەی عەنبەر ئەفشانی**
**لە خاری هیجری گوڵبەرگی تەڕی تازە سوخەندانی**
**وەکو بلبل هەزار ئاوا و گوڕەیی ناڵەیی زارم**

نیمە خەندان: نیوە زەردەخەنە، زەردەخەنەیەکی کەم.
ئەشک: فرمێسک، ئەسرین، ڕۆندک.
خار: دڕک.
گوڵبەرگ: گەڵای گوڵ.
سوخەندان: وتار بێژیی.

**٧- خەس و خاشاکی ڕێگاکەم، بەموژگانی وەفا ماڵی**
**غوبار و گەردی دەرگاکەم، بەئاوی دیدە ڕاماڵی**
**گەداسان چیهرەیی سیدقم بەحەزرەت پاشا ماڵی**
**لە خاکی ڕێگەکەی کەوتم، کە بەڵکم ببمە پاماڵی**
**(......)[1] تالعم سەعدە، لە شوومیی بەختی خۆم، یارم**

خەس: دڕک.
خاشاک: دڕک و داڵ.

(١): لەم جێیەدا واژەیەکی وەکو: بنوارە و شتێک نزیک بەو ڕێنووسە هەبوو، کە بەتەواوی بۆم ساغ نەکرایەوە. هەرچەندە ئەگەر «بنوارە» بووایە، مانای ڕشتەکەی تەواو نەدەکرد.



گەداسان: گەدا ئاسا، وەک گەدا (سواڵکەر).
تالعم سەعدە: بەختم چاکە، بەختم باش و بەختەوەرم.

**٨- لە دەوری بەدری بێ نەقسی، ئیحاتەی دا، کە دوو گێسوو**
**هیلالی ناخونی لایدا، لەسەر ڕووی مەه، حیجابی موو**
**وەدەرکەوتن سفەت خاڵان، لەسەر ماهی تەمامی ڕوو**
**لە شەودا؛ ڕۆژ تلووعی کرد، سیاهی شەو، فەنا بوو، چوو**
**یەدی بەیزای نواند دیسان، دڵی فیرعەونی سەححارم**

بەدر: مانگ.
نەقس: کەموکووڕیی.
ئیحاتە: پەرژین دراو، گەمارۆدراو، دەورگیراو، ئابڵۆوقەدراو.
ناخون: نینۆک.
مەه: مانگ.
یەدی بەیزا: دەست و مەچەکی سپی (هێمایە بۆ دەست و مەچەکی حەزرەتی مووسا و موعجیزەکانی).

فیرعەون: لە بنەڕەتدا واژەیەکی قیبتی (میسری کۆن)ە؛ بەمانای: خانەی مەزن، ماڵی گەورە، کە مەبەست لە تەلار و کۆشکی پاشا کۆنەکانیان بووە و دواتر ئەم ناوە بۆ هەموو پاشاکانی تریان بۆتە ناو و نازناو. ئەم زنجیرە پاشایە هەزار ساڵ پێش زایین فەرمانڕەوایی میسر و دەوروبەریان کردووە و بەزەبروزەنگ و زۆردار ناسراون. یەکێک لەم فیرعەونانە ڕێکەوتی ڕۆژگاری حەزرەتی مووسا بووە و زۆر دژی مووسا و ئایینەکەی بووە.

**٩- لە گەردن عەقدی مرواری، پەرەنگی لەعلی مومتازی**
**کە جار جارە دەگەڵ عەقرەب، بەتەننازی دەکەن بازی**
**مەلەک کەڕ بوو؛ لەبەر خرمەی، فەلەک لەرزی لە ئاوازی**
**گرفتارە دڵی عالەم، بەنازی چاوی غەممازی**
**دەشێ لەو جەمعەدا بووایەم، بەچاوانی گرفتارم**

عەقد: ملوانکە.
پەرەنگ: پلپلە، پرپرە.

تەنناز: نازەنین.

مەلەک: پەری، فریشتە، حۆری.

**١٠- پەرەنگی دەم عەرەقچینی، بەچەندین لوتف و شیرینی**
**کە ئالۆزن دەگەڵ چینی سەری گێسوویی مشکینی**
**یەکێ تاقە لەسەر ئەبرۆ، یەکێکیان جووتی پرچینی**
**یەکێ دەخزێتە بن جیدی، یەکێ دەڕژێتە پەرچینی**
**لە دەست یەکیان بەئازار و لە دەستی یەک، دڵ ئەفگارم**

عەرەقچین: کڵاو.

جید: گەردن.

ئەفگار: زامدار، ماندوو، شەکەت، ئازار چەشتوو، ئازاراوی.

**١١- لە وەقتێ بەستەیی دامی غەزالی چەشمی سەییادم**
**لە قەید و بەندی دوو عالەم، بەحەمدیللاهی ئازادم**
**لە مولکی عارف و عابید، براوە ڕەبت و ئیسنادم**
**نە جزوی ئەهلی تەدریسم، نە شاگردم، نە ئوستادم**
**نە مەستم من، نە مەخموورم، نە مەدهۆش، نە هوشیارم**

دام: داو.

غەزالی چەشم: ئاسک چاو، چاو وەک ئاسک.

سەییاد (صیاد): ڕاوکار، نێچیرەوان.

عارف و عابید: خواناس و خواپەرست.

ڕەبت: پێوەندی.

ئیسناد: پشتیوان.

جزو (جزء): بەش، دەستە، پۆل، تاقم.

واتە: لەو کاتەوەی پابەندی داوی بسکی کچێکی چاو وەک چاوی ئاسکێکی ڕاوکارم، پێوەندیم بەهەموو دنیاوە (دنیای ئێستا و قیامەت) نەماوە و لە سایەی خواوە لە کۆت و پێوەندی هەردوو جیهان ئازادم. لەم بوارەدا «حافظ» دەڵێ:



بندەی عشقم و از هردو جهان آزادم

«٤٤٣»

لەگەڵ خواناسان و خوا پەرستانیشدا، سەروپەیوەندێکم پێیانەوە نەماوە، نە لە دەستەی مامۆستایانی وانە بێژم و نە قوتابیشم؛ مەست و سەرخۆشیش نیم، بەڵکو شتێکم لەمانە لە هیچیان ناچم، چونکە نە هوشیارم و نە بێ ئاگام.

**١٢- نە پیری مەیکەدە و دەیرم، نە زومرەی مەیگوسارانم**
**نە شێخی مەدرەسە و وەعزم، نە ڕشتەی زوهددارانم**
**نە مەجنوونم، نە فەرهادم، نە وێڵی کۆهسارانم**
**نە دەروێشم، نە سوڵتانم، نە جزوی تاجدارانم**
**قبووڵ کا، گەر شەهی خوبان «ئەدەب» ، هەر بەندەکەی یارم**[1]

پیر: ڕابەر، ڕێنوێن.

مەیکەدە: مەیخانە.

دەیر: کەنیسە.

زومرە: دەستە، تاقم، پۆل.

مەیگوسار: خووگرتوو بەمەی، مەیخۆری هەمیشە.

ڕشتە: دەستە، ڕیز، ملوانکە.

واتە: نە پیری مەیخانە و نە پیری کەنیسام، نە دەستەی ئەوانەم کە بۆ هەمیشە و بەردەوام سەریان کردۆتە سەر مەی خواردنەوە، نە شێخی قوتابخانە و حوجرە و ڕێنوێن و ڕابەری موسڵمانانم و نە لە ڕیزی خواناسانیشدام؛ مەجنوون و فەرهادیش نیم، تا شەیدای چۆڵ و بیابان و چیا بم... دەروێش و سوڵتان نیم و لەوانەش نیم کە تاجی شاهێتی لەسەر دادەنێن، بەڵکو ئەگەر یارم پەسەندم بکات (کە خۆی شای هەموو چاکانە)، ئەوا دەبمەوە ئەو بەندەیەی کە تا ساڵی پاریش هەر «بەندە»ی بووم.

(١) وەک پێشتریش ئاماژەمان پێ کرد؛ ئەم پێنج خشتەکییەی «ئەدەب»مان لای «مق» چنگخست و لە دامێنیشدا ئەم یەک و دوو ڕستەیە نووسرابوون: «حسب الفرمایش جناب مستطاب ملا طه نهری ترقیم و یادداشت گردید... زیادە... تاریخ یوم دوشنبە در قریەی: ارمنی بلاغی». واتە: لەسەر فەرمانی جەنابی مەلا تاهای نەهری یاداشت کرا و نووسرایەوە. مێژووی ڕۆژی دووشەممە، لە گوندی: ئەرمەنی بلاغی.

ئەم دوو بەندەی دوایی ئەم پێنج خشتەکییەی «ئەدەب» نیشانەی جیاوازییەکی دەروونی شاعیران و هونەرمەندانی خاوەن بەهرەی بەرز و بەتوانان، کە لە ناخی خۆیاندا، خۆیان بەجیاواز، یان بەواتەیەکی ڕاستتر: خۆیان بەنامۆی ناو کۆمەڵگاکەیان دەزانن و هەرچی سەرنج دەدەن و بیر دەکەنەوە، لە کەسانی تری ناو کۆمەڵگا ئاساییەکە ناچن. بۆیە چ کۆمەڵگاکە لە بەرچاوی ئەوان نامۆیە و چ خۆیشیان بەکۆمەڵگە نامۆن؛ کە هەر لە ڕاستیشدا وایە و ئاکار و بیری داهێنەران، لە شتە ئاسایی و دیاردە دەقگرتووەکانی کۆمەڵ، جیاواز و نامۆیە. ئەم جیاوازییەش بۆ کەسانی بەهرەدار، هەمیشە مایەی کێشەی دەروونیی و کێشەی کۆمەڵایەتییە، کە «ئەدەب» و شاعیرانی تر، لەم بارە ڕۆحیانەدا، زۆر جار نهێنی شاراوەی دەروونیان درکاندووە. «نالی» وەک نموونەیەکی ئەم بارە دەروونییە وتوویەتی:

١- سایەیی پایە وەکو باڵی هوما و بازی سپیم
نەوەکو بوومی قەدەم شووم و نە هەمڕەنگی قەلم
کەوکەبەی تەلعەتی شاهانەیی تۆم بورهانە
کە لەسەر موددەعی، سوڵتانی موبینە جەدەلم
ڕۆژ: سەری کوڵمتە، ڕووناکیی نووری بەصەرم
شەو: خەمی زوڵفتە، تاریکیی طوولی ئەمەلم
حەرەکاتم: سەکەنات و سەکەناتم: حەرەکات
چوستە، سستی، قەوییە زەعیف و سەریعە کەسەلم
«٢٩٠»

٢- چونکە «نالی» لەسەر ئەم ئەرزە غەریبی وەتەنی
هەستە یاری مەدەنیی بە، مەدەنیی بە، مەدەنیی(*)
«٦٧٤»

(*) نالی نموونەی زۆری لەم بوارەدا هەیە و ئەو دوو نموونەیە، مشتێکن لە خەروارێک.





کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)، وەک نموونەی:

١- نەمزانی فەلەک گۆبەنی هەر بۆ منە، یاخۆ
سەد دەستی وەکو دەستی منی کردووە بەزاغا
«شێخ ڕەزا، ٧»

٢- چاکەم لە کەس نەدیوە، برا مەرحەبا نەبێ
چی دەردەچێ لە کیسە؟ قسەی سادە با نەبێ
«حەمدی، ٣٧٥»

**١- مەستی قەدەحی بادەیی زیبا صەنەمێکم**
**هەر لەحظە لە نەشئەی لەبی، وەک جامی جەمێکم**

قەدەح: پەرداخ، لێوان، ئەو دەفرەی مەی پێ دەخورێتەوە.

زیبا: جوان.

صەنەم: بت.

جامی جەم (یان: جامی جیهانبین): جامی جیهان، جامی جیهان نوێن، پیاڵە، یان ئاوێنەی سلێمان، جامی کەیخەسرەو، چونکە لە «شانامە»دا بەپاڵ کەیخەسرەو دراوە؛ کاسە و جامێکی ئەفسانەییە، گوایە «جەمشید» پاشا هەیبووە و هەر کاتێ ویستبێتی هەواڵ و دەنگوباسی جیهان بزانێ، سەیری ئەو کاسەیەی کردووە و جیهانی تێدا دیوە. یان دەڵێن حەوت تەبەقەی ئاسمانی تێدا دیوە. (دهخدا، بەرگی ٥، ل ٧٣٧٣).

واتە: بەجۆرێک سەرخۆشی بادەی شۆخێکی جوانی وەک بتم، لە یەکەمین قوم و فڕدا، هەوایەکی وا کەوتە کەللەمەوە، وەک چۆن جەمشید و کەیخەسرەو، لە کاسەی جیهان بینەکەی خۆیاندا هەموو جیهانیان دەبینی، منیش ئاوا مەست بووم و لە خۆم دەرچووم و جیهانێکی تری پێ نیشاندام، کە ئەم جیهانە ئاساییەی ئێستامان نەبوو، بەڵکو جیهانێک بوو، کە هەمووی بەچاوی ئاسایی دەبینرا.

**٢- ساتێ کە فروغی مەهی دیداری نەبینم**
**ئەو ساتە مەپرسە؛ کە قەرینی چ غەمێکم**

فروغ: درەوشانەوە.

قەرین: هاوڕێ، نزیک.

واتە: هەر ساتێ کە درەوشانەوە و تریفەی مانگی دیتنی نەبینم، ئەو کاتانە لێم مەپرسە چۆنی! چونکە ئەو ساتە هاوڕێی نزیکی غەمێکم کە باس ناکرێ.

**٣- تا دانەنرێ، غەیری لەسەر مە، کەفی «پا»کەی**
**هەر تاوە وەکو سایە، لە بن هەر قەدەمێکم**

کەفی پا: بەری پێ. قەدەم: پێ.

واتە: تا ئەو کاتەی یار پەسەندم دەکات و ڕازی دەبێ پێیەکم پێدا بنێ، ناچارم ئەوەندە یار بێزار بکەم، تا ئەو ئەندازەیەی کە هەمیشە وا هەست بکات، لە هەموو هەنگاو هەڵنانێکیدا، لە بن پێیدام و ئیتر بۆ ئەوەی خۆی لەم سێبەرە ئەفسانەییەم ڕزگار بکات، دەبێ پێم پێدا بنێ.

**٤- قەت نەبووە شەوێکی بەخەمی کۆنەوە بنووم**
**هەر سوبحدەم ئازوردەیی تازە ستەمێکم**

ئازوردە: دڵڕەنجاو، دڵشکاو.

واتە: هەرگیز ڕووی نەداوە و نەبووە، تا شەوێک لەگەڵ خەمە خووپێگرتوو و ڕاهاتووەکانی خۆمدا بخەوم، چونکە هەر ئەوەندەی چاوم لە خەو ڕادەچێ، خەمێکی تازەم لێ پەیدا دەبێ و پەژارەیەکی نوێم بۆ ساز دەبێ.

«هێمن» دەڵێ:

ئەگەرچی شەو درەنگە، ساقی بۆم تێکە کەمێکی تر
کەوا ئەمشەو سەری هەڵدا لە ناخمدا، خەمێکی تر
«٥١»

هەڵبەتە هەر «ئەدەب» خۆی، وێنەی تری لەم بابەتەی هەیە، وەک «ئەوەی لە شیعری ژمارە «٥٦» بەیتی «٥»دا بوو، کە ئەمەیە:



ئەگەر جارێ بەخەمباریی، شەوێ چاوم لە خەو ڕاچێ
سەحەرگاهان خەمێکی نەو، لە خەو دەمکا خەبەردارم

**٥- هێندەی خەم و چین خستە سەری یەک، غەمی گێسوو**
**نازانم ئەوێستاکە، لە بەندی چ غەمێکم!**

واتە: ژمارەی پێچ و چین و ئەڵقەی قژ و بسکی، ئەوەندە زۆرن و ئەوەندەش خۆم لە ناو تاڵ تاڵیاندا بەزیندانیی دیوە و ئەوەندە خۆم لە داوی یەک دوای یەکیان ڕزگار کردووە، نازانم گەیشتوومەتە زیندانی ژمارە چەند!؟ یان ژمارە ئەڵقە و چینی چەند!؟ یان پێچ و چین و ئەڵقەی قژ و بسکی، ئەوەندەیان جۆری جیا جیای خەم داومەتێ، نازانم ئێستا لە نۆرەی کامە جۆریاندام! چونکە واژەی «خەم» بەهەردوو مانای «پێچ و لوول» و «غەم»یش دێت.

**٦- گەنجێکە خوداداوە، بەوی حوسنی جیهانگیر**
**بەو گەنجە، ئەمن چاوەنواڕی کەرەمێکم**

گەنج: گەوهەر و زێڕ و ئەڵماس و مرواری، سامانی زۆر.

خوداداو: خودا پێ بەخشیو، خودایی.

واتە: ئەم دڵبەرەم، سەرمایەیەکی خوداییە و خوداش بەخشندەیە، بۆیە نازانم من چاوەڕێی چ بەخشینێکی ئەو سامانە دەکەم؟!.

**٧- گەر حاڵی «ئەدەب» بێت و بپرسن لە فیراقت**
**ماوم؛ کەم و بێشێکی، بەڵا: کە (العَدَمْ)ێکم**

کەم و بێش: زۆر و کەم.

کە (العدم)ێکم: وەک شتێکی لە نرخی نەبووانم...

«نالی» زاراوەی «بێش و کەم»ی بەمجۆرە بەکاربردووە:

بێش و کەم، بێ شکەم و حیرص، وەکو تیفلی ڕەضیع
زاوییە بێشکەم و بێ شکم و بێ حەیەلم
«٢٩١»

واتە: لە بارەی دووربییەوە هەواڵی «ئەدەب» دەپرسن، لە وەرامدا پێتان دەڵێم: ماوم؛ بەڵام ئەو مانە، وەک شێوە نەماوێکم.

## ٦١

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزوف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن) وەک نموونەی:

١- هەر لەبت، یا سینەشت هەردوو بەدەرخە، دا بڵێین
لەعلی ڕوممانی هەیە، یا لەعل و ڕوممانی هەیە
«نالی، ٥٧٥»

٢- تا بەسەر باغی دڵا بێ، بای خەزانی فیرقەتت
عارزم بۆ سێوی ڕوخسارت لە ڕەنگی بەی دەکا
«سالم، ٢٩»

٣- شوعلەیی ڕۆژی فیراقە، ئاگری برژانی دڵ
هەر نەسیبی دوژمن بێ، قرچەی بوریانی دڵ
«حەمدی، ٩٩»

**١- من لە دنیا غەمزەدەی حاڵی نزاری بلبلم**
**والەیی ناڵین و ناڵەی زارە زاری بلبلم**

غەمزەدە: غەمبار، بەغەم پێکراو، بەغەم ئەنگێوراو.

نزار: باریک، لاواز، ماندوو، شەکەت و .. مانای تری زۆرە (دهخدا، بەرگی ١٤، ل ٢٢٤٢٩). بەڵام لێرەدا مەبەست لە ماندوویی بلبلە.

والە: شەیدا، عەقڵداڵ.

«مەولانا خالیدی شارەزووری» دەڵێ:

بلبل فصل خزانم، والەی شیدای گل
ای دریغا نو گل گلزار رضوانم کجاست!
«٤٧٨»

زار (ی یەکەم): بەمانای گریان. زار (ی دووەم): بەمانای دەنوک و زار دێت.

واتە: من کە پێوەندییەکانی خۆم بەهیچ شتێکی دنیاوە نەهێشتووە؛ هەموو خەمێکی ئەم دنیایەم تەنیا و تەنیا غەمبار و شەیدای ناڵین و گریانی پڕ بەدەنووک و زاری بلبلم.



**٢- هەردوو هەمدەردین و هەردوو کوشتەیی تەنیا گوڵێک**
**بۆیە ڕۆژ و شەو لە گوڵشەن، هەمجیواری بلبلم**

هەمدەرد: هاودەرد.

هەمجیوار: هاوسێ، دراوسێ.

واتە: من و بلبل، هەردووکمان یەک دەرد و یەک مەبەست و یەک خەممان هەیە هەریەکەمان کوژراوی تاقە گوڵێکین، بۆیە بڕیارمان داوە ببینە هاوسێی یەکتر، تا پێکەوە بچینە ناو باغ و بەڕۆژ و بەشەو بەدیار گوڵەوە بین، تا بۆ دەرکەوتن و گەشانەوەی گوڵ و بۆنی گوڵ و دیتنی گوڵ و گەیشتن بەگوڵ، بژین.

«سالم» دەڵێ:

لە هەمدەردت مەکە وەحشەت، وەکو بلبل ڕەفیقت هات
بناڵین بابە جووت هەریەک، ڕەهەندی گوڵعوزارێکین
«٩٦»

**٣- ئەو: گوڵی چوو، من: دڵم چوو، ئەو: بەبای دا، من: بەگوڵ**
**ئەو: بەدەردی من دەناڵێ و من: نزاری بلبلم**

واتە: بەڵام مخابن، هەردووکمان مایە پووچ ماییینەوە، چونکە ئەو (بلبل) هەموو چریکە و گۆرانییەکانی بەڕێگەی «با»دا بۆ گوڵ دەنارد و گوڵەکەش نەیبیست. منیش دڵم لە دەست چوو، چونکە من دڵم بەدلبەر بەخشی و دلبەر لێمی سەند و لە بەرامبەردا دڵی خۆی نەدامێ... بۆیە لەوساوە بلبلەکە بۆ غەمی دەگری و منیش غەمبار و دڵتەنگی گریانە زۆرەکانی بلبلم.

«وەفایی» دەڵێ:

بلبل! وەرە، تا ڕۆحی من و تۆیە، بناڵین
تۆ: باغی گوڵانت چوو، ئەمن: داغی دڵانم
«٦٣»

**٤- یا حەقیقی، یا مەجازیی، عیشق هەر یەک بادەیە**
**گەر ئەمیش مەستم، هەر ئەو مەستی غەفاری بلبلم**

واتە: ئەوین؛ ئەگەر حەقیقی بێ، یان مەجازیی بێ، هەر ئەوینە و هەر یەک جۆرە بادە و شەرابە؛ کە دەخورێتەوە و پێ مەست دەبیت، بۆیە منیش ئەگەر مەست و سەرخۆش بم، هەر لەوجۆرە مەستی و سەرخۆشییەی بلبلە، کە وەک مەستبوونە بەئەوینی خودای بەخشندە.

**٥- تا سەحەر ئەو: گوێی لە فریادی جیهانسۆزی منە**
**تا شەوێ من: هەمدەمی فەریادی زاری بلبلم**

فەریاد: هاوار، بانگەواز.

جیهانسۆز: جیهان سووتێن، جیهان ئاگر تێبەردەر.

واتە: بلبل تا بەرەبەیان گوێی لە ناڵە و بانگ و هاواری دنیا سوتێنی منە و منیش لە بەرەبەیانەوە تا شەو، هاورێی هاوار و ماندووبوونەکانی بلبلم.

**٦- ئەو: بەناڵەی زارەوە، ڕۆژانە دەمسازی منە**
**من: بەئاهی سەردەوە، شەو، غەمگوساری بلبلم**

دەمساز: هاوڕاز.

غەمگوسار: خەمڕەوێن.

واتە: ڕۆژانە، تا تاریک دادێت، بلبل بەناڵە و چریکەوە هاوڕازی منە و منیش شەوانە؛ بەئاهی ساردەوە دڵنەوایی بلبل دەکەم تەقەللای غەمڕەواندنەوەی دەدەم.

**٧- گەرچی یەک دەرسە «ئەدەب» سەودای ئەمن و عەندەلیب**
**مووددەتێک ئەمما ئەمن، ئامۆزگاری بلبلم**

عەندەلیب: بلبل.

واتە: هەرچەندە ئەوین و شەیدایی من و بلبل، هەر یەک ڕەگەز و یەک وانەیە، بەڵام من لە چاو بلبلدا پشوو درێژتر و خۆڕاگرترم، بۆیە هەست دەکەم ماوەیەکە بلبل خەریکە بێزار و ماندوو دەبێ، لەبەرئەوە دەبێ پشتیوانی بکەم و نەیەڵم کۆڵ بدا و وەڕس ببێ و بۆ ئەمەش هەر خەریکی ئامۆژگاریکردن و ڕێنوێنی بلبلم.



## ٦٢

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفوف مەحزوف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن) وەک نموونەی:

١- موخبیر خەبەری داوە لەسەری موفتیی کۆیێ
حەسرەتکەشی شییری سەگە، بۆ کەوچکە دۆیی
«شێخ ڕەزا، ٢١١»

٢- مەئزونی ئەوەندە: وەکو ئاهم، بەنەزاکەت
لادەی سەری زوڵفی، نەوەکو بیخەیە لەرزە
«حاجی قادر، ١٠٩»

٣- ئەگەر گوڵ بێت و شێوەی ڕوومەتی جانانە بنوێنێ
دڕک دەگرێ گریبانی سەراسەری یەخە دەدڕێنێ
«حەمدی، ٣٧٩»

**١- ئەی زولفی کەچت، مایەی ئاشوبی دوو عالەم**
**وەی خاڵی لەبت، دانەیی پابەندی ئادەم**

کەچ: لار، تێکئاڵاو.

ئاشووب: هەرا، پشێوی، هەڵلا، ئاڵۆزی.

دوو عالەم: دوو مانای هەیە: ١- عالەمی ئێستا و عالەمی ئەو دنیای دوای زیندووبونەوە. ٢- جیهانی خۆرهەڵات و خۆرئاوا؛ چونکە لەم مانایەیاندا مەبەستی ئەوەیە بڵێ: زولفەکانت، کە ڕەنگیان ڕەشە و ڕەنگی ڕەشیش هێمایە بۆ کفر و گومرایی و نامسوڵمانی؛ ئەوا هەموو ناوچە نامسوڵمان نشینەکان و بەتایبەتیش ئەورووپای مەسیحی مەبەستە و لە ژێر زولفەکانیشدا، کە ڕووناکایی ڕوخسار و ڕوومەتەکانی دڵبەرە و ڕەنگی ڕووناکیش هێمایە بۆ ڕووناکی ئایینی ئیسلام، ئەوا مەبەست لە ناوچە موسڵمان نشینەکان و بەتایبەتیش خۆرهەڵاتی مەبەستە. بۆیە کە دەڵێ: مایەی ئاشوبی دوو عالەم، دەیەوێ بڵێ: سۆنگەی هەڵایسانی ئاژاوە، لە هەردوو بەشی خۆرهەڵات و خۆرئاوای دنیا،

دانە: ئەو دەنکە دانەوێڵەیەی بۆ چەشەی باڵندە دادەنرێ، تا بەهۆیەوە باڵندەکەی پێ ڕاو بکەن؛ بەڵام لێرەدا مەبەست ئەو دەنکە گەنمەیە، کە ئادەمی پێ لە بەهەشت دەرکرا.

«نالی» دەڵێ:

خاڵت چییە؟! دانەی گەنمی جەننەتی ڕووتە
چاوت چییە؟! فیتنەی حەرەمی قیبلەیی ئەبرۆ
«٣٨٦»

«سالم» دەڵێ:

شەوقی دانەی خاڵی تۆ، خستوومیە ناو داوی خەتەر
بەم گوناهە، ئادەمیش وەک من لە جەننەت دەرکرا
«٣٩»

واتە: ئەی ئەو دڵبەرەی بسکی لوول و پڕ پێچ و چین چینت، بۆتە سونگەی هەرا و پشێوی هەردوو جیهان و خاڵی لای لێویشت، هەر ئەو دەنکەگەنمەیە، کە باوکە ئادەمی پێ لە بەهەشت دەرکرا... کەواتە خاڵی لای لێوت هەر ئەو دانەیەیە کە ئادەمی پێ لە بەهەشت دەکرا و لەم جیهانەشدا هەمان ئەو دانەش خاڵەی تۆیە؛ کە بۆ ڕاوی عاشق دادەنرێ و بسکەکانت دەکرێنە کەرەسەی ئەو ڕاوە و عاشقانی پێوە دەبن و گیرۆدەی ئەوینی خۆتیان دەکەیت و ئەوینیشت هەمیشە بەچەڵەم و کێشەیە.

**٢- میهری قەدت: ئاسایشی عوششاقی جەفاکێش**
**یادی ڕوخت: ئارامی دڵی پرخەمی دەرهەم**

میهری قەدت: قەد و باڵای پڕ سۆز و نەرم و نیانت.

دەرهەم: تێکەڵاو، ئاڵۆزکاو.

واتە: نەرم و نیانی قەد و باڵات، ئارام و ئۆقرە و ئاسایشی دڵدارانی ئازار چەشتوون. یادی ڕوخساریشت؛ دڵنیایی و ئۆقرەی ئەو خاوەن دڵانەن، کە لێوان لێون لە خەمی هەمەجۆرە و تێکەڵدا.

**٣- زەخمی لەدڵم کارییە، گەر تیری نیگاهت**
**سەد شوکر بەزەخمی مە، دوو بادامتە مەرهەم**

واتە: ئەگەر تیری نوارینی چاوە جوانەکانت، دڵم بەجۆرێک زامدار دەکات، کە زامی کارییە، خەمم نییە، چونکە هەر خۆشت دیسانەوە بەمەرهەمی هەردوو چاوە وەک بادامییەکانت، زامەکانم سارێژ دەکەیتەوە.



**٤- مەفتونی دوو خاڵی لەبی لەعلم، کە بەتەشبیھ**
**جووتێ حەبەشن؛ ساکنی سەرچەشمەی زەمزەم**

مەفتوون: شەیدا، سەودا، شێت، سەوداسەر.

کە بەتەشبیھ: کە وەکو.

جووتێ حەبەشن: دوو پێست ڕەشی حەبەشی.

ساکن: جێگر، نیشتەجێ.

سەرچەشمە: سەرچاوەی ئاو، سەرکانی.

زەمزەم: ئاوی زەمزەم کە مەبەست لە دەمی یارە.

واتە: شێت و شەیدای جووتە خاڵەکەی لای لێوتم، کە هەر دەڵێی دوو سەربازی پێست ڕەشی حەبەشین و لە سەرچاوەی ئاوی زەمزەم جێگیربوون.

یان: شێت و شەیدا و عەڤداڵ و هەڵوەدای ئەو جووتە خاڵەی کەنار لێوتم، کە هەر دەڵێی دوو سەرباز و پاسەوانی پێست ڕەشی خەڵکی وڵاتی حەبەشن و پاسەوانیی پارێزگاریی سەرچاوەی ئاوی زەمزەمی هەڵقوڵاوی ناو دەمی تۆ دەکەن.

**٥- نوتقی شەکەرت، شاهیدی شەهدی دەمی تۆیە**
**ئیعجازی مەسیحایە، گەوای عیسمەتی «مەریەم»**

نوتقی شەکەرت: ئاخاوتن و قسە و گفتوگۆی وەک شەکر شیرینت.

شاهید: بەڵگە.

شەهد: هەنگوین.

گەوا: کورت کراوەی «گەواهی»ی فارسییە، کە بەمانای بەڵگەیە.

واتە: گفتوگۆی وەک شەکر شیرینت، بەڵگەی ئەوەن، کە دەمی تۆ، شیرنایەتی و هەنگوینی لێ هەڵدەقوڵێ: هەروەک چۆن حەزرەتی عیسا، کە هێشتا منداڵی سەر بێشکە بووە، توانای قسەکردنی بووە؛ بەڵگەی پاکیژەیی «مەریەم»ی دایکی دەرخستووە.

**٦- سەد خۆزگە بەوەی جارێ وەکو دەستەیی گێسوو**
**دەستێ لە قەد هاڵێنم و دەستێ لە ملت خەم**

واتە: سەد خۆزگە؛ دەستەکانی منیش وەک پەلکە درێژەکانت، کە جار جارە خۆ لە

گەردنت دەئاڵێنن و جارجارەش بەکەمەرتا شۆڕ دەبنەوە، ئەوانیش بیانتوانیبا یەکێکیان خۆیان لە کەمەرت بئاڵاندایە و ئەویتریانیشم کەمەرتی لە ئامێز بگرتبایە.

**٧- هیجرت؛ کە مەماتی هەیە، هەر ساتێ لەتەرزێ**
**وەسڵت؛ بەخودا تازە حەیاتە بەمە، هەردەم**

مەمات: مردن.
تازە حەیاتە بەمە: ژیانەوەی دووبارە ئێمەیە (ئەدەب).
واتە: ڕاستە دابڕان و دورکەوتنە لە تۆ، هەر ساتێک چەندان جۆر مردنی لە دوون، بەڵام لە هەمان کاتدا دیتن و دیداریشت سەرلەنوێ زیندووبوونەوە دەبەخشێ.
ئەگەرچی نیوەبەیتی یەکەمی ئەم بەیتە، لە هەموو تێکستەکاندا «مەماتی هەیە» نووسراوە، بەڵام من پێم وایە «مەماتی مەیە»یە و لە نیوە بەیتی دووەمیشدا «تازە حەیاتە بەمە»یە نووسراوە، بۆیە ئەگەر بەمجۆرەیان بووایە، شیاوتر دەبوو، کە دەبێ لە ئاکامی دووبارە نووسینەوەی دەستخەتەکاندا ئەو هەڵانەی تێکەوتبن.

**٨- زیبەندەیە ئەمڕۆ؛ کە بڵێین: شاهی بتان تۆی**
**چونکە هەموو دەم حیشمەتی شاهیتە فەراهەم**

زیبەندە: جوان، شایان، شیاو.
حیشمەت: دەبدەبە و کەژاوە.
فەراهەم: ئامادەکراو، سازکراو.
واتە: هەر لە خۆت دێت، کە بڵێین ئێستاکە سوڵتانی هەموو جوانانیت، چونکە هەرچی پێویستی و کەرەسەی تەواو و تەدارەکی ڕابەر و سەرکردایەتی کردنی سەردەمی جوانانت تێدا ئامادەیە.

**٩- موژگان: سیەه وغەمزە: کەماندار برۆ: تیغ**
**گێسوو: زری و قەد: عەلەم و طورەتە: پەرچەم**

واتە: کەرەسە و تەدارەکی سەرکردایەتی بوونیشت؛ بریتین لە سوپای مژۆڵ و کەمانداری غەمزە و شمشێری برۆکانت و زرێ و قەڵغانی پەلک و پەرچەمت و بەیداخی قەد و باڵات و کاکۆڵیشت، خودی ئاڵای دەوڵەتەکەتن.
«وەفایی»یش نموونەی ئەم بەیتەی زۆر هەیە:



١- سەف بەستە؛ هەموو مونتەزریری ئەمر و نیگاهن:
قولابی موژەت؛ زوڵفی ڕەشت، گۆشەی ئەبرۆت
هەرێیکی لە لایی بەتەمای قەتلێ «وەفایی»ن:
تابووری حەبەشن، لەشکری چین، عەسکەری هیندووت
«٣٣»
٢- ئەگریجە و پەرچەم، مەدەنی نیرگزی کاڵن
فەوجی حەبەشن، لەشکری سوڵتانی جەمالن
«٤٦»
٣- گوتی: بۆ کوێ دەبەی ڕوحت «وەفایی» دەوریان گرتی:
نیزامی پەرچەم و سازی زوڵفت وعەسکەری خاڵم
«٦٢»

**١٠- پایتەختی شەهی حوسنت و تەختیشە غروورت**
**ئەو ناز و کرێشمەی کە هەتە؛ ئەفسەر و خاتەم**

کرێشمە: ناز و عیشوە.
ئەفسەر و خاتەم: تاج و ئەموستیلەی شاهێتی.
واتە: شای جوانیت؛ دەبێتە پایتەختەکەت و تەختی پاشایەتیشت: لەخۆباییبوونت. ناز و عیشوەشت: تاج و کلکەوانەی شاهێتی.

**١١- کێ بێت و بدا: قەهقەیی جامی دەمی تۆ**
**یەکدەم؛ بەهەموو موڵکی «کەی» و مەملەکەتی «جەم»**

قەهقەهە: قاقا و چریکەی پێکەنین.
واتە: کێ هەیە دڵی بێت، پێکەنین و قاقای دەمی تۆ، بەسەریەکەوە بەهەموو خاک و موڵکی «کیانیان» و «جەمشیدی جەم»ی بگۆڕێتەوە؟!.
«وەفایی» دەڵێ:
بەگۆشەی چاو و خاڵی لێو و خاکی کوێ یار؛ نادەم
ئەگەر سەد جامی جەم، نابی خزر، ئەو ڕەنگی «دارا» بێ
«١٧٣»

**١٢- مەنزور لە عەمری «ئەدەب» ، ئەو ساتە؛ نیگارا!**
**سێوی زەقەنت بگرم و ماچی دەهەنت کەم**

مەنزور:مەبەست، نیاز.

سێوی زەقەن: چەناگەی خڕ و وەک سێو لووس.

واتە: گیانەکەم! هەموو ئاوات و خۆزگەی «ئەدەب» هەر ئەوەیە سێوی چەناگەت بەدەست بگرم و ناو دەمیشت ماچ بکەم.

«سالم» دەڵێ:

دڵم دوزدانە بۆ سێبی زەنەخ چوو
لە خەوفا پای لەغزی، کەوتە ناو چاھ
«١٢١»



٦٣

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)

وەک نموونەی:

١- ئەسبابی تەرەب؛ زیرو بەمە، ئەی بەگی جافان
بەزمێ بگرین چاکە، لە من زیرو لە تۆ بەم
«شێخ ڕەزا،١٨٣»

٢- دڵ کەوتووە بەبۆنی سەری زوڵفی عەنبەرت
بەو بۆنە، کەس نەکەوتووە؛ بادی سەبا نەبێ
«حەمدی، ٣٧٥»

**١- جانا! وەرە، تا جانی عەزیزت بەفیداکەم**
**جارێکی؛ ئەدا و سەد کەڕەتیشت بەقەزاکەم**

قەزا: قەزاوەگێڕ، بەقوربانتی بکەم، تا هەر دەرد و بەڵایەک بۆ تۆ دێتە خوارەوە، منی بەربکەوم، یان: بۆ من بێ و بەر من بکەوێ.

واتە: دڵبەرەکەم ! وەرە بۆ لام، تا نەک هەر یەک جار، بەڵکو سەد جاریش ئەم گیانە شیرینەی خۆمت لە دەور بگێڕم و بەسەر گەردان و بەقوربانت بکەم و ببمە قەزاوەگێڕی دەرد و بەڵای دەوری باڵآت.

وەک لە جێی خۆیدا (لە پەراوێزی دیوانەکەدا) ئاماژەمان پێ کردبوو، نیوەی دووەمی ئەم بەیتە لای «ئا» بەمجۆرە نووسرا بوو:

**جارێکی ئەدا و سەد کەڕەتیشت بەقەزاکەم**

کە واژەی «ئەدا» لەوێدا بەمانای ڕاپەڕاندن و جێبەجێکردنی فەرز و پێویست دەگەیەنێ، وەک چۆن دەبێ نوێژ «ئەدا» بکرێ و دەشکرێ دیسان هەروەک نوێژ بە«قەزا» بگێڕدرێتەوە. بەم پێیە ئەم بەیتە دەگونجێ وەک خوێندنەوەکەی «ئا»ش بخوێندرێتەوە؛ کە ئاوای لێکداوەتەوە:

گیانەکەم! وەرە تا گیانی خۆشەویستی خۆمت بەقوربان بکەم، جارێک بەحازری نەزری کەم، سەد جاریش بەقەرز بگێڕمەوە، وەک نوێژێ کە دەچێ. (هەمان سەرچاوە، ل ١٩١).

**٢- لایێ: کەششی غەمزەتە، لایێ: یۆرشی مووت**
**لەو نێوەدا داماوم، ئەمن ڕوو لە چ لاکەم؟!**

کەشش: ڕاکێشان، کێشمەکێش.

یۆرش: هێرش.

واتە: لە لایەکەوە تیلەی چاوە نازەنینەکانت ڕامدەکێشن بۆ لای خۆیان و بانگم دەکەن؛ لە لایەکی تریشەوە داوی تاڵ تاڵەی بسکەکەت، منیش لەو نێوەدا تێدا ماوم! ڕوو لە کام لایان بکەم و بەگوێ و بەقسەی کامە لایان بکەم؟!.

**٣- تا مەحرەمی هەر چین و خەمی طوڕەیی تۆ بم**
**پێوەم قەدەرێ هەمنەفەسی بادی سەباکەم**

واتە: بەو بۆنەیەوە کە بای سروەش، وەک هەناسەکانی من، ئاشنای سەر و قژتن، نیازم وایە هاوڕێیەتی لەگەڵ ئەوەشدا دروست بکەم؛ تا لەو کاتانەدا کە لە مژینی قووڵی بۆنی قژتدا، تا ئەوپەڕی ناخم، خەریکە تەنگە نەفەس ببم، هانای خێرا بۆ بای سەبا ببەم و هەناسەی لێ بخوازم.

«سالم» دەڵێ :

«سەبا»! ساتێ بەسەر گێسوو یارا
دەماغم وشکە، بێ: بوێ مشکی تەتار
«٩٥»

هەر «سالم» بەپێچەوانەی «ئەدەب»ەوە دەڵێ:

بەقوربی خەڵوەتی دڵبەر نەنازی، ئەی سەبا، زینهار
لە جێی تۆ، پێشتر «سالم» دەمێ هەمڕازی مەحرەم بوو
«١١٣»

**٤- ڕەنجووریی من، دووریی گوڵ قەندی لەبی تۆن**
**بێهوودەیە خۆم ڕەنجە بەحەب بەدەواکەم**

ڕەنجوور: بیمار، نەخۆش، دەردەدار، ماندوو، لاواز، داماو، دڵتەنگ، خەمبار.

ڕەنجە: ماندووبوون، زەحمەت.



واتە: دەزانم لاوازیی و خەمباریی و نەخۆشی من، بەبۆنەی دووریی لە لێوی شیرینی دڵبەرەوەیە و ئیتر پێویست ناکات خۆم ماندوو بکەم و بەدوای دەرمان و چارەسەردا بگەڕێم... هەر «ئەدەب» خۆی، نموونەی تری ئەم وێنە شیعرییانەی هەیە و پێشتر لە شیعری ژمارە (٣٥ بەیتی ١١)دا نووسیمان:

دەردێ نییە دەردم، کە ئەو چارە قبووڵ کا
بێ وەجهە لە لام: ڕەنجی طەبیب، سەبر و دەوا چەند؟

«حاجی قادری کۆیی»ش دەڵێ:

طەبیبم هاتە باڵینم، وەهای گوت:
دریغا، دەردی عیشقە، بێ دەوایە
«١١٦»

**٥- فەرمووتە: لە پاش مردنی من، دێیە مەزارم**
**مردم بەخودا، هێندە بۆ ئەو وەعدە دوعاکەم**

واتە: فەرمووبووت گوایە ئەگەر لە سوێی تۆ و لەتاو تۆ بمرم، دێیتە سەر گڵکۆم، بڕوا بکە، بەخودا، من دەمێکە بەو دەردی سەودایەتەوە مردووم و هەر چاوەنواڕی ئەوەم سەردانێکم بکەیت و دیسانەوەش لەم مردنەمدا، جارێکی تر، بەداخی ئەو نەهاتنەتەوە، مردوومەتەوە.

«نالی» دەڵێ:

گوتت: نالی! ئەتۆ بمرە، ئەمن دێم
خوداکەی بێ، خوداکەی بێ، خوداکەی!

**٦- خەیمەی دڵی مە، تەنگە بەلەشکرگەهی عیشقت**
**پێوەم کە فەراخور بەسوپەهە، بارە بیناکەم**

خەیمە: چادر، ڕەشماڵ.

لەشکرگەه: سەربازگە.

فەراخور: شایان، شایستە.

بارە: دیواری قەڵا و شورا، یان: دیواری شار.

واتە: بۆ ئەو هاتنە بەڵێنت دابوومێ تەشریف بهێنیت، دەبێ بزانیت کە هەواری دڵی

من، جێگەی لەشکر و دەبدەبەی عیشقی شاهانەی تۆی تێدا نابێتەوە؛ بۆیە دەبێ سەربازگەیەکی شایستە و شایانی عیشقی مەزنت بۆ دروست بکەم، کە دیوار و قولیپی دیار بێ.

**٧- هەر نامە سیاه جەننەتییە، گەر وەکو زوڵفت**
**چاتر کە بەعەمدەن؛ ئەمنیش نامە: سیاکەم**

واتە: ئەگەر وەک دەڵێن کەسێک نامەی کار و کردەوەی ، وەک زوڵفت ڕەش بێت، لە بەهەشتدا جێگەی دەبێ، ئەوا منیش بۆ ئەوەی چارەنووسم وەک چارەنووسی زوڵفی تۆ بێت، باشترە بەدەستی ئەنقەست، کار و ئاکار و کارنامەی خۆم ڕەش بکەم.

**٨- مەعلوومە کە تەئسیری نییە، ناڵە لە لای تۆ**
**چبکەم! چ بڵێم! بۆچی فەغان! بۆچی هەراکەم؟**

واتە: وا دیارە سکاڵا و هاوار و ناڵە، لای تۆ دادێک نادات؛ لەبەرئەوە هیچیان ناکەم و هەرخۆم دەخۆمەوە.

**٩- مەعشووقە: لە لا، جام: بەلەب، مەنزڵی خەڵوەت**
**چیدی هەیە دنیا! کە تەمەننا لە خوداکەم؟**

مەنزڵی خەڵوەت: ماڵ و جێگەی چۆڵ.

تەمەننا: داوا، خۆزگە، ئومێد، هیوا، تاسە.

واتە: هەموو ئاواتم لە دنیادا، هەر ئەوەیە لە جێگەیەکی چۆڵ و تەنیادا، بگەمە نزیک یار و لە کەناریدا بادە بنۆشم؛ دنیاش لەمە خۆشتری تێدا نییە و لەمەش زیاتر هیچی تر لە خودای خۆم داوا ناکەم.

**١٠- شەرتی « ئەدەب»ە، جانی فیدای ئەو کەفی «پا» کا**
**بتوانم ئەگەر لەو سەری گێسووتی ڕەهاکەم**

واتە: لەگەڵ دڵی خۆمدا مەرجم کردووە، ئەگەر بتوانم گیانم لە دوای زوڵفت و بسکت ڕزگار بکەم، دەبێ گیانم بەقوربانی بەری پێت بکەم، چونکە من شایانی ئەوە نیم بەسەر و زوڵفتەوە بم، کە ئەوپەڕی بەرزایی تەوقەسەری تۆیە، بەڵکو دەبێ بۆ هەمیشە بەلاوەگێڕی بەری پێت بم.



«نالی» دەڵێ:

«نالی» وەکو زوڵفت، کە موطیعی بەری پێتە
تێکی مەشکێنە، بەجەفا مەیخەرە لاوە
«٥٣٧»

٦٤

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفوف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن) وەک نموونەی:

١- ئەی گەورەکچی دڵبەر و شۆخ، وەختی مناڵییت
دابووم دڵێکی پوختە، بەئەو ڕۆحە عەفیفەت
تۆزێ ون ئەبووی گرووپەی ئەبەست عامیلی ئولفەت
گەردی لە دڵم ئەسڕی، پەل و پەنجەی بازیت
«گۆران، ٤١»

٢- دڵ موجریمی عیشقە، بەخوا حەقییەتی دڵبەر
بەستوویە بەئەگریجەوە، ئەیدا لە قەنارە
«حەمدی، ٣٤٧»

**١- پێوەم کە خۆم بەفیدای لەبی ئەو نیگارەکەم**
**جانی عەزیز؛ هەدییەی ئەو تازە یارەکەم**

هەدییە: دیاری، خەڵات، پێشکەش.

واتە: نیازم وایە خۆم بەقوربانی ئەو یارە تازەیەم بکەم و گیانی شیرینشم بەدیاری پێشکەش بکەم.

**٢- شەرت و قەراری من وەیە تا زەیندەگی ببێ**
**«بادە»م لە ساغەری لەبی ئەو مەیگوسارەکەم**

زیندەگی: ژیان.

بادە:مەی.

ساغەر:دەفری مەی پێ خواردنەوە، پەرداخ.

مەیگوسار: خووگرتن بەمەی خواردنەوە.

واتە: پەیمان و مەرجم لەگەڵ خۆمدا کردووە، دەبێ تا دەمرم هەر کاتێ بمەوێ مەی بخۆمەوە، دەبێ پەرداخی مەیەکەم لە لێوی ئەو یارە مەیخۆرە بکەم، ئەوسا بیخۆمەوە.
یان: پەیمانم کردووە دەبێ هەر لەو دەفرەدا مەی بخۆمەوە، کە یارم مەی پێ دەخواتەوە..



یان پەیمانم کردووە دەبێ هەر کاتێ مەی بخۆمەوە، بەخەیاڵ و خۆزگە، خۆم بەو پیاڵە و ساغەر و پەرداخە بچوێنم، کە یارم بەکاری دەهێنێت.

«سالم» دەڵێ:

لێوی تۆ، ئەو وەختە سەر ساغەر دەچوو
لێوی ساغەر خۆزگە لێوی من دەبوو
«١١١»

**٣- یا: جان بدەم بەڕوئیەتی؛ یا: سەر بەخاکپای**
**شەرت بێ حەیات سەرفی پێی ئەو یەک دوو کارەکەم**

ڕوئیەت: دیتن.

خاکپای: تۆز و خۆڵی بەرپێ.

واتە: مەرجم کردووە: ئەگەر گیانیشم لەسەر داناوە، دەبێ هەر بەو یارە بگەم، چونکە هەموو هیوایەکەم هەر گەیشتنە بەو یارە، یان: دەبێ پێی بگەم؛ یان: دەبێ لە پێناوی پێگەیشتنندا سەر دابنێم . چونکە هەموو ژیانم بۆ ئەم دوو کارە تەرخان کردووە.

**٤- خونچەی لە بانی عالەم، ئەگەر کۆوەبن لە لام**
**حاشا بەغەیری گوڵ، بەچ لادا نەززارەکەم**

خونچەی لەبانی عالەم: هەموو لێو وەک خونچەکانی دنیا.

نەززارە(نظارة): نواڕین، سەرنج، سەیرکردن.

واتە: ئەگەر هەموو کچە لێو خونچەکانی دنیا، پێکەوە لە لام کۆبکرێنەوە، بڕوا ناکەم هەستم بۆیان بجووڵێ و سەرنجی هیچیان بدەم، لە سەیری یارە لێو خونچەکەی خۆم زیاتر، کە ناوازە و هەڵبژاردەی هەموو دنیایە.

**٥- کوا ئەو دەمەی کە جان و سەر و ماڵی خۆم، هەموو**
**سەودا بەنازی غەمزەیی ئەو نازدارەکەم!**

واتە: کوا؟ خوا ڕۆژێکی وا دێنێتە ڕێگەم، تا هەموو گیان و سەر و ماڵی خۆم، بخەمە سەودا و پێناوی نیگای پڕ نازی ئەو نازدارەم؟!.

«نالی» دەڵێ:

بەڵا گەردانی باڵات بم؛ ئەگەر: چووم
فیدای هیندوویی خاڵت بم، ئەگەر: مام
«٢٦٢»

**٦- کوا ئەو دەمەی کە سورمەی دوو چاوی ئەشکبار**
**بەو گەردی نەعلی پارەیی ئەو شەهسوارەکەم!**

سورمە: کل.
ئەشکبار (ئەشک + بار): فرمێسکاوی.
گەرد: تۆز.
نەعل: سۆل، سەرپایی.
پارە: دراو، پارچە پارچە.
شەهسوار: شاسوار.

واتە: خۆزگە خوا ڕۆژێکی وای توش بکردبام؛ کە چاوە تەڕ و پڕ فرمێسکەکانم، بەکلی تۆز و خۆڵی ژێر سۆلە کۆنە و دڕاوی ئەو یارە: شۆڕەسوارە بڕێژم!

**٧- جانا! وەرە، کەتۆی بەلەبی شەهد و قەندەوە**
**ڕۆژانە: خەمرەوێن و بەشەو: خەمگوسارەکەم**

واتە: ڕۆحەکەم! تۆ؛ کە خاوەن ئەو لێوە شیرینە وەک شەکر و هەنگوینیانەیت، لێم نزیک ببەوە، چونکە تۆ خەمڕەوێنی ڕۆژانم و شەوانیش بەتەنگمەوە دێیت و خەمخۆرمیت.

**٨- سایەی سنەوبەری قەدی تۆ، بۆمە، عوشرەتە**
**چ بکەم لە سەیری باخ و چ لەو سایەدارەکەم!**

سایە: سێبەر.
عوشرەت: ژیان.
سایەدار: خاوەن سێبەر.

واتە: گیانەکەم! من هۆگری پشوودان و حەسانەوەی سێبەری ژێر دار سنەوبەری قەدو باڵای بەرزی تۆم و هەر ئەو کاتانە بەژیان دەزانم، کەلەسێبەری باڵای تۆدابم، ئیتر چ کارم بەسەر گەشت و سەیرانی ناو باخ و داری سێبەرداری ترەوە نییە.



**٩- کولمەت: گوڵ و جەمال: گوڵ و تەلعەتت : بەهار**
**لەو نێوە؛ سەیری کامە گوڵی ئەو بەهارەکەم؟!**

واتە: هەموو ئەندامێکی جەستەت، هەر گوڵن و ڕوخساری خۆشت: بەهار. ئیتر من لەو بەهارە و لە ناو ئەو گوڵزارەدا سەیری کامە گوڵت و سەیری کوێت بکەم؟!

**١٠- تۆ: هەم بیساتی ئێمە، ئەمن: هەم ویساڵی تۆ**
**ڕەببی! بەچی تەشککوری ئەو ئیفتیخارەکەم!؟**

بیسات(بساط): سفرەی ڕازاوەی خۆشی.
تەشککور: سوپاس.
ئیفتیخار: شانازیی، سەربەرزیی، سەروەریی.

واتە: تۆ لە لایەکەوە هاوسفرەی بەختەوەری منیت و لە لایەکی تریشەوە منیش هاوژوانتم؛ ئەی ئیتر خودایە! بەچ زمانێ سوپاسی ئەو هەموو شانازیی و سەربەرزییە بکەم؛ کە تۆ پێمت بەخشیوە؟!.

**١١- فەرمووتە: کێیە وا سەری دانا لە خاکی پام!**
**جانا! قبوولی کە: «ئەدەب»ە، جان نسارەکەم**

جان نسار (نثار): گیان بەشاباش و بەدیاری کردوو، گیان پێشکەش کردوو.

واتە: فەرمووبووت: ئەوە کێ بووە، وا سەری لە بەرپێی مندا داناوە؟!. منیش (ئەدەب) وەرامت دەدەمەوە و دەڵێم: گیانەکەم! ئەوە منم: «ئەدەب» ، ئەو کەسەی سەرم بەشاباشی بەری پێت کردووە، تکایە پەسەندم بفەرموو.

کێش: بەحری موزاریعی موسەممەن ئەخرەبی مەکفوفی مەحزوفی: (مفعول فاعلات مفاعیل فاعلان)[1]

وەک نموونەی:

١- بنوارە نەوبەهار و فتوحاتی گوڵشەنی
گوڵ زاری کردەوە، کە دەمی خونچەی پێکەنی
«نالی، ٢٦٦»

٢- ئەمڕۆ بەدڵبەریی، شەهی هەرمەرز و کیشوەری
سا هەڵسە، دەی بنێرە سەرت: تاجی سەروەریی
«سالم، ١٤٥»

٣- چبکەم! نە ئەو کەسەم کە کەسم بێ لە لا بەکەس
خۆشم نە گەیە ئەو کەسەی من بکا بەکەس
«مەحوی، ١٤٦»

**١- تا چەندە ئەمن خەیاڵی وەفا، لەو نیگارەکەم!**
**عومری عەزیز، سەرفی سەر ئەو ئینتیزارەکەم!**

نیگار: لێرەدا مەبەست: یار و دڵبەرە.

ئینتیزار (إنتظار): چاوەنواڕیی.

واتە: ئاخۆ تا کەی و تا چەند، من لە عیشقی ئەو یارەدا هەر چاوەنواڕ بم و بەهیوای ئەوە بم لە بەرامبەر ئەم هەموو ئەوین و سووتان و سەوداییەمدا، ئاوڕێکم لێ دەداتەوە و بڕوا دەهێنێ کە بەڕاستی خۆشم دەوێ و ئەوسا ئەو پەیمانەی لە سەرەتادا بەستبوومان و دەبووایە ئەنجامی بدات و خۆی لێ نەبان کرد؛ باوەڕم پێ دەهێنێ و پەیمانەکەی جێبەجێ دەکات و دڵیم دەداتێ؟.

(١): «ئا» کێشی ئەم غەزەلەی ئاوا نووسیوە: هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفوف مەحزوف (مفعول مفاعیل فاعیل). بەڵام مامۆستا «هەردی» بەوجۆرەی سەرەوەی پێناسە کردووە.



**٢- تاکەی بەیادی سەرو قەدێکی کەنارەجۆ**
**وەک: سەبزە؛ مەنزڵم لە دەم ئەو جۆبیارەکەم؟!**

کەنارەجۆ: دوو مانای پێچەوانەی یەکتری هەیە: ١- تەریک و کەنارگرتوو، دوورەپەرێز. ٢- نزیک و کەناری جۆگە، نزیک لێواری چەم و ئاو.

سەبزە: سەوزایی.

مەنزڵ: ماڵ، خانوو، هەوار، جێگە.

جۆبیار: جۆگە، چەم.

واتە: ئاخۆ تاکەی بەخەیاڵ و بەیادی ئەو یارە باڵا وەک سەروو بەرزەی لێم دوورەپەرێزە، بەتەنیا بۆ خۆم دەگریم و فرمێسکەکانم دەوروبەری باڵای خۆم سەوز دەکەن؟!.

یان: ئاخۆ تاکەی بۆ ئەم یارەی کە وەک دار سەروو، لە ناو چاومدا سەوز بووە، هەر دەبێ بەئاوی فرمێسکی چاوەکانم پاراوی بکەم و فرمێسکەکانم دەبێ بەردەوام بڕژێن!؟.

یان: ئاخۆ تاکەی وەک چۆن سەوزایی پێویستی و ئارەزووی لە کەنار و جۆگە و ئاوە، منیش دەبێ بۆ ئەوەی هەمیشە سەوز بژیم، تاکەی هەر بگریم و هەر بگریم!؟

**٣- تاکەی بەعەزمی گرتنی تەڕلانی طوڕەکەی**
**بێ شەوقی شەمعی ڕوومەتی، فیکری شەوارەکەم؟!**

عەزم: نیاز، مەبەست، هیوا، ئومێد.

تەڕلان: باز.

شەوارە: ئەو کەسەی ڕووناکییەکی بەهێز بەرەو ڕووی بێتەوە و نەتوانێ بەچاو پێش خۆی ببینێ و سەرنجی بداتێ؛ واتە: بەشەوارە دەکەوێ.

واتە: ئەوەندە حەز دەکەم دەستم بگاتە ئەو گوڵەی لە شێوەی بازە و یار لە طوڕەکەی سەری داوە و خۆزگەی بۆ دەخوازم، کەچی ئەوەندە سڵ و سام دامەدەگرێ، دەترسم کاتێ بچم دەست بۆ ئەو گوڵەی سەر کاکۆڵی ببەم، پڕشنگی ڕووناکایی ڕوخساری؛ چاوم بەشەوارە بخات و نەتوانم هیچ ببینم.

**٤- تاکەی لە هیجری ماهی ڕوخی، وەک مونجیمان**
**هەر شەو، بەئەشکی دیدە؛ ئەختەر شمارەکەم!؟**

ماهی ڕوخی: مانگی ڕوخساری، وەک ئەستێرە ناسانم لێهاتووە، شەو تا بەیانی، هەر فرمێسکە وەک ئەستێرە گەشەکانم دەڕێژم و دانە دانە دەیانژمێرم!.

**٥- تاکەی بەیادی خونچە دەهانێکی گوڵعوزار**
**وەک گوڵی قەبایی سەبز لەبەر، پارە پارەکەم!**

خونچە دەهان: خونچە دەم، دەم وەک خونچە.

قەبا: کەوا.

سەبز: سەوز، کەسک.

گوڵی قەبایی سەبز: گوڵی کەوا سەوز کە لێرەدا (کەوا)، بەمانای گەڵاکانی گوڵەکە دێت، کە ڕەنگیان سەوزە و ئەم وێنانە هەر دەستکردی «ئەدەب»ن و پێشینەیان لە شیعری کوردی پێش «ئەدەب»دا نەبووە و بۆ گەڕان بەدوای «گوڵی قەبای سەبز»دا، هەموو فەرهەنگەکانی بەردەستم پشکنین، ناوی گوڵی وایان تێدا نەبوو، بەدڵنیاییەوە دەڵێم کە ئەم وێنە جوانانە، هەر کاری خودی «ئەدەب»ن و پێشتر لە شیعری کوردی پێش ڕۆژگاری «ئەدەب»دا نموونەیان نەبووە. هەرچەندە دەبێ ئەوە بڵێم کە لە هەموو تێکستەکانی تری بەردەستمدا، چ دەستخەت و چ چاپکراو، ئەم بەیتەی «ئەدەب»یان بە: «گوڵی قەبای سەبر» نووسیوە، دیسان دڵنیام کە «سەبر» نییە «سەبز»ە. چونکە ئەگەر «سەبر» بێت، بۆچی سەبر ناگرێ و خۆی دادەدڕێ؟!. پارە پارە، پارچە پارچە، هەڵاهەڵا.

واتە: تاکەی بەیادی یارێکی دەم وەک خونچە و ئەندام گوڵێن، چاوەنواڕیی و بێ ئارامیی، ئۆقرەم لێ هەڵبگرێ و وەک گوڵی کەوای سەوز لەبەر، بکەومە دادڕینی کراس (کەوا) سەوزەکەی بەرم و هەڵوەراندنی گەڵاکانی خۆم... بەم واتایە: ئەوەی بێ وەفاییم لەگەڵدا دەنوێنێ و منیش دەبێ کاردانەوەکەم، هەر گوڵ ئاسایی بێت، کە لێرەدا کاتێ «ئەدەب» خۆی دەکات بەگوڵ و گەڵا و پەڕەکانی خۆی هەڵدەوەرێنێ، نیشانەی خۆکوشتنی گوڵەکەیە، بۆیە ئەم بەرپەرچدانەوەیەی «ئەدەب» هەڵوێستێکی ئەوپەڕی شاعیرانە و ڕۆمانتیکانەیە.

هەڵبەتە دەگونجێ بەمجۆرەی تریشی بخوێنینەوە:



تاکەی بەیادی یارێکی خونچە دەمی جەستە و ئەندام گوڵینەوە، چاوەنواڕیی و پەژارەی بێ ئارامیی، ئۆقرەم لێ ببڕێ لە بەرابەر بێ وەفایی دلبەردا، کە خونچەگوڵە، دڵم نایەت هیچی بەرابەر بکەم ناچار هەر دەگریم و دەگریم و دەگریم و لە ئاکامی زۆر گریانمدا، نقومی فرمێسکەکانی خۆم دەبم و جلوبەرگەکانم لەبەردا سەوز دەبن و بەوەش داناکەوم، جلە سەوزەکانم، لەبەر خۆم دادەدڕم... لەم وێنە نزیکانەدا «نالی» دەڵێ:

بێ سەرووی ڕەوانم ؛ کە لەبەر ئەشکی ڕەوانم
«خەرقە» بووەتە: «غەرقە»، «کەوا» سەبزە لەبەرما
«١١٩»

**٦- لایێ: سوپاهی غەمزە و لایێ:سوپاهی خاڵ**
**کوا ئەو تەوانە یەک تەنە، ڕوو لەو هەزارەکەم!**

تەوان: توانا.

هەزار : ژمارەی هەزار«١٠٠٠».

واتە: دڵبەرەکەی من، کە خاوەنی لەشکری نیگای پڕ ناز و لەشکری خاڵە و بەو دوو لەشکرەیەوە، کە هەزار دەبن و هێرشم بۆ دێنێ، نازانم منێکی تەنیاو تەنیا باڵ، چۆن بەتەنیا ڕووبەڕووی ئەو هەزارە و بەرگریی ئەو هەزارەم پێ دەکرێ!؟.

«وەفایی» دەڵێ:

ناچێتە دڵم غەمزەی پەیوەستە، کەچی دەمخا
ئەو لەشکرە بەرگەشتە، هەر فەتح و زەفەر دێنێ

**٧-گەر میحنەتی زەمانە، گەر زیللەتی فیراق**
**غەیرەز ڕەزا بەحوکمی مەشییەت، چ چارەکەم!**

غەیرەز: جگە، بێجگە لە.

زیللەت: داماویی، کوێرەوەریی و دەردەسەریی.

فیراق: جیایی، لێکدابڕان، دووریی.

مەشییەت: تێپەڕاندن ، چارەنووس.

واتە: ئەگەر دەردەسەرییەکانی ڕۆژگارە، یان مەینەتییەکانی دووریی یار، ئەوا ناچارم جگە لە ڕازیبوون و ملدان بۆ یاسای چارەنووس، چبکەم؟!.

**٨- نه تاقەتی وەمە، کە دەمێ بێتە باوەشم**

**نە تابی وەم هەیە، کە دەمێ لێی کەنارەکەم**

واتە : بەم هەموو دەردەسەریی و مەینەتییەوە، نەبڕستی ئەوەم هەیە؛ چارەسەری ئەم دووریی و دابڕانە بکەم و بگەمەوە بەیار و یار لە ئامێز بگرم، نە دەشتوانم دەستبەرداری یاربم و لێی داببڕێم.

**٩- پێوەم «ئەدەب» ، کە تا ببێی ناڵەیی دڵان**

**مینای دڵ؛ پەرەنگی دەم ئەو گۆشەوارەکەم**

واتە: ناچارم بەهەر جۆرێ بێ؛ ڕازی دڵم بەیار بگەیەنم، بەڵام چۆن بەم بێ هێزییەمەوە توانای دەربڕینی ئەو هەموو نهێنی و ڕازەم هەیە!؟.. ویاریش بەم دوورییە؛ کە نامبیستێ؛ناچارم کارێک بکەم تا ببیستێ، ئەویش بەوەی:مینای دڵم؛ (کە مەڵبەندی هەموو ڕازەکانمە) بکەمە پلپڵەی گوارەکانی گوێی و گوارەکانیشی چونکە نزیکترین شتێ بەگوێچکەکانی، ئەوسا بەڵکو بەو ڕێگەیە گوێی لە ڕازم ببێ و ببیستێ.





کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزوف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن) وەک نموونەی:

١- سەد نوشابن من د دل ئیرۆ ژ خارێن سۆرگولان
یەک ب یەک پەیکان چەڤی بوون چوونە جەرگی دا کولاب
«مەلای جەزیری،٧٨»

٢- دەفتەری ئەعمالی من، بێ قەترەیێکی ڕەحمەتت
کە بەسەد زەمزەم سیاهیی نوقتەیێکی لێ دەشۆم؟!
«نالی، ٣٠٠»

٣- ڕاستیی شمشاد و قەددی تۆ، بەئەندازەی یەکن
هەردوو مەوزوونن، وەلاکین ئەم: زەخیم و ئەو: نزار
« سالم، ٦٠»

٤- دەستی زاڵم کەوتم و نەم ما هەوای گوڵ عەنبەرم
گوڵ؛ شکا بازاڕی؛ خوێنی بلبلیش کەوتە سەرم
«حەمدی،١٢٢»

**١- چاوەکەم بیستم نەخۆشیت، یاڕەبی نەتبێ ئەلەم**

**تۆ؛ کە یەک زەڕەت ئەلەم بێ، بۆ مە یەک دنیایە غەم**

ئەلەم: ئازار، نەخۆشی.

واتە: چاوەکەم بیستم نەخۆشیت، لە خودا داوا دەکەم نەخۆش نەبیت، چونکە ئەگەر تۆ، تۆسقالێکیش نەخۆش بکەویت بۆ من زۆرە و وا دەزانم هەرچی ئازار و نەخۆشی دنیایە، لای من کۆبوونەتەوە.

**٢- هێندە غەمناکم لەبەر تۆ، ئەی نیگاری خونچە لەب**

**چی دەکەم، چەندی دەکەم، ناچێتە سەر کاغەز: قەڵەم**

واتە: بەو نەخۆش کەوتنەی تۆ، ئەوەندەم غەم هاتۆتێ، بڕوا بکە، ئەی لێو خونچەیی، هەرچی دەکەم دەکۆشم، قەڵەم بۆ سەر کاغەز ناچێ.

**٣- گەر نەگا ئەورۆکە نامەی سیحەتی ئەندامی تۆ**
**خەو لە چاوم ناکەوێ، بەو دوو لەبی لەعلت قەسەم**

ئەورۆکە: ئەمڕۆ.

سیحەت: تەندروستی، چاکبوونەوە.

واتە: سوێند بەو لێوە ئالانەت، ئەگەر هەر ئەمڕۆ هەواڵی چاکبوونەوەی تۆم نەگاتێ، ئارام و ئۆقرە و حەسانەوە و خەوتنیشم نامێنێ.





کێش: بەحری هەزەج مەکفووف مەقسوور موسەممەن: (مفعول مفاعیل مفاعیل مفاعیل)
وەک نموونەی:

١- عەوداڵی ئەبەد هەر منم، ئەی چەرخی جەفاکێش
تا دەربەدەر و شەهر بەشەهرم؛ وەکو دەروێش
«سالم، ٧٥»

٢- ئەی سەروی بوڵەند قەدد و برۆ تاق و مەمک جووت
کێ دەستی دەگاتە بەی و ناری نەگەیشتووت؟!
«نالی،١٥٢»

٣- ئەم ئەهلی کەماڵە هەموو حەیرانن و مەبهووت
ئەم ئەرزە لە دووت بۆچی کەوا لەرزایەوە نەبزووت؟!
«حەمدی، ٢١٩»

**١- ساقی! وەرە بەو مژدە؛ کە ئەو شەمعی شەبوستان**
**کاشانەیی ئەغیارە؛ کە ڕووی کردە گوڵستان**

شەبوستان: جێگەی خەوی پاشایان و میران.

کاشانە: ماڵ، خانوو، خانووی زستانە، کۆڵێت.

ئەغیار: بیانی، نامۆ، نەیار، دوژمن. مانای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی پێکەوە دێن.

**٢- لەب ڕێزێ بدە ساغەر و بۆم تێکە پەیاپەی**
**شەوگاری وەها فرسەتە بۆ بادە پەرستان**

لەب ڕێز: پڕ پڕ، لێواولێو.

ساغەر: دەفری مەی خواردنەوە.

پەیاپەی: پەیتا پەیتا، یەک لە دوای یەک.

واتە: ئەهای مەیگێڕ، لە بەرابەر ئەو مزگێنییەدا، کە ئەو چرای جێی خەوی سوڵتانە، ڕووی لە کۆڵێتێکی نەیارانەی ناو گوڵستان کردەوە، پەرداخێکی پڕ پڕی مەییم بدەرێ و پەیتا پەیتاش بۆم دووبارە بکەرەوە، چونکە هەلە و شەوگاری لەمجۆرە، بۆ مەیخۆران هەرگیز ڕێک ناکەوێتەوە.

**٣- خووم بێنە، کەدو بێنە، سەبوو بێنە، لەبالەب**
**ئەمشەو، کە شەبستان مە، با بێتە مولستان**

خووم: گوپەی گەورەی گڵینی شەراب و مەی و سرکە و ترشیات و ئارد و دۆشاو و دانەوێڵە و ئاو و شتی لەم بابەتانە، کە لێرەدا مەبەست لە کووپەی شەرابە، (دهخدا، بەرگی ٧، ل ٩٩٤٦).

کەدوو: کەندوو، کەنوو (کە ئەمیش هەر گڵینە).

سەبوو: گۆزەی گلێن.

مەه: مانگ.

مولستان: لە دووبەشی (مول + ستان) پێکهاتووە، کە «مول» بەتەنیا بەمانای: مەی، بادە، شەراب دێت و لەگەڵ «ستان»یشدا دەبێتە: مەیستان، شەرابستان.

شاعیرانی کورد واژەگەلی «خووم، سەبوو، موول»یان بەمجۆرە بەکاربردووە:

١- خندەی گل، نشئەی مل، جعد سنبل بر زبان
شیمەی خۆش، چشم دلکش، تان گیسویت غرض
«مەولانا خالید، ٥٣٥»

٢- مەجلیسێکی چەمەن و بلبل و بەزمی گوڵ و مول
بەدووسەد مەدرەسە ودەرس و کیتابی نادەم
« نالی، ٣٠٦»

٣- مەستی من، وەرایی یارانە
ساقیا خووم بدە بەجامی سەبوو
« سالم، ١١٦»

٤- ژەهرە: مول، بێ ڕووت بەواللە العظیم
خارە: گول، بێ بۆت بەواللە العظیم
«سالم، ٨٧»

٥- دەبینم سیبحە دەردەستانی ملکەچ بوو لەتەکیانا
لە سەحنی گوڵشەنا، سەرمەست و دەستەملانی شیشەی مول
«مەحوی، ٢٠٥»



٦- نەوەک مەیخانە خاڵی بێ، هەتا پیری موغان ماوە
سەرم قوربانت ئەی ساقی! گەلێ تینووم، سەبوو بێنە
«حەریق، ٥٥»

واتە: بادەم بەکووپە و بەگۆزە و بەکەندووی سەرڕێژ و پڕ پڕ بۆ بێنە، با ئەمشەو، جێی حەسانەوە و خەوی ئێمە، بێتە شەرابستان و مەییستان.

لە هەموو تێکستە دەستخەت و چاپکراوەکانیشدا نیوەی دووەمی ئەم بەیتە ئاوا نوسرابوو:

**ئەمشەو، کە شەبستانی «مەی» ، بابێتە مولستان**

کە«مە» بەتەنیا هیچ ناگەیەنێ و لە هەمان کاتیشدا کێشی نیوەی بەیتەکە لەنگ دەکات، بۆیە (پێم وابوو) دەبێ«مەه» بووبێ.

**٤- سوبحانە! چ خۆشە، کەدڵارامی وەفادار**
**خۆی بێتە عیادەت لە مەریزان و لە خەستان**

سوبحانە: خودایە؛ هەڵبەتە هەڵدەگرێ مەبەستی لە بەرەبەیانیش بێ.

عیادەت: سەردان و دیدەنی نەخۆش و زامدار.

مەریز(مریض): نەخۆش، زامدار.

خەستە: نەخۆش.

واتە: خودایە! چ ڕووداوێکی شیرین و خۆشە! کە یار لوتفی نواندووە و خۆی سەردان و دیدەنی زامداران و نەخۆشانی خۆی کردووە.

**٥- خۆشتر ئەمەیە؛ بێ بەنیشاری قەدەمی کەی:**
**سەد جانی عەزیزت؛ نە بەدەستێ، بەدوو دەستان**

واتە: بەڵام لەمە خۆشتر و جوانتر ئەوەیە؛ بۆ ئەم پێشوازییەی یار، گیانی شیرینت بخەیتە سەر لەپی هەردوو دەست و بەرەو پیری بچیت و پێشوازی لێ بکەیت و گیانت لە بەرپێیدا پێشکەش بکەیت.

**٦- جارێ سەری کوڵمەی بگری، جارێ لەبی لەعل**
**گا: بنکی دوو مەمکانی، دەمێ: سەری پوستان**

پوستان: مەمک.

واتە: کاتێکیش بەرەو پیری چوویت، باوەشی پیا بکەیت و تاوێ سەری کوڵمی و لێوی ئاڵی بگریت و تاوێکیش هەردوو مەمکی و هەندێ جاریش گۆی مەمکی و سەری مەمکەکانی.

**٧- گەھ زەحمەتی دەی، گاهێ نەدەی، گاهێ بەطیبەت**
**هەرچی کە بکەی، عوزر پەزیرایە لە مەستان**

گەھ: جار، کەڕەت، چەل.

طیبەت: بەنیانی، لەسەرخۆ.

عوزر: پاکانە، بیانوو.

پەزیرا: پەسەند، قبووڵ.

واتە: جارێک ماندووی بکەیت و جارێ ماندووی نەکەیت و جارێکی تریش بەنیانی و نەرمیی، شوێنی وای بگریت و بگوشیت، کەپاکانە هێنانەوە لە سەرخۆش و مەست پەسەند بکرێ و وەربگیرێ.

**١١- تاکەی «ئەدەب» ئەم عوشرەتە؛ هەرتاکو نیدا دێ**
**مردووت بمرێ، هەستە؛ ئەوا مردوو هەڵستان**

نیدا: بانگەوازی ڕۆژی زیندووبوونەوە.

واتە: لە لایەکەوە دەکرێ بڵێین وەک دەرکەوت ئەم هەموو بەزمە خۆشەی «ئەدەب» بەمجۆرە دەیگێڕێتەوە، کە گوایە یار سەردانی کردووە؛ تەنیا خەون و خەیاڵێکی دەستکردی دڵی خۆی بووە و بەم خەون و خەیاڵەش، مەست و بێ ئاگا بووە، بۆیە ڕۆحی هۆشیاری «ئەدەب» بەئاگای دەهێنێتەوە و پێی دەڵێ: ئەم هەموو تەمەنە خۆشەی خۆت، کە لەگەڵ ئەم دیدارەی یاردا، بەسەرت برد، بەدرێژایی قۆناغی ژیان و مردنت بووە و ئەوا دوای مردنت، دیسان لەگەڵ سەرلەبەری مردوواندا زیندوو بوویتەوە.

لە لایەکی تریشەوە دەکرێ بڵێین: ئەم دڵبەرە بێ بەزەییە، مەگەر لە ڕۆژی قیامەت و زیندووبوونەوەدا، بەزەیی پێدا بێتەوە و ئەمجۆرە دیدەنی و دڵنەواییەت بکات.



«حەمدی» دەڵێ:

تۆ هەر خەریکی سەجدە بە ئەی ڕۆحە پاکەکەم
نابێ بوەستی، تا لە حەشردا نەدا: نیدا

«١٨٨»

٦٨

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم: (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن) وەک نموونەی:

١- ژ مەحبووب دوور کرم چەرخی فەلەک وێ پورِ هلاڤێتم
نزانم دێ ل کوو دت من دڤێ دەوران و چەرخێدا
« مەلای جەزیری، ٣٩»

٢- مەگەر مەیخانەیە دنیا، کەوا کاسی لەبەر کەئیسی
بەنەغمەی عوودی سووتاوی، بەنەشئەی تاسی، تاساوی
«نالی،٦٨٢»

٣- لەگەڵ زاهید بەتەقدیری فەلەک هەرگیز جودا نابین
لە قورب و غەیرە ڕەغبەتدا، بەمیثلی سیر و مارێکین
«سالم، ٩٦»

٤- هەزار حەقم وت و نەشبووم وەکو «مەنصوور» بەسەر دارێ
نەما کەس دامەنی نەگرم، پەنام بردە هەموو شارێ
«حەمدی، ١٤٨»

**١- نیگارانی دیاری مە، شەکر لەب، گوڵعوزارانن**
**هەموو تورکی کەماندارن، هەموو عەنقا شکارانن**

نیگاران: دلبەرانی جوان و شۆخ و شەنگ.

دیاری مە: (دیار +ی مە): ناوچەی ئێمە، لای ئێمە.

گوڵعوزار: ئەندام گوڵین.

عەنقا: باڵندەی ئەفسانەیی.

واتە: دڵبەرانی وڵات و هەرێمی ئێمە، هەموو لێو شیرین و ئەندام و لەش و لار گوڵینن و هەمووشیان وەک کچە تورکی خاوەن چاوی جوان، تیرو کەوانیان(تیلەی چاویان) بۆ ڕاوی عاشق هەڵگرتووە و ڕاوکردنەکانیشیان ئەوەندە کارامانەیە، تەنانەت«عەنقا» شیان لە دەست ڕەها نابێ.



**٢- هەموو سیمین بناگوشن، هەموو ماهی زرێ پۆشن**
**دەمێ نێش و دەمێ نۆشن، چ جادووگەر نیگارانن**

سیمین: زیوین.

بناگوش: بناگوێ، لاجانگ.

واتە: دڵبەرانی ئێمە، هەموویان وەک مانگی زرێ پۆش وان، جاری وا هەیە وەک دووپشک و مار پێوە دەدەن و دەگەزن و جاری واشە، بەپێچەوانەوە زۆر دڵنەرم و بەخشندە و بەتامن و جاری واشە تیلەی چاوانیان هەمووی سیحر و جادووە.

**٣- هەموو غیلمان بەچەن سادە، پەری نەسلن، پەری زادە**
**بەخەندە: نەشئەیی بادە، بەغەمزە: مەیگوسارانن**

واتە: دڵدارانی ئێمە، هەموویان نەوەی کوڕە بەهەشتیی و پەریزادەن و هەرتەنیا زەردەخەنەیەکیان، ئەوەندەی دەسەڵاتی بادە خواردنەوە، مەستیی و سەرخۆشیی دەبەخشێ و نواڕینە پڕ نازەکانیشیان، هەر دەڵێی هەموو تەمەن و کار و پیشەیان مەی خواردنەوە بوو.

**٥- بەدوو لەب: جووتێ گوڵنارن، بەغەبغەب: سێوی خونسارن**
**بەگێسوو: دوو سیەهـ مارن، بەچاو: ئەفسوونی مارانن**

گوڵنار: گوڵەهەنار.

خونسار: شارێکە سەر بەپارێزگای «ئەسفەهان»ی ئێران و لە جێگەیەکی کوێستان و ناوچیا دایە؛ کانی و ئاوی سارد و سێوی بەناوبانگی هەیە. (دهخدا، بەرگی ٧، ل ١٠١٥٤).

واتە: هەردوو لێویان، دوو گوڵە هەنارە و ڕوخساریان هەموو گوڵە و بەپرچ و بسکیش؛ دوو مارن و بەچاوانیش هەر دەڵێی ئەفسوون و جادووی مارن.

«نالی» دەڵێ:

دوو جادوو ماری مەغزی ئادەمی خواری قەرار داوە
لە سەر شانی، وەکو ضەحاک و ناوی ناوە: زولفەینی
«٦٧٦»

**٦- بەباڵا: سەرووی ئازادن، بەگێسوو: دامی صەیادن**
**لە صەیدی دڵ چ ئوستادن، چ ماهیر جانشکارانن**

سەرووی ئازاد: دار سەرووی زۆر بەرز، کە هەر هەڵدەچێ و لە بەرزاییدا ئەندازەی نییە و ئازادە.

دامی صەیاد: داوی ڕاوکار.

ئوستاد: مامۆستا.

ماهیر: شارەزا، وریا.

جانشکار: ڕاوکاری گیانن.

**٧- لە مەشقی عیشوە بازیدا، لە شێوەی کینەسازیدا**
**لە عەرسەی تورک تازیدا، چ شیرین شەهسوارانن**

عەرسە: مەیدان، گۆڕەپان.

تورک تازی: لە دوو بەش (تورک + تازی) پێکهاتووە و مانای وەک هەڵمەت و هێرش و تاڵان و بڕۆی تورکانە دێت و لێرەدا واتای شاڵاو، هەڵمەت، تاڵان و بڕۆ دەگەیەنێ. (دهخدا، بەرگی ٥، ل ٦٦٥٢).

شیرین شەهسوار: شای شیرین سوار، شای شۆڕەسوار.

واتە: لە کاتی مەشق و ئەزموونی ئەویندارییی و لە شێوەی ڕق و کینە هەڵسان و تووڕەبووندا، هەروەک هەڵمەت و شاڵاوی ئەو تورکانەن، کەلە مێژوودا بەتاڵان و بڕۆ و شاڵاوکار ناوبانگیان دەرکردووەو هەموو خۆرهەڵاتیان کردۆتە مەیدانی ڕاو ڕاوێن و فڕاندن و دزین و تاڵان و بڕۆ.

**٩- لە موڵکی لوتف و ڕەعنایی، لە کیشوەر: حوسن و زیبایی**
**لە پاتەختی دڵارایی، چ سەرکەش تاجدارانن**

کیشوەر: وڵات، نیشتمان.

دڵارایی: واژەیەکی لێکدراوی (دڵ + ئارا)یە و بەمانای: مایەی دڵخۆشکردن و شادمانی دڵ (دهخدا، بەرگی ٧، ل ١٠٩٩٨).

واتە: لە موڵکی خۆیاندا، هەموو ئاکارێکیان بریتییە لە میهرەبانیی و نیانیی نواندن و



لە نیشتمانەکەشیاندا جوانیی و شیرینیی دەرخستن؛ بەلام لە پایتەختی نیشتمانەکەیاندا (کە دڵیانە)، لە دڵنەوایی و دڵدانەوە و بەختەوەرکردنی دڵداردا، سوڵتانێکی خاوەن تاجن، کە زۆر سەرچل و بێباکن.

**١٠- دزی دڵ، ئافەتی جانن، شکستی دین و ئیمانن**
**نە بەستەی عەهد و پەیمانن، نە خەستەی جان نسارانن**

ئافەت: نەخۆشی، پەتا، بەڵا.

شکست: شکان، هەرەس، تێشکان.

واتە: بەڵام کە بانگیان کردیتە ناو پایتەختی نیشتمانەکەیانەوە، کە دڵیانە، ئیتر لەوێ پابەند و دەربەستی هیچ وەفا و مەرج و پەیمانێک نین و دەکەونە دزینی دڵت و لە خشتە بردن و تەفرەدانی ئایینیت و هەرەس پێهێنانی دین و ئیمان و بەڵا و دەردەسەری بەسەر ڕۆحتدا دێنن و بەتەنگ ئەو هەموو گیانبەخشینەوەنین، کەدڵدارانیان بەدیاری پێشکەش کردوون.

**١١- نە ئۆگریار و ئەغیارن، نە بابی ڕەنج و ئازارن**
**نە مەحرەم عاشقی زارن، نە هەمدەم بێقەرارانن**

ئۆگر: هۆگر.

ئەغیار: نەیار، بیانی، دوژمن.

واتە: نە ئەوەتە ببنە هۆگری یار و نە ئەوەتە ببنە دوژمن و نەیاریش لەو بابەتانەش نین ئازار و زیان بگەیەنن. لەگەڵ دڵدارانی دڵ گریاویشدا نابنە هاوخەم و هاودەمی دڵدارانی بێ ئارام و دڵ پڕ پەژارە و دەرد و ژانیش نین.

**١٢- قەدەحدار و مەه ئاشامن، دڵئازار و دڵئارامن**
**دەمێ وەحشی، دەمێ ڕامن، چ ئاهوو جیلوەدارانن**

قەدەحدار: پیاڵە و پەرداخی مەی خواردنەوە بەدەست.

مەی ئاشام: وشەیەکی لێکدراوە (مەی + ئاشام)، کە: بەمانای: مەیخۆر، بادەخۆر، شەرابخۆر دێت.

«کەلیم»ی شاعیر دەڵێ:

می آشام غمت پیمانه و ساغر نمی دارد
بجز تبخانه بر لب ساغر دیگر نمی دارد
«دهخدا، بەرگی ١٤، ل ٢١٩٢٩»

واتە: پیاڵەی مەی بەدەست و بادەخۆر و شەرابخۆرن و مایەی زویرکردنی دڵ و لە هەمان کاتیشدا مایەی هێورکردنەوەی دڵن، چونکە ئاکاریان یەک ڕەواڵ و یەک جۆری نییە، بەڵکو تاو تاون و هەر تاوەی بەرەنگێکن! تاویَ زۆر سلۆک و بەپارێزن و تاوێکیش ڕام و دەستەمۆن؛ بۆیە ناتوانریَ چ جۆرە شتێکیان لیَ بنریَ و دەبیَ مەگەر ناویان بنریَ: ئاسکی بەناز و عیشوە.

**١٣- «ئەدەب» چبکا لە یارانی، لە یاری نازدارانی!**
**دەمیَ خوێنخواری بێباک و دەمیَ خەمخواری جارانن**

واتە: «ئەدەب» بەدەست ئەمجۆرە دڵدارانەوە ڕاماوە؛ نازانیَ چ بکا؛ چونکە تاوێک خەریکی خوێنخۆریی و تاوێکیش وەک جارانیان؛ خەریکی خەمخۆرین.



**٦٩**

**سەرنج:** وەک دیارە ئەم شیعرەی بەبۆنەی مەرگی کەسێکی نزیک و خۆشەویستی خۆیەوە وتووە.

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن) وەک نموونەی:

١- من د دل کۆڤان هەزاران داغ و کەی پڕ بێ حساب
مەحنەتا وەردێن ب خارن وێن د دل دا سەد نوشاب
«مەلای جزیری، ٧٧»

٢- وەی کە ڕوو زەردی مەدینە و ڕوو سیاهی مەککە خۆم
دەرکراو و دەربەدەر، یاڕەب دەخیلی عەفووی تۆم
«نالی، ٢٩٩»

٣- گەر موقارین بن لە وەسڵا: ڕووی من و ڕوخساری یار
قەت بەیەک ناگەن، لە یەک جا؛ ئەم خەزان و ئەو بەهار
«سالم، ٦٠»

**١- ئەی خونچەیی نەزاکەتی سەحنی حەساری من**
**ئەی گوڵشەنی سەیاحەتی حاڵی نزاری من**

سەحن: مانای زۆرە، بەڵام لێرەدا مەبەست لە دوو مانایە: یەکێکیان بەمانای میانەی نێوان دیواری بن حەوشە، یان هەر خودی حەوشە و مانایەکی تریشیان: پەنا-یە (دهخدا، بەرگی ٩، ل ١٣٤٩٧) کە هەردوو ماناکە بۆ لێکدانەوەی بەیتەکە دەبن.

حەسار: دیوار، پەرژین.

سیاحەت: گەڕان، گەشت.

**٢- ئەی لالەزاری ساحەتی گوڵزاری عەیشەکەم**
**ئەی ماهی چاردە شەوی دەیجووری تاری من**

لالەزار: گوڵجاڕ (گوڵاڵەجاڕ)، جاڕی گوڵاڵە.

**٣- ئەی شەمعی تابناکی شەبستانی تیرەکەم**
**ئەی ماهی چاردە شەوی دەیجووری تاری من**

تابناک: ڕووناک، پڕتەو.

شەبستان: ژووری خەوی میران و سوڵتانان.

تیرە: تاریک.

**٤- ئەی بادەیی سەبوحیی و جامی نیشاتەکەم**
**ئەی نەشئەیی مەدامەیی حاڵەتی خوماری من**

سەبوحیی: بەربەیانی، کازیوە.

نیشات (نشاط: عەرەبی): جموجۆڵ، چالاکیی، هەڵسووڕان.

مەدام: یان: مودام: هەمیشە، بەردەوام.

**٥- سەرووی قەدت، کە زیبی گوڵستانی ئێمە بوو**
**بۆ بوو بەتەرزی خاک؛ لە بەختی هەژاری من؟!**

زیب: جوانیی.

تەرزی خاک: ئەو لق و پەلی درەختانەی بەرەو ڕووی خاک شۆڕ دەبنەوە و جارێکی تر لە خاکدا دەڕوێنەوە.

واتە: باڵای وەک سەرووی بەرزت، کە مایەی ڕازانەوە و جوانیی باخەکەمان بوو، کەچی لە بێ بەختی من، لق و پەلکی، بەرەو زەوی لاربوونەوە و سەریان لە خاک نا.

**٦- شەرت و قەرارم بەجودایی بەتۆ، چ بوو؟**
**شەرتت نەبردە ئاخر و بردت قەراری من**

واتە: من و تۆ، پەیمانمان کردبوو، دەبێ بۆ هەمیشە پێکەوە بین و ئەگەریش بڕیار بێ لە یەکتر جوێ ببینەوە، دەبێ هەردووکمان بەجووتە لە یەکتر جیا ببینەوە، نەک بەتاک، کە لەمەدا، تۆ هەر خۆت بەتەنیا لێم جیا بوویەوە و پەیمانەکەمانت نەبردە سەر و لەگەڵ خۆتدا بردت.



**٧- دوێنێ؛ کە نەوبەهاری ئەمن بوو جەمالی تۆ**
**ئەمڕۆکە؛ خاکی توربەتی تۆیە، بەهاری من**

واتە: تا دوێنێ (تا پێش جیابوونەوەت) بەخۆشیی جوانیی تۆوە، تەمەنم لە سەرەتای بەهار دەچوو. بەڵام ئیتر لەگەڵ جیابوونەوەی تۆدا، لەگەڵ چوونی تۆدا بۆ ژێر گڵ، بەهاری تەمەنی منیش، بووە ئەو خاکی مەرگەی کە ئێستا تۆی تێدایت.

**٨- خۆزگە وەکو گوزاری منە، سەرمەزاری تۆ**
**ئەمڕۆکە ڕەهگوزاری تۆ بووایە مەزاری من**

گوزار: تێپەڕین، سەردان.

ڕەهگوزار: ڕێباز، ڕێگە.

واتە: وەک چۆن ئێستا گڵکۆکەی تۆ، بۆتە شوێن سەردان و هاتوچۆی من، خۆزگە مەرگی من، ئەوەندە پێش مەرگی تۆ بکەوتایە، ئێستاکە شوێنەواری نەمابایە و لەگەڵ زەویدا تەخت بووایە و ببووایەتە ڕێبازگە و شوێن هاتوچۆی تۆ.

**٩- تۆ بووی صەنەم، بەڕۆژ و بەشەو، خەمڕەوێنی من**
**وێستاکە کێ بێ لە جێی تۆ، بەغەمگوساری من!؟**

واتە: ئەی ئەو خۆشەویستەی کە سنووری خۆشەویستیمان، تا ئەندازەی پەرستنت بوو... کەواتە ئەی بتەکەم، تۆ بەڕۆژ و بەشەو خەمڕەوێنی من بوویت و کە خەم زۆری بۆ دەهێنام، پەنا و هاوارم بۆ تۆ دەهێنا. ئەی ئێستا! لەجیاتی تۆ، کێ دەبێتە غەمڕەوێنی من!.

**١٠- بێ قامەتی سەهیت، کەوا فەرشی ئەلحەدە**
**سەر هەڵبڕە و بزانە چییە ڕۆژگاری من!**

سەهی: بەرز و ڕێک، بەتایبەتیش وەک پێشتر ئاماژەمان پێ کرد، لەگەڵ «سەرو» و «سنەوبەر»دا بەکاردەبرێ.

واتە: باڵا و لەشولاری وەک سەرووی بەرزی تۆ، کە ئێستا بەردی (ئەلحەد)یان لەسەرە، بۆ ئەم بەردە، بۆتە فەرش، ئاخۆ ئاگات لەوە هەیە، کە ئێستاکە، من بەبێ ئەو باڵا بەرزەت، حاڵم چۆنە و لە چدام!؟.

**١١- بێ ڕوویی تۆ، مەحاڵە «ئەدەب» زیندەگی بکا**
**ڕەحمێ بکا بەحاڵی؛ مەگەر کردگاری من**

واتە: دەزانی لە چدام! بڕوا بکە ئەوەتەی ڕوخساری تۆم لێ دوورکەوتۆتەوە، کارێکم بەسەرهاتووە، یەکجار تێکچووم و ئیتر بەبەرمەوە نەماوە بژیم و حەز دەکەم بمرم، مەگەر خوا خۆی نەیەوێ بمکوژێ و بەم حاڵەوە بمهێڵێتەوە.





کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن) وەک نموونەی:

١- عومرێکی درێژە بەخەیاڵی سەری زوڵفت
سەوداو و پەرێشانم و سەودایەکی خاوە
«نالی، ٥٣٣»

٢- پێم خۆشە، کە عومرم بەجەفا سەرفی غەمت بێ
بەو شەرتە کە مایەی ئەمەلم ماچی دەمت بێ
«سالم، ١٤٣»

٣- وەسمان حەبەش و حەمەشێن و ئەحمەدی حاجی
دەم دەم دەوەڕن وەک سەگ و توولە و تانجی
«شێخ ڕەزا، ٢١٤»

**١- ئەی لوعبەتی تەنناز و دڵئارام و پڕ ئەفسوون**
**ئەی شاهیدی پڕ ناز و سوخەن جۆی و سەمەنگوون**

لوعبەت: بووکی ڕازاوە.
سوخەن جۆ: قسەدۆز، لێکۆڵەر.
سەمەنگوون: ئەندام وەک گوڵ، گوڵێن (گوڵی یاسەمین).

**٢- هەر من بەتەنێ شیفتەیی تەلعەتی تۆ نیم**
**عالەم بەسەری نێرگسی فەتتانتە مەفتوون**

شیفتە: شەیدا، عەڤداڵ.
فەتتان: شەیداکار، سەوداکار.
مەفتوون: شەیدابوون.

**٣- فەرمووتە: کە فیردەوسی بەرینە، روخی زیبات**
**گەر جەننەتە؛ بۆ خوابگەهی دوو بەچە ئاهوون؟**

فیردەوس: بەهەشت.

خوابگەه: خەوتنگە، شوێنی خەو.

بەچە ئاهو: کارمامز، کارئاسک.

واتە: فەرمووبووت کە ڕوومەت و ڕوخسارت وەک بەهەشتی بەرین وان؛ ئەی ئەگەر بەهەشتە، بۆچی بۆتە شوێن خەوی دوو کارمامزا؟ کە مەبەست لە کارمامز، هەردوو چاوەکانێتی.

**٤- شاعیر دەهەنی خونچەیی تۆی شوبهی بەگوڵ کرد**
**نەیزانی، خەتای کردبوو، وەڵڵاهی بەشەڕ چوون**

دەهەن: دەم، زار.

شوبهی بەگوڵ کرد: وەک گوڵ چوواند.

واتە: شاعیران دەمی وەک خونچەی تۆیان، بەگوڵ چواندبوو. بەڵام نەیانزانیبوو، کە وانییە، بۆیە لە نێو خۆیاندا لەسەر ئەمە بەشەڕ هاتوون. وەک لە جێگەی خۆیدا و لە پەراوێزی ژمارە (٥)دا ئاماژەمان پێ کردووە، کە «ئا»، لەباتی: بەشەڕچوون، بەسەوچوون-ی نووسیوە، کە دەگونجێ ئەو جۆرەش بخوێندرێتەوە. یان دەگونجێ لێرەدا «بەشەڕچوون»ی نێوان گوڵ و خونچە بگرێتەوە. چونکە شێوەیان لەیەک دوورە.

**٥- فەرمووت: کە «ئەدەب» دڵ نەشکێنێ بەجەفای تۆ**
**چۆنم نەشکێ شووشە، کە ئاماجی روخام بوون**

ئاماج: نیشانە، ئامانج.

روخام: بەردی زۆر سەخت و ڕەق.

واتە: فەرمووبووتان کە دڵم بەم هەموو جەفایەت نەشکێ. منیش دەڵێم: ئاخر چۆن دڵی وەک شووشەم لە بەرامبەر بەردی سەختی وەک جەفای تۆدا نەشکێ؟. یان چۆن دڵم لەبەر جەفای تۆدا ناشکێ! بۆ نازانی جەفای تۆ، ئەوەندەی بەردی خارا ڕەقە و دڵی منیش شووشەیە!؟.



نالی دەڵێ:

١- بۆچی نەگریم، سەد کەڕەتم دڵ دەشکێنی!
بۆ مەی نەڕژێ، شیشە لە سەد لاوە شکاوە؟!
«٥٣٥»

٢- دڵ شیشەیی پڕ خوێنی فیراقی فەرەقی بوو
مەکسووری ڕقی بەو دڵی وەک بەردی ڕەقی بوو
«٣٧٥»

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن) وەک نموونەی:

١- ئەم عـومـرە عـەزیزە، کـە لە بۆت نەقـد و دراوە
سەد حەیفە و دریّغا، کـە مـوسـڵـمـانـی نەمـاوە
«نالی، ٥٣٣»

٢- ئەی گەورەکچی دڵبەر و شۆخ، وەختی منالّیت
دابووم دلّێکی پوخـتـە، بەو ڕۆحە عـەفـیـفـەت
تۆزێ ون ئەبووی گرپەی ئەبەست عامیلی ئولفەت
گـەردی لە دڵم ئەسـڕی، پەل و پەنجـەیی بازیت
بۆ ڕاسـتـیی نەڵێم گەورەکچی عـیشـوە سـەراپا
ئەوسـا نیـیـە، تا ناخی نیگای دیدە، بەری بێ
ئەوسا نیـیـە، تا ناوی قـسـەش، دیوی دەری بێ
ئەوسا نییە، ئەوسا نییە، ئەوسا نییە، بەخوا!
«گۆران، ٤١»

٣- لەم ڕێگەیە تەقـدیری وا بوو؛ کـە ئێـمـە
پامـاڵی جەفـا بین و ڕەقـیب سـەیر و سـەفـاکا
«شێخ ڕەزا، ١٧»

**١- ئەمڕۆکە عەجەب، شۆڕش و غەوغایە لە گوڵشەن**
**وەقـتی تەرەبی بولبـولی شـەیدایە لە گـوڵشـەن**

غەوغا: هەرا، مەرافە، هەڵڵا، ئاڵۆزیی.
تەرەب (طرب): گۆرانی چڕین، خۆشیی.

**٢- خەمـڵـیـوە بەسـەد ڕەنگە؛ گـوڵ و لالەیی سـەحرا**
**سەد نەغمە لە هەر لا، دوو سەد ئارایە لە گوڵشەن**

خەملّیو: پێگەییو، پێگەیشتوو.
لالەیی سەحرا: گوڵاڵەسوورەی دەشتودەر.



**٣-تێکەڵ لە هەموو لاوە: شەقیق و گوڵ و نەسرین**
**ئەلحەق کە گەهی سەیر و تەماشایە لە گوڵشەن**

شەقیق (شقايق): گوڵاڵەسوورە، گوڵێلک.
ئەلحەق: بەڕاستی.
گەه: کات، دەرفەت.

**٤-سەتحی چەمەن ئەمڕۆ لە قەڵەم، قودرەتی سانیع**
**وێنەی قەڵەمی سەنعەتی ئەو شایە لە گوڵشەن**

سەتح (سطح): ڕوو، تەختایی.
قودرەتی سانیع: دەسەڵاتی کردگار.

واتە: کە سەیری ئەو سەوزایی و گوڵجاڕ و چیمەنە دەکەیت، سەرت لە کردەوەی خوا سووڕ دەمێنێ، کە بەقەڵەمی خۆی چی نەخشاندووە و لە ناو ئەو نەخشاندنەشدا، وێنەی یار، شای وێنەکانی ناو ئەو سەوزایی و گوڵجاڕەیە.

یا دەکرێ بەوجۆرەش لێک بدرێتەوە، کە ئەم هەموو نەخشە جوانە، دەستکردی کردگارە، کە شای هەموو سەنعەتسازیی و قەڵەمێکە.

**٦-بولبول؛ سەحەریی نەغمە نەوازە بەسەراحەت**
**یاران! چە گەهی تەوبە و تەقوایە لە گوڵشەن!**

سەحەریی: ئەو کارەی لە بەرەبەیاندا ئەنجام دەدرێ، کە لێرەدا مەبەست لە کاری چریکە چڕینی بولبولە.

نەغمە نەواز: بەستە و گۆرانی چڕین.
سەراحەت (صراحة): ڕاستیی.
گەه: کات، وەخت، دەم.
تەوبە: پەشیمانیی لە شتێک.
تەقوا: خواپەرستیی.

واتە: ئەوەتا بولبـول بەئاشکرا و بێ پەردە تێی چریکاند و کەوتە گۆرانی چڕین، ئەرێ گەلی دۆستان؛ ئێستا کەی کاتی تۆبەکردن و خواپەرستییە.

**٧-ئەمڕۆ نەشکێ؛ کەی دەشکێ، تۆبەکە ئەمڕۆ**
**تۆبە شکەنیی؛ حوکمی تەقازایە لە گوڵشەن**

حوکمی تەقازا: ئەرکی سەرشان، پێویست.

واتە: ئەگەر لە ڕۆژێکی وەک ئەمڕۆدا، تۆبە نەشکێنین، ئەی کەی دەیشکێنین! چونکە ئەمڕۆ تۆبە شکاندن وەک کارێکی پێویست، ئەرکی شانمانە.

«نالی» دەڵێ:

ساقی! بەمەیی کۆنە، لەسەر عادەتی نەوبە
بشکێنە بەسەد نەوبە، دووسەد عادەتی تەوبە

«پیرەمێرد» دەڵێ:

دوێنێ، بەتەوبەیەک قەدەحەکەم شکان
ئەمڕۆ، بەخوێنی ئەو قەدەحە، تۆبەکەم شکان

**٨- ساقی! بدە بەو جامی زەڕەت، بادەکە، ئەمڕۆ**
**هەنگامی مەی و ساغر و سەهبایە لە گوڵشەن**

جامی زەڕ: پیاڵە و دەفر و پەرداخی لە زێڕ دروستکراو.

واتە: ساقی! بەو دەفرە زەڕینەت بادەم بدەرێ. ئەمڕۆکە کاتی پیاڵە وەرگرتن و مەی خواردنەوەیە.

**٩-هاوارە، وەکو بولبولی شەیدا «ئەدەب»ی زار**
**دەستی نەگەیشتە گوڵ و ڕسوایە لە گوڵشەن**

هاوارە: مخابن، جەخارە.

واتە: مخابن، ئەدەب، وەک بولبولی شەیدا دەستی بەگوڵ ڕانەگەیشت و لەم گوڵجارە بەرینەدا تەنیا و بێ یار و شەرمەزار و ڕسوایە.



٧٣

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)، وەک نموونەی:

پێی بڵێ بادی سەبا غەم لێرە بێ کەس کەوتووە
دڵ بوو غەمخواری ئەمانە، لەحزەیێ گیری نەکا
«حاجی قادر، ٥٣»

**٢- عەقرەبی زوڵفی نگونسارت دڵی پێکا، نە نێش**
**نێشە جارێ ئێش و نێشی، غەیری زوڵفی پڕ لە چین**

نگونسار: سەرەوژێر، هەڵگەڕاوە، دەمەونخون.

واتە: دڵم پێکراوی دووپشکی پەلکی هەڵگەڕاوەی تۆیە، نەک پێوەدانی چزووی و شتی تر. چونکە ئەم پەلکە چین چینانەت، کار و پیشەیان هەر تاوەی بەجۆرێکە: تاوێک پێمەوە دەدەن و تاوێکیش ئازارم دەدەن.

**٣- هێندە مەفتوونم بەدیدارت، بەدیدارت قەسەم**
**نەشئەیی سەد ساڵە وا نابێ لە بۆ: «مائی موعین»**

واتە: بڕوا بکە، ئەوەندەی تاسەی دیدارت دەکەم، ئارام و حەجمینم لێ هەڵگیراوە و هەموو ئاواتێکم بۆتە خۆزگەی دیدارت، بۆیە سوێند بەو دیدارەت دەخۆم، کە بەئەندازەی ئەو مەستییە سەد ساڵییەی بەمەی، یان «مائی موعین» بەسەرخۆشی دەبەخشێ، ئەوەندە ئارەزوومەندی دیتنتم.

**٤- چەندە خۆشە کونجی خەڵوەت، مەی لە لا، دڵبەر لەکن**
**خاسە بوت، پڕ بادە ساقی، سادە بێ وەک مەهـ جەبین**

خاسە بوت: یان: خاسە بت: (یاری وەک بتی یەکجار جوان و تایبەت).

واتە: ئای چ خۆش دەبێ، ئەگەر لە جێگەیەکی وادا بیت. هەر خۆت و یار و بادە پێکەوە بن و مەیگێڕێکی ڕوخسار وەک مانگیش پیاڵەی پڕ مەییت بداتێ.

«هێمن» دەڵێ:

بەهار و گوڵ، کچ و مانگەشەو و شیعری تەڕ و بادە
لەوە زیاتر جەنابی شێخ؛ گەرەکتە عالەمێکی تر!

**٥- خۆزگە بەدوێنێ شەوێ، کە خۆم و خۆی بووین دوو بەدوو**
**گەه لە باخی خونچە کردن بوو؛ دەمێ نەسرین چنین**

مانای ئەم بەیتە و بەیتی دوایی پێکەوە دێن.

**٦- دەست لە مل، ساعید لە ساعید، لەب لەسەر لەب، ڕوو بەڕوو**
**کەف لەناو کەف، دەم لەسەر گوڵ، بەی گوشین و پێکەنین**

ساعید: قۆڵ، باسک.

کەف: دەست.

بەیتی (٥) و (٦) واتە: خۆزگەم بەدوێنێ شەوێ، کە هەر من و یار دوو بەدوو پێکەوە بووین، بەهەموو جۆرێک ڕاماندەبوارد، تاوێک دەست لە ملی یەکتر دەبووین، تاوێک خونچەی لێو مژین...

لە فۆلکلۆری کوردیدا دەڵێ:

خۆزگەم بەدوێنێ پارشێوێ
وێکڕا نووستبووین بەچارشێوێ

**٧- تا دەکەم مەدحی: دەمی؛ دێن و مەلائیک پێم دەڵێن:**
**ئافەرین بۆ شیعری ڕەنگینت «ئەدەب»، سەد ئافەرین**

واتە: تا باسی لێوی ڕەنگینی یار دەکەم، شیعرەکانیشم ڕەنگی جوانیان لێ دەنیشێ و ڕەنگاوڕەنگ دەبن، بۆیە فریشتەکان، کە چاویان لەم کارەمە، دێن بۆ لام و ئافەرین و دەستخۆشی نووسینی ئەم شیعرە ڕەنگینانەم لێ دەکەن.



٧٤

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)، واتە هەمان کێشی شیعری پێشووی هەیە، وەک نموونەی:

١- با حەقیشی بێ، لە بۆ «مەنسوور»، «انا الحق» حەق نییە
شێتییە مەجنوون ئەگەر بێ، نازی لەیلایی بکا
«مەحوی، ١٩»

٢- من خەوی ئەو چاوە، عەرزی ئینوسیرینم دەکرد
نووست و فەرمووی: هیچ کەسێ تەفسیر و تەعبیری نەکا
«حاجی قادر، ٥٣»

**سەرنج:** ئەم غەزەلە، لەگەڵ غەزەلی پێشوودا وێنەی دووبارەوەبووی لە یەکتر نزیکیان زۆر تێدایە. بەڵام غەزەلی پێشوو (٩) بەیت و ئەمیان (١١) بەیتە.

**١- سوبحدەم، هەنگامی گوڵ، سۆزەی نەسیمی عەنبەرین**
**چەندە خۆشە، بادە وەرگرتن لە یاری نازەنین**

هەنگام: کات، دەم.

واتە: بەرەبەیانانی زوو، ئەو کاتەی گوڵ لە خەو ڕادەبێ و سروەی بۆنخۆشی پڕ لە عەنبەر بەسەر باخدا تێدەپەڕێ، ئا لەو کاتەدا چ خۆشە پیاڵەی مەی وەرگرتن لە دەستی یاری پڕ ناز و عیشوە.

**٣- گەه سەماعی ئەرغەنوون و گەه سوراحی لەعلی ناب**
**گا لە باخی تەلعەتی یارانی گوڵڕوو؛ گوڵچنین**

سەماع: گوێگرتن، بیستن.

ئەرغەنوون: ئامێری مۆسیقایی (ئەرگەنوون).

**٦- گەه لە جامی لێوەکەم، دەمژی قوڕابەی شەهدی ساف**
**گەه لە فنجانی دەمی تەنگی؛ ڕەواقی ئەنگەبین**

قوڕابە: شووشەی گەورەی مەی، ئەو جۆرەی کە ملیان باریکە و دامێنیان زۆر گەورەیە و لە شێوەی (مەشکە) دان.

فنجان: دەفری بچووک بۆ پێ خواردنەوەی قاوە و هەر شتێ بخورێتەوە.

ڕەواق: پێشتر بۆ جێگەی تر، بەمانای تر لێکمان دایەوە، بەڵام لێرەدا: پاڵاوتە دەگرێتەوە.

ئەنگەبین: هەنگوین.

واتە: تاوێک لە پیاڵەی دەمی، شەراب و مەیی پاڵاوتەم دەخواردەوە، تاوێکیش لە شووشەی دەمی تەنگی، هەنگوینی پاڵاوتەم دەخوارد.

**٨- گەه لە بادەی مەستی کردم، گەه لە غەمزەی چاوی شێت**
**گا لە زوڵفی والە و شەیدا؛ نە عەقڵم ما، نە دین**

والە: سەودا، شەیدا، عەقڵداڵ.

**٩- گا لە دوو لەب ساغەری تێکرد؛ کەها: ئابی حەیات**
**گا لە گەردن شیشەیی ڕاگرت؛ کەها: ماء المعین**

ئابی حەیات: ئاوی ژیان.

ماء المعین: ئاوی سازگار و ڕەوان. هەرچەندە لە بنەچەدا «ماء معین»ە و لێرەدا لەبەر سەروای شیعرەکە «ئەلف» و «لام»ی بۆ زیاد کراوە.

شاعیرانی فارس «ماء معین»یان بەمجۆرە بەکاربردووە:

١- ز کافور و از مشک و ماء معین
درخت بهشت و می و انگبین
«فردوسی»

٢- یکی ماء معین آمد، دیگر عین الیقین آمد
سیم حبل المتین آمد، چهارم عروة الوثقی
«منوچهری»

٣- یک مثل بشنو بفضل مستعین
پاک چون ماء معین از بو معین
«ناصر خسرو»



٤- گل بر آرند اوّل از قعر زمین
تابه آخر برکشی ماء معین
«مولوی»

٥- عاشق صادق بەزخم دوست نمیرد
کز اشتیاق چنانم کەتشنه ماء معین را
«سعدی»

(دهخدا، بەرگی ١٣، ص ١٩٩١٥)

واتە: تاوێک لە دەفری لێوەکانیدا، مەی بۆ تێدەکردم و پێمی دەوت: ئەمەیان بخۆرەوە، چونکە ئەمە ئاوی ژیان و زیندووبوونەوەیە (واتا: ماچی لێوەکانی دەدامێ).

«نالی» دەڵێ:

لێوی تۆ، ئاوی بەقا، من حەضرم
فەیزی تۆ، ڕەحمەت و من: سەوزەگیا
«١٢٥»

تاوێکی تریش گەردنی بەرز و لووس و بێ گەردی ڕادەگرت و دەیوت: ئەمەشیان لە ڕەنگی ئاوی ڕوون و ڕەوان و سازگار دەچێ و لێوتی پێوە بنێ و بیخۆرەوە.

**١٠- گا بەڕووی خۆی کرد ئیشارە، گەه بەڕەوزەی سینەکەی**
**«هذهِ جَنّات عَدنٍ فادخلوها خالِدین»**

ڕەوزە: باخ، باخچە، گوڵشەن.

هذە جَنّات عَدنٍ فادخلوها خالدین: ئەمەیان بەمانای: ئەمەش بەهەشتی خودایە و تێی بچۆ و بۆ هەمیشەش بەزیندوویی تێیدا بمێنەوە.

**١١- موختەسەر دوێنێ شەوێ، تا تەلعەتی میهری مونیر**
**هەر «ئەدەب» بوو، بێ سەدا، موختاری فیردەوسی بەرین**

موختەسەر: بەکورتی.

میهر: خۆر.

مونیر: ڕووناک، پڕشنگدار، گەش.

بێ سەدا: بێ دەنگ.

موختار: خاوەن، سەرپشک.

فیردەوس: بەهەشت.

واتە: بەکورتی، بەدرێژایی دوێنێ شەو، تا هەتاو گزنگی دا، ئەدەب هەر خۆی و بەبێ دەنگ، لە بەهەشتی بەریندا، سەرپشک و خاوەنی هەموو شتەکان بوو. هەرچی دڵخوازی بکردایە، لە بەردەستیدا ئامادە و زۆربوون.





کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)، وەک نموونەی:

١- تێگەییو شێوەنیە ئەمڕۆ، دا سبەی شایی بکا
پێگەییو دەروێشتە، دا سوبحەی شەهەنشایی بکا
«مەحوی، ١٦»

٢- بۆ کەرێ ئیعلانی حەربی کرد لەگەڵمان شێخ حەسەن
سەیری کەن یاران چ گۆبەندێکی گێڕا ئەم کەرە
«شێخ ڕەزا، ١٩٥»

**١- بەستەیی زوڵفم ئەگەر؛ چاهی زەنەخدانت چ بوو؟**
**سیلسیلەت کردم لە گەردن؛ بەند و زیندانت چ بوو؟**

سیلسیلە: زنجیر.

واتە: ئەگەر تا ئێستا بەداوی زوڵفەکانت بەسترابوومەوە و زنجیرت لە ملم کردبوو، ئەی ئیتر زیندانی چاڵی چەناگەت چی بوو، کە تیایدا زیندانیم دەکەیت؟.

«کوردی» دەڵێ:

بەزوڵف و پەرچەم و ئەگریجەکانت غارەتت کردم
دڵێکم بوو، ئەویشت خستە نێو چاهی زەنەخدانت
«٤٣»

**٢- فیتنەیی چەشمی سیەه، کافی بوو بۆ سامانی مە**
**تیرەبارانی سەفی سەربازی موژگانت چ بوو؟**

واتە: ئەو گۆڵمەز و بەزەم و هەرایەی چاوە ڕەشەکانت بەسەرمانی هێنا، بەس بوو بۆ تالانی سەروسامانمان، ئیتر دوای ئەمە، بۆچی سەربازی برژانگەکانت لێ هاندراین، تیرەبارانمان بکەن؟.

**٣-ئێمە جەمعی عاشقان، ئاشوفتە حاڵی زوڵفی تۆین**
**تۆ لەمە ئاشوفتەتر، زوڵفی پەرێشانت چ بوو؟**

ئاشوفتە: ئاڵۆز، تێکچوو.

واتە: ئێمە و مانانی دڵدارانی تۆ، تێکڕا ئاڵۆز و شێواوی و زوڵفی تۆین، ئەی قژ و زوڵفی تۆ بۆچی لە ئێمە شێواوتر و ئاڵۆزترە!.

**٤- گەر لە ئەووەڵ؛ قەسدی تۆ، پێکانی سینەی مە نەبوو**
**بێ سەبەب، تۆ بەو خەدەنگی غەمزە ڕاسانت چ بوو؟**

قەسد: مەبەست، نیاز، ئامانج.

ڕاسان: ڕاپەڕین، ڕابوون. ئەمە لەو واژە کوردییە پەتی و جوان و ڕەسەن و دەگمەنانەیە، کە لە شیعری کلاسیکی کوردیدا، بەتەنیا «ئەدەب» بەکاری هێناوە؛ هەرچەندە مامۆستا هەژاری موکریانی بەماناکانی: دەست بەرزکردنەوە بۆ هەڕەشە، مانای لێکداوەتەوە (هەنبانە بۆرینە، بەرگی ١، ل ٣٤٠)، بەڵام ڕاستترەکەی: ڕاپەڕین و ڕابوونە.

واتە: ئەگەر لە سەرەتای کارەوە مەبەستت تیرەبارانکردنی سنگی ئێمە نەبوو، ئەی بۆ بێ هۆ، نیگا پڕ نازەکانت لێ ڕاساندین و کردوونەتە تیر و، چاوەنوارِن، سنگمان بئانگێون!؟.

**٥- گەر نەبوو مەنزووری تۆ، ڕەفعی خۆماری عاشقان**
**سوبحدەم بەو بادەوە، نێو بەزمی مەستانت چبوو؟**

مەنزوور: مەبەست.

ڕەفع: لابردن.

واتە: ئەگەر مەبەستت ڕەواندنەوەی سەرخۆشیی دڵدارانت نەبوو، ئەی بۆ لە بەرەبەیاندا بەبادەی مەیەوە هاتیتە ناوجەرگەی بەزمی مەیخۆرانەوە!؟.

**١٠- ئەی «ئەدەب» گەر تابی شوعلەی شەمعی دیدارت نەبوو**
**دەور بەدەور ئەو شەمعە، وەک پەروانە، سووڕانت چبوو؟**

تاب: توانا، وزە، وره، دەسەڵات.

شوعلە: تیشک، ڕووناکی.

واتە: ئەی «ئەدەب» ئەگەر توانای خۆ لەبەرڕاگرتنی پڕشنگی ڕووناکی، مۆمی ڕوخساری یارت نەبوو، ئەی بۆچی وەکو پەپوولەی شەیدای ڕووناکی، ئەو هەموو سووڕان و خولخواردنەت بەدەوری ئەو مۆمی ڕوخسارەدا، لە چی بوو؟!.



## ٨٢

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەقسوور، یا مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)، وەک نموونەی:

١- خەشمێ ل فەقیران مەکە زوو پادشەهی من
پورسێ بکە جارەک لە خەطا و گونەهی من
«مەلای جزیری، ٤٥٤»

٢- بۆچی نەگریم سەد کەرەتم دڵ دەشکێنی
مەی بۆ نەڕژێ، شووشە لە سەد لاوە شکاوە؟
«نالی، ٥٣٥»

**١-خاڵی حەبەشی فامتە، وا نەقشە لەسەر ڕوو**
**یا زەنگیی هیندوو نەسەبە، ساکینی مینوو؟**

خاڵی حەبەشی: خاڵی ڕەش، وەک ڕەنگی پێستی خەڵکی حەبەشە.

فام: ڕەنگ (بەڵام ڕەنگی جوان)، هەرچەندە «فام» بەتەنیا بەکار نایەت، بەڵکو هەمیشە پاشگری واژەیەکی ترە و بەتایبەتیش پاشگری واژەگەلی تایبەت بە«ڕەنگ» و بابەت و کەرەسەی ڕازاندنەوە و جوانیی.

«مەحوی» دەڵێ:

بۆ دەفعی سیخنی کردن لە زاهید، راغیبی مەی بوو
کەچی ساقی وتی: نادەم بەکەم فام، ئەز مەیی گوڵ فام
«٢١٥»

هەروەها «سەعدی» دەڵێ:

برخیز تایسکونهیم این دلق ازرق فام را
بر باد قلاشی دهیم این شرک تقوی نام را
«دهخدا، بەرگی ١١، ل ١٦٩٥٣»

هیندوونەسەب: پێست ڕەشی هیندی زادە، یان پێست ڕەشانی ئەفریقایی.

مینوو: بەهەشت.

واتە: ئایا ئەو خاڵە ڕەشەی نەخشی سەر ڕووتە، هەر خۆی خاڵە، یان پێست ڕەشێکە و لە بەهەشتدایە؟! مەبەستیش لە پێست ڕەشی هیندوویی، یان ئەفریقایی، کەسانی ناموسڵمانن، کە سەرەڕای ئەوەش لەسەر ئایینی هیندین، واتە: ناموسڵمانن، بەڵام لە بەهەشتدان. مەبەستیش لە بەهەشت؛ ڕوخساری یارە.

«کەمالی» دەڵێ:

سەد حەیفە لە ناو جەننەتی ڕووتایە بەدائیم
خاڵی حەبەشی زادە، کە هیندوویەکی سیایە
«١٠٧»

**٢- بۆ دینی خەلایق، کە لە ڕووت پەردەیی لادا**
**یەکدەفعە لە دین، پەردەیی تەعزیمی وەلاچوو**

دین: ئایین، هەروەها بەمانای «دیتن»یش دێت.

واتە: کە یار، پەردەی کەژاوەکەی لادا و ویستی سەیری ئەملاولای خۆی و خەڵک بکات، ئیتر ئەوانەش کە زۆر پابەندی ئایینن و پێیان وایە نابێ چاویان سەیری شتی حەرامی پێ بکرێ، خۆیان پێ ڕانەگیرا و پەردەی شکۆی ئایین و شەرعیان وەلانا و بەرسەرنجیان دا.

یان: کاتێ کە یار پەردەی کەژاوەکەی لادا و سەیری خەڵک و دەوروبەری خۆی کرد، ئیتر خواناسانیش، کە دەبووایە سەیری نەکەن، حەجمینیان لەبەر هەڵگیرا و کەوتنە سەیرکردنی و ئەم ڕێسایەش لە شەرعدا، جۆرە ڕێپێدانێکی هەیە، چونکە ئەگەر شتێک لەسەروو توانا و دەسەڵاتەوە بێ، ئیتر لە ئەستۆ نەگرتنی ئەرکی پێویست، بەتاوان دانانرێ، چونکە «لا یکلّف الله نفساً إلاّ وسعها».

«مەحوی» دەڵێ:

لە پەردەی جیلوەیەکتا ڕوونمایە شۆری سەد مەحشەر
نیقابێ لادە لەو چیهرە، ببینە زەلزەلەی مەخلووق
«١٨١»



**٣- مورغی دڵی من: ڕووتە پەناهی؛ لە جەفای مووت**
**شاهێنی لە ئەو ئاورە، پێ چاترە: تەیهوو**

مورغ: باڵندە، مەل.

پەناه: پەنا، داڵدە، نوا.

تەیهوو: قەتێ، هەوێردە.

واتە: مەلی دڵی من، لە تاو ستەمی زوڵف و پەرچەمت، پەنای بۆ ڕووت هێناوە. هەرچەندە دەشزانم کە ڕوخسارت ئاگرە، بەڵام دەسەڵات چییە! وەک ئەوەی قەتێ، لە ترسی سووتان، پەنا بۆ شەهێن بەرێ؛ کە شەهێنیش هەر دوژمنی قەتێیە.

**٤- چەندت لە موویەک تاقەتە، جانا دڵی عوششاق**
**سەد نامی خودا، بۆ دڵی مە، تاقەتی یەک موو**

واتە: دڵبەرەکەم! ئەویندارانی تۆ، لە بەرامبەر ستەمتدا، ئەوەندەی تاڵە موویەکیان هێز و توانا تێدا ماوە، بۆیە لەباتی جارێک، سەد جار لە خودا دەپاڕێینەوە، تا ئەوەندەی تاڵە موویەک توانا و هێزی تر بەدڵمان بدات.

یان: گیانەکەم؛ تۆ هەر خەریکی ئەوەیت لە ڕێگەی تاڵە مووەکانی ئەگریجە و قژتەوە، دڵدارانت بەداوەوە بکەیت، ئێمەش نەک جارێک، سەد جارە سوێندت بۆ دەخۆین، کە ئیتر توانای تاڵە موویەکتمان نەماوە.

«کوردی» دەڵێ:

وەک تاڵی زەعیفم لە هەتیتەی غەمی دووریت
شایستەیە ئێستاکە، کە حەلقەی کەمەرت بم

«مەحوی» دەڵێ:

زەعیفیی؛ منی کردە پووش، ئێستەکەش
لە من هەر دەکەن ئەم غەزالانە: ڕەم
«٢٣٧»

**٥- بەو خاڵی دوو ئەبرۆت، دەسە ئەگریجەیی داوت**
**دڵ شەشدەرە، دەرچوونی نییە، چاکە وەدەرچوو**

شەشدەر: مەبەست لەو شەش خانە و دەرکەی یاری تاوڵە (تەختەنەرد)یە، کە هەریەکە لە هەردوو یاریزانەکە، تەقەللای ئەوە دەدات، بۆ ڕێگە گرتن لە یەکتری، ئەو (شەش) دەرکە و خانانە، لە یەکتر بگرن.

واتە: بەو خاڵەی نێوان هەردوو ئەبرۆت و چەپکە داوی ئەگریجە و کاکۆڵت، دڵ هەموو ڕێگەکانی لێ بەستراوە و دەرفەتی دەربازبوونی نییە.

**٦- گەر لالەیی بێداخی ڕوخیم دی؛ وەکو لالە:**
**جەرگی منی دڵسووتە؛ لە داخی خەمی ڕەش بوو**

لالە+ی یەکەم: گوڵاڵەسوورە.

لالە+ی دووەم: چرای دەستیی.

واتە: کاتێ گوڵاڵەسوورەی ڕوخساری یارم بینی و سەرنجم دا، وەک گوڵاڵەسوورە ناوەندەکەی ڕەش نەبووە، هەستم کرد ئەو ڕوخسارە گەشە، جەرگی منی دڵسووتاوە و وەک چرای دەستیی لە داخی ستەمی یار، بەسووتان ڕەش دەبێ.

مەحوی دەڵێ:

لە خەزنەی دڵمدا هەرچی هەیە، هەر داغی سەودایە
دەسا ئەم نەقدە، دەردی عیشقی پێ سەودا نەکەم، چبکەم!
«٢٣٠»

**٧- ئەو غەمزەیی ئاهووت، کە شێری دەشکاندن**
**یا لیلعەجەب! ئەورۆ چییە، وا مەیلی بەئاهوو**

یالیلعەجەب: چ سەمەرەیەکە!.

ئاهوو-ی یەکەم: ئاسک.

ئاهوو-ی دووەم: مانای بێ دەسەڵاتان و لە هەمان کاتدا بەمانای «تاوان»یش دەدات.

واتە: ئەو نیگا ئاسکانەت، کە جاران شێری پێ ڕاو دەکران و شێری پێ دەشکان، ئەی ئەمڕۆ، چییە وا ئارەزووت لە تاوانە.

یان: ئارەزووت لە ئازاردانی بێ دەسەڵاتانە!.



**٩- وەک لەعلی لەب و قامەتی تۆ، تورفەیی مەوزوون**
**بیللاهی ئەگەر دیویە کەسێ: خونچە و ناژوو**

تورفە: شتی ناواز و دەگمەن.

مەوزوون: ڕێکوپێک.

ناژوو: سەروو.

واتە: تا ئێستا شتی سەمەرە و ناوازە و لە هەمان کاتیشدا ڕێکوپێک و پێکەوە گونجاوی وەک لەعلی لێوی تۆ و سەرووی باڵات نەبووە و کەس نەیدیوە، کە داری سەروو، بەری خونچە بهێنێ.

یان: تا ئێستا ڕووی نەداوە و کەس نەیدیوە، کە لەعلی لێوی تۆ، لەگەڵ باڵای وەک سەرووتدا، بەوجۆرە هاوئاهەنگ و تەبا و ڕێک و گونجاو بن و ئاوا جوان بێنە پێش چاو.

**١٠- ڕەنجووریی هیجرانی «ئەدەب»، بێ لەبی شەهدت**
**باوەڕ مەکە، گەر بێت و شیفای بێ بەئەرەستوو**

ڕەنجووریی: نەخۆشیی، کزیی، لاوازیی، بیماریی.

واتە: نەخۆش کەوتنی ئەدەب، بەسۆنگەی دوورییەوەیە لە یار، بۆیە دەبێ چارەسەریشی هەر نزیکبوونەوە بێ لە چێژکردنی هەنگوینی لێوی یار و ئەم دەردەم هەر بەوە چارەی دێت و لای هیچ پزیشک و حەکیمێ و تەنانەت لای ئەرەستۆش چارەی ناکرێ.

«کوردی» دەڵێ:

ئەی طەبیب! ئەر تۆ تەماتە، زامی دەردم چارەکەی
تاکو گەرماو گەرمە، بۆی پەیدا بکە: شەهدی ویساڵ

## ٨٣

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن سالم (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)[1] وەک نموونەی:

١- ب نازێ فیرقەتی صوهتم ژ فەرقێ سەر حەتا پێدا
خەدەنگا غەفلەتێ نوهتم ژ بەرقا لامیعا تێدا
«مەلای جزیری، ٣٥»

٢- ئەگەر مەیخانەیە دنیا، کەوا کاسی لەبەر کەئسی
بەنەغمەی عوودی سووتاوی، بەنەشئەی تاسی تاساوی
«نالی، ٦٨٢»

٣- «ڕەزا»ش لەو نەسلەیە، بیبەخشە یاڕەب چونکە قەت نابێ:
گوڵێ بێ خار و بەحری بێ بوخار و ئاگری بێ دووود
«شێخ ڕەزا، ٤٣»

**١- سەبا لەکنم گوزەرگاهت، دیاری دڵبەرە ئەمرۆ**
**شەمیمی عەنبەرئامێزت وەها جانپەروەرە ئەمرۆ**

لەکنم: لە لام، لە نزیکم، لەگەڵم، پێم وابێ، لەوانەیە، بەلای منەوە.

«نالی» واژەی «لەکن»ی بەمجۆرە بەکاربردووە:

لەکن تۆ، خار و خەس: گوڵزارە بێ من
لەکن من، خەرمەنی گوڵ: خارە بێ تۆ
«٣٨٢»

گوزەرگا: ڕێبازگە.

شەمیم: بۆنی خۆش.

واتە: ئەی سروە، پێم وایە ئەمرۆ ڕێبازگەکەت لای ماڵی یارمەوە بێ، یان: لای ماڵی یارمەوە هاتبی، چونکە ئەمرۆ بۆنی خۆشت، گیان دەبووژێنێتەوە و بۆنی عەنبەری لێ دێت.

(١) سەرنج: «ئا» کێشی ئەم شیعرەی ئاوا داناوە: «بەحری ڕەمەل موسەممەن سالم».



«مەحوی» دەڵێ:

بەر خیدمەتی غوباری ڕەهی یاری من: سەبا
دێنێ هەموو دەمێ، بەدوعاوە، سەلامی میسک
«١٨٩»

«مەحوی» واژەی «عەنبەر»ی بەمجۆرە بەکاربردووە:

بۆ کەمێ لەو عەنبەرە، بۆ تەقوییەی ڕۆحی دەماغ
بێنی کا، وەک ئێمە، دایم چاوەڕێی ئیحسانە ڕۆژ
«١٤١»

**٤- بەڕوودا قافڵەی هیجرت، سەرای دڵمی لە خەم پڕ کرد**
**خەرابەی دڵ، لە لوتفی تۆ؛ عەجایەب بەندەرە ئەمرۆ**

قافڵە: کاروان.

سەرا: کاروان سەرا.

خەرابە: کاولە.

واتە: کاروانی دووریی تۆ، کاروانسەرای دڵمی پڕ لە غەم کرد، دڵیشم کە دەمێک بوو خەمی تۆی تێ نەهاتبوو، چۆڵ و هۆڵ و وێرانە و داڕووخاو و کاول بوو، بەڵام ماڵی غەمت ئاوا بێ، کە دڵمی ئاوەدان کردەوە و ئەوەتەی خەمی تۆی لێ هەڵچنراوە، دڵم دەڵێی ئەو بارخانە و بەندەرانەیە، کە باریان لێ دادەگیرێ و باریان لێ دەخرێ.

**٥- لە تەختەی عاجی ڕوخسارت، بەموو داسی نەزەر لەغزی**
**دەداوتدا، دڵی بۆیە لە عەمەدەن شەشدەرە ئەمرۆ**

تەختە: تەختەنەرد، تاوڵە.

واتە: ئەی یارە - پەیکەرە لە عاج دروستکراوەکە، لە کاتێکدا زۆر بەئاستەم لە ڕوخسارتم دەڕوانی، ڕوخسارت ئەوەندە ساف و لووس و خز و سپی بوو، نیگاکانم پێتەوە گیر نەبوون و خزان؛ ئیتر وەک ئەو کەسەی لە یاری تەختەنەرد (تاوڵە)دا، هەر شەش خانەکەی لێ بەسترا بێ، چۆن دڵی تەنگ و گوشراو دەبێ، منیش ئاوا نەمتوانی هیچ جۆرە سەرنج و نواڕینێکم بەئاکام بگەیەنم.

**٦- بەبێ تۆ، خوسرەوی عالەم؛ لە لام وەک ڕەنجی فەرهادە**
**بەوەسڵت ڕۆحی شیـرینم، هەلاهەل، شەککەرە ئەمـڕۆ**

هەلاهەل: کوشندە؛ بۆیەش دەوترێ: ژەهری هەلاهەل. ناوی ناوچەیەکیشە لە نێوان هیند و چیندا (دهخدا، بەرگی ١٥، ل ٢٣٥٠٩). بەڵام لێرەدا مەبەست ئەو جۆرە ژەهرەیە، کە دەستـبـەجێ دەمـرێنێ. لە دەمـێکیـشـەوە لە کـوردیدا دەوترێ: هەلا هەلا بووە؛ واتە: تەفروتونا و نغرۆ بووە.

واتە: ئەگەر تۆی شیرینم نەبیت، ببمە خوسرەوی جیهانیش، لە لام بێهودەیە و وەک ڕەنجی فەرهادە. بەڵام بەپێچەوانەوە، کە بەتۆ بگەم، ئیتر ژەهری هەلاهەل بەلامەوە، وەک شەکر شیرین دەبێ.

**٧- غوڵامی تۆ: «ئەدەب»، تا بوو، لە ناو عوششاقی بێ سەر بوو**
**بەڵێ تاجی سـەرم بۆیە لەسـەریان ئەفـسـەرە ئەمـڕۆ**

غوڵام: نۆکەر، خزمەتکار.

واتە: «ئەدەب»ی خزمـەتکاری تۆ، هەتا لە توانایدا بوو، لە بەرامبـەرتدا و لە ڕیزی ئەویندارانتدا، بۆ هەموو فرمانێکت سەری پێوە نەبوو، واتە: هەمیشە ئامادە و تەیار بوو، بۆیە ئێستا لای ئەو ئەویندارانەی تۆ؛ کە نەیانتوانیوە وەک من بن بۆت، بوومەتە تاجی سەر و سەرداریان و ئەوەندەم بچووکیی خۆم لە بەرامبەرتدا نواندووە، هیچ کام لەو ئەویندارانە، ناتوانن نکووڵی لەو ڕاستییە بکەن و وەک نموونە باسم دەکەن، کە ئەمە بۆ من، پاشایەتییە و ئێستا لە ڕیزی دڵدارانتدا، شاهەنشای هەموویانم.



**٨٤**

کێش: بەحری موجتەس مەخبوون موسەممەن مەحزووف: (مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلن) وەک نموونەی:

١- شەوی بەهاری جوانیی خەوێ بوو پڕ تەشویر
لە فەجری پایزی پیـریی، بەیانی دا تەعـبیـر
«نالی، ٢٠٤»

٢- مەپرسە دەردی غەریبی و لەززەتی وەتەنم
ئەوی لە دەستی دەگریام، ئەمێستە بۆی دەگریم
«حاجی قادر، ٨١»

**١- شەوی گوزەشتە، کە یاری عەزیز میهمان بوو**
**ڕەواقی مە، بەسەفا ڕەونەقی گوڵستان بوو**

گوزەشتە: ڕابووردوو، تێپەڕیو، بەسەرچوو.
میهمان: میوان.
ڕەواق: نوا، بەرهەیوان، ڕاڕەو، تارمە (کە سەری گیرا بێ).
سەفا (صەفا): خۆشیی.
ڕەونەق: گەشەونەشە، پڕشنگ، ڕووناکی

واتە: دوێنێ شەو، کاتێ یاری شیرین لە لامان میوان بوو، کۆڕ و کۆمەڵەکەمان، کە لە بەرهەیوانەکەدا دانیشتبووین، بەزمی خۆشیی و گەشانەوە و ڕووناکییەکی وای پێ بەخشرا بوو، دەتووت گوڵستانە.

«نالی» دەڵێ:

مەجلیسێکی چەمەن و بولبول و بەزمی گوڵ و موڵ
بەدوو سەد مەدرەسە و دەرس و کیتابی نادەم
«٣٠٦»

**٢- نیگاری مە، کە هەمیشە دڵی بەعیشوە دەبرد**
**دوێ شەوێ بەنەزاکەتی؛ هەزار چەندان بوو**

واتە: سەرەڕای ئەوەش کە یاری من هەمیشە ئەوەندە شۆخ و شەنگ بووە و هەمیشە دڵی دڵدارانی بەعیشوە بردووە، بەڵام دوێنێ شەو بەتایبەتی، جۆرە ئاکار و نەزاکەتێکی نواند، هەزار ئەوەندەی جاران زیاتر، دڵی دڵدارانی بەناز و عیشوە برد.

**٣- لە عەکسی نووری جەماڵی، وەکو بەهەشتی بەرین**
**بەهەر تەرەف نەزەرت خستبایە، غیلمان بوو**

عەکس: وێنە، تیشکدانەوە.
نوور: ڕووناکی.
جەمال: جوانیی.
تەرەف: لا، ئاقار.
نەزەر: سەیرکردن.
غیلمان: کوڕی بەهەشتیی.

**٤- لە ڕەنگی دوو لەبی یاقووتی و مەیی لەعلی**
**بیساتی عوشرەتی مە، خیتتەیی بەدەخشان بوو**

بیسات: ڕایەخی.
عوشرەت: ئەنجوومەن، کۆڕ، کۆمەڵ.
خیتتە: وڵات، هەرێم.
بەدەخشان: مەبەست لە هەرێمی بەدەخشانە.

واتە: هەموو شتەکانی دەوروبەر و خۆشمان، ڕەنگی ئاڵیان دەنواند، چونکە ڕەنگی زاڵ؛ ڕەنگی سووریی لێوەکانی و ڕەنگی شەرابی ئاڵی وەکو لەعل بوو، کە بەهەموویان ڕەنگێکی ئاڵیان بەکۆڕەکەمان بەخشیبوو، لەبەرئەوە کۆڕەکەمان دەتوت هەرێمی بەدەخشانە.



**٥- دوو تاقی جووتە برۆی، وەک دوو تیغی بڕندە**
**دوو سەف مژۆڵی سەراسەر، دوو جەعبە پەیکان بوو**

تاق: نیمچە کەوانەیی، چونکە لێرەدا مەبەست لە شێوەی برۆی یارە، کە وەک لە مانای تێکڕای بەیتەکەدا دەردەکەوێ، دەیەوێ ئەو شێوەی «تاق»ە کە وتمان: نیمچە کەوانەییە، وەک شمشێرێک نیشان بدات.
تیغ: هەموو شتێک کە ببڕێ.
بڕندە: تیژ.
سەف: دەستە، پۆل.
جەعبە: (یان: جوعبە): توورەکە، سندووق، هەگبە، کیسە.

واتە: کەوانەی هەردوو تاقی برۆکانی، دوو شمشێری تیژ و بڕندە بوون. هەردوو دەستە مژۆڵەکانیشی، دوو توورەکە تیر بوون، یان: هەردوو پۆلە برژانگەکانیشی، دوو تیردان بوون.

**٦- دوو تورکی بادە پەرستی، دوو نێرگسی مەستی**
**بەغەمزە: تیر و نەزەر: شیر و ناز: فەتتان بوو**

واتە: هەردوو چاوەکانیشی، کە وەک ئەو تورکانەی شەیدای بادەن، ئاوابوون، دوو نێرگسی سەرخۆش بوون. ئەم چاوانە، کاریان هەر ئەوە بوو: بەنیگای ئەفسووناوی تیر بهاوێژن و بەنواڕینیش شیر و بەنازکردنیش، دڵدارانیان شەیدا و شێت دەکرد.

**٧- شوعاعی تەلعەتی ماهی، لە چەنبەری گێسوو**
**وەکو حەلقەیی: هالە؛ مەهی درەخشان بوو**

شوعاع: تیشکدانەوە.
چەنبەر: بازنە، ئەڵقە.
هالە: خەرمانە.

واتە: کاتێ ئەڵقەی پەرچەم و کاکۆڵی نیشتبوونە سەر ڕوومەت و ڕوخساری یار، ڕووناکایی ڕوخساری یاریش، لە نێوان ئەڵقەی زوڵفەکانییەوە بەجۆرێک دەبریسکایەوە، دەتوت مانگی چواردەیە و تریفەکەیشی وەک ئەڵقەیەک بەدەوری ڕوخساریدا دەدرەوشێتەوە.

«سالم» دەڵێ:

ڕووی لــە نــاو طــوڕە، چــرایــە
نەیشەکر قامەتە، قەندی لە لەبایە
«١٣٧»

«نالی»ش دەڵێ:

پەچەیی پەرچەمــیی و پرچی ســیــا
هەر دەڵێی مـانگەوە: کـولمی؛ تیـا
«١٢٤»

**٨- بەغەمزە: باز و ڕەوش: کەو، بەجیلوە: وەک تاوس**
**بەلەنجە: هەر وەکو کۆتر، بەشێوە: جەیران بوو**

ڕەوش: ئاکار، هەڵسوکەوت.

جەیران: ئاسک.

واتە: بەنیگا وەک: باز و بەئاکار وەک: کەو و خۆنواندن و جیلوە، وەک: تاووس و بەنێسکە و لەنجەولار، وەک کۆتر و بەشێوەش، هەروەک شێوەی: ئاسک بوو.

**٩- دەهانی خونچە گوڵی، وەقتی نوتق و خەندە و ناز**
**دەمێکی خونچە تەبەسسوم، دەمێکی خەندان بوو**

واتە: دەمیشی، کە وەک خونچە گوڵ وا بوو، لە کاتی قسە و پێکەنیندا، تاوێک بەئاستەم زەردەخەنەی دەهاتێ و لە خونچە دەچوو، تاوێکیش کە بەناز پێدەکەنی، لە گوڵ دەچوو.

**١٠- بەدینی یار، هەرچی ئەهلی جەمع بوو، مەسروور**
**مەگەر دڵی مە؛ کە لەو زوڵفەوە پەرێشان بوو**

بەدینی یار: بەدیتنی یار (دەشگونجێ مانای: لە ڕوانگە و بەلای یارەوە بێ).

واتە: ئەوانەی لەو کۆڕەدا ئامادەبوون، هەموویان بەدیتنی یار، دڵشاد و بەختەوەر بوون، تەنیا من نەبێ، کە بەسۆنگەی تێکچرژاویی زوڵف و پەلکەکانییەوە، تێکچرژا و ئاڵۆز بووم.



کوردی دەڵێ:

شادن لە تەماشای نەزەرت، مەحرەم و ئەغیار
مروەت نییە تەنها هەر ئەمن دەربەدەرت بم

**١١- «ئەدەب»، وەتێمەگە ئەو نیعمەتە، هەمیشەگییە**
**کە وە یەکێ لە بەسەرچوونی دەوری دەوران بوو**

هەمیشەگی: هەمیشەیی.

دەوری دەوران: سووڕانەوەی ڕۆژگار.

واتە: ئەی ئەدەب! بەلاتەوە وا نەبێ ئەم خێروبێر و خۆشییە، بۆ هەمیشە هەر وادەبێ، بەڵکو ئەوە هەڵکەوتێکی سووڕانەوەی ڕۆژگار بوو، بۆت هەڵکەوت، ئەگینا ئیتر ئەو خێروبێر و دڵشادییە تێپەڕی و خوا دەزانێ کەی هەڵکەوتێکی تری وا شیرین هەڵدەکەوێتەوە.

«سالم» دەڵێ:

چراغی عومری شیرینم، شەوی هیجرت بەیانی هات
زەمانی وەسڵی دڵبەر، ڕۆژگارێ بوو، ئەویش ڕابوورد
«سالم، ٥٥»

٨٥

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن) وەک نموونەی:

١- فەییاضی ریاضی گوڵ و میهر و مل و لەعلی
ئەی شەوقی روخ و زەوقی لەبت ذائیقە بەخشا
«نالی، ٧٦»

٢- نەمزانی فەلەک گۆبەنی هەر بۆ منە، یاخۆ
سەد دەستی وەکو دەستی منی کردووە بەزاغا
«شێخ ڕەزا، ٧»

٣- ئەم نەوعە گوڵە، هەڵدەکەوێ ساڵێ لە قەرنێ
نەک وەک گوڵی بازاڕییە؛ هەر ساڵە کە سەوزە
«حاجی قادر، ١٠٩»

**١- زیبا، صەنەما، چەندە دڵارا پسەری تۆ**
**ڕەعنا قەد و شیرین لەب و نازک کەمەری تۆ**

زیبا: جوان.
صەنەما: ئەی بتەکە.
پسەر: کوڕ.

واتە: ئەی بتە جوانەکە، تۆ چەندە لە بەردڵان و باڵا جوان و لێو شیرین و کەمەر زراڤیت.

**٢- ڕەنگین و گەش و تورفە، چما لالەیی حەمرای**
**ڕەنگین و تەڕ و تازە، مەگەر نەیشەکەری تۆ!**

تورفە: نایاب و سەیر.
چما: هەر دەڵێی، مەگەر، وەکو.
نەیشەکەر: نەی قامیش + شەکەر: قامیشی شەکر.

واتە: ڕەنگاوڕەنگ و پرشنگدار و ڕووناک و سەیریت، هەر دەڵێی گوڵاڵەسوورەیت.



لەوەشدا هەر ڕەنگینیت، کە هەمیشە تەڕ و تازەیت؛ نازانم بۆ ئەوەندەش تامت شیرینە، ناشێ قامیشی شەکر بیت!؟.

**٣- خونچە دەهەن و سەروو قەد و «قورص»ی قەمەر ڕوو**
**قوربانی سەرت، کامە دەلیلە، بەشەری تۆ!**

واتە: ئەندامەکانی جەستە و لەشت، لەوە ناچن ئەندام و پارچەی ئادەمیزاد بن! چونکە: دەمت: خونچەیە و قەدت: سەرووە و ڕوخسارت: مانگە؛ ئاخر قوربانی سەرت بم، بەچ بەڵگەیەک بسەلمێ، کە تۆ ئادەمیزادیت!.

نالی دەڵێ:

١- هەرچی مەحبووبم دەبینێ، وا تەحەییور دەیگرێ
سوێند دەخوا، بەخوا؛ دەڵێ: «بالله ما هذا بشر»
«٨١»

دیسان «نالی» هەر لەم بارەیەوە دەڵێ:

٢- هەرچەندە کە ئینسانە لە بەرچاوی من و تۆ
مومکین نییە ئەم لوتفە، لە ئینسان و بەشەردا
«٢٠٢»

**٤- هەرچەندە کە شیرینە، شەکەر تەعمی لە دەمدا**
**حەددی چییە بێ بەو: دوو لەبی گوڵشەککەری تۆ**

واتە: شەکر، کە هەرچەندە چێژی لە دەمدا شیرینە، بەڵام کەی ڕایەی ئەوەی دەکەوێ وەک لێوەکانی تۆ شیرین بێ!؟.

«نالی» دەڵێ:

لەبەر خەندەی لەبی لەعلی ئەتۆ بوو
کەوا شەککەر دەباری؛ گوڵ دەپشکووت
«١٥٠»

**٥- حەددی چییە تاووس؛ کە بنازێ بەپەڕی خۆی**
**ئەو دەم؛ کە لە گوڵزاری مەدا، جیلوەگەری تۆ**

واتە: ئەو کاتانەی تۆ، لە گوڵزار و باخی ئێمەدا، ناز و عیشوە دەنوێنیت، دیمەنێکی ئەوەندە شیرین و ڕەنگینت هەیە، کە تاووس پڕکێشی ئەوە ناکات، لە ئاستتدا بەپەڕی ڕەنگین و جوانیی خۆی بنازێ.

**٦- خورشید ئەگەر زینەتی ئافاقە بەئەنوار**
**خاڵێکە لە ڕوخسارەیی حوسنی قەمەری تۆ**

خورشید: خۆر.

ئافاق: کۆی (افق)ە و بەمانای ئاسۆگەل.

ئەنوار: ڕووناکیی.

واتە: هەرچەندە خۆر، مایەی ڕووناکیی و جوانیی و ڕازاندنەوەی هەموو ئاسۆیەکە، بەڵام لە ئاست ڕووی جوانی وەک تۆی مانگدا هەر دەڵێی تاقە خاڵێکە بەئاسمانەوە.

**٧- سەد جارە، کەمە پادشەهی موڵکی هونەر بین**
**هەر تاجی سەری، فەخری مەیە؛ خاکی دەری تۆ**

واتە: سەد ئەوەندەی تر، من سوڵتان و پادشای هونەر و داهێنانی هەموو موڵکی هونەر بم، بەڵام هێشتا خاکی بەردەرگاکەی تۆ، وەک تاجی شاهێتی منە، چونکە هەر بەهرەیەکم هەبێ و هەر هونەرێکم لە توانا بێ، هەوێنەکەی هەر جوانیی تۆیە. (ئەم بەیتەش نموونەیەکی تری شانازیی کردنی «ئەدەب»ە بەشاعیرێتی و هونەری داهێنانی خۆیەوە، کە پێی وایە: پاشای هەموو موڵکی هونەرە – واتە: پاشای جیهانی هونەر).

«کوردی» دەڵێ:

لە عەشق و دوورییە «کوردی» ، وەکو بولبول غەزەلخوانە
گەدایی کۆیی تۆ بم، نەک بەشاهەنشاهی دونیا بم

«گۆران» دەڵێ:

من ژیانم، گیانم، هەستیم
هیوام، تاسەم، شادییم، مەستیم



بیرم، هۆشم، هەرچیم هەیە
بەهرەی جیلوەی ئەو زوهرەیە

**٨- فەرمووتە: کە دڵ ڕێی نەدەنێ، سەیری جەمالت**
**کوێی دی هەیە بیپچێتێ! دڵەی دەربەدەری تۆ**

واتە: گوایە فەرمووبووتان کە لەمەولا ئیتر نەیەڵن بێم سەیری جوانییت بکەم... باشە گیانەکەم! وای دابنێ ئیتر نایەم بۆ دیتنت، بەڵام ئاخر هەموو ئارەزوویەکی دڵم، هەر دیتنی جوانیی تۆیە و لە هەر کوێم دەربکەن، دڵم هەر ڕوو لە دەرکەی جوانیی تۆ دەکا و شوێنێکی تر نییە تاسەم لێی بشکێ.

«کوردی» دەڵێ:

دەریشم کەیت و سەد هێندەش ڕەقیبم لێ لە کارا بێ
غولامی حەلقە دەرگوشم، دەبێ دەرباری دەرگا بم

**٩- مەشهوور لە عالەم؛ کە دڵ ئاگای لە دڵانە**
**وەڵڵاهی ئەگەر لەو دڵی مە، باخەری تۆ**

واتە: ئەو پەندە چەند بەناوبانگ و چەند لە ناو هەموو خەڵکدا جێگیرە، کە دەڵێ: «دڵ ئاگای لە دڵە» . کەچی سوێند بەخوا، ئەو پەندە هەرچەند ڕاستیش بێت، بەڵام تۆ هەرگیز ئاگات لە دڵی من نییە و ئەو پەندە لای تۆ هەر نییە.

**١٠- سەد جارە وەکو سەرووی سەهی بێ، قەدی ڕەعنات**
**دەستی کە نەگاتێ؛ چییە بۆ مە، ئەمەری تۆ؟**

واتە: با قەد و باڵاشت وەک داری سەروو بەرز بێت، بەڵام چ کەڵکێکی بۆ من هەیە، کە دەستم نەگاتە لێکردنەوەی بەروبوومی و بەمەش چ بەرێکی بۆ من دەبێ!؟.

«سالم» دەڵێ:

کە من نەخلی مرادم بێ سەمەر بێ
بەمن چی، باخی عالەم جوملە، بەربێ
«١٣٨»

حەلاوەت تا قیامەت نابڕێ «سالم» لە ناو دەمما
ئەگەر نەخلی مرادم دەفعەیی: یەک بۆسە نەوبەردا
«۲۲»

**۱۱- جانا! وەک «ئەدەب» بەستەی ئەو دانە خاڵە**
**تا مردنی؛ جێ حەڵقەی زوڵفە، بەسەری تۆ**

واتە: گیانەکەم! «ئەدەب» دڵبەستەی ئەو دانە خاڵەتە و تا مردنیش جێگەی هەر لە ئەڵقەی زوڵفەکانتدایە و سوێند دەخۆم بەسەری تۆ، کە هەموو ژیانم، هەر ئەمەیە و هیچ ئاواتێکی ترم نییە.



## ٨٦

کێش: بەحری هەزەج موسەددەس مەقسوور، یا مەحزووف: (مفاعیلن مفاعیلن فعولن)[1]، وەک نموونەی:

۱- زەمـــانی لالزارون هەفـــتــــەیی بی
کە فەسڵی نەوبەهارون هەفتەیی بی
غـەنیـمـەت دون ویسـاڵ یاری جـانی
کە وەسڵی ڕووی یارون هەفتەیی بی
«بابە تاهیری عوریان، ۱۱۳»

۲- تە جـانێ من دڤـێت ئەی جـانێ عـالەم
ژ من بستێن ب لەعلێن خوەی شەکەر ریز
«مەلای جزیری، ۲۷۰»

۳- لەبت مـیم و قـەدت ئەلف و زوڵف چیم
دەزانی بەم ســیـــیـــانە؛ تاڵبی چیم!؟
«نالی، ۳۱۲»

**۱- قەسەم بەو خاڵی نەقشی صورەتی تۆ**
**کە هەر بۆ حوسنی تۆ بوو؛ زینەتی تۆ**

واتە: خاڵێک بەڕوخسارتەوەیە، سوێند دەخۆم بەو خاڵەت، کە ئەو خاڵەت لێ بۆتە نەخش و هەر بۆ زیاتریش جوانکردنت، لە ڕووتا چەسپاوە.
«مەلاونا خالید» دەڵێ:

سوگند بەخالی زلبت گشتە پدید
سوگند بە خطی کە بە گردش بدمید
«۵۱۳»

(۱) سەرنج: مامۆستا «ئا» کێشی ئەم غەزەلەی ئاوا نووسیوە: «بەحری هەزەج موسەممەن مەقسوور مەحزووف».

**٢– ئەوەندەی تۆ دەبینم، لێم دەشێوێ**
**کە باخی جەننەتە، یا تەلعەتی تۆ!**

واتە: کە دەوترێ باخی بەهەشت، فلانە شت و فیسارە شتی تێدایە؛ من هەمیشە بەو خەیاڵەوەم کە نموونەی ئەو شتانە بەچاوی ئاسایی ببینم، بۆیە کە زۆربەی زۆری ئەو شتانەی لە بەهەشتدا هەن، لە تۆدا دەیانبینم، ئەوسا سەرم لێ تێک دەچێ، کە ئاخۆ ئەو شتانە: خودی باخی بەهەشتن، یان ڕوخساری تۆن!؟.

«سالم» دەڵێ:

ڕووی دلارامم بەهەشتێکە لە ئیمکانی خلود
ئارێ ئارێ، عیشقی نەسلی ئادەمی بۆیە دەکا
«٤٠»

**٣– بەهەشتی جاویدانم بۆ چییە من!**
**ئەگەر وەعدەی وەفا بێ؛ وەسڵەتی تۆ**

واتە: کەواتە ئەگەر وا بێ و تۆ خۆت بەهەشت بیت؛ ئەی باشە ئیتر ئەو بەهەشتەی ترم بۆ چییە! بەو مەرجەی کە ڕێگەم بدەیت بچمە ناو بەهەشتەکەتەوە؟!.

**٤– بەیادی شەککەری شیرینی لێوت**
**گەوارایە شەرەنگی هیجرەتی تۆ**

گەوارا: سازگار، زوڵاڵ.

شەرەنگ: ژەهر، تاڵاو، کەکرە.

واتە: ئەگەرچی کە ژان و ئازاری دووریت زۆر تاڵ و سەخت و وەک ژەهراوە، بەڵام لە جەنگەی ئەم دەرد و ئازارەشدا، کە یادی شەکری شیرینی لێوەکانت دەکەمەوە، ئەوسا ئەم ژەهراوەم لێ دەبێتە شەربەتێکی سازگار و خۆش.

**٥– بەدیدارت؛ ئەگەر بیدەم هەتا هەم**
**بەنیعمەت هەردوو دنیا: زیللەتی تۆ**

واتە: ئازار و ژەهراوی دیداری تۆ، بەخێر و خۆشیی و بەختەوەریی هەردوو دنیا ناگۆڕمەوە، لەبەرئەوە سوێند بەدیدارت دەخۆم، ژەهراوی دیداری تۆم بەرامبەر بەهەردوو دنیا ڕاگرتووە و دیداری تۆم لە هەردوو دنیا، پێ شایانتر بووە.



**٦– لە دەستی میحنەتت کێ بێ و بناڵێ!**
**شیفای دەردانە، بیللا میحنەتی تۆ**

واتە: هەرچەندە ئازار و ستەمت زۆرن، بەڵام ئازار و ستەمیشت هەر خۆشن و کەس لە دەستیان وەڕس و بێزار نییە، چونکە سوێند بەخودا ستەم و ئازاریشت هەر دەوای دەردانە و ئازار و ژانی دڵە دەردی پێ چارەسەر دەکرێ.

**٧– لەوێ ڕۆژێ، بەخاکی پای گەیشتووم**
**بەجان و دڵمە، شەوقی خزمەتی تۆ**

واتە: لەو ڕۆژەوەی خودا ئەوەی بەنیسیب کردووم، شاد بم بەخاکی بەرپێی، ئیتر لە قووڵایی هەستمەوە، خۆزگە و تاسە و ئارەزووی ئەوە دەخوازم هەر خزمەتێکم لە دەست بێت، بۆ چاکەی تۆ، دریغی نەکەم و بەدڵ و گیان جێبەجێی بکەم.

**٨– خودایە وا دەبێ؛ شەو تا سەحەرگاه**
**من و تۆ بین و ئەمن و سوحبەتی تۆ؟**

واتە: خودایە! تۆ بڵێیی ئەوەم بۆ بڕەخسێ، جارێک من و یار، لە ئێوارەوە تا بەرەبەیان پێکەوە بین و هەر بەتەنیاش من و تۆ، قسە و گفتوگۆی دووقۆڵیی بکەین!.

**٩– گوتم: چی دی، بەجانان دڵ نەدەم من**
**خودایە تۆ دەزانی و فرسەتی تۆ**

واتە: لە دڵی خۆمدا بڕیاری ئەوەم دا، کە ئیتر دڵ بەمجۆرە یارە منداڵکارانە دەم، کە بەبێ پەروا و هەرزەکارانە، ئازاری دڵان دەدەن. بەڵام دەسەڵاتی ئەم بڕیاردانەشم، هەر بۆ ویست و دەسەڵاتی خوا خۆی هێشتەوە، تا بزانم دەسەڵاتی ئەوەم تێدا پەیدا دەکات!؟.

**١٠– «ئەدەب» ئەوڕۆ تەشەککور واجبە بۆت**
**کەوەی پابەندی بووی، بوو قیسمەتی تۆ**

کەوەی: بۆ ئەوەی، لەبەرئەوەی، بەو بۆنەیەوە.

واتە: ئەی «ئەدەب»، ئیتر لەسەرت پێویستە سوپاسی خوا بکەیت، چونکە ئەوەی ئارەزووت دەکرد، خوا لە چارەی نووسیت و بوو بەنسیبت.

٨٧

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم: (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)، وەک نموونەی:

١- ژ هەر بێ داغ و بێ دەردی مەپرسن میحنەتا عیشقی
چ زانن بێ خەبەر ژانا دلێ داغ و کەسەر تێدا
«مەلای جزیری، ٣٧»

٢- ئەگەرچی ڕۆژ و شەو، مەشغوولی نەغمەی موتریبم، ئەمما
لە تەم خاڵی نییە ساتێ، دڵەی مەفتوون و غەمگینم
«کوردی»

٣- نەواڵەی تۆبە دەربێنە، هەتا تەن نەبووەتە سەفرە
پیاڵەی شیشە بشکێنە، هەتا وەک کووپە نەشکاوی
«نالی، ٦٨٥»

**١- گوتم: زوڵفت لەسەر کوڵمت، بەحەلقە و پێچش و تابە**
**گوتی: ئەفعی لەسەر پشکۆ؛ قەراری پێچش و تابە**

واتە: بەیارمم وت: ئەوە بۆ زوڵفەکانت، لەسەر هەردوو کوڵمت، ئەوەندە خۆیان لوول و پەپکە کردووە! لە وەڵامدا پێمی وت: دیارە نازانییت، کە ئەگەر مار، لەسەر پشکۆ دابنرێت، هەر بەوجۆرەی لێ دێت و لە جێی خۆی هەر گینگڵ دەخوات.

**٢- گوتم: کەوتۆتە گەردابی غەمی عەشقت، سەفینەی دڵ**
**گوتی: غەرقی جەمالی من، چ باکی مەوج و گردابە**

گەرداب: گەرداو، گەردەلوول، باهۆز، زریان.

سەفینە: پاپۆڕ.

مەوج: شەپۆڵ.

واتە: پێم وت ئاگات لەوە هەیە، کە کەشتی و پاپۆڕی هەموو تەمەنم کەوتۆتە گەردەلوولی غەمی عەشقی تۆوە، کەچی وتی: ئەوەی شەیدا و سەودای جوانیی من بێ، کەی دەربەستی شەپۆڵ و گەردەلوول و چەڵەمەی هەیە!؟.



**٣- گوتم: پەژمووردە بوو جانا، گوڵی عومرم لە هیجرانت**
**گوتی: پەژموردەیی وەسڵم، هەمیشە سەبز و شادابە**

پەژمووردە: ژاکاو، سیس.

شاداب: تەڕ و تازە و پڕ ژیان، پاراو.

واتە: وتم: گیانم لە حەسرەت دووریت، بێ ناز و سیس و ژاکاوە. دڵبەریشم وتی: دەبێ هەر وابێ، چونکە پێچەوانەی دووریی و لێکدابڕان، کە دیتن و دیدارە، هەمیشە سەوز و تەڕ و تازە و پاراو و پڕ لە ژیانە. لەبەرئەوە ئەوەی لێم دوورە، ئەگەر ئاواتی دیدار و دیتنمی لە دڵدا بێ، دەبێ هەمیشە سەوز و پاراو بێ.

«مەحوی» دەڵێ:

کە سینەی ڕێشمی بەو تیغی نازە ئەنجن ئەنجن کرد
وتی: پەژمووردەیە ئەم لالەزارە، ئاوی تێدەگرم
«٢١٩»

**٤- گوتم: بۆ چوونە لەعلی لەب، دەبێ وەعدەی ویساڵم بێت؟**
**گوتی: لەعلی سوخەندانی، لە عالەم تاق و نایابە**

سوخەندان: قسەبێژ، بوێژ، شاعیر.

**٥- گوتم: دڵخەستەیی دەردی فیراقی تۆم، عیلاجم کە**
**گوتی: چارەت بەگوڵبەرگی تەڕی خۆشڕەنگی سیرابە**

دڵخەستە: دڵ بریندار.

گوڵبەرگ: گەڵای گوڵ.

خۆشڕەنگ: ڕەنگ جوان.

واتە: پێم وت: دڵ برینداری نەخۆشیی و حەسرەتی دووریی تۆبە و چارێکم بۆ بدۆزەرەوە. وتی: چارەت بەوە دێت: کە پەڕە و گەڵای تەڕ و پاراوی گوڵی ڕەنگ جوان لەسەر لێوت دابنێی... واتە: چارەت بەوە دێت، کە ماچێکی لێوی وەک گەڵای گوڵی ڕەنگ جوان و پاراوی دەمم بکەیت.

**٦- گوتم: شیرین دوو لیمۆیێکە مەمکت، لێم ترش ڕوو بوو**
**گوتی: نازی حوسن، نەقدی تورنجی دەستی ئەحبابە**

نەقد: دراو، ڕەخنە.

تورنج (یان: ترنج): میوەیەکی لە شێوەی پرتەقاڵ و نارنج دایە، بەڵام پێستی ئەم، ئەستوور و گرنج گرنج و زبرە.

واتە: وتم: مەمکەکانت هەر دەڵێی دوو لیمۆی شیرینن، کەچی ڕووی خۆی لێ گرژ کردم و وتی: نازی جوانان، لە بەرامبەر ستایش کردنیاندا دەبێ ڕوو گرژ بکەن و وەڵامی ترش بدەنەوە. وەک ئەوەی کە ئێمەی ناسک و جوان، خاوەنی دوو مەمکی وەک شێوەی لیمۆی شیرین، تامی وەک لیمۆی شیرین تامیشیان شیرینە، دەبێ نازکردنمان وەک تورنج وابێ، کە پێستەکەی لە چاو لیمۆدا، زبرترە. بەمانایەکی تر: ئێمەی ناسک و شیرین، هەموو سەرمایەیەکمان، کە وەک دراوێکی کاش، بەدەستمانەوە بێ، دەبێ نازی زبر و ڕووترشیی بنوێنین.

**٧- گوتم: گێسوویی پڕ نێشت؛ لەبەرچی مایلی ڕووتە**
**گوتی: نەت بیستووە عەقرەب، ئەگەر مایل بەمەهتابە!؟**

واتە: پەلک و زوڵفەکانت، کە چزوودارن، بۆچی ئاوا شەیدای ڕوخساری گەرمتن!؟. وەڵامی دامەوە و وتی: ئەی نەتبیستووە، کە دووپشک، ئارەزووی لە مانگەشەوە!؟.

**٨- گوتم: سەوداسەری چینی دوو زوڵفی عەنبەرینی تۆم**
**گوتی: عیللەت بەسەودایە، لە فیکری ڕەفعی سەودابە**

عیللەت: نەخۆشی.

واتە: پێم وت: عەڤداڵ و سەودای چینەکانی زوڵفە بۆن عەنبەرینەکەی تۆم، وتی: ئەوە پێوەندی بەخۆتەوە هەیە و دەبێ بەدوای چارەی نەخۆشیی سەودایی خۆت بکەویت؛ کە سەودایی، جۆرێکە لە پلەکانی شێتیی و لە پزیشکی کۆنیشدا، دەوترا: سەودایی زۆر، شێتیی پێوەیە.



**١٠- گوتم: زوڵم و ستەم تاکەی؟ بەسە جەور و جەفا تا چەند!**
**گوتی: چ بکەم «ئەدەب»، ئەمڕۆ جەفا بۆ دڵبەران دابە**

داب: ڕەوشت و خوو، ئاکار.

واتە: کاتێ لە بەرامبەر ئەو هەموو نامیهرەبانیی و خۆنەبان کردن و چەوساندنەوەیەمدا، سکاڵای خۆمم لای یار کرد، کە ئاخۆ تاکەی و تا چ سنوورێک هەر بەوجۆرە لە بەرامبەرمدا بەوجۆرە ئاکار دەنوێنێ!. لە وەڵامدا پێمی وت: کە ئەی «ئەدەب»، مەگەر نازانی ئاکاری دڵدارانی ئێستا، هەر بەوجۆرەیە، کە من لە ئاستتدا دەیکەم و ئەم ئاکارە بۆتە ڕەوشتمان، کە دڵدارانی خۆمان ئازار بدەین!؟.

«سالم» دەڵێ:

١- گوتم: زارم لە غەم خواریی، وتی: قانوون مەشێوێنە
وەفا بۆ دڵبەران! هەی بێ خەبەر، یەکبارە مەعدوومە
«١٢٣»

٢- زوڵمی بێ پایانی تۆ، تابێ بەدڵ لەززەت دەدا
یا ئیلاهی! قەت نەیێ بۆ زوڵمی «سالم» زەوال
«٧٩»

«مەحوی» دەڵێ:

١- وتم: ئەی دڵ، لە دڵبەر شەکوەکردن حەیفە؛ دڵ دەیوت
ئەمە بۆ دڵبەرێکی دڵنەوازە، ئەو دڵ ئازارە
«٤٦٤»

٢- دڵ گلە و شەکوەی لە ئەشکەنجەی عەزابی زوڵفی یار –
کرد و ئەو فەرمووی: ئەدی زنجیری زاڵم بۆ چییە
«٢٩٤»

٣- لەو شۆخە؛ نیمە چاوی تەرەحوم، کە مەزهەبی؛
جەور و جەفایە، دەرهەقی ئەهلی سەفا بەخصوص
«١٥٥»

«وەفایی» دەڵێ:

١- ڕوو بەئەبرۆتە ئەگەر، بۆچی دڵ ئازارە موژەت؟
ئەهلی قیبلە عەجەبە، وا ڕەوشی کافرییە!
«١٦٢»

٢- پێم گوت بەنەسیمی سەحەر: ئەی پەیکی «وەفایی»
مروەت نییە گوڵ هێندە لەسەر جەور و جەفامە
گوڵ هاتە شەکەرخەندە، بەدەم بادی سەباوە
فەرموویە: «وەفایی»، کە جەفا، عەینی وەفامە
«١٣٤»





کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)، وەک نموونەی:

١- دڵ لە ئیدراکی حەقیقەت بێ بەشە، بێ داغی عیشق
«مەحویا» دانا دەبێ بەم چاوە بینایی بکا
«مەحوی، ١٨»

٢- قامەتی بێ شک نەمامی عەرعەرە، یا سەوسەنە
دەک فیدای ناز و گریشمەت بم، پەریزادەی سنە
«شێخ ڕەزا، ١٨٨»

**سەرنج:** وەک لە جێی خۆیدا ئاماژەی پێ کراوە: «نوسرەتە»ی ئەم غەزەلە لە هەموو تێکستەکاندا «نوسرەتە» و بەتەنیا لای «ئا» ساقییە. منیش زۆر لەوە دڵنیا نیم، کە لە بنەڕەتدا «ساقی»، یان: «نوسرەت» بووبێ! بەڵام «نوسرەت» شاعیرانەترە.

**١- دڵڕوبایی مونحەسیر ئەمشەو بەحاڵی نوسرەتە**
**نووری بەزمی مەیگوساری، چاوی کاڵی نوسرەتە**

دڵڕوبایی: دڵڕفێنی، دڵ کێشان.
مونحەسیر (منحصر): تایبەت.
مەیگوسار: خووگرتوو بەمەی خواردنەوە.
نوسرەت: مەبەست لە نوسرەت خانمی دڵبەری «ئەدەب»ە.

واتە: هەموو تایبەتمەندییەکانی ئەمشەو، تایبەتە بەنوسرەت خانم. چونکە نوسرەت دەزانێ چۆن دڵ دەڕفێنێ و هەر ڕووناکی چاوی کاڵی نوسرەتیش، ڕووناکایی بەزم و خۆشیی بادە خواردنەوەی ئەمشەومانە.

**٢- تێکشکێنن ساغەر و منیا، وەکو زوڵفی بتان**
**بادەیی پڕ نەشئە؛ ماچی لێوی ئاڵی نوسرەتە**

ساغەر و مینا: دەفر و پیاڵەی مەی.

واتە: وەک چۆن لە دوای هاتنی ئاییینی ئیسلام پەیکەری بتەکانیان شکاندووە، ئەوا

ئێستاش نوسرەت خانم، بۆ خۆی پەیامی ئایینێکی تازەیە و بۆ ئەمەش ئەو شتانەی لەمەوبەر، لە بەزمی بادە خواردنەوەدا، بەکار دەبران، دەبێ ئێستا هەموویان بشکێنرێن و لەناو ببرێن. چونکە لەمەودوا بادەی مایەی خۆشیی و شوری سەر؛ ماچی لێوە ئاڵەکانی نوسرەتە.

**٣- بەرنە دەر شەمع و چرا، بۆچی بسووتێن وەک ئەمن**
**ئافتابی شوعلەوەر، نووری جەماڵی نوسرەتە**

ئافتاب: هەتاو.

شوعلەوەر: پڕشنگدار.

واتە: مۆم و چرا هەڵگرن و بیانبەنە دەرەوە و پێویستمان پێیان نییە و ئیتر ڕووناکایی جوانییەکانی نوسرەت، دەبنە هەتاوی پڕشنگداری کۆڕ و کۆمەڵەکەمان.

**٤- موتریب و ڕەققاس و چەنگی، با نەیەن بەو بەزمەدا**
**موتریب و چەنگی دوو زوڵفی، پایماڵی نوسرەتە**

موتریب (مطرب): گۆرانیبێژ.

ڕەققاس (رقّاص): سەماکار.

چەنگ: ئامێرێکی مۆسیقاییە.

پایماڵ: بەرپێ ماڵین (مەبەستی لە زوڵفی نوسرەت خانمە، کە تا بەرپێی درێژە و لە زەوی دەخشی).

واتە: گۆرانیبێژ و سەماکار و ئامێری مۆسیقاییش لەو بەزمەی ئێمەدا نەبن؛ چونکە گۆرانیبێژ و مۆسیقا، بریتین لە هەردوو پرچە درێژ و لە زەوی خشاوەکانی نوسرەت خانم، کە بەدەوری باڵایدا، تا بەری پێی دەلەرێنەوە و وەک سەما بکەن، ئاوان.

**٥- بێ سەبەب ئاوا نەبوو؛ ئەوشۆ هیلالی یەکشەوە**
**بەدری کامل؛ قورصی چیهرەی بێ زەواڵی نوسرەتە**

بەدری کامیل: مانگی چواردە.

قورص: بازنە، کە مەبەستی بازنەی ڕوخسارە.

چیهرە: ڕوخسار.



بێ زەواڵ: لەناو نەچوو، ئاوا نەبوو.

واتە: ئەمشەو مانگی یەکشەوە، هەر لە خۆڕاییی و لە خۆیەوە نەبوو، کە ئاسمانی بەجێهێشت و ئاوا بوو، چونکە دەیزانی کە بازنەی ڕوخساری نوسرەت خانم، مانگی چواردەی جێگیر و ئاوا نەبووی ئاسمان دەبێ.

**٦- نامەوێ لەو بەزمەدا بن؛ شەهد و شەککەر، بۆ مەزە**
**شەککەری شیرین؛ عیتابی ترش و تاڵی نوسرەتە**

واتە: نامەوێ لەو کۆڕەماندا هەنگوینی پاڵاوتە و شەکر، بۆ مەزەی مەی ئامادە بکرێن، لەبەرئەوەی گلەیی و تەشەری ترش و تاڵی نوسرەت خانم، بەسن بۆ مەزەی مەیی و بادەمان.

«نالی» دەڵێ:

شیرینیی و لە تاڵیی و ترشیی عیتابی ڕووت
خاڵت لەسەر جەبین، بۆوەتە دانەیی سماق
«٢٤٩»

**٧- دڵبەرن ئینسافەن ئەو ئەشعاری تۆ؛ ئەمما «ئەدەب»**
**دڵڕوبایی مونحەسیر، ئەمشەو بەحاڵی نوسرەتە**

دڵبەرن: دڵڕفێنن.

ئینسافەن: خوا هەقە، خوا هەڵناگرێ.

واتە: ئەی «ئەدەب» خوا هەڵناگرێ شیعرەکانی ئەمشەوی تۆ، بەڕاستی شیعرگەلێکی دڵڕفێنن، بەڵام لەسەروو ئەم شیعرانەی تۆوە، بەخوا دڵڕفاندن هەر لە نوسرەت خانم جوانە و تایبەتە بەنوسرەت خانم و هەر لە نوسرەت خانم خۆی دێت و خۆی دەزانێ چۆن ئەفسوونی دڵ داگیرکردن بەکار بهێنێ.

## ٩١

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن) وەک نموونەی:

١- کوشتەیێن دیدار و دینێ بێ خەتا هەر دەه سەدن
هەر سەحەر دیسا ژ نوو وێن تێنە کێرێ سەد جەلەب
«مەلای جزیری، ٧١»

٢- تۆ ئەگەر هەستی، لە جێ ڕاوەستی، دێو و کافریش
دێن دەڵێن: بەخودا قیامەت ڕاستە هەستانی هەیە
«نالی، ٥٧٧»

٣- چاوەکەت وەختێ بەئیما، مەیلی جامی مەی دەکا
هەرچی مەی دەیکا لەگەڵ ئەو، ئەو لەگەڵ ئێمەی دەکا
«سالم، ٢٩»

**١- دڵبەرا! دڵداری وەکو تۆ، با وەفا بێ چاترە**
**گەر نەبێ مەیلی وەفاشی، بێ جەفا بێ چاترە**

واتە: ئەی دڵڕفێنەکەم، ئەویندارى وەک تۆ، بەوەفا بێ چاکترە. ئەگەر وەفایشی نەبێ، با سزا و ئازار و جەفای نەبێ باشترە.

**٢- خوسرەوی خوبانی ئەورۆ، عاشقی ڕووتە، گەدا**
**پادشا لوتفی لەگەڵ زومرەی گەدا بێ، چاترە**

خوسرەو: نازناوی پاشاکانی ساسانییە. بەڵام نازناوەکە لە بنەڕەتدا «کەسرا»یە و عەرەبەکان کردوویانە بە«خەسرەو».

واتە: تۆ خۆت سوڵتان و شاهەنشای هەموو چاکانی ئەم سەردەمەیت و ئەویندارانی ڕوخساریشت هەموویان هەژار و ڕووتن، بۆیە ئەگەر پادشا، هەندێ سۆز و میهرەبانیی لەگەڵ هەژاران هەبێ چاترە.

«نالی» دەڵێ:



ئەتۆ: شا: من: گەدا، دادم بپرسە
لە زوڵمی چاوی بیمارت کوژاوم
«٢٩٣»

دیسان ئەم وێنەیە، بەو بەیتەی «نالی» نزیکە، کە دەڵێ:

هەرچەندە کە ڕووتم، بەخودا مایلی ڕووتم
بێ بەرگییە عیللەت، کە هەتیو، مەیلی هەتاوە

«شاهۆ»ش خوسرەوی خوبانی بەمجۆرە بەکاربردووە:

ئەی خوسرەوی خوبانی من، تۆی دەرد و هەم دەرمانمی
وەی ماهەکەی تابانی من، فێنکی دڵی بریانمی
«شاهۆ»

**٣- بەردەوە زوننارى موو، با وەرگەڕێ عالەم لە دین**
**کفری پەنهان، تا بەکەنگێ؟ ئاشکرا بێ چاترە**

زوننار: یان: زنار: واژەکە لە بنەڕەتدا یۆنانییە و بریتی بووە لە: زوناری و کورتییەکەی «زونە» بووە و چەندین مانای هەیە:

(مانای واژەی «زوننار»مان لە غەزەلی ژمارە «١٠» بەیتی «٩»دا لێکداوەتەوە).

- پشتێنێک بووە بەئەستوورایی قامکێک، کە پەیڕەوانی ئایینی زەتوشتی لە کەمەریان بەستووە.
- لە دوای بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام و لەسەر فرمانی موسڵمانان، مەسیحی و جوو، لە پشتیان بەستووە، تا لەگەڵ پەیڕەوانی ئایینی ئیسلام جوێ بکرێنەوە. بەڵام ڕەنگی پشتێنی جوو، هەنگوینیی بووە.
- ئەو هێڵ و پشتێنەیەیە؛ کە ئاست و ئەندازەی مەی و بادە، لە لێوان و پیاڵە و پەرداخ دەکرێ و لە کاتی خواردنەوەی بادەکەشدا، ئەو ئەندازەی مەیەی لە پەرداخەکەدا دەمێنێتەوە، دیسان هەر پێی دەڵێن: زنار.
- هەندێ جاریش لە فارسیدا بەمانای «کەشتی» هاتووە.
- لە زاراوگەلی تەسەوف و عیرفانیشدا، بەمانای ڕاستیی و یەکڕەنگیی لە خواپەرستیدا.
- ملوانکەیەکی ملی کەشیشانی مەسیحە، لەگەڵ خاچێکدا، بەگەردندا ئاوێزانی دەکەن،

ئەم ملوانکەیە زۆر جار لە هەورێشم، یان لە کەتان دەبێ.

– زۆر جاریش هەمان پشتێن بەستنی زننار، بەمانای: ئامادە و تەیار بوونە بۆ ڕاپەڕاندنی کار و فرمانێک، لە کوردیشدا دەوترێ: فلانە کەس، کەمەربەستەی فیسار کەسە.

– هەندێ جاریش بەمانای ئاشکراکردنی نهێنییەکی شاردراوە دێت، کە لە فارسیدا بەمەیان دەڵێن: لە ژێر جبەدا شاردنەوە.

«حافظ»یش لەم بوارەدا ئاوا دەڵێ:

حافظ این خرقه که داری تو ببینی روزی
کـه چه زنار ز زیرش بەجفـا بگشـایند
«دهخدا، بەرگی ٩، ل ١٢٩٣٨»

ئەم بەیتەی «ئەدەب» لێرەدا، بەم مانایە دێت، نەک بەمانای پشتێن و شتی تر، کە بەداخەوە تا ئێستا مانای واژەی «زوننار» لە ئەدەبی کلاسیکی کوردیدا، هەر بەمانای «پشتێنی مەسیحییانە» لێکدراوەتەوە.

چونکە «ئەدەب» دەڵێ:

بەردەوە زوونناری موو، باوەرگەڕێ عالەم لە دین
کفری پەنهان، تا بەکەنگێ؟ ئاشکرا بێ چاترە

بەواتای ئەو نهێنییە شاراوەیەی لە دەمێکەوە پاراستووتە و ئەگەر دەربخرێ دەبێتە ئاشکراکردنی شتێکی تازە و وەرسووڕانی بڕوای خەڵکی لە دوای بڕوایەکی تازە. ئەوا بەمەش ئەدەب، نرخ و بەهای زوڵف و قژی یار بەباڵا دەبڕێ و دەری دەخات، کە ئاستی خۆشەویستیی قژ و زوڵفی یار، بەئەندازەی خۆشویستنی خەڵکە، بەرامبەر بەبڕوا و ئایینێکی تازە.

«مەحوی» دەڵێ:

لەگەڵ دەستی مەلا، ڕێ ناکەوێ زوونناری زوڵفی یار
وەکو «شێخ» ئیختیاری مەزهەبی «تەرسا» نەکەم، چبکەم!
«٢٣١»



**٤– زوڵمەتی کرداری من، خاڵت لە خولدی ڕوومەتت**
**نامەیی ئەعمالی ئێمە، تا سیا بێ چاترە**

خولد: بەهەشت.

واتە: کارەکانی من هەموویان ڕەشن، وەک خاڵە ڕەشەکەی بەهەشتی سەر ڕوومەتت، کە سەرەڕای ئەوەش ڕەنگی ڕەشە، بەڵام بەسەر کوڵمەتەوە بۆتە نەخش و جوانیی. لەبەرئەوە ئەگەر کرداری ڕەشی منیش، ببنە مایەی جوانترکردنی تۆ، ئەوا خۆزگە دەخوازم و تەقەللا دەدەم، کە کرداری من، تا ڕەشتر بن چاکترن.

**٥– گەر ڕەقیبت لێم ڕەزا بێ، مەنعی عیشقی تۆ دەکا**
**نامەوێ قەت لێم ڕەزا بێ، ناڕەزا بێ چاترە**

واتە: من و ڕەقیب، هەردووکمان نەیار و ناحەزی یەکترین و هەرگیز کەسمان لە کاری ئەویترمان ڕازی نین، بۆیە ئەگەر ڕەقیبت لێم ڕەزا بێ، ئەوا دەبێ من، مل بۆ داخوازییەکانی ڕەقیب دانەوێنم، کە ئەویش دەست هەڵگرتنە لە ئەوینی تۆ، لەبەرئەوە ڕازیبوونی ڕەقیب لێم، مانای سازشی منە لەسەر ئەوینی تۆ و ئەمەش بەمن ئەنجام نادرێ. بۆیە لە ڕێگەی ڕەقیبتەوە، هەر چیم لەسەر ئەوینت بەسەر دێت، با بەسەرم بێ و پێم خۆشە و پێی ڕازیم و ڕازیبوونی ڕەقیبتم، پێ ناڕازیی خۆمە.

**٦– من شەوێم هیجرانی تۆ دی، ئەودەمەم هاتوویە لا**
**ئەودەمەش جانا، تەلافی «ما مَضی» بێ، چاترە**

تەلافی: لەناوبردن، لە بەرچاو نەگرتن.

ما مضی: ئەوەی تێپەڕیوە، ئەوەی چووە.

واتە: سەد شەوی دووریی و دابڕانی سەخت و دژواری تۆم چەشتووە و ئێستا لەم هەل و دەرفەتەدا، کە بۆ لام هاتوویت دەبێ کارێکم لەگەڵ بکەیت، هەرچی ژان و خەمی ئەو سەدان شەوە پڕ ئازارە هەیە، لە بیرم بەریتەوە و ئەمشەو قەرەبووی ئەو هەموو دووریییەم بۆ بکەیتەوە، بەجۆرێک کە منیش هەرچی دووریم چەشتووە، لە یادی بکەم.

**٧- تۆ دەفەرمووی جانفیدای ئەو خاکپایەم، کە بڵێ:**

**گەر لە تۆ بێتو جودا بێ، خاکی پا بێ چاترە**

خاک پا: خاکی بەرپێ، یان: شتی بێ بایەخ و بێ نرخ.

واتە: تۆ دەفەرمووی: کەسێکم خۆش دەوێ، کە بڵێ خۆم بەقوربانی خاکی بەرپێ دەکەم. منیش دەڵێم: خۆ بەقوربانی کردن، بەمانای جیابوونەوە لە خاکی بەرپێ. لەبەرئەوە حەز دەکەم هەر زیندوویەکی بێ بایەخ و بێ بەها بم، تا لە خاکی بەرپێی تۆ جیا نەبمەوە.

«مەحوی» چەند جوان ئەم وێنەیە ڕوونتر دەکاتەوە:

ڕێ درا بێ بەگەدایێ، نەفەسێ لەو دەرەدا
هەر کەسێ، تا نەفەسە، عارییە شاهەنشاهی
«٣١٩»

**٨- با وجوودی شۆری غەمزەی تۆ، چ شۆرێک و چ بەرگ**

**ڕاستیی عوششاقی تۆ، تا بێنەوا بێ چاترە**

واتە: کاتێ دڵدارانی تۆ، هەموو خەون و ئاواتێکیان، تیلەی چاوێکی تۆ بێ، کە بۆیان دەبێتە ڕووداوێکی وەک هەڵلا و هەرایەکی یەکجار خۆش و شیرین و هەموو شتێکی تریان بیر دەچێتەوە و ئەوی پێوەندی بەجلوبەرگ و جێگەی حەوانەوە و داڵدە و ئامێزێکی میهرەبانەوە هەبێ، لە یادیان نییە، ئیتر چ پێویستییەکیان بەمیهرەبانیی بەرامبەر نواندن و جلوبەرگ و پۆشتەییەوە هەیە!؟ لەبەرئەوە ئەویندارانی تۆ، تا بێ بەرگ و بێ جێگە و بێ نوا بن، چاکتر بیر لە تیلەی پڕ نازی چاوەکانت دەکەنەوە.

**٩- باری خەم کەوتن لە دڵدا، تازە ناڵەم بۆ ببێ**

**کاروان خستی، جەرەس: تا بێ سەدا بێ چاترە**

واتە: جاران بەر لەوەی کاروان، بگاتە کاروانسەرا و بارخانە و خانەکان، دەنگی زەنگوڵەی ملی وڵاخ و ژاوەژاوی نزیکبوونەوەیان و دەنگی وڵاخدارەکانیان، خاوەن کاروانسەرا و بارخانە و خانەکانیان بەئاگا دەهێنایەوە، تا خۆیان بۆ جێگەکردنەوەی بارەکان و تاقەتکردنی وڵاخەکان ئامادە بکەن. ئەدەب لێرەدا دەڵێ: کە بارخانەی خەم، بەبێ ئاگاداریی و ئامادەکردنی ڕۆحم، لە دڵدا باریان خست، ئیتر دەنگە دەنگ و هاوار و ناڵە و بیستنی دەنگی زەنگوڵەی کاروانم بۆچییە و دەبێ پێم خۆش بێت، یان ناخۆش



بێت، خۆم بۆ تەدارەکی جێگەکردنەوەی ئەم باری خەمانە، ئامادە بکەم و شانی بەبەر بدەم و هاوار و ناڵە و ئاخ و ئۆفیشم لێ نەیەت و بەبێ دەنگیی، خەمەکانم بلاوێنم.

**١٠- تا بزانن قەدری وەسڵی یەکتر و جەوری فیراق**

**جار بەجار عاشق لە مەعشووقی جودا بێ چاترە**

واتە: بۆ ئەوەی دڵدار و دڵبەر، نرخ و بەهای دیدار و دیتنی یەکتر چاک بزانن، باشترە وایە جار جارە ئەو دووانە لە یەکتر دابڕێن و دوور بکەونەوە. ئەوسا ئازار و ژانی دووریی، تام و چێژی دیدار و ژووان، مەزنتر و شیرینتر دەکات.

**١١- نانوێنێ ئەو دڵەی تەنگ بێ، لە عەکسی ڕوومەتت**

**ئاوێنەی دیداری تۆ، بالانما بێ چاترە**

واتە: تیشکدانەوەی پڕشنگ و ڕووناکی و خەرمانەی دەوری ڕوومەتت، مەودایەکی بەرینی بۆ خۆی داگیر کردووە و ئەوەی دەیەوێ ئەو هەموو ڕووناکی و خەرمانەیە، لە ئامێزی دڵیدا جێگە بکاتەوە، دەبێ خاوەن دڵێکی بەئەندازەی ئەو خەرمانەیە، گەورە بێ، بۆیە ئەوینی تۆ، دەبێ لە دڵی تەنگدا نەبێ.

یان هەڵدەگرێ وێنەکە، بەوجۆرەش بخوێنرێتەوە؛ کە ئەوینی تۆ، بەئەندازە و بارتەقای درەوشانەوە و بلاوبوونەوەی ناوبانگتە و ئەو کەسەش کە دڵداری تۆ بێ «دەبێ خۆی بۆ ئەوە ئامادە بکات، کە ئەم ناوبانگە بەربلاوەت، دەردەسەریی و کێشەی زۆر لە دوایە و دڵێکی گەورە و پشوویەکی نەپساوی دەوێ، تا لە ئەستۆی بگرێ.

**١٢- صورەت و مەعنا یەکێکە، بۆ نیشاتی عارفان**

**گەر مەجازیی، گەر حەقیقی، بێ هەوا بێ چاترە**

عارف: واژەیەکی خوداناسییە و بەمانای ناسین و پەرستنی خوا، لە ڕێگەی پشکنین و ئەزموونی ڕۆحیی و دڵنیابوونی بێ چەندوچوونەوە، کە پەرستنی خودا، شتێکە شایان و پێویست، نەک لە بەرامبەر خۆزگە و ئومێد و ترس و سزادانی دواییدا. ئەم واژەیە قووڵتر و بەربلاوترە لە واژەی «تصّوف»ی عەرەبی و پێوەندییان بەیەکەوە نییە و سەرچاوەکەیشی، چ لە باری واژەکە و چ لە چۆنێتی پەرستنی خوداشەوە پێوەندی بەفکری «زهد» و «تصوف»ی عەرەبییەوە نییە و لە هەردوو بوارەکەشدا، مێژووی بۆ سەرچاوەکانی یەکتاپەرستی هیندی – ئاریایی دەگەڕێتەوە.

واتە: لای مرۆڤی عارف، وێنە و مانا، بۆ هەڵسوکەوتی ئەوینەکەیان هەر یەکێکن و ماناشیان پێکەوە تەواو دەبێ، بۆیە ئەگەر ئەوینەکە مەجازیی بێ، یان حەقیقی، دەبێ شان بەشان و هاوتەریبی یەکتر گەشە و پەروەردە بن و بۆ هەردوو ئەوینەکەش، چەند سادە و ساکار و بێ ڕووتووش بن چاکترە.

**۱۳- ئێوە فەرمووتان: «ئەدەب» جانی ببەخشێ بۆ ویساڵ**
**نامەوێ جانی عەزیزم، خاکی پا بێ چاترە**

واتە: تۆ وتبووت: بۆ ئەوەی «ئەدەب» بتوانێ بەمن بگات، دەبێ لە ڕێگەمدا خۆی ببەخشێ. منیش دەڵێم: گیانێک لە پێناوی تۆدا نەبەخشرێ، بۆ چمە!، لەبەرئەوە حەز دەکەم بۆ ئەو مەبەستە (بەیەک گەیشتن) گیانم ببەخشم و لە دواییدا کاتێ گیانم بەخۆڵ و خاک دەبێ، با لە بەرپێی تۆدا ڕۆ بکرێ.



## ۹۲

کێش: بەحری موزاریع ئەخرەب مەکفووف مەقبووز: (مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن)، وەک نموونەی:

۱- دەستم لە گەردنی خۆت هەڵمەگرە ئەی حەبیبە
وەبزانە خوێنی خۆمە، یا مننەتی ڕەقیبە
«نالی، ۳۹٤»

۲- ساقی لە پەردە دەرهات، جامی شەرابی هێنا
دڵ خیرەما لە حیرەت، مەه ئافتابی هێنا
«سالم، ۳۵»

۳- ئەی بێ نەزیر و هەمتا، هەر تۆی کە بەرقەراری
بێ دار و بێ دیاری، بێدار و پایەداری
«حاجی، ۱٤۳»

**۱- ئەو قاسیدی چ مەملەکەت و کامە کیشوەرە**
**ئیزهاری مەتڵەبی لە دەهەن شەهد و شەککەرە!**

قاسید: نامەبەر، تەتەر، پەیامبەر.

مەملەکەت: وڵات، ناوچە، هەرێم.

کیشوەر: نیشتمان، وڵاتی گەورە.

ئیزهار: دەرخستن، دەرکەوتن.

مەتڵەب: مەبەست، داخوازیی، پەیام.

دەهەن: دەم، زار.

واتە: ئەرێ ئەو نامەهێنەرە، خەڵکی کام وڵات و هەرێمە، کە لە دەرخستنی مەبەستەکانیدا، دەڵێی هەنگوین و شەکر لە زاریەوە دەردێن.

**۲- پەیغامی کامە یارە، کە قاسید دەڵێی دڵی**
**ئەنفاسی عیسەوی لە تەلەففوظ موصەووەرە**

پەیغام: پەیام، ڕاسپاردە.

تەلەففوز (تلفظ: عەرەبی): شێوەی ئاخاوتن، فۆنەتیک.

موصەووەر: وێنەگر، وێنەکێش، وێنەساز.

واتە: ئەوە ڕاسپاردەی کامە دۆستی هێناوە، کە هەناسەکانی دەڵێی هەناسەکانی حەزرەتی عیسایە و شێوەی دەربڕینەکانی، ئەوەندە جوان شتەکان بەرجەستە دەکات، وەک ئەوەی وێنەی شتەکانمان لە بەرچاودا، وێنە بۆ بکێشێ.

**٣- پەیغامی ئاشنایە وەها جانفەزا بڵێ:**
**پەیغامی ئاشنا، نەفەسی ڕۆح پەروەرە**

جانفەزا: گیانپەروەر.

واتە: کەواتە ئەو ڕاسپاردەیە، هەر ڕاسپاردە و پەیامی دۆستانەیە؛ کە بەوجۆرە ڕۆح پێی بکرێتەوە و هەناسە و تەوژمی تازە بەڕۆح بدات.

**٤- جانا مەگەر سەبا گوزەری خستە پەرچەمت**
**ئەمڕۆکە وا جیهان، لە شەمیمی موعەتتەرە!**

جانا: گیانەکەم، ڕۆحەکەم.

سەبا: شەماڵ، سروە.

گوزەر: ڕێگە.

شەمیم: بۆن، بۆن و بەرامە.

موعەتتەر: گوڵاوی.

واتە: ڕۆحەکەم، ئەرێ ئەوە بای سروە، بەناو زوڵفی تۆدا تێپەڕیوە، وا سەرتاسەری جیهان، پڕ لە بۆنی گوڵاو، واتە: بۆنی تۆ بووە.

«سالم» دەڵێ:

سەبا!، سا بێ بەسەر گێسوویی یارا
دەماغم وشکە، بێ بۆی مشکی تاتار
«٥٩»

«مەولەوی تاوەگۆزی»ش دەڵێ:

بۆ باڵای هەرزان، وە دەشت و هەردان
نمەز ڕای لای تۆم، وەکام گوزەردان!



**٥- جەورت: غەذایی ڕۆحی منی سوختە دڵە**
**ئاتەش موسەللەمە؛ کە حەیاتی سەمەندەرە**

جەور: سزا، چەوساندنەوە.

غەذا: خۆراک.

سوختە: سووتاو.

ئاتەش: ئاگر.

موسەللەم: ئاشکرا، شتێک کە سەلماندنی نەوێ.

سەمەندەر: باڵندەیەکی ئەفسانەییە و لە ناو ئاگردا دەژی.

واتە: سزا و چەوساندنەوەت، خۆراک و توێشووی گیانی منی دڵسووتاوە، کە سووتانی دڵی من، لەبەرئەوەیە کە خۆم لە ئاگری عیشقدا بوومەتە سەمەندەر و ئاشکراشە کە سەمەندەر، هەموو ژیانی هەر لە ئاگردایە و بەبێ ئاگر ناژی. بۆیە سزای تۆش، کە وەک ئاگرە و لە دڵم بەردەبێ، دەبێتە خۆراک بۆ گیانم.

**٦- هەرچەندە ڕۆژی من؛ سیەهە بێ فرووغی ڕووت**
**کاشانەکەم؛ شەوانە: بەیادت منەووەرە**

سیەهـ: (سیاه): ڕەش.

فرووغ: ڕووناکی.

کاشانە: ماڵ، خانوو، لانە.

منەووەر: گەش، ڕووناک.

واتە: ئەگەرچی ڕۆژانی ژیانی من، بەبێ ڕووناکیی ڕووی تۆ، تاریکن، بەڵام ڕوومەتەکانت ئەوەندە ڕووناکیان بەڕۆحم بەخشیوە، کە لە منەوە ڕووناکیی سەردەکا و شەوانیش ماڵەکەم، هەر بەو ڕووناکییەی ڕوومەتەکانت، ڕووناک و گەشە.

«سالم» دەڵێ:

١- ڕاستە دڵ بەندە لە طوڕەی زوڵمەتی زوڵفت، وەلێ
ڕەوشەنە کولبەم لەبەر شەوقی خەیاڵی ڕوومەتت
«٤٦»

٢- هەر شەو، کە مەهتابی ڕوخت دەرکەوێ لە دوور
کولبەی دڵم لە تیرەگییا پڕ دەبێ لە نوور
«٦٤»

٣- نەبوونی شەمعی کافووری لە وەسڵا سەهلە بۆ عاشق
هەموو شەو ڕەوشەنە کولبەم، لە شەوقی ڕوویی جانانم
«٨٢»

٤- لە دورجی سینەما، تا گەوهەری یادی ڕوخی تۆ بێ
لەبەر شوعلەی ئەوا، شەو تا سەحەر، مەیلی چرا ناکەم
«٨٥»

**٧- سۆزی دەروون و یادی سەری طوڕەکەت مودام**
**بۆ مەحفەلی خەیاڵی مە، وەک عوود و مەجمەرە**

مودام: هەمیشە، بەردەوام.

مەحفەل: کۆڕ، کۆمەڵ، مەجلیس.

عوود: شتێکی بۆن خۆشە.

مەجمەر: ئاگردان، یان: ئەو ئامێر و دەفرەی بۆ عوود سووتاندن ئامادەی دەکەن.

واتە: سۆزی دڵی من، کە هەمیشە وەک ئاگر دەسووتێ و سەری پەرچەمی تۆش، کە هەمیشە بۆن و بەرامەی خۆش بڵاو دەکاتەوە، هەردووکیان کەرەسەی کۆڕ و کۆمەڵی خەیاڵی ئێمەن، وەک ئەوەی بەئاگری سۆزی من، داری عوودی بۆن و بەرامەی سەر و پەرچەمی بۆنخۆشی تۆ بسووتێنن.

یان: سۆز و ناڵەی دەروونی من و ئامێری عوودی دروستکراو لە تاڵی پەرچەمی تۆ؛ کەرەسەی کۆبوونەوەی کۆڕ و کۆمەڵی ئێمەن.

«نالی» دەڵێ:

١- لە شەوقی ڕوویی شەمع و زوڵفی دوود و طوڕەیی مەجمەر
سوپەند و عوود و پەروانە، بخوور و غالیە سووتن
«٣٢٩»



٢- زوڵفت، کە لەسەر ڕوو، بەخەم و تابشە ئەمڕۆ
دوودی سیەهی عوودە، لەسەر عاریزی پشکۆ
«٣٨٤»

**٨- مەنزووری من؛ لە وەسڵی لەبت، ڕەغمی دوژمنە**
**گەر نە، لە لام وەفا و جەفا؛ هەردوو یەکسەرە**

مەنزوور (منظور: عەرەبی): مەبەست، نیاز.

ڕەغم: سەرەڕا، سەربار.

واتە: من لە ڕقی ناحەزان، مەبەستم ئەوەیە بگەمە لێوەکانت، لەبەرئەوەی خۆم لە هەموویان بەشایستەتر و نزیکتر لە هەموویان دەزانم، ئەگینا چ وەفا و چ جەفای تۆم لە لا وەک یەکە و بۆ من هیچ جیاوازییەک لە نێوانیاندا نابینم و هەردووکیان یەک شتن.

**٩- سەودایێ تۆ؛ نە عاریزیە بۆمە، عیشقی تۆ**
**ڕۆژی ئەزەل، بەئاب و گڵی موخەممەرە**

عاریزی (عارض: عەرەبی): ڕاگوزاری.

موخەممەر: هەوێنی شتێک کە پێی هەڵشێکرا بێ.

واتە: ئەوینی تۆ، بۆ ئێمە، هەروا شتێکی ڕاگوزارییانە نییە، بەڵکو ئەوینی تۆ، هەر لە ڕۆژی بناغە دانانی گەردوونەوە وەک هەوێنێک، لەگەڵ ڕۆحی زگماکی مندا، پێکەوە هەڵشێلراون و دەبێ پێکیشەوە بن.

**١٠- حوکمی قەزا بوو حەبسی دڵی مە، بەدامی مووت**
**غەیرەز ڕەزا؛ چ چارە، بەهەرچی موقەددەرە**

حوکمی قەزا: چارەنووسی خودایی.

غەیرەز ڕەزا: جگە لە ڕازیبوون.

واتە: هەر بەهەمان ڕێسای ئەزەل، دەبووایە چارەنووسی ئێمە وا بنووسرێ، تا بەداوی ئەوینی تۆوە ببم. ئەمەش بڕیاری خودایە و دەبێ بۆ ئەم بڕیارە، لە ڕازیبوون زیاتر چیم هەبێ و! لەم چارەنووسەشدا هەر چیم بەسەردێ و هەر چیم لە چارە نووسراوە، دەبێ لە ئەستۆی بگرم و متەقم لێوە نەیەت.

**١١- زاهید لەمە بەحوسنی روخت شیفتە ترە**
**حەیفێ کە بەو لیباسەوە، بۆی نامویەسسەرە**

زاهید: خوداناسی درۆینە، خواناسی بەڕواڵەت.

حوسن: جوانیی.

شیفتە: سەودا.

لیباس: جلوبەرگ.

مویەسسەر: ئاسان، لوان.

نامویەسسەر: نائاسان، نەلوان.

واتە: زاهید، کە بەڕواڵەت و بەدرۆ، خەریکی خواپەرستییە، لە بەرامبەر جوانیتا، لە ئێمە زیاتر سەودات بووە، بەڵام بەو هۆیەوە کە جلوبەرگی خواپەرستیی پۆشیوە، بۆی دەست نادات وەک ئێمە بەئاشکرا دەری ببڕێ کە سەودات بووە.

«نالی» دەڵێ:

١- زاهید! مەکە مەنعی دڵ، بۆ تۆ نییە سوودی گوڵ
خاکت بەسەر ئەی غافڵ، کەوتوویە چ سەودایە؟!
«٥٦٢»

٢- سوفیی خەڵوە نشین، بۆ نەزەرێکی گوڵی ڕووت
ڕەنگە وەک نەرگسی تەڕ، چاوی سپی بێت و دەڕێ
«٦٥١»

«مەحوی» دەڵێ:

چاوی مەیگوونت وەها مەیخانەی ئاوا کردەوە
چۆڵی کرد ئاخر بەزاهید: خەڵوەخانەی شەعبەدە
«٢٧٣»

**١٢- گەر مەنعە، گەر مەلامەتە، تا مردنم «ئەدەب»**
**زوونناری گەردنم، سەری گێسووی دڵبەرە**

مەنع: قەدەغە، پاوان، ڕێگە لێگرتن.

مەلامەت: سەرکۆنە، گلەیی، سەرزەنشت.



واتە: هەر چیم لە بەرامبەر ئەوینتدا پێ بکەن، هەر لە ڕێگە لێگرتنمەوە؛ تا سەرکۆنە و گلەیی، بڕیارم داوە ئەوەی بەلای خەڵکەوە، وەک کفر و حەرام و کاری بێ دینییە، دەبێ تا مردنم دەستی لێ هەڵنەگرم و زوونناری گەردنم، ئەڵقەی پرچەکانی تۆ بێ.

«نالی» دەڵێ:

غەیری زوڵفی تۆ، کە ڕشتەی عومرمە
دەست لە «ما فیها»ی زەمان بڕیاوم ئەز
«٢٢٢»

«سالم» دەڵێ:

حەدیسی نەنگ و نامم، زۆر شوکر مەشهووری عالەم بوو
لە حەرفی موددەعی ناکەس، نییە باکم منی سەودا
«٣٧»

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)، وەک نموونەی:

١- سوفتی یێن پوڕ لەعل و مەرجانان بە موژگانان حەتا
دیدە ڕەوشەن بوون ب دینا دێم دوڕێ سیمین غەبەب
«مەلای جزیری، ٧٤»

٢- عـاشـقی بێ دڵ دەناڵێ، مـەیلی گـریانی هەیە
بێ شکە هەورەتریشـــقـــە؛ تاوی بـارانی هەیە
«نالی، ٥٧٢»

٣- تا بەسـەر باغی دڵا بێ، بای خـەزانی فـیـرقـەتت
عـارزم بۆ سێـوی ڕوخسـارت، لە ڕەنگی بەی دەکا
«سالم، ٢٩»

**١- خۆشە بادە، هەر دەمەی؛ ئەمما بەیانی خۆشترە**
**ئاشکاریش خۆشە عەیش، ئەمما نیهانی خۆشترە**

ئاشکار: ئاشکرا.

عەیش: ژیان.

نیهانی: نهێنی.

واتە: بادە خواردنەوە هەموو کاتێ و هەمیشە خۆشە، بەڵام بەیانیـان خۆشترە. ژیانیش ئەگەرچی بەئاشکرا و بێ پەردە خۆشـە، بەڵام ئەمـیش ئەو شتـانەی خـۆشە، کـە نهـێنین و دوور لە چاوی خەڵکەوە دەکرێن؛ کە مەبەستی ئەدەب لێرەدا، وەک ئەویندارێی و ژووانە.

**٢- عومر هەر فەسڵێکی خۆشە، گەر بەنیعمەت رابرێ**
**گەر خودا بیدا بەڕەحمەت، نەوجەوانی خۆشترە**

نەوجەوانی: لاوێتیی.

واتە: تەمەن ئەگەر بەدەست ڕۆیشتوویی دەست بدات، هەموو وەرزێکی خۆشـە، بەڵام وەرزی لاوێتیی، سەرباشقەی هەموو وەرزەکانی تەمەنە و ئەگەر هەر لە سەردەمی لاوێتیدا خودا بتداتێ، لە هەموو وەرزەکانی خۆشترە.



**٣- حیشمەتی شاهان ئەگەرچی خۆشە، بۆت مومکین ببێ**
**گـەر لە من پرسی؛ بەجـانـان پاسـەبانی خـۆشـتـرە**

حیشمەت: دەبدەبە و شکۆ.

پاسەبان: پاسەوان.

واتە: هەرچەندە دەبدەبە و شکۆی شاهان؛ ئەگەر بۆت بلوێ، خۆشە. بەڵام ئەگەر من لە هەڵبـژاردنی چارەنووسی خـۆمـدا، سـەرپشک بکرێم، ئەوا پێم خـۆشـە بەگـیـان و بەدڵ پاسەوانی دەرگانەی یار بم، خۆشترە.

«کوردی» دەڵێ:

گـەدایی کـۆیی جـانانە، بەشـاهی عـالەمی نادەم
گەدایی خۆشترە بۆ من، لە شاهیی گەر موخەییەر بم

**٤- سـەد وەکـو مـووسـا؛ یەدی بەیزا و ئیـعـجـازی هەبێ**
**گـەر تەجـەللای ڕوو نەبێ، بەخـودا شـوانی خـۆشـتـرە**

واتە: هەموو ئەو بەهرانەی کە خودا بەکەسێکی دەبەخشێ و پێوەی دەناسرێ و بەهۆی ئەو بەهرەیەیەوە خەڵکێکی زۆری لێ گرد دەبنەوە و دەبێتە سەرباشقە و پێغەمبەر و ڕابەر، ئەگـەریش گـرنگ بن، بەڵام ئەو بەهرانە ئەگەر زۆریش گرنگ بن، هێشـتا ئەوەندەی ئەو ئاستە گرنگ نین، کە لەتەکیدا، ئەوینی پڕشنگ و گزنگی ڕوخسـارێکی جوان، شەیدای نەکـردبێ، بۆیە خاوەنی بەهرەی بێ عـەشق، خـاوەنی سـامـانێکی گـەورە و مـەزن نییـە و ئەوسا لەجیاتی ئەو بەهرەیە، شوانێتی و شوانکارەیی خۆشترە.

**٥- گەر گەدای و عاشقی؛ شاهێکی بێ تاج و نگین**
**خوسرەوی بێ شۆری شیرین؛ سارەوانی خۆشترە**

نگین: ئەو بەردە بەنرخانەی کە موستیلە و تاجی سەری شاهانی پێ دەڕازێننەوە.

سارەوان: حوشترەوان.

واتە: هەر کـاتێ عـاشق بوویت، با هەژاریش بیت، وەک ئەوە وایە شـاهێکی بێ تاج و بێ نیشـانەیت؛ چونکە خوسرەوی پەروێزیش، سەرەڕای ئەوەی شا بووە، بەڵام ئەگـەر خودی خەسرەو، ئەویندار «شیرین» نەبووایە، ناوی تێکەڵ ئەفسانەی دڵدارانی ناودار نەدەبوو، ئەوسا لەباتی ئەوەی شاهێتی پێ خۆش بێ، حوشترەوانیی پێ خۆشتر دەبوو.

**٦- جان نثاری عاشقان، خۆشه ئەگەر بۆ دڵبەران**
**بۆ کەسێکی جان نسارە؛ جان فشانی خۆشترە**

جان نثار: گیان پێشکەشکردن؛ گیانبەخشین.

جان فشان: گیان دانان، گیان بەفیداکردن، گیان بەقوربان کردن.

واتە: گیانبەخشینی ئەویندااران بۆ دڵبەرانیان خۆشە، بەڵام ئەو ئەویندارانەی فێری ئەوەن گیانیان بەدڵدارانیان پێشکەش بکەن، ئەگەر گیانفیدا بن خۆشترە.

**٧- قەهر و لوتفی یاری مە، بۆ ئێمە یەکسانە، بەڵان**
**گاهگاهێکیش بەخەڵوەت، میهرەبانیی خۆشترە**

قەهر: ڕق، کینە.

گاهگاه: جاروبار، ناوبەناو.

خەڵوەت: تەنیایی.

واتە: بەلای ئێمەوە، چ ڕق و تۆران و چ سۆز و میهرەبانیی دڵبەرمان، بەلامانەوە وەک یەک و یەکسانە. بەڵام ئەگەر ئەم دوو حاڵەتی ڕق و میهرەبانییە، لە کاتی ژووان و دیداری دووقۆڵیی و تەنیاییدا، میهرەبانیی باڵ بەسەریاندا بکێشێ خۆشترە.

**٨- عومری جاویدان ئەگەرچی نیعمەتێکە بێ قەرین**
**ئەی «ئەدەب» بیللا بەمە، ماچی فلانی خۆشترە**

جاویدان: نەمریی، هەرمان.

قەرین: نزیک، هاوتا.

واتە: هەرچەندە تەمەنی درێژ و هەتا هەتایی (ئەگەر بلوێ)، بەهرەیەکی یەکجار خۆش و سامانێکی گەورە و بێ هاوتایە. بەڵام ئەگەر لەو تەمەنە درێژە و هەمیشەییەدا، هەر خەریکی ژیانی ئاسایی و سەرژمێریی ڕۆژان و مانگان و ساڵانی ئەو تەمەنە بێت، چ تام و چێژێکی هەیە!؟ بۆیە بەخوا، بەلای منەوە هەموو تەمەنی درێژ، تام و چێژی ئەو شتە نادات، کە لە تەمەنتدا خۆزگەی بۆ دەخوازیت و لە هەلێکدا بۆت هەڵدەکەوێ و پێی دەگەیت، وەک ئەوەی بەلای منەوە، ماچی (فلانە کەس)، بەهای هەموو تەمەنی هەیە، ئەگەر دەستم بیگاتێ.



«سالم» دەڵێ:

**خەمۆشی تابەکەی «سالم»! برینی باتینی کوشتمی**
**نیهانی بەسیەتی، خوێنم حەنای پەنجەی فلانیی بێ**
«١٤١»

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)، وەک نموونەی:

١- چاوی من دەم دەم دەڕێژێ ئاوی ساف و خوێنی گەش
دابلێن دەریای عومانە، دوڕ و مەرجانی هەیە
«نالی، ٥٧٣»

٢- جورعە نۆشیی تۆ بکەم؛ ئیتر لە بەزمی مەیکەدە
چاوی مەخموورت بەعاشق؛ کاری بادەی مەی دەکا
«سالم، ٢٩»

٣- هاتەوە ئاشووبی دەوران، مەردی مەیدان هاتەوە
شێری یەزدان، لەندەهووری ئیبنی سەعدان هاتەوە
«شێخ ڕەزا، ١٠٩»

**١- ئەی ڕەفیقان! دڵ، نزاری غەمزەیێکی دڵبەرە**
**خۆنوێن و شێوەباز و ساحیر و جادووگەرە**

نزار: کز و مات و لاواز.

خۆنوێن: کەسێک کە حەز بەخۆ دەرخستن و خۆ نیشاندان بکات.

شێوەباز: ئەمیش هەر نزیکە و مانای خۆ دەرخەری هەیە.

واتە: گەلی برادەرینە. دڵم مات و ماندووی تیلە چاوی دڵبەرێکی خۆ دەرخەر و شێوە بەرچاو و جادووگەر و ئەفسوونگەرە.

**٢- تا بڵێی خۆش مەنزەر و مشکین خەت و ڕەعناقەدە**
**تا بڵێی بەد عەهد و شەرت و بێ وەفا و خودسەرە**

خۆش مەنزەر (منظر): شێوە جوان.

مشکین خەت: زوڵف و قژی، بۆن و بەرامەی مسکی خەتای هەیە.

ڕەعنا قەد: باڵا ڕێک و ڕەوان.

بەد عەهد: پەیمان بەد، بڕیار نالەبار.

خودسەر: جەربەزە، سەرکەش، لەخۆ ڕازی.



**٣- دڵبەری، جانپەروەری، گوڵپەیکەری، عیشوەفرۆش**
**مەهوەشی، کوڵمەگەشی، میناگەشی، مینادەرە**

جانپەروەر: گیانپەروەر.

گوڵپەیکەر: ئەندام وەک گوڵ.

مەهوەش: مانگ ئاسا، وەک مانگ.

میناگەش: گەردن گەش.

هەرچەندە لە جێی خۆیشیدا ئاماژە کراوە؛ کە دەکرێ «مینا گەش»، بە«میناکەش» یش بخوێنرێتەوە و لەم بارەدا «میناکەش» بەمانای «بادەخۆر» دێت.

مینادەر: بادەدەر، مەیگێڕ، ساقی. لە هەمان کاتدا ئەگەر «مینا» مەبەست لە «گەردن»یش بێت، ئەوا مانای: گەردن بەرز و گەردن بەدەرەوەش دەدات.

**٤- گوڵبەدەن، شیرین سوخەن، تەنگی دەهەن وەک شەهدی ناب**
**چەه زەقەن، گێسوو ڕەسەن، طوڕە شکەنج و چەنبەرە**

شیرین سوخەن: قسە شیرین، ئاخاوتن شیرین.

تەنگی دەهەن: دەمی بچووک.

شەهدی ناب: هەنگوینی ناوازە و نایاب.

چەه زەقەن: چەناگە چاڵ.

گێسوو ڕەسەن: پەلک وەک ڕەشمە، وەک تەناف و گوریس.

طوڕە شکەنج: پەرچەمی ئەڵقە ئەڵقەیە.

چەنبەر: بازنە.

**٥- مەه لیقا، شیرین ئەدا، هەم دڵگوشا، هەم دڵڕوبا**
**مەجلیس ئارا، بادە پەیما، هەم مەیە، هەم ساغەرە**

مەه لیقا: دیمانە وەک مانگ.

شیرین ئەدا: ئاکار شیرین.

دڵگوشا: مایەی دڵ کردنەوە.

دڵڕوبا: دڵڕفێن.

مەجلیس ئارا: کۆڕ و کۆمەڵ دەڕازێنێتەوە.

بادە پەیما: مەیخۆر.

ساغەر: پیاڵەی مەی، پەرداخ، لێوان.

**٦- شۆخی چین، تورکی خەتا، زیبی خوتەن، ماهی تەتار**
**شۆڕی شار، ئاشووبی موڵک و ئافەتی هەر کیشوەرە**

شۆخی چین: شەنگ و شۆخی وڵاتی چین.

تورکی خەتا: کچە جوانی تورکی وڵاتی خەتا.

زیبی خوتەن: هەوێنی جوانیی وڵاتی خوتەن.

ماهی تەتار: مانگی وڵاتی تەتارستان.

شۆڕی شار: سۆنگەی هەرا و زەنای شار.

ئاشووبی موڵک: مایەی هەڵاڵا و پشێوی مەملەکەت و دەردەسەریی و پەتای هەموو وڵاتان.

**٧- دەفعی خەم، ڕەفعی مەلالەت، مایەیی وەجد و نیشات**
**قووتی دڵ، ڕۆحی ڕەوان، ئارامی جیسم و پەیکەرە**

دەفعی خەم: خەمڕەوێن.

ڕەفعی مەلالەت: لابەری دڵتەنگیی.

مایەیی وەجد و نیشات: مایەی بووژانەوە و جۆش و خرۆشە.

قووتی دڵ: خۆراکی دڵە.

ئارامی جیسم و پەیکەرە: ئارامی لەش و ئەندامی لەشە.

**٨- لوعبەتی، ڕەنگین ڕوخی، ڕەنگین لەبی، ڕەنگین عوزار**
**خۆش قسەی، خۆش سوحبەتی، خۆش فیترەتی، خۆش گەوهەرە**

لوعبەت: جوان، بووک.

ڕەنگین ڕوخ: ڕوخسار ڕەنگین.



ڕەنگین لەب: لێو ڕەنگین.

ڕەنگین عوزار: ڕەنگین شێوە و ڕوخسار.

خۆش سوحبەت: هاودەمێکی قسە خۆش.

خۆش فیترەت: ئەسڵ زادە.

خۆش گەوهەر: نەژاد پاک.

**١٠- لەودەم ئەو زیبا صەنەم بۆتە بتی مە، دوو جیهان**
**یاشەمەن، یا بەڕهەمەن، یا بت شکەن، یا: بوتگەرە**

زیبا صەنەم: بتی جوان، جوانە بت.

شەمەن: بتپەرست.

بەڕهەمەن: ڕابەر و پێشەوای ئایینی بودایی.

بت شکەن: بت شکێن.

بوتگەر: بت ساز، بت تەراش.

واتە: لەو کاتەوەی ئەو جوانە بتەی ئێمە، بۆتە ئەوەی ئێمە بیپەرستین؛ ئیتر سەرتاسەری ئەم جیهانە، لە ناو خۆیاندا کردوویانەتە هەڵاڵا و چەند دەستەگەرایی؛ دەستەیەک لە ئایین لایان داوە، دەستەیەک بوونەتە بتپەرست، دەستەیەک هەر خەریکی بت شکاندنن، دەستەیەکیش خەریکی بت سازکردن و بت تەراشیین...

بەمانایەکی تر: ئەم بتەی ئێمە، ڕێسای بتپەرستیی و ڕێ و شوێنی جارانی بتپەرستیی تێکداوە و سەری لە خەڵکیش شێواندووە و بۆتە مایەی وەرسووڕانی ڕێبازی ئایین و فکری سەرومڕی خەڵکی جیهان.

«مەحوی» دەڵێ:

١- دەیوت کە بەڕهەمەن مەهی ڕووی ئەو صەنەمەم دی
گەر بت ئەمە بێ، خزمەتی بتخانە حەرامە
«٢٧٥»

٢- گەر بتی ئێمەت نەدیوە، بۆچی دوێنێ دەتپەرست
ئەی بوڕەهمەن، تۆ لە لات ئەمڕۆ کەچی وەک لاک «لات»
«٦٠»

**١١- ذائیقەی قەندی لەبی؛ شاخەی نەباتی میسرییە**
**رایەحەی زولْفی خەمی، شیشەی گولاّبی قەمسەرە**

ذائیقە (ذائقە): تام و چێژ.

شاخە: لق، پەلک، چڵ.

نەبات: جۆرە کلۆیەکی وردی ڕەنگ ئاویی سپات و تام و چێژ شیرینە؛ لە وشککردنەوە و پەروەردەکردنی لیمۆی شیرین دروست دەکرێ، کە جاران لە جێی شەکر بەکار دەبرا.

میسر: مەبەست لە وڵاتی میسرە، کە ناوهێنانی لێرەدا لەگەڵ «نەبات»دا، بەو هۆیەوە بووە؛ کە لە کاتی خۆیدا، لە بەرهەمهێنانی «نەبات»ی چاکدا بەناوبانگ بووە.

رایەحە: بۆن و بەرامە.

زولْفی خەمی: زولْفی ئەڵقاویی.

شیشە: شووشە.

قەمسەر: یان (قەمصەر): شارۆچکەیەکی باشووری شاری (کاشان)ی ئێرانە و نزیکەی (٣١٠٠٠) گەز لە کاشانەوە دوورە. لە ناوچەیەکی کوێستان و زۆزانی سارد و لە هەمان کاتیشدا سازگاردا هەڵکەوتووە. بەهۆی ئاووهەوای سازگارییەوە، میوەی زۆر و زۆر بەتام و بۆن خۆشی هەیە. لە وەرزی بەهاران و پشکووتنی گوڵیشدا، خەڵکەکەی بەچاندن و پەروەردەکردنی گوڵەوە خەریکن و شارەزاییەکی زۆریشیان لە «گولاّو» گرتندا هەیە؛ کە لە دوورایی چەندان کیلۆمەترەوە بۆنی گوڵ و گولاّوی ئەم شارە دەکرێ و هەر بۆ ئەم مەبەستەش سەدان کارخانەی گولاّوگرتن لەم شارەدا هەیە، کە لەم شارەوە، گولاّوی بۆ سەرتاسەری ئێران و جیهانیش دەنێردرێ. بۆیە لە دەمێکەوە ئەم شارە، لە گولاّوی چاکدا بەناوبانگە. (دهخدا، بەرگی ١١، ل ١٧٧٥٣).

واتە: تام و چێژی شیرینایی لێوی، هەر دەڵێی لقە نەباتی میسر و بەرامە و بۆنی زولْفە لوولەکانیشی، هەر دەڵێی شووشەی گولاّوی شاری (قەمسەر)ن.

**١٣- شەو هەموو شەو، تا سەحەرگاهان لە دووریی یاری خۆم**
**نەشتەرم باڵین و ناڵەی یار و خارم بەستەرە**

نەشتەر: تیغ، چەقۆ.

باڵین: سەرین، بالیف.



خار: دڕک و داڵ.

بەستەر: نوێنگەی خەو.

واتە: هەموو شەوان تا بەیانی، لە دووری دڵبەرەکەی خۆم، سەرینەکەم لێم دەبێتە نەشتەر و هاودەمم: هاوار و ناڵە ناڵمە و جێگەی خەوتنەکەشم: دڕک و داڵە.

**١٤- گەر «ئەدەب» بێتە بەیانی ڕەنجی شەوگاری فیراق**
**شەرحی هیجرانی؛ وەرای گونجاییشی ئەم دەفتەرە**

بەیان: باسکردن، ڕوونکردنەوە.

ڕەنجی شەوگاری فیراق: ئێش و ژانی شەوانی تەنیایی و دووریی.

وەرا: لە سەروو، لەودیو.

گونجاییش: جێگەبوونەوە، جێگەکردنەوە، بەرایی جێگە بۆ لەخۆگرتنی، مەودا.

واتە: بێتو بمەوێ، ئێش و ئازاری شەوانی تەنیایی و لێکدابڕانی خۆم و یارم ڕوون بکەمەوە، ئەوا ئەوسا ئەم دەفتەر و دیوانی شیعرەم، جێگەی ئەو ڕوونکردنەوانەی تێدا نابێتەوە، چونکە ئەو باسانە لە سەروو توانا و مەودای لە ئامێزگرتنی ئەم دەفتەری شیعرەن و یەکجار زۆر زۆرن.

«سالم» لە شتێکی نزیکی ئەم وێنەیەوە دەڵێ:

سا شەرحی وەسفی تۆ، بەچ وەجهێ بکەم ئەدا
هەرچی خەیاڵی من هەیە؛ دەیڵێم و تۆ: بەرتەری
«١٤٥»

٩٥

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن) وەک نموونەی:

١- هەوری میحنەت، بارِشی غەم، سەیلی ماتەم بوو تەمام
بەرقی تابان، میهری ڕەخشان، ڕەعدی غورِان هاتەوە
«شێخ ڕەزا، ١٠٩»

٢- گوڵ بەتۆزی پاتەوە، لاف و گەزافی لێدەدا
سەد شوکر سوزەی نەسیم هات و ئەویشی لێ ستاند
«حەریق»

**١- خەستەیی موژگان خەدەنگێکم، نیگاهی دڵبەرە**
**بەستەیی گێسوو کەمەندێکم، دڵی ئەفسوونگەرە**

خەستە: ماندوو، زامدار.

موژگان: مژۆڵ، برژانگ، موژە.

بەستە: بەستراو.

واتە: زامدار و ماندووی چەپکە تیرێکی مژۆڵەکانی کچێکم، کە سەیرکردنەکانی دڵ دەبەن و کەمەندی قژ و پرچی کچێکیش بەستوومی، کە کاری دڵی، هەر دەڵێی ئەفسانە و جادوو لە مرۆڤ دەکا.

**٢- مەدهۆشی زیبا روخ و شیرین کەلامێکم بەناز**
**وەقتی گوفتاری: دەمی تەنگی، ریواقی شەککەرە**

مەدهۆش: سەراسیمە، سەرلێشێواو.

زیبا: جوان.

روخ: روخسار.

ریواق: شیلە.



**٣- شوهرەیی ئافاق و تاقی عالەمە، بۆ حوسنی شار**
**سادەیی سەنگین دڵ و حۆری وەش و سیمین بەرە**

شوهرەی ئافاق: ناوبانگ بەربڵاو.

تاقی عالەم: تاقانەی جیهان، بێچوون.

سەنگین دڵ: دڵڕەق، دڵ وەک بەرد.

حۆری وەش: پەری ئاسا، وەک پەری، فریشتە ئاسا.

سیمین بەر: ئەندام زیوین.

**٤- تا خەیاڵی خەتتی سەبزی، بۆتە سەودایی سەرم**
**دڵ لە دووی سەودایی زوڵفی، هەر وەکو سەوداگەرە**

سەودا (ی یەکەم): ئەوین، ئارەزوو، خولیا.

سەودا (ی دووەم): ڕەش (ڕەنگی ڕەش).

سەودا (ی سێیەم): مامەڵەکار.

خەتی سەبز: هێڵی سەوز؛ کە مەبەست لە دیمەنی دەم و ڕووی یارە.

واتە: لە وەتەی خەیاڵ و خولیای ئەو ڕوخسارە سەوزەیە، لە لام بۆتە سەودا و ئەوین، ئیتر دڵم لە تاو جوانیی قژە ڕەشەکەی، کار و پیشەی بۆتە کاری وەک مامەڵەکاران.

**٥- گەر لە گۆشەی ڕوومەتی، پەنجەی وەلادا: تاری موو**
**شوز و شیراز و عێراق، پڕ ئینقیلاب و پڕ شەڕە**

شوز: (یان: شیز، یان: ئازەرگشنیسب)ی شاری دێرینەی زەرتوشتی نزیک (٤٩ کیلۆمەتری) باکووری خۆرهەڵاتی شاری «تیکان تەپە»ی ناوچەی هەوشاری ئێران؛ کە دواتر بە«تەختی سلێمان» ناو نرا و کۆنترین و گەورەترین و پیرۆزترین ئاتەشگە و پەرستگەی ئایینی زەرتوشتی بووە و کاتێ خۆی شاهەکانی ساسانی، لە بۆنەگەلی سەرکەوتن و تاج لەسەرنانندا، بەنیازی سوپاس و دوعاکردن، دەبووایە لە «تێسفۆن – مەدائین»ی ٣٢ کیلۆمەتری باشووری خۆرهەڵاتی بەغدای ئێستاوە، بەپێی پیادە، زیارەتی ئەم ئاتەشگەدەیە بکەن و هەر لەمێشەوە دەستەچیلەی ئاگر، بۆ ئاتەشگەتەکانی تر، بردراوە (مێژووی مۆسیقای کوردی – م. ح. ب، ل ٧٦).

شیراز: شاری گەورە و بەناوبانگ و دێرینە و پڕ لە شوێنەواری گرنگی مێژوویی، کە کەوتۆتە باشووری خۆرئاوای ئێران و (٩٠٠ کیلۆمەتر) لە تارانی پایتەختی ئێرانەوە دوورە و گۆڕی هەردوو شاعیری ناودارانی ئێرانی: (حافظ) و (سەعدی)یشی تێدایە.

عێراق: لە بنەچەدا مەبەست لە شاری (ئەراک)ی ئێرانە چونکە هێشتاش ئێرانیان هەردوو پیتی (ئەلف) و (عەین) تێکەڵ دەکەن و وەک یەکیان دەخوێننەوە و ئەم شارە بە«عێراق» ناو دەبەن و مێژوونووسانی کۆنیش هەر بە«عێراق»یان ناوبردووە. سنووری ئەم شارە لە خۆرهەڵاتەوە: شاری (قوم)، لە باکوورەوە (فەرهان)، لە خۆرئاواشەوە کێوەکانی (شازەند) بوونەتە سنووری (دهخدا، ٢، ١٦٣٠).

ئینقیلاب: شۆڕش (بەمانای ئێرانی).

واتە: قژ و زوڵفی یار، کە کەوتوونەتە سەر ڕوومەتی و ڕوومەتیان داپۆشیوە، ئەگەر بێتو بەپەنجەکانی، تاڵی مووەکانی سەر ڕوخساری لابدات و ڕوومەت و کوڵمەکانی دەرکەون، شەڕ و هەرا و هەڵلایەکی ئەوەندە گەورە دەقەومێ، کە مێژووی دێرینە و ئێستای مرۆڤایەتی و شارە پڕ لە شوێنەوارە مێژووییەکانی وەک «شوز»، شیراز، ئەراک، هەمووی ڕادەپەڕێ و شەڕ و شۆڕش لەسەر دیتن و داگیرکردنی ئەو یارە دەکەن.

**٦- وا لە بەحری فیرقەتیدا، غەرقی گەردابی خەمم**
**کەشتیی سەبرم بەدایم باسکوون و لەنگەرە**

بەحری فیرقەت: زەریای دووریی و لێکدابڕان.

غەرق: نقوم.

گەرداب: گەرداو، گەردەلوول، باهۆز.

کەشتیی: پاپۆڕ.

باسکوون (با + سکوون): بەئارامیی.

لەنگەر: وێستانی پاپۆڕ.

واتە: لە زەریای دووریی و لە یار دابڕنێکی ئەوەندە دژوار دام، نوقمی گەردەلوولی خەم بووم، بۆیە وەک ئەو پاپۆڕ و کەشتییانەی لە بەرامبەر مەترسی گەردەلوولدا ناوێرن بڕۆن و ناچار دەبن بوەستن و لەنگەر بگرن، تا بزانن ئاکامی گەردەلوولەکە چۆن دەکەوێتەوە، منیش ئاوا ئەوەندە سەختم لێ قەوماوە، ڕاماوم و وەستاوم و لە زەریای خەمی خۆمدا،



چەقم بەستووە و نازانم ئەنجامی ئەم خەمی دوورییەم چۆن دەبێ.

«کوردی» دەڵێ:

لە کەشتی عەشقی تۆدا بم، لە (باد)ی (عەکسی) سڵ ناکەم
دەبا لەم گێژی دەریایە، نەیەن خەڵقم بەهانادا

**٧- عەشقی ڕووی، موڵکی دڵی گرت و دەڵێن: سەبری بێ**
**موددەعی قەلعەی موسەخخەر کرد، چ وەعدەی سەنگەرە!**

موددەعی: دوژمن، نەیار.

قەلعە: قەڵا، دژ.

موسەخخەر: داگیرکردن.

واتە: ئەوینی ڕوخساری یار، لەشکری ئەوینی؛ موڵکی دڵمی داگیر کرد؛ کەچی هەڤاڵانم پێم دەڵێن: ئارامت بێ! منیش دەڵێم: ئەو کاتەی لەشکری دوژمنێک هێرش دەکا و قەڵای قایم دەگرێ، ئیتر لەشکری بەزیو، چی پێ دەکرێ و چۆن بەسەنگەر گرتن، کاری سەردەگرێ!.

**٨- تابەکەی ناڵەت، لە دەست شەوگاری هیجرانە «ئەدەب»**
**شەرحی هیجرانی؛ وەرای ئینشایی خامە و دەفتەرە**

تابەکەی: هەتاکەی.

واتە: ئەی «ئەدەب» هەتاکەی هاوار و دادت لە شەوانی دووریی و تەنیاییە! وا چاکە هەر بێ دەنگ بیت و باسی نەکەیت. چونکە باسی دەردی دووریی، لە سەروو وزە و مەودا و دەسەڵاتی قەڵەم و دەفتەرەوەیە.

«نالی» دەڵێ:

کەی دەکا شەرح و بەیاناتی ڕمووزی دەردی دڵ
ڕوورەشێ هەروەک دەوات و دووزبانێ وەک قەڵەم
«٣١١»

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن) وەک نموونەی:

١- هەر مەجالێ ئەو د جەنگێ بێتو رەت هەر جارەکێ
ڕاست و چەپ دێ بێختن سەد سەد ب مرزاق و قەصەب
«مەلای جزیری، ٧٢»

٢- تۆ، ئەگەر هەستی، لە جێ ڕاوەستی، دێو و کافریش
دێن دەڵێن: بەخودا قیامەت، ڕاستە هەستانی هەیە
«نالی، ٥٧٧»

٣- حاڵی عیشق و تابشی هیجرت، نیشانەی دا بەمن
ئاگری سوزندە هەر کارێ بەبێشەی نەی دەکا
«سالم، ٢٩»

بەیتی یەکەمی ئەم غەزەلە، وەک پێشتر و لە جێی خۆیدا ئاماژەمان پێ کرد، هەر تەنیا لای «ئا» بەمجۆرە دەست پێ دەکات:

من لە دنیادا هەر ئەو یاری وەفادارم بەسە
ئەو دڵارامەم بەسە، ئەو یار و خەمخوارم بەسە

**١- دەردی بێ دەرمانی عەشقت، بۆ دڵی زارم بەسە**
**جەور و میحنەت تا بەگەنگێ، ڕەنج و ئازارم بەسە**

واتە: لەو ڕۆژەوەی دەردی عیشقی تۆم لێ بۆتە کار و پیشە و چێژی خۆش و بەتامی لێ تام دەکەم، ئیتر خۆم وا پێ ڕاهێناوە تا بتوانم دەرەقەتی بێم و بەرگەی بگرم، چونکە لە بەرامبەر ئەم عیشقەتدا، هەموو پیشەم بۆتە بەرگری و خۆڕاگریی لە بەرامبەر دەردە شیرینەکەیدا و بەهۆی ئەم دەردەوە، توانا و برستم کەم بووە و دڵم بێ هێز بووە. بۆیە ئیتر ئەگەر چەوساندنەوە و ئازاری ترم سەربار نەخەیت، پێی ڕازیم و لە حاندی دێم، بەڵام ئەگەر کێشە و دەردەسەریی زیاتر، بۆ ئەم دەردی عیشقەم زیاد بکەیت، ڕەنگە لە توانامدا نەمێنێ و بەرگەی نەگرم.



«مەحوی» دەڵێ:

خودا ئەم دەردی عیشقەم لێ نەکا کەم
هەتا ماوم، بەس، لە باتیی هەر دەوا بەس
«١٤٥»

**٢- بمکەنە موختاری گەنجی عالەم و گەنجی لەبت**
**خەندەیێ لەو دوو لەبی لەعلی گوهەربارم بەسە**

موختار: هەڵبژێردراو، کوێخا، سەرپشک کراو.

گەنج: سامان.

واتە: ئەگەر هەموو عالەم، منی کردە نوێنەری خۆی و سەرپشک و دەسەڵاتی ئەوەی دامێ؛ تا لە نێوان یەکێک لە دوو سامانی دنیایی و سامانی لەعلی لێوی تۆ هەڵبژێرم، ئەوسا بێ سێ و دوو؛ زەردەخەنەیەکی هەردوو لێوی لەعلیلینی تۆ، هەڵدەبژێرم و هیچی ترم ناوێ. چونکە کە زەردەخەنەی لێوی لەعل و گەوهەر باری تۆ دەبینم، هەموو سامان و گەنجی دنیام لە بەرچاو دەکەوێ.

«مەحوی» دەڵێ:

کە ئەو لێو و ددانەم دی، بەجارێ
لە بەرچاوم هەموو لەعل و گوهەر کەوت
«٨٩»

**٣- دەردی بێ دەرمانی عیشقی، گەر دڵی کردووم نزار**
**غەمزەیێ لەو چەشمی بیماری پەرستارم بەسە**

واتە: هەرچەندە لە وەتەی تووشی ئەوینی دڵبەرم بووم، بوومەتە دەردەدارێکی بێ دەوا و دەرمان و ئەم دەردی ئەوینەی، دڵی زامدار و ماندوو کردووم و دەبێ بۆ چارەی ئەم دەردەم، ببرێمە نەخۆشخانە و خانمێکی میهرەبان، بەلامەوە بێ، بەڵام چونکە دەردی ئەوینەکەم، بێ دەرمانە، بۆیە ئەگەر یار تیلەی چاوێکیم تێ بگرێ، لەجیاتی هەموو شتێکە بۆ من و پێویستم بەهیچ شتێکی تر نییە.

«نالی» دەڵێ:

طەبیبی من؛ دەبێ دەخلی هەبێ، ساحێب ئیشارەت بێ
مەگەر چاوت بزانێ من، لەبەرچی مەست و بیمارم
«٢٧٣»

«حاجی قادر» دەڵێ:

طەبیبم هاتە باڵینم، وەهای گوت:
دریغا! دەردی عیشقە، بێ دەوایە
«١١٦»

**٤- با نەبم مەحرەم وەکو بولبول، بەهەر ئەسراری گوڵ**
**لەحزەیێ سەیری گوڵی گوڵزاری ڕوخسارم بەسە**

ئەسرار: نهێنی، شتی شاردراوە.

واتە: بەو هۆیەوە کە بلبل هەمیشە لە ناو باغدایە و بۆ هەمموو گوڵێک گۆرانی دەڵێ و لەگەڵ هەمموو گوڵێکدا دەدوێ و گفتوگۆیان لەگەڵدا دەکات و ڕازی دڵی لەگەڵ سەرجەمی گوڵان و گوڵانیش لەگەڵ بلبلدا، ڕازی دڵیان بۆ بلبل باس دەکەن، هەموویان بەیەکتر ئاشنا و مەحرەمی ڕازی یەکتر دەبن... بەڵام من وەک بلبل نیم و بۆ هەمموو گوڵێک ڕاز و نهێنیم نییە، بەڵکو بۆ تاقانە یارێکی خۆم سەودا و ئەوینم هەیە و دیتنی ساتێکی گوڵی ڕوخساری یاری خۆمم بەسە و هەر ڕوخساری ئەو، ئۆخژنم پێ دەبەخشێ.

**٥- با نەبێ ئەمساڵەکەت غەیری ستەم، دەرحەق بەمن**
**یادی شەوگاری ویساڵی لوتفەکەی پارم بەسە**

دەرهەق بەمن: بەرامبەر بەمن.

واتە: ساڵی پار لەگەڵمدا زۆر میهرەبانییت نواند و ڕێگەت پێدام، زۆرم دیدەنی کردیت. بۆیە ئەمساڵ، کە هەر لە سەرەتاوە لە چەوساندنەوە و ئازاردان زیاتر، هیچی ترت بەرامبەرم نەنواندووە، دەربەست نیم و بەیادی شەوانی ساڵی پارەوە، دڵخۆشیی خۆم دەدەمەوە و ئەم ئازاری دابڕانە، لە بیر خۆم دەبەمەوە.



«سالم» دەڵێ:

هەتا دەمرم، بەدووریی تەرکی میهری ئاشنا ناکەم
دڵم تا سبحدەم هەر شەو، لەگەڵ یادت هەم ئاغوشە
«١٢٦»

**٦- بۆ بەتەحریکی ڕەقیبت، زەخمی دیکەم لێدەدەیت؟**
**بەو خەمی ئەبرۆت قەسەم، زەخمی ئەوەڵ جارم بەسە**

تەحریک: دنەدان، هاندان.

زەخم: زام، برین.

واتە: وا دیارە بەهۆی دنەدانی نەیارانەوە، کەوتوویتە بریندارکردنم و تۆڵە لێکردنەوەم، بەڵام سوێند بەکەوانیی برۆکانت دەخۆم و دەبێ بڕوام پێ بکەیت، کە یەکەمین ئەو زامەی لە سەرەتای ناسینمانەوە، دڵمت پێ زامدار کردووە، ئەوەندە کاریگەر بووە، هێشتا ساڕێژ نەبووە و هێشتا ئازاری هەیە و ئیتر بەرگەی زامی تازە ناگرم.

«کوردی» دەڵێ:

خۆت بۆ ستەمان کەم بووی؟ بیستت قسەی ئەغیاریش
فیرعەونی زەمان ئامان، گوێ مەگرە لە هامانت

«حەریق» دەڵێ:

چت داوە لە ڕووترشیی و سرکەی دەمی ئەغیار!
قەندی لەبت شیرین، بەدەمی تاڵی خومارم

**٧- بۆچمە میننەت لە ئاهووی کیشوەری چین و خەتا!**
**ڕایحەیێ لەو طوڕەیی وەک میشکی تاتارم بەسە**

میننەت (بەفۆنەتیکی ئێرانییانە): مننەت، باک، ناز، چاکە.

واتە: ئەگەر ئاسکی هەردوو وڵاتی چین و خەتا، بەوە بەناوبانگ بن، کە بۆن و بەرامەی خۆش، لە ناووکیاندا هەیە، من کارم بەو میسکەی ناووکی ئەوان نییە، چونکە بەلای منەوە بۆن و بەرامەی پەرچەم و کاکۆڵی یار، زۆر لە بۆن و بەرامەی ناووکی مامز و ئاسکی چین و خەتا خۆشتر و دەربەستی هیچیان نیم.

«سالم» دەڵێ:

ئەگەر ئەفشان بێ نەفخەی چینی زوڵفت
خەجاڵەت دەیگرێ ئاهووی تاتار
«٥٨»

**٨- دڵبەرا فەرمووتە: بێ قەندی لەبی تۆ، چۆن دەژیم؟**
**زیکری قەندی لێوت و تیکراری گوفتارم بەسە**

دڵبەرا: پیتی ئەلفی دڵبەر (ا)، ئامرازی بانگەوازە.

زیکر (ذیکر): یاد.

تیکرار: دووبارە.

واتە: ئەی دڵبەرم! بەپرسیارەوە فەرمووتانە؛ بەبێ مژینی قەندی لێوت، چۆن دەژیم!؟ لە وەڵامدا دەڵێم: هەر کاتێ یاد و بیری مژینی لێوت بکەم، بێ سێ و دوو یادی ئەو کاتانە دەکەمەوە، کە تیایاندا ماچم دەکردی و لێوتم دەمژی، ئیتر بۆ ئەوەی بەحەسرەت شیرینی لێوتەوە ئازار نەچێژم، هەر ئەوەندەم بەسە، ئەو یادانە لە دڵی خۆمدا دووبارە و چەندین بارە بکەمەوە.

«سالم» دەڵێ:

دەنێمە زەرفی خاتر: یادی بۆسەت
ئەگەر تەبعم تەمەننای گوڵشەکەر کا
«٣٠»

**٩- ماتەمی کوژرانی خۆم ناوێ؛ ئەقاریب بیگرن**
**زوڵفی خوێنخواری سیەهپۆش و عەزادارم بەسە**

ماتەم: پرسەی مردوو.

ئەقاریب: خزمان.

سیەهپۆش: ڕەشپۆش، پرسەدار.

عەزادار: ماتەم بار، تازیەبار، پرسەدار.

واتە: هەر کاتێ لەسەر باڵای تۆ، دەکوژرێم، پێویست بەوە ناکات خزم و خوێشانم پرسەم



بۆ دابنێن و شیوەن و گریانم بۆ بگێڕن، بەڵکو وەسێت دەکەم، هەر زوڵف و قژە ڕەشپۆشەکەی تۆم بەسەلامەتیی بۆ بمێنێ و کەس لە دوای کوژرانی من، دەردەسەری بۆ تۆ دروست نەکەن، لەسەر ئەوەی، کە تۆ بوویتە هۆی کوژرانم، بەڵکو کەس دەردەسەری و کێشەت بۆ دروست نەکات و قژ و زوڵفە ڕەشەکەتم، وەک خۆی، بەو ڕەشیی و جوانییە، بۆ بپارێزێت و لە دوای من، قژی تۆ خۆش.

«هەژار موکریانی» دەڵێ:

شەوە؛ دنیا وەکو زوڵفت سیاپۆش
وەرە با دەردی دڵ بکرێ فەرامۆش
دەستم دەستۆکە، با بتگرمە باوەش
ئەگەر مردم لە خۆشییان، چاوی تۆ خۆش

دەشگونجێ بەو بارەشدا بخوێنرێتەوە، کە ئەگەر لەسەر تۆ کوژرام، وەسێت دەکەم، هەر خۆشت لە جێی خزم و خوێشانم، پرسەم بۆ بگریت و خۆت ڕەشپۆش بکەیت بۆم.

لەم بوارەدا «کوردی» دەڵێ:

ئەگەر مومکین نەبوو وەسڵت، کە من مردم وەسییەت بێ
لەباتی قەوم و خوێشانم، لەسەر قەبرم بکە شینم

هەر لەم بوارەدا لە فۆلکلۆری کوردیشدا هاتووە:

فەسڵێ دەمبەن بۆ گوێی قەبری
تاوێ لە من بگرن سەیری
بزانم یارم چۆن بۆم دەگری!

**١٠- ئاشنای بێگانە نابم، تۆ کە لێم بێگانە بووی**
**تەعنەیی ئەعدا و لۆمەی یار و ئەغیارم بەسە**

تەعنە: توانج، سەرزەنشت، پلار.

ئەعدا: دوژمن، نەیار.

یار: دۆست.

ئەغیار: نەیار.

واتە: گیانەکەم، هەر کاتێ زانیم تۆ دەتەوێ لێم دوور بکەویتەوە و دوورەپەرێز بیت و

خۆتم لێ نەناس و نامۆ و بێگانە بکەیت، من پەنا بۆ نەیاران و ناحەزان نابەم، تا بیانکەمە دەمڕاست و ڕاوێژکار، بۆ ئەوەی دڵی تۆم بۆ ئاشت بکەنەوە، چونکە هەر ئەو نەیار و بیانییانەی، ئەو توانج و تەشەرانەم لەو ڕووەوە لێ دەدەن، بەسمە بۆ ئەوەی کە من بەتەنیا و تەنیا، هەر تۆ شک دەبەم و کەسم نییە و نامەوێ کەسی تر لە نێوان من و تۆدا هەبێ و ببێتە پردی نێوانمان. سا ئیتر ئەو بیانی و نەیارانە، هەر چیم لۆمە و سەرزەنشت دەکەن، هەمووی بۆ من دەبنە بەڵگەی ئەوەی کە من هەر تۆ دەناسم و لەم تۆ ناسینەشمدا، هەر چیم لە ناوبانگ زڕان و بەدناویی بەسەر دێت، پێی ڕازیم و بەسمە.

«مەحوی» دەڵێ:

لەسەر تۆ، بوومە پەندی عالەمێ، وتم و وتی: مەحوی
بەسێبی موشریکی، بەس، یا: لە دنیا، یا: لە من لادە
«٢٦٩»

٢- لەو سەرگرانی نازە بپرسن: لەسەر چی؟ بۆچ؟
بێگانە بوو لە یار و بەبێگانە یار بوو؟!
«٣٥١»

٣- من دەمێکە خۆ لە خووی یاری قەدیم شارەزام
دوژمنی یارانی دێرینە و بەدوژمن ئاشنا
«٣٥»

**١١- تازە من دەربەندی نام و نەنگی خۆم بۆچی بم**
**ئیسمی رسوایی، سەری کۆڵان و بازاڕم بەسە**

دەربەند: دەربەست.

نەنگیی: سووک بوون و نزمیی.

واتە: دەمێکە باس و خواسی عەشقێنی من و تۆ، لای هەموو کەس ئاشکرا و لەسەر زارانە و لە هەموو کۆڕ و کۆمەڵ و گەڕەک و کۆڵان و تەنانەت لە گوزەری بازاڕەکانیشدا بوومەتە بنێشتە خۆشە و ناوم زڕاوە. ئیتر تازە بەتازە، کە وام بەسەر هاتووە، بەتەنگ چییەوە بم و چۆن چۆنی و تەقەللای ئەو مێژووی ناوبانگ زڕانەم بم!؟



«نالی» دەڵێ:

ئەی ڕەفیقان! صوحبەتی نالی مەکەن
بۆچ؟! کە من لەوڕا وەکو بەدناوم ئەز
«٢٣١»

«سالم» دەڵێ:

حەدیسی نەنگ و نامم، زۆر شوکر مەشهووری عالەم بوو
لە حەرفی موددەعی ناکەس، نییە باکم منی ڕسوا
«٣٧»

**١٢- تا «ئەدەب» بەستەی کەمەندی زوڵفی مەفتوولت نەبوو**
**ئەی شەکەر لەب! بۆچی نەتفەرموو: گرفتارم بەسە؟**

کەمەند: ئەو ئامێرەی لە شێوەی چەنگاڵی چەماوەدا لە ئاسن دروست دەکرێ و بەگوریسەوە دەبەسترێ و لە جەنگدا ڕووەو دیواری قەڵای بەرز و جەستەی دوژمن، هەڵدەدرێ، تا خۆ بەدیواری قەڵاکە بگەیەنن و پیایدا هەڵزنێن، یا جەستەی دوژمنەکەی پێ ڕابکێشن. هەمان ئامێر، بەکەمێک جیاوازییەوە، بۆ وڵاخ بەستنەوەش بەکار دەبرێ. لە ئایین و ئەویندارییشدا، مەبەست لە بەکێشکردنی دڵبەر و دەروێشانی ڕێبازگەی تەریقەتێکە. کە ئەدەب لێرەدا مەبەستی لە سەرجەمی مانای کەمەندەکانە.

مەفتوول: بادراو، لوولدراو (کە مەبەست لە پرچ و زوڵفە).

واتە: من نەمزانی ئەویندارانێکی تری زۆری بەر لە من، وەک من گرفتارت بوون، منیش بەهەمان ئەوینی ئەوانەوە، کەمەند کێشی زوڵفی لوول و بادراوت بووم و تا تووشی داوی زوڵفیشت نەبووم، دەنگت نەکرد، کەچی هەر تووشی داوی زوڵفت بووم، زۆر بێباکانە وتت: ئیتر پێویستم بەکەسی تر نییە، پێمەوە گرفتار بێ!. لەبەرئەوە تازە دوای ئەوەی گیرۆدەی کەمەندی زوڵفت بووم، دەربەستی ئەوە نیم تۆ بەداوەوە بوونم بزانیت، یان نەزانیت، بەڵکو گرنگ ئەوەیە، من لای خۆمەوە شانازیی بەوەوە دەکەم، کە منیش وەک زۆری تر، گرفتارت بووم.

«مەحوی» دەڵێ:

١- موژەت قوللابی گیرا، زوڵفی دڵگیرت کەمەندئاسا
مەحاڵە بەر گرێ، یا بەربێ، کەس کەوتە بەرگیرت
«٦٦»

٢- کەمەندی زوڵفی وەک ئەبرێشمی خاوی نیگارینت
لە دڵ ئالا، خەیاڵی خاوە، دڵ لەو داوە بەربوونت
«٧٥»



## ٩٧

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن)، وەک نموونەی:

موحبەتێ محنەت د زۆرن      حوب د بێم بێ شەک بەلایە
عومر و ژی خوەش پێ دبۆرن      سۆتن و دەرد و جەفایە
«مەلای جزیری، ٥٢٢»

**١- گوتم: با کەم بناڵێنم، نەڵێم دەردم بەکەس چاکە**
**گوتی: ناڵینی جارجارت، لە دوور بێ، وەک جەرەس؛ چاکە**

جەرەس: زەنگ.

واتە: پێم وت حەز ناکەم هیچ کەسێ وا تێت بگات تۆ دڵ ڕەقیت و ئەوینیشت بۆتە مایەی ئازاردانی منی دڵدارت، لەبەرئەوە کاتێکیش ئەو هەموو ئازارەم، زۆرم بۆ دێنن ناچارم هەر خۆم بخۆمەوە و نەیەڵم دەنگ و ناڵەم دەربچێ، نەک کەس گوێی لە ناڵە و هاوارم بێ! کەچی تۆ دەڵێی: تازە من هۆگری ئەو ناڵە ناڵەت بووم و خووم پێوە گرتووە و بۆتە مایەی پڕکردنەوەی بۆشایییەکی ئەو هۆگربوونەم، بۆیە حەز دەکەم هەمیشە گوێم لە ناڵە ناڵی بێ!.

«سالم» دەڵێ:

١- چاوی من مەخفی دەڕێژێ: ئەشکی سوور
نەک بزانێ دەردی دڵ؛ نامەحرەمێ
«١٤٨»

٢- ناڵە سوودی نییە «سالم»، لە دڵی کافردا
لەب بدۆزە لە ئەلەم، ئەم هەموو هاوارە عەبەس

«مەحوی» دەڵێ:

١- بەغەدداری نەوەک ناوت بەرن، بمئەنجنی، قەت من
شکاتی جەوری تۆ، بەرکەس دەبەم؟ بڕوانە چۆنم بۆت
«٧٦»

٢- کە نادا «مەحویا» دادێ بەحاڵت
بەسی بێ: داد و ئاه و ناڵە، بابەس
«١٤٦»

**٢- گوتم: مورغی ڕەوانی من، ڕەوانە لەو تەنە بێ تۆ**
**گوتی: ئەو مورغە بێ باڵە، لە لای من بێ قەفەس چاکە**

مورغ: مەل، باڵندە.
ڕەوان-ی یەکەم: ڕۆح، گیان.
ڕەوان-ی دووەم: ڕۆیشتن، دەرچوون، هەر شتێ کە بڕوات.
تەن: لەش، جەستە.

واتە: پێم وت: مەلی ڕۆحم، ئەوەندە هۆگری نزیکایەتیت بووە، حەز دەکات هەمیشە لێت نزیک بێت و بەنزیکایەتیت دەژی؛ لەبەرئەوە هەر ئەوەندەی بزانێ لێی دووریت، ئیتر ڕۆحم بەجێ دەهێڵێ و جەستەم بەبێ ڕۆح دەهێڵێتەوە تکا دەکەم هەر لێم نزیک بە، یا ڕۆحم دەرنەچێ... کەچی لە وەڵامی چارەسەریدا پێمی وت: ئەو مەلی ڕۆحەی تۆ، کە تۆ پێت وایە جەستەی تۆ جێ دەهێڵێ؛ دڵنیات دەکەم هەر بەرەو لای من هەڵدەفڕێ و ئیتر لای من باڵ ناگرێ؛ یان: ئیتر لای من باڵی نامێنێ و ئەگەریش پێت وایە باڵی هەیە و دەفڕێ؛ با لای من لە قەفەسدا بێ.

سالم دەڵێ:

١- لە ناو سینەی قەفەسما، شەرتە ئازاری نەکەم ئیتر
لە داوی زوڵفی دڵبەر، گەر بە«سالم» مورغی دڵ بەربێ
«١٤٣»

٢- حەپسی منی ئەیمەن، بەخۆدا دوورە لە ئینساف
ئەم مورغە، بەبێ قەید و قەفەس، ڕامە هەموو دەم
«٨٦»



**٣- گوتم: مەنعم دەکا زوڵفت، لە پابەندیی لەبی شەهدت**
**گوتی: شەهدی دەهانی من، بەبێ نێشی مەگەس چاکە**

مەنع: ڕێگریی، قەدەغە، پاوان.
شەهد: هەنگوینی پاڵاوتە.
دەهان: دەم و زار.
نێش: چزوو.

واتە: زۆر شەیدا و تامەزۆری هەنگوینی لێوەکانتم، بەڵام زوڵفەکانت، بوونەتە ڕێگر و ڕوخسارتیان داپۆشیوە و ڕێگەی ماچکردن و مژینی هەنگوینی دەم و لێوتم نییە؛ بەڵکو زوڵفەکانت وەلابنێ. لە وەڵامدا وتی: ئەگەر بیەڵم هەنگوینی لێوم بەبێ ڕێگر و پەرژین، بەدەرەوە بێ، ئەوسا پارێزگاریم لە مێش و مەگەس پێ نەکرێ (کە مەبەست لە دڵدارانێتی)؛ بۆیە پێم چاکە زوڵفەکانم، ڕوخسارم داپۆشن.

«حەریق» دەڵێ:

چۆن دەکەی مەنعی دڵی من، تۆ لە شەهدی لێوی خۆت!
لێوی تۆ، وەک شەکەرستان و دڵی من، وەک مەگەس
«٢٦»

«مەحوی» دەڵێ:

وتم: ڕوخسەت دە جانا، بەقوربانی لەبت کەم: جان
وتی: بەحرێکی شەهد؛ ئەڵبەت دەنیشێ پێیەوە مێشێ
«٣٠٣»

**٤- گوتم: حەبسی دوو هیندووم من، هەتا مەستی خەیاڵی تۆم**
**گوتی: مەستی خەراباتی، لە پێوەندی عەسەس چاکە**

هیندوو: پێست ڕەش (ئاماژەیە بۆ زوڵف).
خەرابات: کەلاوە.
خەراباتی: ئەوانەی لانەواز و سەرخۆشی بەردەوامن و لە کەلاوەدا ژیان بەسەر دەبەن.
پێوەند: ئەو جۆرە کەلەپچە و ئامێرەی ئاژەڵ و زیندانیی پێ دەبەسترێتەوە.
عەسەس: ئێشکچی شەوان، پاسەوانی شەو، دارۆغە، گزمە.

واتە: وتم هەر کاتێ بەخەیاڵی دیدار و دیتنی تۆوە، مەست دەبم و دەمەوێ بۆ لات بێم، زوڵفەکانت لە پێم دەئاڵێن و دەمبەستنەوە، بەڵکو چارێکم بکەیت.

وتی: خەیاڵی مەست، کە بەرەو تاریکیی و ناو ڕەشایی زوڵفەکانم دێت و هەر لە ناو زوڵفەکانیشمدا گیر دەبێ و دەمێنێتەوە و لەو لانەواز و سەرخۆشانە دەچێت، کە حەز دەکات بچێتە کەلاوەی تاریک و لە کەلاوەی تاریکدا ژیان بەسەر دەبات، لەبەرئەوە ئەگەر پاسەوانانی شەو! گومانی لێ بکەن و بیگرن و بیبەستنەوە و زیندانی بکەن، شتێکی سەیر نییە.

«نالی» دەڵێ:

وەکو پەروانە، بەشەو هێندە بەموشتاقیی دێم –
بەچرای کوڵمتەوە – ڕەنگە عەسەس لێم بگەڕێ
«٦٥٣»

«حەریق»یش واژەی «عەسەس» بەمجۆرە بەکاربردووە:

چاوەکەم لەو باغی حوسنە، مەنعی چاوی من مەکە
لازمە بۆ پاسەوانیی باغەکەت؛ جووتێ عەسەس
«٢٦»

**٥- گوتم: بۆ گوڵبەنی قەددت، خەیاڵی گوڵچنینم کرد**
**گوتی: بۆ سەرووی ئازادم، کە نەتبێ دەسترەس، چاکە**

گوڵبەن، یان: گوڵبەند: پشتێنی گوڵێن، وەک چۆن تاجە گوڵینە، بۆ سەر تەوقە سەر و ملوانکەی گوڵ، بۆ گەردن و مل دروست دەکرێن، هەر بەوجۆرەش دەشێ گوڵبەند (لەسەر پێودانی بازووبەند، کەمەربەند) بۆ سەر کەمەر و پشتێن دروست بکرێ، کە ئەم دەستەواژانە هەر لە هونەری «ئەدەب» دەوەشێنەوە.

سەرووی ئازاد: داری سەرووی بەرز.

دەسترەس: شتێک کە دەست بیگاتێ.

واتە: پێم وت حەز دەکەم کەمەربەندێکی گوڵێن، بۆ کەمەرت بچنم، لە وەڵامدا پێمی وت: باڵام وەک سەرووی بڵند بەرزە و دەستت پیا ناگا و بەو خەیاڵەوە خۆت ماندوو مەکە.



دەگونجێ ئەم بەیتە بەمانایەکی تریش لێک بدرێتەوە، پێم وت خەیاڵی ئەوەم هەیە: دەستێ لە کەمەرت وەرێنم و دەست بەقەد و باڵا و سەر و سنگتدا بهێنم، کەچی وەڵامی دامەوە، کە: باڵام بەرزە و دەستت پیاناگا و هەرواش بێت چاکە.

«نالی» دەڵێ:

ئەی سەرووی بوڵەند قەد و برۆ تاق و مەمک جووت
کێ دەستی دەگاتە: بەی و ناری نەگەیشتووت!
«١٥٢»

«مەحوی» دەڵێ:

ئەوەندەم لەو قەد و باڵایە، ئاشووب و بەڵا دیوە
لە سەیری سەرووی باغم؛ غایلەی غولی بیابانە
«٢٧٨»

**٦- گوتم: میهری بتان تاکەی؟ خەیاڵم عوزلەتە جانا**
**گوتی: عەشقی پەری ڕوویان، هەتا ئاخر نەفەس چاکە**

میهری بتان: نازی بتان.

عوزلەت: کەنارەگیریی، دوورەپەرێزیی.

واتە: وتم: ئیتر لەگەڵ کاری ئەویندا و بەدەست نازکێشانی دڵبەرانەوە شەکەت و ماندوو بووم و نیازم وایە لەمەودوا دەستبەرداری ئەم کارە بم، وەڵامی دامەوە، کە ناتوانیت دەستبەرداری ئەوینت بیت، چونکە ئەوینی پەری ڕوویان، هۆگربوون و خولیایەکی شیرین و هەمیشەییە و ئەوی تووشی ئەوینی پەری ڕوویان بوو، ئیتر ناتوانێ دەست لە ئەوینیان هەڵگرێ، تا ئەو ڕۆژەی دەمرێ و تا دوایین هەناسەی، بەبێ ئەوینیان ناژی.

«مەحوی» دەڵێ:

تۆ دڵت دێوانە کردم؛ ئێستەکەش
نانوێنی ڕوو، پەری ڕوخسار هەی
«٢٢٢»

«وەفایی» دەڵێ:

١- دڵی دێوانە، لەسەر زوڵفی، لە عالەم بەرییە
قەت ڕەهایی نییە لەو داوە، کە بەستەی پەرییە
«١٦١»

٢- لەو زوڵفە - بەغەمزەی نیگەهت - نیمە ڕەهایی
من بەستەیی نێو داوی پەریزادەیی جادووم
«٧٢»

**٧- گوتم: بۆچ ڕێم نییە جارێ، بەگوڵزارت گوڵی نەورەس!**
**گوتی: گوڵزاری گوڵخێزم «ئەدەب»، بێ خار و خەس چاکە**

نەورەس: تازە پێگەیشتوو.

گوڵخێز: گوڵ بەرهەمهێن.

خار و خەس: دڕک و داڵ.

واتە: وتم: ئەی دڵدارە گوڵینەکەم، کە هەمووت گوڵزارە؛ بۆچی وەکو هەموو ئەوانەی حەز لە دیدەنی گوڵزار و باخ و گوڵشەن دەکەن، بۆیان هەیە بچنە ناو باخ و گوڵشەنەوە و کەچی من بۆم نییە هەر تەنیا جارێک سەردانی گوڵزار و باخچەکەت بکەم!. وتی: ئەو باخ و گوڵشەنەی من، کە هەمیشە گوڵ بەرهەم دەهێنێ، دەبێ بەردەوام لە دڕک و داڵ، بژاری بکەم و بیپارێزم، بۆیە دەبێ کەسێک کەسێک سەردانی بکات، کە وەکو بەشەکانی باغەکە وابێ و هەر تەنیا لە دوورەوە بۆنیان پێوە بکات، نەک کەسێکی وەک تۆ، کە بۆ ناو باخەکەم، وەک دڕک و داڵێت.

«نالی» دەڵێ:

لە کن تۆ: خار و خەس، گوڵزارە بێ من
لە کن من: خەرمەنی گوڵ، خارە بێ تۆ
«٣٨٢»



**٩٨**

کێش: بەحری موزاریع ئەخرەب مەکفووف مەقبووز: (مفعول فاعلات مفاعیل فاعیلن)، وەک نموونەی:

١- قوربانی تۆزی ڕێگەتم، ئەی بادی خۆش مروور
وەی پەیکی شارەزا؛ بەهەموو شاری شارەزوور
«نالی، ١٧٤»

٢- پوستانی دڵبەرم؛ بەنەزاکەت لە چینی زوڵف
وەک گۆی عاجە، بۆ خەمی چەوگانی ئابەنووس
«سالم، ٧٣»

٣- جۆبارە، لالەزارە، هەتا چاو بڕ دەکا
«مەحوی» بەهەشتی بۆچییە! چبکا لە ئاو و باخ!
«مەحوی، ١٧٣»

**١- جانا کەمم حەواڵە بەبادە و پیاڵەکە**
**ماچێ بەمە، لە لێوی پیاڵەت، حەواڵەکە**

جانا: گیانەکەم.

بەمە: بەئێمە.

حەواڵەکە: بنێرە.

واتە: گیانەکەم، ئەوەندە حەسرەتی ماچی ئەو لێوە ئاڵەتم چەشتووە و هەر پێی ناگەم، ناچار بووم بەردەوام پەنا بۆ بادە خواردنەوە ببەم، تا بەخەیاڵی ماچی لێوتەوە، سەرخۆش بم و کەمێک ئۆخژنم بگاتێ.

«سالم» دەڵێ:

جورعە نۆشیی تۆ بکەم، ئیتر لە بەزمی مەیکەدە
چاوی مەخموورت، بەعاشق کاری بادەی مەی دەکا
«٢٩»

**٢- شەهد و شەرابە نۆشی حەریفانی بەزمی تۆ**
**جامێ بەمە، بەراتی سەر ئەو لێوە ئاڵەکە**

شەهد: هەنگوین.

حەریف: هاوپیشە، هاوکار.

واتە: لە کۆڕ و کۆبوونەوەی تۆدا، هاوپیشەکانت ماچی لێوان دەکەن و بادە دەنۆشن. منیش چاوەنوارم وەک ئەوانم لەگەڵدا بکەیت و ئەو ماچانانەی بۆ کەسانی تری بەرات و خەڵات دەکەیت، منیش بێ بەش نەکەیت.

«وەفایی» دەڵێ:

من وەها زوو مەستی مەی نابم بەنەشئەی چاوەکەت
مەرگی من؛ ساقی! لەگەڵ ئەو جامە؛ لێوت بێنەوە
«١٥٨»

**٣- تا موختەسەر لە حاڵی مەت ئاگەهی ببێ**
**ئاوێنە ڕاگرە؛ نیگەهێ بەو جەماڵەکە**

موختەسەر (مختصر): بەکورتی، پوختەکەی.

ئاگەهی: ئاگاداریی.

نیگەهێ: سەیرکردنێک، چاوگێڕانێک.

واتە: بۆ ئەوەی ئاگات لەوە هەبێ، کە بەهۆی جوانیی و شۆخ و شەنگیتەوە، چەندانت گیرۆدە بووە، دەبێ هەر خۆت لە ئاوێنەدا لە خۆت ورد بیتەوە، ئەوسا دەزانیت جوانییەکەت، چ کارەساتێکی بۆ دڵدارانت دروست کردووە و ئەوسا کراسێک لە سۆز و ناڵەی دڵ و سووتانی ئێمە، لە خۆت دادەڕیت....

«مەحوی» دەڵێ:

شەوێ لەیلا بەمەجنوونی دەوت بنوارە حاڵی خۆت
بەخۆڕایی کە چۆنت دا بەبا، عەقڵ و کەماڵی خۆت
جوابی دایەوە مەجنوون: ئەگەر تاقەت ببێ لەحظێ
لە ناو ئاوێنەدا بنوارەرە حوسن و جەماڵی خۆت
«٣٣١»



**٤- دەردی فیراق و غوسسەی ئەییام و بەختی بەد**
**هەرسێ دووچارمن، وەرە ئەو ڕۆژە تاڵەکە!**

غوسسە (غُصّة): خەم، دڵتەنگیی، پەژارە، مەترسیی.

ئەییام: ڕۆژان (کۆی ڕۆژ).

بەختی بەد: بەختی خراپ.

واتە: چارەنووسم تاڵە، چونکە: ١- دەردی جیایی. ٢- خەم و پەژارەی ڕۆژان. ٣- بەختی خراپ: هەرسێکیانم لە لا کۆبوونەتەوە و ژیانمیان لێڵ و تاڵ کردووە.

**٥- تیرێکی غەمزە، کافییە بۆ تیپی عاشقان**
**سەیری خەدەنگی سەتوەتی ئەو چاوە کاڵەکە**

کافییە: بەسە.

سەتوەت (سطوة): هێرش، دەسەڵات، شکۆ.

واتە: تەنیا تاقە سەیرکردنێکی بۆ پۆلی دڵداران، بەسە بۆ ئەوەی هەموویان بئەنگێوێ و هەموویان تووشی دەردی ئەوینی خۆی بکات. ئەمەش دەسەڵات و شکۆیەکی سەیر و مەزنە، کە ئەو چاوە کاڵانەی ئەوەندەیان توانا هەبێ.

«وەفایی» دەڵێ:

تۆ ڕەنجە مەبە، کوشتنی ئاسانە وەفایی
بەو غەمزە ئیشارەت بکە، بەو چاوە بفەرموو
«١١٠»

«مەولانا خالید» دەڵێ:

تیرها غمزات را از دل دل دادگان
هر طرف بینم فتاده بر سرکویت غرض
«٥٣٥»

«نالی» دەڵێ:

دەکەی نەخچیری سەد دڵ هەر بەتیرێ
ئیلاهی هەر بمێنێ دەست و بازووت
«١٥١»

**٦- چاهی زەقـەن لە ڕێگە و گـێـسـوو: دەلیلی دڵ**
**تۆ سەیری ئەم عەساکەش و ئەم کوێر و چاڵەکە!**

چاهی زەقەن: چاڵی چەناگە.

عەساکەش: ئەو کەسەی دەستی بەگۆچانەوەی نابینایان دەگرێ و ڕێنوێنییان دەکات؛ کە لێرەدا مەبەست لە: عەساکەش: زوڵفی یارە.

کوێر: نابینا (بەڵام لێرەدا مەبەست لە: دڵە).

واتە: ئەڵقە و پێچی زوڵفەکانی، بەسەر ڕوخساریدا بڵاوکردۆتەوە و تا نزیک سەر چەناگەی بوونەتەوە، منیش بەخەیاڵ لە ڕێگەی وردبوونەوە لە زوڵفەکانی، سەرنج لە چەناگەی دەدەم، تا بەڕێنوێنی زوڵفەکانی، لە دڵەوە سەرنجم دەکەوێتە چاڵی چەناگەیەوە، جوانیی چاڵی چەناگەی گیر و زیندانیم دەکات... لەوێدا بەهۆش خۆم دێمەوە و لەبەر خۆمەوە دەڵێم: تۆ سەیری ئەم زوڵفانەی بکە، کە وەک شارەزا و ڕێنوێنی دڵ، سەرنجی نەدیتە و نەشارەزایانەی منیان بۆ کوێ برد!!.

«کوردی» دەڵێ:

لە نێـو چاهی زەنەخـدانت ئەسـیـرن
هەزارێکی وەکـو: هارووت و مـارووت

هەروەها «وەفایی» دەڵێ:

١- لەسەر چاهی زەنەخدان؛ دێ و دەچێ، ڕوحمی نییە زوڵفت
فـەرەنگیی ڕۆژ پەرسـتـە، کـافـرە، زیندانەوانیی من
«٩٣»

٢- دڵ لەسەر پەرچەمی شێواوە، ئەسیری زەنەخە
ئـارێ، ئـارێ. ئـەوە دێـوانـەیـە؛ زیـنـدانـی دەوێ
«٢٠٥»

**٧- سەد ضەیغەمت شکاری دوو چەشمن، بەیەک نیگا**
**نیـروویی شـێـری شـەرزە و ئەو دوو مـەراڵەکـە**

ضەیغەم: شێر (مەبەست لە دڵدارە).

شکار: ڕاو.



نیروو: هێز، توانا، وزە.

مەراڵ: ئاسک، مامز (لێرەدا مەبەست لە چاون).

واتە: هەر بەیەک تیلایی پڕ لە نازی چاوەکانت، سەد نەڕە شێرت ڕاو کرد! تۆ سەیری توانایی ئەو نەڕە شێرانە و زەبری ئەو چاوە مامزییانە!!.

«نالی» دەڵێ:

١- گەلێ شێر و پوڵەنگ و باز و شاهێنی شەهەنشاهی
وەکـو «نالی» بەدڵ نێـچـیـری ڕاوی چاوی جـادووتن
«٣٣٠»

٢- ئەڵا، ئەی ئاسکی ناسک، بەپاسک
شکاندت گـەردنی سـەد شـێـری شـەرزە
«٤٤٩»

**٨- ڕۆژ و شەوم خەیاڵی ویساڵی لەبت هەیە**
**«یا للعـجب» خەیاڵی منی پڕ خەیاڵەکە**

ویساڵ: دیدار، دیتن، بەیەک گەیشتن.

یا للعجب: چ سەیرە، چ سەمەرەیەکە.

واتە: هەمیشە و بەردەوام، بیر لەوە دەکەمەوە چۆن چۆنی بەلێوی تۆ بگەم. تۆ سەیری ئەم سەمەرەیە و ئەم خەیاڵ پڵاوەی من بکە! وەک ئەوە وایە: دوای کڵاوی با بردوو بکەوم! چونکە دەزانم کە هەرگیز پێی ناگەم.

**٩- تا کـەی سـەری تەکـەببـور و نازت دەگـەڵ مـەیە!**
**جارێکی تەفەققوودێکی لە ئەم خەستە حاڵەکە**

تەکەببوور (تکبر): فیز، گەنجەفە.

تەفەققود (تفقد): سەردان، دیدەنی، ئەحواڵپرسی.

مەیە: ئێمەیە.

خەستە: نەخۆش، ماندوو، نارەحەت.

واتە: ئەم هەمـوو فـیز و ناز و لـووتبەرزییەت تاکەی لەگەڵ ئێمەی نەخۆشیی ئەوینی

خۆتدا دەکەی!؟ ئاخر ئێمە پێمان خۆشە سەرێک لە ئێمەی دەردەداری خۆت شۆڕ بکەیتەوە و سەردانێکمان بکەیت.

«نالی» دەڵێ:

هەر بەئومێدی عیادەت، بەڵکە جارێ بێتە لام
من، ئەگەرچی بیشمرم، پێم خۆشە ئەم بیمارییە
«٥٨٤»

«مەحوی» دەڵێ:

١- لێــوی بەپرســشی نەخــۆشێ نەپشکواند
دەردا! تەبیبی ئێـمە، کـە نادا دەوا بەکـەس
«١٤٧»

٢- چ شۆخە! هاتبوو گۆیا عەیادەتە «مەحوی»
کە ڕۆیی، ڕووشی نەدامێ، بلێ خوداحافیز
«١٦٣»

«وەفایی» دەڵێ:

دیم هاتە عیادەت، دەمی پڕ خەندە بوو؛ یەعنی:
ڕۆح و دڵی بیـمـارە، دەوای گـوڵشـەکـەری من
«٩٢»

**١٠- وەعدەی ویساڵی داوە بەمە، یاری مە «ئەدەب»**
**کـــەمـــتـــر لە دەردی دووریی، دیداری ناڵەکـە**

وەعدە: پەیمان، بەڵێن، بڕیار.

بەمە: بەئێمە، بەمن.

واتە: ئەی «ئەدەب»، ئەو یارەی ئێـمـە، بەڵێنی داوە دیدەنیـمـان بکات، ئیـتـر ئەوەندە ناڵە ناڵی دەردی دووریی و بێزاریی لە دەست دووریی مەکە.

«نالی» دەڵێ:

مەکە ئیخلافی ئەو وەعدەی کە فەرمووت
دەخیلت بم؛ کە خانەی صەبرەکەم سووت
«١٤٨»



**٩٩**

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف، یا مەقسوور: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)، وەک نموونەی:

١- «نالی» نییەتی سیحری بەیان، حیکمەتی شیعرە
ئەمما نیـیـەتی قـووەتی دڵ، قـودرەتی ئینشـا
«نالی، ٧٨»

٢- یارەب گـوزەران کـا؛ بەسـەفـا، وەختـی عـەزیزت
پەیوەسـتـە لە دەوری چەمـەن و گـەردشی باغـا
«شێخ ڕەزا، ٧»

٣- مـەئزوونی ئەوەندە: وەکـو ئاهم بەنەزاکـەت
لادەی سـەری زوڵفی، نەوەکـو بیـخـەیە لەرزە
«حاجی قادر، ١٠٩»

**١- دڵ چەنگی سـەری طوڕەتە، بەو مـاهی بەچەنگە**
**گەر چەنگی نییە، بۆچی بەهەیئەت قەدی چەنگە؟**

چەنگ: قـوڵلاب، لە هەمان کـاتیشدا ئامێرێکی مۆسیقاییە، بەڵام لێرەدا مەبەست لە قوڵلابە.

طوڕە: کاکۆڵ، پەرچەم.

ماه: مانگ. (لێرەدا مەبەست لە ڕوخساری یارە).

هەیئەت: شێوە، ڕوخسار.

واتە: سوێند بەو مانگی ڕوخسارە قوڵلابییەت، دڵی من، وەک ئەو گوڵەی سەر کاکۆڵ و پەرچەمت وایە، کە لە شێوەی قووڵلابدا چنگی لە پەرچەم و کاکۆڵت گیر کردووە، ئەی ئەگەر قوڵلاب نییە، بۆچی شێوەی گوڵەکە، وەک قوڵلاب چەمیوەتەوە و چنگی لە دڵم گیر کردووە!؟ (یان: بۆچی ئەڵقە ئەڵقەی کاکۆڵ و پەرچەمت، چەمیونەتەوە و چنگیان لە دڵم گرتووە!؟).

«نالی» دەڵێ:

حەڵقە حەڵقەی چ دەکەی داوی کەمەندی زوڵفت
بۆ دڵی خەستە؛ کەوا بەستەیی هەودابێکە!؟
«٤٦٢»

«سالم» دەڵێ:

ڕەها ناکا دڵم طوڕەی خەمی یار
سەری نەبڕن هەتا وەک پەرچەمی یار
«٥٧»

**٢- خوێنی لەبی عوششاقە، خُضّابی کەفی ڕەنگین**
**ئەو دوو کەفە ڕەنگینە، چ موحتاجی بەڕەنگە!**

خوضضاب: ڕەنگی خەنە و وەسمە.

کەف: بەری دەست، لەپی دەست.

واتە: ئەو ڕەنگ خەنەییەی بەری دەستە ڕەنگینەکانت، خوێنی لێوی ئەو دڵدارانەیە، کە لە پێناوی تۆدا سەریان داناوە. بەڵام بۆچ وا دەکەی!؟ خۆ بەری دەستە ڕەنگینەکانت، خۆیان جوان و ڕەنگینن و چ پێویستییان بەڕەنگکردنە!؟.

«نالی» دەڵێ:

حەنایی کردووە پەنجەی، بەخوێناوی دڵی زارم
ئەمە ڕەنگە شەهادەت بێ، کە کوشتەی دەستی دڵدارم
«٣٧»

**٣- ڕوخسارە فروزانە لە ناو زوڵمەتی گێسووت**
**یا تەلعەتی بەدر و ئوفوق و وادیی زەنگە؟**

فروزان: درەوشاوە، پڕشنگدار، گەشاوە.

تەلعەت: دەرکەوتن.

بەدر: مانگ.

ئوفوق: ئاسۆ، گزنگ.



وادی: دۆڵ.

زەنگ: ڕەش (بەمانای پێست ڕەشیش دێت).

واتە: ئەوە ڕوخسار و ڕووی گەش و درەوشاوەیە، لە ناو تاریکایی زوڵفەکانتدا، یا دەرکەوتنی مانگ و گزنگە، لە چاڵایی و دۆڵی وڵاتی تاریکی و پێست ڕەشاندا!؟.

**٤- زوڵفی بەشکەن، شوهرەیی خارەزم و خەتا-یە**
**چاوت بەفیتەن، فیتنەیی ئیسلام و فەرەنگە**

شکەن: پێچ و لوول.

شوهرە: ناودار، بەناوبانگ.

خارەزم و خەتا: هەردووکیان هەرێمن لە خۆرهەڵات، هەردووکیشیان بەوجۆرە بەناوبانگن، کە ناووکی ئاسکەکانیان بۆنی میسک دەدات.

فیتنە: پشێویی، ئاشووب.

فەرەنگ: ئایینی مەسیحایی.

واتە: زوڵفە لوولەکانت، لە ناوداریدا، ناوداری هەرێمەکانی «خارەزم و خەتا»ن، چاوەکانیشت لە ئاژاوەنانەوەدا، مایەی ئاژاوەی نێوان ئایینی ئیسلام و مەسیحن. بەم پێیە؛ لە سەرێکەوە: زوڵفەکانت مایەی ناودارییە لە خۆرهەڵات، کە زۆرترین ئیسلامی تێدان و چاوەکانیشت مایەی ئاژاوەی نێوان ئایینی ئیسلام و مەسیحن؛ کە زۆرترین مەسیحایی لە ئەوروپادان. بەواتا: تۆ قسە و باسی سەر زمانی دانیشتوانی خۆرهەڵات و خۆرئاوایت.

**٥- گەر شەهدی لەب و ماچی دەمت، نەیشەکەرە بۆم**
**زەوقی شەوی هیجرت، لە دەمم: ژەهری شەرەنگە**

شەهدی لەب: هەنگوینی دەم (مەبەست لە ماچی شیرینە).

نەیشەکەر: قامیشی شەکەر.

شەرەنگ: ژەهر، گوژاڵک.

واتە: ئەگەرچی چێژ و بەرامەی ماچی دەمت، وەک تامی هەنگوین و شەکر بوو، بەڵام ئازاری شەوی دووریت، وەک ژەهر، بەدەم تاڵ بوو.

**٦- لوتفی دڵم و ڕەحمی دڵ و صەخرەیی صەممات**

**کەیفییەتی خارا و سەبوو، شیشە و سەنگە**

صەخرە: بەردی سەخت و ڕەق.

صەمما: لە (ئەصەم)ەوە هاتووە، بەمانای کەڕ و هیچ نەبیستوو.

خارا: جۆرە بەردێکی یەکجار سەخت و ڕەقە و زۆرینەی هەڵکۆڵراوە بەردینەکانی دێرینە و بەناوبانگەکانی جیهان، لەسەر ئەمجۆرە بەردانە هەڵکۆڵراون.

سەبوو: گڵی ڕەقی سوورەوەکراو، کە دەکرێتە دەفر و گۆزە و کاسە و شەربە.

شیشە: شووشە.

سەنگ: بەرد.

واتە: سۆز و میهرەبانیی دڵی من و بەردی سەختی هیچ نەبیستووی دڵی تۆ، وەک نێوانی بەردی خارا و گۆزە و دیزە و بەرد و شووشە وایە.

«نالی» دەڵێ:

دڵ: شیشەیی پڕ خوێنی فیراقی فەرەقی بوو
مەکسووری ڕقی بەو دڵی وەک: بەردی ڕەقی بوو
«٣٧٥»

**٧- تەنگیی دەمی تۆم هاتە نەزەر، لەو غەزەلەیدا**

**بۆیەم بەخودا، وەک دەهەنت قافییە تەنگە**

هاتە نەزەر: هاتە بەرچاو، هاتە بەرهەست.

دەهەن: دەم و زار.

واتە: لە کاتی نووسینی ئەو غەزەلەدا، تەنگیی دەمی تۆم هاتە خەیاڵ و هەست، بۆیە قافیەی غەزەلەکەشم تەنگە.

«نالی» لە بارەی تەنگیی دەمی یارەوە، ئاوا دەڵێ:

١- وەسفی ڕوخساری لە فیکری بەنی ئادەم بەدەرە
ئیتیدای مەدحی دەمی، وەک خەبەری بێ ئەسەرە
«٤١١»



٢- دەم، هەمدەمی خونچێکە، نەپشکووتووە هێشتا
با، کەشقی نەکرد بەرگی عەتر پۆشی گوڵی ڕووت
«١٥٢»

«وەفایی» دەڵێ:

١- خەندە بەم شیرینییە، دەم: بەم نموونەی حیکمەتە
قەت «وەفایی» نەبووە وا خۆش بێ: خەبەر، بێ موبتەدا
«١٣»

٢- ماچی دەمی خەندەی، دەمەکەی سیڕی بەیان کرد
ئەو جەوهەرە وا فەردە، نە مەوجوودە نە مەعدووم
«٧٢»

٣- چییە ئەم نوقطە! کەوا بۆتە نیشانەی دەمی
نوقطەیی هیچە، کەچی نوکتەیی سەد ئاهی دڵە
«١٣٣»

«مەحوی» دەڵێ:

١- دەم؛ نادیار و نازی قسەی پڕ دەشت و شار
دنیایەک ئاوی زیندەگیی و دەرخرێ لە هیچ
«٩٩»

٢- بێ چوونە عەدەم، پەی بەسۆراغی دەمی تابەی
فایز ببە بەم گەوهەرە، لەو بەحرە، بەرۆچوون
«٢٤٤»

«حاجی قادری کۆیی» دەڵێ:

جەبینی: ماه و روخی: میهرە، زوڵفی: شەو، دەهەنی:
سەبەب بەقافیە تەنگیی بوو، «حاجی» نەینووسی
«١٦٢»

**٨- بێ وەجهە «ئەدەب» فیکری ڕەهایی لە کەمەندی**
**تا کێشی کەماندارە؛ بڕۆ پڕ لە خەدەنگە**

بێ وەجهە: بێ مانایە، بێ کەڵکە، بێهوودەیە.

ڕەها: دەربازبوون، دەرچوون.

واتە: چونکە برۆکانت تازە برژانگەکانتی وەک تیرهاوێژەرێک، بۆ تیر هاویشتن ئامادە کردووە و مژۆڵەکانیشت، تیردانی خۆیان پڕن لە تیر، ئیتر من و خەیاڵی خۆ دەربازکردن، لە گیرۆدەیی تۆ، شتێکی بێ کەڵک و بێهوودەیە و تا دەمرم، دەبێ هەر گیرۆدەی تۆ بم.

«مەحوی» دەڵێ:

١- خەلاسی بوونی قەت ناوێ، ئەسیری زوڵفی زنجیرت
لەبەر تیرت؛ مەلەک بێ، هەڵفڕینی نەبووە نەخچیرت
موژەت قوللابی گیرا، زوڵفی دڵگیرت کەمەند ئاسا
مەحاڵە بەر گرێ، یا بەربێ، کەس کەوتە بەرگیرت
«٦٦»

٢- کەمەندی زوڵفی وەک ئەبرێشمی خاوی نیگارینت
لە دڵ ئالا، خەیاڵی خاوە، دڵ لەو داوە بەربوونت
«٧٥»



٨٩

**سەرنج:**

١- لەبەرئەوەی ئەم غەزەلە، لە ڕووی (کێش) و وێنەی شیعریی و مانای زۆربەی واژەکانیشیەوە، وەک غەزەلی پێشوو، واتە: وەک غەزەلی ژمارە (٩٩) وایە؛ بۆیە لەم ڕووەوە لێکدانەوەی کێش و واتای بەیت و واژەکانی، بەکارێکی دووبارە دەزانین.

٢- ئەم غەزەلەی «ئەدەب» زۆر لە کەش و هەوا و تەنانەت (کێش) و ژمارەی بەیتەکانی غەزەلێکی شاعیری ناسراو «تاهیر بەگی جاف» دەچێ؛ کە لە لاپەڕەکانی (٢٣ – ٢٤)ی دیوانەکەیدا چاپکراوە. بۆیە بۆ بەبیرهێنانەوەی خوێنەرانی هێژا، بەپێویستم زانی غەزەلی ناوبراوی «تاهیر بەگ» وەک خۆی بۆ ئێرە بگوێزمەوە، تا ئەگەر لە داهاتوودا، لە دووتوێی کەشکۆڵ و دەستخەتی هێشتا چاپ نەکراودا ئەوە ساغ بووەوە، کە ئەم غەزەلەی تاهیر بەگ، هی کێیە؛ ئەوسا ئەم بەبیرهێنانەوەیە، کەڵکی بۆ توێژەرانی مێژووی شیعری کلاسیکی کوردی دەبێ. هەرچەندە پێشەکی من پێم وایە، کە غەزەلی ناوبراو، سنعەتسازیی و کەش و هەوای شیعری «ئەدەب»ی زۆرتر پێوەیە.

ئەم بیرهێنانەوەیەش لەو کلاوڕۆژنەیەوە دەنووسم؛ چونکە دیسانەوە غەزەلێکی تری (ئەدەب)؛ کە لەم دیوانەی بەردەستماندا ژمارە (١١١)مان داوەتێ و بەم بەیتە دەست پێ دەکات:

دڵ لە حەسرەت غەمزەکەی دوو نێرگسی پڕ خەوتەوە
وەک خەمی زوڵفت عەزیزم، چوو بەڕوودا و کەوتەوە

لە لاپەڕە (١٨)ی دیوانی چاپکراوی «تاهیر بەگی جاف»دا و هەر بەناوی (تاهیر بەگ)یشەوە لە دەیان ساڵ لەمەوبەرەوە چاپکراوە و هیچ ڕەخنەگر و توێژەرێکی ئەدەبیی کوردی، ئاماژەی بۆ نەکردووە.

ئەی پرتەوی ڕەنگت، وەکو ڕەنگی هەمەڕەنگە
خاڵت، بەمەسەل زوڵفی سیاهت شەوی زەنگە
بەزمت تەرەب ئامادەیە، ساقی مەیی فەرموو
دەنگی دەف و ناڵەی نەی و ئاوازەیی چەنگە
لێوت؛ کە وەکو لەعلی بەدەخشانە، بەئاڵیی
گەنجووری نیگەهبان و دەهان و دەمی تەنگە

تابووری مـــوژانت لەگـــەڵ ئەگـــریجـــە بەرابەر
وەســـتـــاوە، ئەڵێی لەشکری ژاپۆن و فـــەرەنگە
صـــەد نامی خـودا بێ لە دوو پســـتـــانی ئەنارت
گـــرد و شلک و نازک و پڕ چنگ و قـــەشـــەنگە
بۆ باری غـەمت، گـەر بەدەنم سـسـتـە، مـەڕەنجـە
پـێکراوی مـــــــوژەی تـۆیـە، ڕاوی تفـــــــەنگە
سەرگەشتە و ئاشوفتـەیی عیشقم وەکـو فەرهاد
کـێـو و بەدەن و سـینە و سـەر و پەنجـە: قـوڵنگە
چاوت بەمـــەســـەل ئافـــەنی دڵهـــایە، ولێکن
بۆچ وایە! کـە ئەبرۆیی کـەچت، مـەیلی بەچەنگە؟
لەم ڕۆژە؛ کە ڕووی خستە بەری پێی و وتم پێی:
ئەی ئەبلەهـ، کـەی مـــاڵشی ئایینە و ســـەنگە!
مەعدەمێکە «تاهیر»، کە ئەگەر مات و خەمۆشە
دێوانەیی ڕووی تۆیە، نە مـەسـتی مـەی و بەنگە
(دیوانی: تاهیر بەگ –
چاپخانەی نەجاح – بەغداد – ل ٢٣ – ٢٤).



## ١٠١

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)، وەک نموونەی:

١– ئەسـپی نەفـەست دێت و دەچێ، گـەرمـە عـەنانی
ئەی مـەسـتی ریازەت، هەلە! هوشـیـاری جلـەو بە
«نالی، ٣٩٣»

٢– وەعـدەی مـن و تۆ، ئەی ڕەمـەزان، ڕۆژی جـەزا بێ
شـــەرعی مـن و تۆ، لە حـــوزوور باری خـــودا بێ
«شێخ ڕەزا، ١٥٨»

**١– ئەو خاڵی سیەهچوردە، کە هەر عەینی جەماڵە**
**بۆ سەڵتەنەتی کیشوەری حوسنت، دوو قەڕاڵە**

سیەهچوردە: ڕەشتاڵە.

قەراڵ: ڕابەر، فەرمانڕەوا.

واتە: ئەو خاڵە مەیلەو ڕەشەت، کە هەر خۆی لە خۆیدا جوانە و لێت بۆتە نەخش، لە هەمان کاتیشدا ئەگەر هەر خۆت، بەبێ ئەو خاڵەش، وەک یەک پاشا و یەک دەسەڵاتدار و فەرمانڕەوای دەوڵەتی تاقانەی جوانیی خۆت بیت، ئەوا بەهۆی ئەم خاڵەتەوە، جوانییت ئەوەندەی تر دەسەڵاتی داویتێ و ئێستا وەک دوو قەڕاڵ و دوو پاشا و دوو فەرمانڕەوای نیشتمانی جوانیی خۆتیت.

**٢– حیرەت نییە ڕەم کردنی تۆ، جارێ لە ئێمە**
**ئەم حەوسەڵەیە، خاسییەتی چینی مەراڵە**

حیرەت: سەرسامیی، ڕامان، سەرسوڕمان.

ڕەم کردن: سڵ کردن (بەتایبەتی بۆ ئاسک)، پارێز.

حەوسەڵە: تاقەت، پشوو، توانا، ئارام.

خاسییەت: تایبەتمەندێتی.

مەراڵ: ئاسک، مامز.

چینی مەراڵ: ئاسکی وڵاتی چین؛ یان پۆل و دەستەی ئاسک.

واتە: بەلامەوە جێی سەیر و سەرسوڕمان نییە، کە تۆ پارێزم نەدەیتێ و سڵم لێ بکەیت؛ چونکە ئەمجۆرە حەوسەڵەیە خوویەکی زگماکی و تایبەتمەندییەکی تاقانەیە بەئاسکانەوە.

«نالی» دەڵێ:

لەحزەییێک و لەمحەیەک، چاوم بەچاوی ناکەوێ
کێ دەڵێ وەحشی غەزالە، مەیلی ئینسانی هەیە!
«٥٧٦»

«سالم» دەڵێ:

تا لە دڵما بێ، خەیاڵی وەحشی تۆ، دەگرم نەفەس
نەک بەسروەی بای هەناسەم، ڕەم بکەی میثلی غەزال
«٧٩»

«مەحوی» دەڵێ:

١- لە عوششاق و ڕەقیب، ئەو شۆخە چاوی لوتفی وەرگێڕا
کە ئاسک؛ ئادەمیی، یا سەگ ببینێ، غەیری سڵ چبکا!؟
«١٥»

٢- نەکەوتە دام و ڕامی کەس نەبوو وەحشیی نیگاری من
جیهانێ سەعی و کۆشش چوو، لە ڕێی ئەم ئاهووە زایع
«١٦٦»

«وەفایی» دەڵێ:

رامی دڵم نەبوو هەرگیز، بەفسوون دڵ بووە خوێن
گوڵە سەرمەستە؛ غەزاڵێکی عەجەب وەحش وسڵە
«١٣٣»



**٣- ئاشوفتەگیی سەد دڵی شەیدایە بەجارێ**
**ئەو زوڵفی سەمەن سایە، کە ئاڵۆزی شەماڵە**

ئاشوفتەگیی: شێواویی، ئاڵۆزیی، پەرێشانیی.

زوڵفی سەمەن سا: زوڵفی وەک گوڵی یاسەمەن، یاسەمین ئاسا.

واتە: هەر کاتێ شەماڵ، ئەو قژ و زوڵفە وەک گوڵی یاسەمینەت دەشێوێنێ، ئیتر ئەوە بزانە، کە هاوکات سەدان دڵی شەیداش بەجارێ دڵیان دەئاڵۆزێ و ژیانیان لێ دەشێوێ.

هەر ئەدەب خۆی لە غەزەلێکی تریدا دەڵێ:

تا تێک نەچێ بەبادی سەبا، چینی طوڕەکەی
دەرناکەوێ چ خوێنێ دەکا ئەم طەریدەیە
«غەزەلی ١١٤»

**٤- چەندت بەمە شیرینە، سەحەرگاهی ویساڵت**
**سەد چەندە، شەبی هیجری لەبی تۆ، بەمە تاڵە**

سەحەرگاهی ویساڵت: بەیەک گەیشتنی بەربەیانیانت.

سەد چەندە: سەد ئەوەندە.

شەب: شەو.

واتە: ئەگەرچی ژووان و دیدەنی بەربەیانیانت، بەلای منەوە یەکجار بەتام و شیرینە، بەڵام ئەو شەوانەش، کە لە ماچی لێوی تۆ، دوور دەبم، سەد ئەوەندەی شیرینی ئەو دیدارانەتم بەلاوە تاڵن.

«مەحوی» دەڵێ:

ویساڵت: نارە، هیجرت: ڕۆژەڕەش، وەک ئافتابی تۆ
لە تۆ نەزدیکە: پشکۆیە، خەڵووزە: گەر لە تۆ بێ دوور
«١٢٩»

**٥- هێندەم بەجەفا دیوی، ئەگەر بێیە کەنارم**
**تەردیدمە! یاڕەب ئەمە تۆی؟ یانە، خەیاڵە؟**

تەردید (تَردید: عەرەبی): دووودڵیی، سێ و دوو کردن.

واتە: ئەوەندەی دەردی دووریی و ستەمی تۆم چەشتووە و لەگەڵ جەور و جەفاتدا ڕاهاتووم و دەقم پێوە گرتووە، پێم وایە ئیتر دەبێ نێوانی من و تۆ، هەر ئەو دووریی و ئازارە بێت، بۆیە کە لە ڕێکەوتێکدا پێک دەگەین و لە تەنیشت خۆمەوە دەتبینم، بڕوا بەخۆم ناکەم، کە ئەمە ڕاستییە و ئەمە خۆتیت لە کەنارمەوە، نەک خەیاڵ!.

**٦- ناگونجێ لە دڵ پێکەوە: هەم عیشقی تۆ، هەم عەقڵ**
**ئەو سەڵتەنەت و ویسعەتی ئەم شارە جەلالە**

واتە: عیشق و عەقڵ، مەودایان لە یەکەوە دوورە و ئەو دووانە پێکەوە ناسازێن، بەتایبەتیش «عەقڵ» لە دڵی عاشقدا، جێگەی تەنگ و نالەبارە، چونکە عیشق مەودا و پێوانەیەکی بەرین لە دڵ و هەستدا داگیر دەکات و پێی ناخۆشە، بابەتێکی تر، بۆ خەریکبوونی دڵ، پەیدا ببێ. بۆیە ئیرەیی پێ دەبات و تەنگی پێ هەڵدەچنێ.

«نالی» دەڵێ:

عاشق: هەوەسی مەیکەدە و عیلمی بەسیطە
عاقڵ: طەلەبی مەدرەسە و جەهلی مورەککەب
«١٣٥»

«سالم» دەڵێ:

قەراری عاشق و قانوون و حیکمەت، زددی یەک هاتن
کە تەسکینی برینی دڵ، بەنەفخەی زوڵفی مشکین بوو
«١٠٩»

**٧- تا بادەیی عەیشم نەچەشی، کەشفی نەبوو بۆم**
**لەو مەزهەبەدا، خوێنی گرفتاری حەلالە**

عەیش: ڕابواردن.
چەشی: چەشتن، تامکردن.
کەشف: پشکنین، دیتنەوە.

واتە: پێشتر هیچم دەربارەی ڕابواردن و لەزەتی ئەوین نەدەزانی، بەڵام دواتر، کە تامی سیحراویی مەیی ئەوینم کرد، بۆم دەرکەوت ئەوی لەو ڕێباز و بیروباوەڕەدا نەژی؛ نازانێ چ جیهانێکی شیرین و تایبەت و جیاوازە. بۆیە پێی خۆشە هەموو تەمەن و ژیانی لەو



ڕێباز و بیروباوەڕەدا دابنێ و مردنی خۆیشی هەر لەو پێناوەدا، بەپەیامێکی پیرۆز و شیرین و بەرز دادەنێ.

**٨- مەدحی قەد و باڵاتە، لە ئەشعاری «ئەدەب»دا**
**ڕێزەی شەکەرە؛ تێکەڵی ئاوێکی زوڵاڵە**

ڕێزەی شەکەر: شەکری وردە، شەکری زۆر ورد.

واتە: تۆ وەک ئاوێکی زوڵاڵ و ڕوون و سازگاریت و شیعری منیش لە چاو تۆدا، وەک وردە شەکرێکی زۆر وردە، خۆ ئەگەر لە شیعری مندا، وەسفی قەد و باڵای تۆ هەبێ، ئەوا دەبێ ئەوسا ئەو وردە شەکرەی شیعری من لە تۆی وەک ئاوە ڕوون و زوڵاڵەکەدا بتوێتەوە و بەیەکجاریی دیار نەمێنێ و نەبینرێ و هەر تۆی ئاو بەچاو ببینرێیت، چونکە من هەرچی وەسفی شاعیرانەی تۆ بکەم، لە بەرامبەر جوانیی تۆدا ون دەبێ و دیار نامێنێ و بەتەنیا جوانیی تۆ ئاشکراتر و جوانتر دەبێ و هەر جوانیی تۆش دەمێنێ و من لە ناوتدا دەتوێمەوە.

«حاجی قادری کۆیی» دەڵێ:

لێوی وەک قەندە موکەڕڕەڕ، لە دەما شیرینە
بۆیە تەکرارە، وەکو: ناڵە، ئەنیسی نەفەسە
«١١٤»

## ١٠٢

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)، وەک نموونەی:

١- شاه ب قەصدا کوشتنا من، رم هەژاند و بوو سەبەب
دامە چەشمێ قەهر و خەشمێ رم ل دل دا کو ئەدەب
«مەلای جزیری، ٧٠»

٢- ئاسمانی حوسنی مەحبووبم لە ئەبرۆ و زولف و ڕوو
دوو هیلال و دوو شەو و دوو ماهی تابانی هەیە
«نالی، ٥٧٤»

٣- چاوەکەت وەختێ بەئیما، مەیلی جامی مەی دەکا
هەرچی مەی دەیکا لەگەڵ ئەو، ئەو لەگەڵ ئێمەی دەکا
«سالم، ٢٩»

**١- زوڵمەتی یەڵدا؛ دەگەڵ نووری مصەووەر، تێکەڵە**
**یا: دەگەڵ هەنیەت، سەری زوڵفی موعەنبەر، تێکەڵە!**

زوڵمەت (ظوڵمەت): تاریکایی.
یەڵدا: دوایین شەوی پاییز و یەکەمین شەوی زستان.
نوور: ڕووناکیی.
مصەووەر: وێنەکێشراو.
هەنیە: ناوچەوان، تەوێڵ.
موعەنبەر: عەنبەراویی.

واتە: ئەوەی لە وێنەی ڕوخسار و کاکۆڵەکانتدا دەیبینین؛ چۆن چۆنییە!؟ کە تاریکایی بسکەکانت، دەڵێی ڕەشایی شەوی یەڵدان و لەگەڵ ڕووناکایی ڕوخساری وەک بەدەست وێنە بۆ کێشراوتدا تێکەڵن! یان: ئەو دوو ڕەنگە، سپی و ڕەشە؛ ڕەنگی ناوچەوان و هەنیەی ڕووناکتن، لەگەڵ سەری بسکە وەک عەنبەراوییەکانتدا تێکەڵن؟.



**٢- لەشکری ئەگریجە و زوڵفن، بەتاراجی دڵان**
**یا: بەیاری یەک سپاهی هەفت کیشوەر، تێکەڵە!**

تاراج: تاڵان، بڕۆ، فڕاندن.
یاری: یاریدەدان، هاریکاریی، یارمەتی.
سپاه: لەشکر، سوپا.
هەفت: حەوت.
کیشوەر: وڵات (وڵاتی گەورە).

واتە: کاکۆڵەکانت و زوڵفەکانت، کە دەڵێی لەشکرن و دڵی دڵداران بەتاڵان دەبەن؛ هەر بەڕاستی، ئەوە دەسەڵاتی ئەو کاکۆڵ و زوڵفانەن؛ یان: لەشکری حەوت دەوڵەتی گەورەن و ئاوا هێرش و پەلامار و هەڵمەت، بۆ سەر دڵی خەڵکی دەبەن؟.

**٣- شەهدی گوفتاری لەبی، وەک شەککەری شیرینتە!**
**یا: لە جامی گەوهەریندا، شەهد و شەککەر، تێکەڵە!**

شەهد: هەنگوینی پاڵاوتە.
جامی گەوهەرین: مەبەست لە ناودەم و ددانی یارە.

واتە: ئەوە هەر قسەکردنەکانت بەو لێوانەت ئاوا شیرینە؛ یان پێشتر ئەم قسانەت لە ناودەمتدا، لەگەڵ هەنگوینی پاڵاوتە و شەکردا تێکەڵاوت کردوون و ئامادەت کردوون؛ ئەوسا دەیاندرکێنیت؟!.

**٤- خاڵ و خەتن؛ بوونە زیبی تەلعەتی ڕەنگینی تۆ!**
**یا: لە ناو مەجمەر، بخووری عوود و عەنبەر، تێکەڵە!؟**

زیب: جوانیی، مایەی ڕازاندنەوە.
تەلعەت: ڕوخسار.
مەجمەر: ئاگردان، مقەڵی.

واتە: ئەو شتانەی بوونەتە مایەی ڕازاندنەوەی دەموچاو و ڕوخسارت، ئەو خەت و خاڵانەی سەر ڕوخسارتن، یان هەر ڕوخسارت دەڵێی ئاگردانێکی پڕ پشکۆی سوورە و داری عوود و بۆنی عەنبەریان تێدا دەسووتێ؛ کە ئاوا گەش و بۆندار و ڕووناکیت!؟.

**٥- نوتقی ڕوح ئەفزاتە، لەو لەعلی لەبی جانبەخشەدا!**
**یا: بەئاوی زیندەگیی، حەوزێکی کەوثەر، تێکەڵە!**

نوتق (نوطق): قسە، دووان، ئاخاوتن.

ڕۆح ئەفزا: هەر شتێک ببێتە مایەی درێژترکردنی ژیان، گیانپەروەر، مایەی شادی و بەختەوەریی، دڵخۆشکەر. (دهخدا، بەرگی ٨، ل ١٢٣١٩).

ئاوی زیندەگیی: ئاوی ژیان، ئەو ئاوەی ئەگەر کەسێک بتوانێ چنگی بخات و بیخواتەوە، ئیتر هەرگیز نامرێ.

حەوزی کەوثەر: مەبەست لەو حەوزەیە کە دەڵێن لە بەهەشتدا هەیە.

واتە: ئەرێ ئەوە کاتێ دەدوێیت، هۆی چییە وا قسەکانت شادی و خۆشیی و ژیان بەگیان دەبەخشن! ئەوە چی لە ناو زارتدایە، وا ئەوە گیانپەروەرە!؟ هەر هۆی ئەوەیە، کە لێوە وەک لەعلەکانت، خۆیان لە بنەڕەتدا وەک هەناسەکانی ناو دەمی حەزرەتی عیسا، گیان دەبەخشن و مردوو زیندوو دەکەنەوە!؟ یان قسەکانت لە ناو زارتدا، پێشتر لەگەڵ ئاوی «کەوثەر»ی ناودەمت تێکەڵ دەکەیت؛ کە ئاوا ژیانی تازەترمان پێ دەبەخشێتەوە؟!.

**٦- گەردنی میناى تۆیە و لێوی تۆیە و چاوی تۆ!**
**یا: لە بەزمی مە، مەی و مینا و ساغەر، تێکەڵە!؟**

مینا: پێشتر، لە زۆر شوێنی تردا، ماناکەیمان لێدایەوە؛ کە بەمانای: شووشەی مەی و گەردنی بەرز و باریک و... هتد، بوو.

بەزمی مە: کۆڕ و کۆبوونەوەی ئێمە؛ کە بۆ مەبەستی مەی و بادە خواردنەوە سازکراوە.

واتە: ئاخۆ بەهۆی سەیرکردن و سەراسیمەبوونمان و لێڕامانمان لە گەردنی بەرز و باریک و لووس و لێوی ئاڵی تۆ و زەبری سەرنج و تیلەی چاوەکانی تۆ، وا ئێمەی مەست و سەرخۆش و بێ هۆش کردووە!، یان: ئامادەبوون و گردنەوەمانە، لە دەوری بادە و سوراحی و دەفر و پەرداخی مەی، وا سەرخۆش و مەست بووین!؟ نازانم هۆی کامیانە!؟.

**٧- سینەتە جانا! کە دەدرەوشێ؛ لە بن تاری حەریر!**
**یانە: مەهتابە، دەگەڵ دیبای «شوشتەر»، تێکەڵە!؟**

تاری حەریر: تاری هەوریشم، کە لێرەدا مەبەست لە تاڵی قژی یارە و لە شێوەی ئاوریشمدایە.



مەهتاب: خەرمانەی مانگ.

دیبا: کوتاڵ، قوماش، کە لە ئاوریشمی ڕەنگاوڕەنگ دروست کرابێ. هاوکات بەمەبەستی ڕوخساری جوانی یار و دڵبەریش بەکاری دەهێنن.

شوشتەر: ناوی شارێکە لە پارێزگەی «خوزستان»ی باشووری خۆرئاوای ئێران. هاوکات ناوی پەردەیەکیشە لە ئاوازی مۆسیقای ئێرانی؛ بەڵام لێرەدا هەر مەبەست لە شاری «شوشتەر»ە. (دهخدا، بەرگی ١٠، ل ١٤٥٦٨).

واتە: گیانەکەم! ئەوە ڕووناکایی سنگ و بەرۆکتە، کە لە نێوان تاڵ تاڵی هەوریشمی قژە خاوەکەتدا دەدرەوشێتەوە!، یان: خەرمانەی مانگە و لەگەڵ قوماشی هەوریشمی ڕەنگاوڕەنگی شاری «شوشتەر»دا تێکەڵە!؟. (وەک دیارە دەبێ ڕۆژگارێک، شاری شوشتەر قوماشی ئاوریشمینی بەرهەم هێنا بێ و کارخانەی چنینی تێدا بووبێ).

**٨- دڵ کە کەوتە زوڵفی تۆ، پرسیم چ بوو، لەرزی و وتی:**
**تا تەماشاکەی شکەنج و چین و چەنبەر تێکەڵە**

شکەنج: تێکشکاو، لوول.

چەنبەر: بازنە، بازنەیی، ئەڵقە ئەڵقە.

واتە: ئەو کاتە دڵ خۆی بەنێو زوڵفەکانیدا کرد و دیار نەما، وتم: دەنگوباست چییە؟ بەترس و لەرزەوە وتی: تا چاو هەتەر دەکات، هەر پشێویی و تێکەڵاویی و ئاڵۆزاویی دەبینم، چونکە یەکە یەکەی تاڵە مووەکانی زوڵفی، پێچ و لوول و بەیەکدا چوون و تێک ئاڵاون.

**٩- هەر دەمێ وەسفی لەبی تۆ، بێتە زیبی شیعری من**
**سەلسەبیلێکە دەڵێی قەندی موکەڕەر تێکەڵە**

زیب: ڕازانەوە.

سەلسەبیل: بادەی بەهەشتیی.

مانای ئەم بەیتە، وەک مانای دوا بەیتی غەزەلی پێشووە و لەوێ واتایمان لێکداوەتەوە.

## ١٠- زاهیدان تەکفیری منیانە و لە دنیا بێ خەبەر
## لەم زەمانە؛ سوبحە و زوننار و مێزەر تێکەڵە

زاهید: موسڵمانی بەدرۆ و ڕیاکار.

تەکفیر: بەکافر حساب کردن.

واتە: موسڵمانانی ڕیاکار و درۆزن، لەسەر ئەوە سەرکۆنەم دەکەن، کە گوایە کافر بووم و لە ئیسلام لامداوە، چونکە زوڵفی ڕەشی یارمم خۆش دەوێ، کە نیشانەی تاریکایی و ڕەشیی و ڕێ ونکردنی باوەڕی ڕاستەقینەیە و بەمەش تاوانی هەڵبژاردنی ئاییینی مەسیح بەپاڵم دەدەن! لە کاتێکدا، هەر لە پاڵ ئەو خۆشەویستییەمدا بۆ زوڵفی ڕەشی یار؛ ڕوخساری ڕووناکی یاریشم خۆش دەوێ، کە ئەمیان نیشانە و ڕەمزی ڕووناکیی ئاییینی ئیسلامە.

دەکرێ ئەم بەیتە، بەم مانایەی تریش لێک بدرێتەوە: موسڵمانانی درۆزن، لەسەر ئەوە من بەکافر دادەنێن، کە گوێ لە دەبەنگیی و لە درۆکانیان ناگرم و لەوە هوشیارترم بە: (زوونار و مێزەر و تەسبیح)ی درۆزنانە و ڕیاکارانە هەڵبخەڵەتێم.

«وەفایی» دەڵێ:

١- زەمانێ قیبلەم: ئەبرۆتە، دەمێ زوننار: گێسووتە
بەدەردی بێ دەوا ماوم، لەگەڵ کفر و موسڵمانیی
«٢٠٢»

٢- ئیشارەی چاو و عیشوەی زوڵفەکەت، بوون بەمورشیدی ڕێگام
ئەگەر دەیری موغان قیبلەم، ئەگەر زونناره بەرماڵم
«٦١»

## ١١- خۆزگە بەو شەخسە «ئەدەب»، وەک تۆ و دڵی شەیدایی تۆ
## دڵ دەگەڵ سەودایی جانانی هەتا سەر تێکەڵە

واتە: چونکە من هەر بەیەکجاریی و بەئاشکرا، هەموو کار و پیشە و تەمەنم بۆ ئەوینی یار تەرخان کردووە و لە هەموو دڵمەوە، بێ سێ و دوو کردن و چەندوچوون، ئەو ڕێگەیەم بەڕاستیی و تا سەر هەڵبژاردووە، بۆیە حەزیش دەکەم هەموو دڵداران وەک من بن و شەیدایی و سەوداییبیان بۆ یار، هەر ڕاست و پاک و تا سەر بێ.



«نالی» دەڵێ:

غەیری زوڵفی تۆ، کە ڕشتەی عومرمە
دەست لە (مافیها)ی زەمان بڕیاوم ئەز
«٢٢٢»

«سالم» دەڵێ:

١- سەراسەر کاری «سالم» عیشقی تۆیە، ئەووەڵ و ئاخر
خەجاڵەت بێ قیامەت، گەر بەبێ تۆ؛ مەیلی جەننەت کا
«٢٨»

٢- لە حەشریشا سەر و کارم لە عیشقە
ئەگەر دەستم بگاتە دەستی مەطلووب
«٤٤»

١٠٣

کێش: بەحری هەزەج ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)، وەک نموونەی:

١- جەورا تە بەهێتین و جەفایا تە پەرێتین
قوربانی تە بم گوهـ بدە جارەک گلەهی من
«مەلای جزیری، ٤٥٥»

٢- هەرچەندە کە ڕووتم، بەخودا مایلی ڕووتم
بێ بەرگییە عیللەت، کە هەتیو مەیلی هەتاوە
«نالی، ٥٣٤»

٣- پێم خۆشە کە عومرم بەجەفا، سەرفی خەمت بێ
بەو شەرتە کە: مایەی ئەمەلم ماچی دەمت بێ
«سالم، ١٤٣»

**١- جانا کە دەڵێی مورغی دڵی مەت، بەچ ڕامە؟**
**خاڵی سیەهـ و زوڵفی خەمت، دانە و دامە**

واتە: گیانەکەم، دوای ئەوەی دڵی منت گیرۆدەی ئەوینی خۆت کردووە و دەشزانیت چۆنت گیرۆدە کردووە، ئەوسا لێم دەپرسیت: ئەرێ مەلی دڵی تۆ، چۆن چۆنی بەئەوینمەوە دەستەمۆ بووە!؟ لە وەڵامدا دەڵێم: خاڵی ڕەشی سەر ڕوخسارت و زوڵفە پێچ خواردووەکەت، یەکەمیان دانی بۆ دانا و دووەمیشیان داوی بۆ نایەوە.

«سالم» دەڵێ:

لەسەر ڕوو، دانەیی خاڵت بەفەن داناوە، دەیزانم
بەقەسدی مورغی دڵ، زوڵفت بەدەورا داوە، دەیزانم
«٧٩»

«وەفایی» دەڵێ:

هاتم بەبۆنەی خاڵت، تووشی داوی زوڵفت بووم
تەیرێکی نابەڵەد بووم، نەمزانی دانە و داوە
«١٥٢»



**٢- جان دێنییە بەر موردەیی سەد ساڵە بەگوفتار**
**ئەنفاسی مەسیحە ئەمە، بەخودا نە کەلامە**

موردە: مردوو.

ئەنفاس: هەناسە.

کەلام: قسە، گفتوگۆ.

واتە: حەزرەتی مەسیح، کاتێ دەدوا، بەهەناسەکانی مردووی پێ زیندوو دەبوونەوە؛ تۆش: گیانەکەم! مردوویەک کە سەد ساڵیش بێ مردوو بێ، زیندووی دەکەیتەوە. کەواتە بەخودا قەسەم، وا دیارە ئەمە هەر بەتەنیا ئەوەندە نییە، کە تۆ قسە دەکەیت، بەڵکو نهێنی قسەکەت لەوەدایە، کە تۆ خاوەنی موعجیزەیەکیت.

«نالی» دەڵێ:

دوور لە تۆ، دڵ هێندە بێ ئارام و بێ حاڵ کەوتووە
ئەی مەسیحای عەصر! لەو لێوانە دەرمانی دەوێ
«٧٠٣»

«وەفایی» دەڵێ:

عەجەب ماوم بەبۆسێ لەو دەمە؛ هەر جانە بەخشینت
بەئیعجازت قەسەم! ئاتەش پەرستم، گەر موسڵمانی
«٢٠٢»

**٣- لەعلی لەبت و ماچی دەمت؛ هەردوو فەرەحزان**
**ئەو نەشئەیی جانبەخشی من ئەوڕۆکە لە کامە؟**

فەرەحزا: ئاسوودەبەخش، مایەی شادی و خۆشیی، هۆی بەختیاریی.

واتە: لێوی ئاڵت و ماچی دەمت، هەردووکیان مایەی خۆشیی و بەختەوەریی و دڵشادین. تۆ بڵێی ئاخۆ ئەم ئارەزووە گیان بووژێنەرەوەیەی ئەمڕۆی من، بەهۆی خۆشی و شادیی کام یەک لەو دووانەوە بێ!؟.

«نالی» دەڵێ:

سەرخۆشی شەرابی دەمی تۆ بووم و ئەمێستاش
قوربان! سەری تۆ خۆش، کە نەماوە سەری خۆشم
«٢٨٣»

**٤- هەر جێگە دەچم، شوهرەتی عیشقم بەدواوە**
**یارەب چییە ئەو شۆڕش و غەوغا؛ لە دوامە!**

شوهرەت: ناوبانگ، ناودار.

واتە: لە هەر کوێ بم و بۆ هەر کوێ بچم، بەزم و هەرا و گۆڵمەزێکی عەشقێنی و عاشقێتیم بەدواوەیە و ناوبانگیی عاشقیم دنیایەکی گرتۆتەوە. ئەی خوایە! ئەم هەموو هەرا و هۆریا و قاوە چییە وا لە دووم نابێتەوە!؟.

«سالم» دەڵێ:

داستانی عیشقی من، فاشە لە هەر کووچە و سووقاق
عەقڵی دێوانەم لە پاش ئەم حاڵە؛ سرپۆشیی دەکا!
«٣٢»

**٥- هەر کەس لەمەیی عیشقی لەبت، ساغەری وەرگرت**
**تا مردنی؛ خوێنی جگەری شوربی مودامە**

ساغەر: بادە، مەی.

شورب: خواردنەوە.

مودام: لێرەدا دەشێ بەدوو مانا بێت: ١- مەی. ٢- هەمیشە و بەردەوام.

واتە: ئەوەی لە ئەوینی لێوی تۆ، بادەی وەرگرتبێ؛ ئیتر تا دەمرێ، دەبێ بۆ هەمیشە و بەبەردەوامیی لەباتی بادە، خوێنی جگەری خۆی بخواتەوە.

«سالم» دەڵێ:

من لە نەشئەی جامی لەعلت، مەحشەریش نایێمە هۆش
جامی وا، «سالم» لە دەورا، قیسمەتی «جەم»، کەی دەبێ!؟
«١٤٢»



**٦- سەد جارە وەکو طوڕە، منت خستەوە لاوە**
**پابەندی گێسووتە، کە ناچینە چ لا، مە**

طوڕە: کاکۆڵ، پەرچەم.

پابەند: پێ بەستراو.

ناچینە چ لا، مە: ئێمە بۆ هیچ جێگەیەک ناچین.

واتە: دەیان و سەدان جار، وەک لادانی پەرچەم و کاکۆڵەکانی، ئێمەی بەملا و لادا فڕێ دا، بەڵام هەروەک چۆن پەرچەم و کاکۆڵەکانی، ڕەگەکانیان وەک سەرلەبەری ڕەگی تاڵە مووەکانی تری سەرت، لە سەرتا نێژراون و بەم کاری بەملا و لادا خستنیان، لێت جوێ و لێت دوور ناکەونەوە، منیش هەروا ڕەگم لە جەستەدایە و هەر چۆنێ دەرمان بکەیت، بۆ هیچ جێگەیەکی تر ناچین و لێت جوێ و لێت دوور ناکەوینەوە.

«مەحوی» دەڵێ:

غولامانە؛ سەرم دانا لە بەرپێتا، وەکو زوڵفی
کەچی ئەو؛ هەر منی خستۆتە پشتگوێ، وەک غولامانە[١]
«٢٧٧»

**٧- پاداشی خەتا و جەور و ستەم، ڕەسمی قەدیمە**
**ئەمڕۆ، ستەمی تۆ، بەجەزای کامە خەتامە؟**

پاداش: خەلات، چاکە دانەوە لە بەرامبەر کارێکی باشدا.

ڕەسمی قەدیم: داب و ڕەوشتی کۆنینە.

جەزا: سزا.

خەتا: تاوان.

واتە: بەگوێرەی داب و دەستووری پێشینە، ئەگەر کەسێک تاوان و کارێکی پێچەوانەی داب و ڕەوشتی کۆمەڵایەتی و یاسایی بکردایە، سزای تاوان و کارەکەیان بەسەردا دەدا؛ بەڵام ئێستاکە و لەم ڕۆژگارەماندا، کە تۆ، ئەو هەموو سزا و ستەمەمم بەرامبەر دەنوێنیت، بەرامبەر کام تاوانمە، کە لە بەرامبەرتدا کردبێتم!؟.

(١) غولامانە:ی یەکەم، بەمانای غولام و نۆکەر. غولامانە:ی دووەمیش بەمانای کاکۆڵ و پەرچەم.

«سالم» دەڵێ:

یاقووتی لەبت، جائیزە بەخشینی بەئیسپات
بێتو بەقەدەر خزمەتی من، گەر کەرەمت بێ
«١٤٣»

«وەفایی» دەڵێ:

ئاخر ئەی سوڵتانی خوبان، تابەکەی نامیهرەبانیی؟
چاکە مەحرووممم نەفەرمووی، یا خیتابێ، یا عیتابێ
«١٧١»

**٨- گەر جەورە، ئەگەر لوتفە، ئەگەر قەهرە و گەر میهر**
**هەر عاشقی زارین و نزارین بەخودا، مە**

واتە: سوێند بەخودا، ئەگەر ڕقە و ئەگەر میهرەبانی و ئەگەر سۆزە و ئەگەر هەر شتێکم لەگەڵدا بنوێنیت، من هەر عاشقە بێ دەسەڵات و داماوەکەی بەردەستی خۆتم. چونکە دەزانم دڵبەران هەمیشە حەز بەئازاری دڵدارانیان دەکەن.

«تاهیر بەگ» دەڵێ:

جارێ ناپرسی لە حاڵی من، مەگەر نازانی تۆ
زار و بێزار و نەزارم، کاری من هەر زارییە
«٢١»

«وەفایی» دەڵێ:

بەشینی عاشقان، ڕەسمی قەدیمە: شایی مەعشووقان
بەلەیلێ: نەغمەیی عوششاقە، گەر مەجنوون بناڵێنێ
«٢٠٤»

«مەولەوی تاوەگۆزی» دەڵێ:

مەظەننەت چێشەن، منیچ بەو تەورە
ئەر مەیلەن مەیلەن، ئەر جەورەن جەورەن



**٩- فەرمووتە: «ئەدەب» بۆچی لە بادەی هەیە ئیکراه!**
**حەققا، کە بەبێ جامی دەمت، بادە حەرامە**

ئیکراه: بەدزێو لە بەرچاو گرتن، ڕق لێ بوونەوە.

حەققا: بەڕاستی.

واتە: لە زمانی تۆوە بۆمیان گێڕایەوە، کە فەرمووتە: بۆچی «ئەدەب» مەیخواردنەوەی بەلاوە دزێو و ڕقی لێیەتی!؟ لە وەڵامدا دەڵێم: هەر بەڕاستی مەیخواردنەوەم بەو شێوەیە لە بەرچاو حەرامە، کە تۆم لێ دووریت و ناتوانم پەرداخ و جامی لێوەکانت ماچ بکەم، ئەگینا ئەگەر تۆم لێ نزیک بیت و بەدەم مەیخواردنەوەوە، جار جار ماچێکی لێوت بکەم، ئەو کاتە بادەم لا شیرین دەبێ:

«نالی» دەڵێ:

شەرابی لەعلی ڕوممانی لە نالی
حەرامە، بێ مەزەی ماچێکی لێوان
«٣٢٢»

«مەحوی» دەڵێ:

با وجوودی لێوی شەککەرباری تۆ
بێ وجوودە: نەشئە بەخشینی شەراب
«٤٤»

١٠٤

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)، وەک نموونەی:

١- بۆ گـــوڵـی ڕووت هاتم و پەرچەم دەبینم، بۆیە وا
ماهی نەورۆزم بەشیوەن، وەک موحەڕەم خۆی نواند
«حەریق، ٢٠»

٢- تا بەسـەر باغی دڵا بێ: بای خـەزانی فـیـرقـەتت
عاریضم بۆ سێوی ڕوخسارت، لە ڕەنگی بەی دەکا
«سالم، ٢٩»

٣- هەر لەبت، یا سینەشت، هەردوو بەدەرخە، دابڵێن
لەعلی ڕوممانی هەیە، یا لەعل و ڕوممانی هەیە
«نالی، ٥٧٥»

**١- دڵبەری غـارەتگەری دینم لەگەڵ ئیـمانمە**
**باوجوودی غـارەتی دینم دەگـەڵ ئیـمانمە**

غارەتگەر: تالانکار.

باوجوودی: سەرەڕای ئەوەی، لەگەڵ ئەوەشدا.

واتە: خاوەنی دڵدارێکم، باوەڕ و ئایینمی لێ بەتاڵان بردووم، بەڵام سەرەڕای ئەمانەش هاودینمە و ئەو شتەیە، کە لەگەڵ ئایین و بڕوامدا دەگونجێ.

**٣- عەیشمە، ئازارمە، هەم خەممە، هەم خەمخوارمە**
**یارمــە، دڵدارمــە، هەم دەرد و هەم دەرمــانمە**

واتە: ئەو دڵبـەرەم: ژیانمە، ئازارمـە، لە یەک کاتیـشدا: هەم خەم و هەم خەمـخـوارمە. دڵبەرمە، دڵبەردمە، پێکیشەوە دەرد و دەرمانیشمە.

**٤- دڵبەری، سیمینبەری، جانپەروەری، جادووگەرە**
**لوعـبـەتی، پڕ حیلەتی، بێ عـەهد و بێ پەیمانمە**

سیمینبەر: سنگ و سینەی وەک زیو.



لوعبەتی: وەک بووک، بووک ئاسا.

پڕ حیلە: زۆر فێڵباز.

**٥- تالعی شێـواومی خـسـتـۆتە ژێر عـارەقـچنی**
**پێم دەسەلمێنێ و دەڵێ: گێسووی عەتر ئەفشانمە**

تالع: بەخت، چارە، چارەنووس.

عـارەقچن: کڵاو، لە هەمان کاتیشدا بەجلی تەنکی ژێرەوەش دەڵێن، کە عارەقی لەش هەڵدەچنێ. بەڵام لێرەدا مەبەست لە کڵاوە.

عەتر ئەفشان: عەتر و گوڵاو پژێن.

واتە: بەخت و چارەی ڕەش و شێـواوی منی (کـە زوڵفـە ڕەشـەکـانێـتـی) خسـتـۆتە ژێر کـڵاوەکەیەوە، کـەچی لەباتی ئەوەی بڵێ: ئەوەی لە ژێر کـڵاوەکـەمدایە؛ زوڵـفەکـانمە، یان بەختی ڕەشی تۆیە، دەڵێ زوڵـفەکانمە!. بەوەش پێم دەسەلمێنێ کە زوڵفەکانێتی؛ چونکە لە ژێر کڵاوەکەیەوە بۆنی عەتر و گوڵاوی لێ دێت.

**٦- دوو کەمـانی ئابنووسی داوەتە دوو تورکی مەست**
**سوێند دەخوا: دوویان برۆ و دوو نەرگسی فەتتانمە**

ئابنووس: دارێکی ڕەنگ ڕەشی لووس و پتەوی زۆر جوانە.

کەمانی ئابنووسی: ئاماژەیە بۆ برۆی دڵبەر.

تورکی مـەست: واژەی تورک لە دێرزەمانەوە لە ئەدەبی کورد و دراوسێکـانی کوردیشـدا، بەدوو مانا دێت:

١- تالانکار و خوێنڕێژ و بێ بەزەیی. ٢- جوان، چونکە لە کچی جواندا بەناوبانگن و لێرەشدا (تورکی مەست)، مەبەست لە هەردوو ماناکەیە.

واتە: دوو تیـروکەوانی لە ئابنووس دروسـتکراوی بەدوو تورکی سـەرخۆش سـپاردووە و بەربوونەتە تیـرەباران کـردنم، کـەچی سـوێند دەخـوات و دەڵێ: دووانیـان برۆ و دووانی تریشیان چاومن!.

«کوردی» دەڵێ:

١- دڵ لە دەست تورکی دوو چاوت، چ دەبوو حـاڵی ئەگـەر
نەبووایە ســـەری تیـــری مـــۆژە و تیـــغی برۆت

٢- چاوی مەستت وا دیارە فیتنەیێ بەرپا دەکا
خوانی دین، وەک: تورکی یەغمایی، بەناز یەغما دەکا

«سالم» دەڵێ:

تورکی پڕ ئەفسوونی چاوی، کاری سەد جادوو دەکا
ساعەتەن تەسخیر دەبێ، بۆ هەر مەکانێ ڕوو دەکا
«٣٠»

«مەحوی» دەڵێ:

نەوەک هەر چاوی مەستە، خۆشی هەر مەست
بەلادادێ، کە دێ، وەک تورکی سەرمەست

**٧- نێزەیی سەربازی کێشاوە، دەڵێ غەمزەی منن**
**تیری تیرەندازی هێناوە، دەڵێ موژگانمە**

نێزە: ڕم.

تیر: چەند مانایەکی هەیە: تیر، گولله، ستوونی دارینەی ڕێک و ڕاست، چوارەمین مانگی هەتاویی (ئێران)، سیازدەمین ڕۆژی هەموو مانگێکی هەتاویی. بەش، تاریکیی، ئەستێرەی عەتارد. بەڵام لێرەدا هەر مەبەست لە (تیر)ە و تیری ئەم بەیتەش مەبەستی لە تاڵەکانی برژانگی دڵبەرە.

**٨- باخەکەی شەددادی زاهیر کرد، دەڵێ: سینەی منە**
**دۆزەخ و نیرانی ڕۆناوە، دەڵێ: هیجرانمە**

شەدداد (و باخی شەدداد): مەبەست لە (ئیبن عاد)ە، کە ئەم ناوە لای مەسیحی و جوو نەناسراوە و کاتی خۆی (جالوت) کە بەدەستی (داوود) کوژراوە، یەکێک بووە لە سەرهەنگەکانی شەدداد. دەڵێن ئەم شەدداده کۆشکێکی زۆر گەورەی دروست کردووە، کە هەر خشتێکی لە زێڕ و یەکێکی تریان لە زیو بووە و باخێکیشی تێدا ڕۆناوە، کە لەجیاتی درەخت و میوەکانیان، لە گەوهەر دروستی کردوون و لەجیاتی خاک و خۆڵیش، عەنبەر و میسک و زەعفەرانی تێدا ڕۆ کردووە و لەجیاتی ئاویش، جۆگەلەی هەنگوین و شیر و لوئلوء و مەرجانی بەکار هێناوە. ئەمەیشی بۆ ئەوە دروست کردووە، تا حەزرەتی داوود، ئەو (واتە: شەدداد) بکا بەخوای تاقانەی خۆی بناسێ و ئەم کۆشک و تەلار و



باخەیشی لەجیاتی بەهەشت دروست کردووە، کاتێکیش ئەم کۆشک و باخەی تەواو کردووە، دەڵێن ویستوویەتی بۆ سەیرکردنی بچێت، بەڵام کاتێ ویستوویەتی لە ئەسپەکەی دابەزێ و لاقێکی گەیاندۆتە زەوی و لاقەکەی تری لە ئاوزەنگیدا بووە، ئیزرائیل گیانی سەندووە. (دهخدا، بەرگی ٩، ل ١٤١٨٩).

زاهیر: ئاشکرا، دەرکەوتوو، دەرخستوو.
نیران: ئاگر (ئاگری دۆزەخی مەبەستە).

واتە: وەک چۆن (ئیبن عاد)، لەجیاتی باخی بەهەشت، خۆی بەهەشتی کفری دروست کردووە. ئەمیش سنگ و بەرۆکیمان بەدیار دەخات و کاتێ لێی دەپرسین: ئەم باخە جوانە چییە؟ لە وەڵامدا دەڵێ: باخەکەی شەددادە و کاتێ گەرمایی ئاگری دۆزەخی دووریشیمان دەگاتێ و دەپرسین ئەوە ئەمەیان چییە؟ دەڵێ: ئەوە ئاگری دوورییە. (هەڵبەتە لێرەدا مانای دووریی، لێک دەدرێتەوە، کە کاتێ گەرمایی سنگ و بەرۆک و ڕوخساری، دەگاتە دڵدارانی و دڵدارانیشی بۆیان نییە لێی نزیک ببنەوە و دەبێ هەر لە دوورەوە سەیری بکەن، ئەوسا دەگونجێ ئەم ئاگری دوورییە، مەبەست لەم دوورییەش بێت.

**٩- موعجیزەی مووسای لە ناو دوو ئەژدەهادا جیلوەدا**
**پێم دەڵێ: یەک میهری ڕوو و یەک: زوڵفی وەک ثوعبانمە**

موعجیزەی مووسا: حەزرەتی مووسا بەرامبەر هەموو فێڵ و جادووەکانی فیرعەوندا، کە بەسۆنگەی (جیوە)وە دەیتوانی شێوەی مار و دووپشک و ئەژدەها دروست بکات، خوای گەورە توانای موعجیزەیەکی پێ بەخشی، کە بەهۆی گۆچانەکەی دەستییەوە، دەیتوانی گۆچانەکەی ڕاهێڵێ و هەژدەهایەکی گەورەی لێ دروست بکات و هەموو ئەو مار و دووپشک و ئەژدیهایانەی فیرعەون هەڵلووشێ. موعجیزەیەکی تری حەزرەتی مووسا، بریتی بوو لەوەی کە: دەستی لە بن باخەڵی دەردەهێنا، ڕووناکییەک دەردەکەوت، کە جیهانی ڕووناک دەکردەوە و کاتێکیش دەستی بۆ باخەڵی دەبردەوە، ڕووناکییەکە دیار نەدەما. (دهخدا، بەرگی ١٤، ل ٢١٧٨٩).

میهر: خۆر، هەتاو.
ثوعبان: مار.

واتە: ئەگەر حەزرەتی مووسا بۆ هەڵتەکاندنی فرتوفێڵ و جادووی فیرعەون، دەسەڵاتی تەنیا ئەژدیهایەکی لە لایەن خواوە پێ درابوو، کەچی ئەم یارەی من، موعجیزەی دوو

ئەژدیهای لە یەک کاتدا پێیە (کە مەبەستی لە هەردوو زوڵفی ئەملا و لای ڕوخسارێتی) و کاتێکیش لێی دەپرسم: ئەم دوو ئەژدیهایەت بۆچی و لە یەک کاتدا چۆن چۆنییە!؟ لە وەڵامدا دەڵێ: موعجیزەی یەکێک لە ئەژدیهاکانم (کە زوڵفەکانێتی) دەبێتە پاسەوانی سەر گەنجینەی سەر ڕوخسارم چونکە لە ئەفسانەی پێشیناندا هاتووە، گوایە هەموو گەنجینەیەکی بەنرخ و بەبەها، مار و ئەژدیهای لەسەر پەپکە دەخوات (کە شێوەی لوولیی و پێچ و گرمۆڵەبوونی زوڵف، لەسەر ڕوخسار و ڕووی یار، دیمەن و شێوەی ئەژدیهای سەر خەزێنە و گەنجینە بەدیار دەهێنێ). ئەویتریشیان دەبێتە: ڕووناکی، بۆ ڕووناککردنەوەی جیهان.

«نالی» دەڵێ:

ئەژدیهای زوڵفی، لە دەوری گەنجی حوسنی حاریسە
حەڵقە حەڵقە، چین بەچین، سەر تا بەخواری گرتووە
«٥٣٩»

### ١٠- حەزرەتی خدرە، لەسەر چەشمەی حەیاتی دا و دەڵێ
### خاڵی زومردینمە زیبی؛ خونچەیی خەندانمە

خدر (خضر): ناوی وەلی، یان پێغەمبەرێک بووە، کە یار و هاوڕێی حەزرەتی مووسا بووە و خوای گەورە بەتایبەتی بۆ فێرکردن و ڕێنوێنی کردنی مووسا ناردوویەتی. بەڵام دواتر کە مووسا، زانیارییەکانی لێ وەرگرتووە خۆی لێ نەبان و دوورەپەرێز گرتووە. ناوی تەواوی خۆی (تالیا) بووە بەڵام ئێرانیانی دێرینە (ئیلیا یوحەننا)یان پێ وتووە. لە (المعیار)دا هاتووە، گوایە لەسەر هەر جێگە و درەختێکی وشک دابنیشتبایە، شوێنەکەی سەوز دەبوو، بۆیە بە(خضر) واتە: سەوز ناوی دەرکردووە و، بەوەش دەناسرێ کە «ئاوی ژیان»ی خواردۆتەوە و تا ڕۆژی قیامەت هەمیشە زیندووە و هەمیشەش سەوزە و هەمیشە یاریدەدەر و هاوکاری ئەو ڕێبوارانەیە، کە تینوون و پێویستیان بەئاوە. لە کوردەواریشدا بە«خدری زیندە» ناوبانگی دەرکردووە. دەوترێ گوایە «ئەسکەندەر»یش عەڤداڵی هەمان ئاوی ژیانی حەزرەتی خدر بووە و تەقەللایەکی زۆری بۆ پەیداکردنی داوە و پێی نەگەیشتووە؛ بەڵام بەگوێرەی قسەی (شانامە)ی فیردەوسی خدر پێی گەیشتووە و خواردوویەتییەوە (دهخدا، بەرگی ٧، ل ٩٨٤٤).

سەرچەشمە: سەرچاوە، چاوگە.



زومرد (زومڕود): لە بنەڕەتدا واژەکە یۆنانییە و ناوی «سماراگدوس»ە و عەرەبەکان کردوویانە بە«زمرود» بەردێکی سروشتیی ڕەنگ سەوزی زۆر جوان و گرانبەها و تا قەوارەکەی گەورەتر بێت، نرخەکەیشی گرانتر دەبێ. ئەم بەردە لە (سیلیکاتی ئەلەمنیۆم) و (بریلیۆم) پێک دێت، کە ئەمانیش لە ناو بەردی (پەگماتیت)دا هەن. دەڵێن گوایە بۆ (پەرکەم، فێ) لێ نەهاتن بەکەڵکە و ئەگەریش مار، سەیری بکات، دەمرێ (دهخدا، بەرگی ٩، ل ١٢٩١٧).

زیب: جوان، ڕازاوە.

واتە: خاڵێک لە لای لێوەکانی یارمدایە هەر دەڵێی حەزرەتی خدرە و، لەسەر سەرچاوەی ئاوی ژیان دانیشتووە، کەچی یار پێم دەڵێ: ئەوە خاڵێکی وەک زومڕودە و بۆ ڕازاندنەوەی دەم و لێوی وەک خونچە و هەمیشە پڕ زەردەخەنەم لەوێدا داناوە.

«نالی» دەڵێ:

لێوی تۆ: ئاوی بەقا، من خضرم
فەیضی تۆ: ڕەحمەت و من: سەوزەگیا
«١٢٥»

«وەفایی» دەڵێ:

خاڵی دەمی تۆ، زەنگییە، کەوتۆتە بەدەخشان
یاخۆ (خضر)ە، چەشمەیی حەیوان دەفرۆشێ
«٢٠١»

«مەحوی» دەڵێ:

١- خضر ئەگەر چاوی حەیاتی بڕییە ئاوی حەیات
من لە خاکی دەری جانانەمە، هەر چاوی حەیات
«٦٣»

٢- کە خضر ئەو خاک و خۆڵی بەر دەرەی دی
وتی: تۆ خاکی، یا ئاوی حەیاتی؟!
«٢٩٨»

**١١- نافـەیی ئاهووی خـەتایی ناوەتە ژێر پیـرەهەن**

**ئەو عەجەب سوێندیش دەخوا: بۆی نافی نافەسانمە**

نافە: ئەو بۆنە خۆشەی لە ناوکی جۆرە ئاسکێک دێت.

ئاهووی خەتایی: ئاسکی وڵاتی خەتا و خوتەن.

پیرەهەن: کراس.

نافەسا: وەک ناف، ناف ئاسا.

واتە: بۆنی ناووکی یار، کە دەڵێی بۆنی نافەی مامزەکانی وڵاتی خەتایە، لە ژێر کراسەکەیدا شاردۆتەوە و کاتێ پێی سەرسام دەبین، کە ئەو بۆنی نافە و میسکە چییە!؟ سوێند دەخوا و دەڵێ: بۆ پێتان سەیرە! ئەوە نافەی ئاهووی وڵاتی «خەتا» نییە، بەڵکو ئەوە هەر بۆنی ناووکی خۆمە، کە بۆنی لە بۆنی ناووکی ئاسکی«خەتا»دەچێ و هیچی تر.

یان دەکرێ بەمجۆرەش بخوێندرێتەوە: بۆنی میسک و نافەی مامزی وڵاتی خەتای لە ژێر کراسەکەیدا شاردۆتەوە، کاتێ سەرسامیی خۆمان دەردەبڕین و دەڵێین، ئەو بۆنە خۆشەت لە کوێ هێناوە؟! لە وەڵامدا دەڵێ ئەوە هەر لە بنەڕەتدا، بۆنی ناووکی خۆمە، کە وەک بۆنی ناووکی مامزی وڵاتی «خەتا»یە.

**١٢- من دەڵێم: گوفتارەکەت بۆ هێندە شیرینە، دەڵێ:**

**شەککەری نوتقم، نەتیجەی دوو لەبی قەندانمە**

واتە: ئاخاوتن و گفتوگۆی یار ئەوەندە شیرینە، جێی سەرسوڕمانە، بۆیە کاتێ لێی دەپرسم: چۆن و بەچی دەتوانیت قسەکانت ئەوەندە شیرین بکەیت؟! لە وەڵامدا دەڵێ: ئەوە لەبەرئەوەیە، کە لێوەکانم خۆیان شەکر و قەندن، بۆیە قسە و ئاخاوتنیشم وا شیرینن.

«نالی» دەڵێ:

١- بەو شەهدی کەلامەت، کە بەئیشرابی لەطافەت
لەززەت دەیەنێ بەدڵ و زیهنی موخاطەب
«١٣٥»
٢- لەبەر خەندەی لەبی لەعلی ئەتۆ بوو
کەوا شەککەر دەباری، گوڵ دەپشکووت
«١٥٠»



**١٣- هەر شەوە تا سوبحدەم شەمعی شەبوستانی «ئەدەب»**

**سوبحدەم تاکو شەوێ، سەرووی سەهی بوستانمە**

شەمعی شەبوستان: چرا و مۆمی ژووری ئاخاوتن.

سەرووی سەهی: جۆرە دار سەروویەکی بەرز و ڕێک و هەڵچووە.

بوستان: باخ و بێستان.

واتە: دڵبەرەکەی من، بۆ بەسەربردنی شەوانی شیرینم، تا بەرەبەیان، بۆم دەبێتە مۆمی چرای خەوتن و لە بەرەبەیانیشەوە تا شەو دادێ، بۆم دەبێتە سەروویەکی باڵا بەرز و ڕێکی باخ و بێستانی دڵداریم.

«وەفایی» دەڵێ:

١- سەرووی سەهی، قوربان! ئەگەر ئازادە، ئەدی بۆچ
بادام و گوڵ و سونبول و نەسرینە بەری تۆ؟
«١١١»
٢- نازانم ئەتۆ چی بەلەب و قامەتی شیرین
غونچەی شەجەری، یانە گوڵی نەیشەکەری تۆ؟
«١١٢»

«حاجی قادری کۆیی» دەڵێ:

لێوی وەک قەندە، موکەڕڕەر لە دەما شیرینە
بۆیە تەکرارە، وەکو: ناڵە، ئەنیسی نەفەسە
«١١٤»

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)، وەک نموونەی:

١- سوفتی یێن پوڕ لەعل و مەرجانان ب موژگانان حەتا
دیدە ڕەوشەن بوون ب دینا دیم دوڕێ سیمین غەبەب
«مەلای جزیری، ٧٤»

٢- کاروان ئەر سست ڕۆیی، تا دەگاتە کۆیی لەیل
شەوقی بێ پایانی دڵ، وشتر بەمەجنوون پەی دەکا
«سالم، ٢٩»

٣- قەومەکان! بەو زاتە وا حوکمی لەسەر بەحر و بەرە
بەرخە نێرێ گەر نەنێرێ، هەر کەسێ خاوەن مەڕە
«شێخ ڕەزا، ١١٨»

**١- تا بفەرمووی دڵبەرا، حەسرەت بەدیدارت هەمە**
**تا بڵێی میحنەت لە دووری تۆ هەمە، ئێستا کەمە**

واتە: ئەی دڵبەرەکەم! هەتا دڵت حەز دەکات، عەڤداڵ و پەرۆشی دیدەنیتم؛ کاتێکیش کە ناتبینم، هەرچی دەرد و خەم و پەژارەیە، لە لام کۆ دەبنەوە، بۆیە ئەگەر هەر چۆنێک تۆ، پێوانەی ئەم دەرد و پەژارەیەم بکەیت، هێشتا کەمت فەرمووە و هێشتا ئەندازەی خەمی من زۆرترە.

«مەحوی» دەڵێ:

کە تۆ غایب لە بەرچاوم دەبی، چم بێ لە تۆ غایب
قیامەت حازری بەرچاومە، خۆمم لە خۆ غایب
«٤٨»

«تاهیر بەگ» دەڵێ:

گەر دەزانی چەند پەشێوە، حاڵەکەم بۆ دیدەنت
سەد ئەوەندەی زوڵفەکانت؛ دڵ پەرێشانم وەرە
«١٦»



**٢- هەمدەمی حوزن و خەمم، تا هەمدەمی ئەغیاری تۆ**
**خۆزگە بەو کەس کا، بەیادی خاڵەکەی تۆ، بێ خەمە**

هەمدەم: هاوڕاز، هاوڕێ.

حوزن: خەم.

ئەغیار: نەیار، بیانی، نامۆ.

واتە: تا ئەو کاتەی تۆ، لەگەڵ نەیاران و خەڵکی نائاشنا و ناحەزاندا، هاوڕێ و هاودەم بیت، ئیتر منیش خەم دامدەگرێ و هەر خۆم دەخۆمەوە. نازانم چۆن لەم کارەی تۆ، دەتوانم بێ خەم بم!؟. لەبەرئەوە خۆزگە بەوانە دەخوازم، کە وەک من، شەیدای تۆن، کەچی بێ خەمیشن!.

«وەفایی» دەڵێ:

خۆزگەم بەوەی لە دۆی تۆ، هەر دەنواڕیتە ڕووی تۆ
مــــردم بەئارەزووی تۆ، قـــوربانی ئاشناتم
«٥٧»

«سالم» دەڵێ:

دڵی دڵبەر، کە مایل بێ بەئەغیار
نییە تەدبیری «سالم» جوز مودارا
«٢٥»

**٣- عەرزی حاڵی؛ حاڵەکەی زارم ئەوا نووسی لە تۆ**
**گەرچی نامەی ئاشنایانت لە لا؛ نامەحرەمە**

عەرزی حاڵ: سکاڵانامە.

زار: مات و مەلوول و بێ هێز.

نامەحرەم: نائاشنا، بیانی.

واتە: ئەوا سکاڵانامەی خۆمم بۆ نووسیت، تا لە داروباری خەم و بێ هێزیی و لاوازیم تێبگەیت؛ ئەگەرچی دەشزانم و دڵنیام، کە نامەی دۆستانت پێ نائاشنا و بیانی و نامۆیە.

«سالم» دەڵێ:

تا دەڵێم؛ مروەتکە، ڕەحمێ، جەوری تۆ ئەفزوون دەبێ
داد و بێدادم لە گوێتا، هەروەها نەشنیدەما «٣٢»

«مەحوی» دەڵێ:

لە نالەی گەرمی دڵ، باکت نەبوو تۆ
بەئاهی سەردی «مەحوی»، من دڵم سووت «٨٢»

**٤- گەر دەپرسی ڕۆزگارم چۆنە بۆ زوڵفی سیات**
**بەو لەبی لەعلت؛ وەکو زوڵفی سیاهت دەرهەمە**

ڕۆزگار: ڕۆژگار.

زوڵفی سیات: زوڵفی سیاهت؛ زوڵفی ڕەشت.

لەبی لەعل: لێوی ئاڵی وەک لەعل.

دەرهەم: شێواو، ئاڵۆز، بەناویەکداچوو.

واتە: گیانەکەم. ئەگەر ژیانی ئێستام دەپرسیت، کە بۆ زوڵفە ڕەشەکانت چۆنم و چۆن دەژیم! دەڵێم سوێند بەلێوە ئاڵەکانت، حاڵم وەکو حاڵی قژ و زوڵفە ئاڵۆز و شێواوەکەت، ئاڵۆز و پەشێوە و خۆمیش نازانم چۆن هەموو کار و بەرنامەم، خۆشیی و ناخۆشیم، تێکەڵ و پێکەڵ و ئاڵۆز بوون.

«تاهیر بەگی جاف» دەڵێ:

گەر دەزانی چەند پەشێوە؛ حاڵەکەم بۆ دیدەنت
سەد ئەوەندەی زوڵفەکانت، دڵ پەرێشانم، وەرە «١٦»

**٥- زەخمداری ناوەکی هیجرم، بەچاوانت قەسەم**
**غەمزەییێکی چاوی وەک بادامی تۆم بۆ مەرهەمە**

زەخمدار: زامدار، بریندار.



ناوەک: پەیکانی تیر.

هیجر: جیایی، لێک دابڕان، دوورکەوتنەوە.

غەمزە: تیلەی چاوێکی پڕ ناز.

مەرهەم: دەرمان.

واتە: بریندار و زامداری تیری دەستی خۆتم. بۆیە سوێند بەچاوەکانت دەخۆم، ئەگەر لە جێی داوودەرمان هەر تەنیا تیلەی چاوە وەک بادامی و پڕ نازەکانی خۆتم، نیشان بدەیت، ئەوە باشترین دەرمانی سارێژبوونی برینەکانم دەبێ.

«نالی» دەڵێ:

تیرەکەی ئەو ڕۆژە؛ مەحبووبەم کە لوتفی کرد بەمن
گەر نەبەخشێ، مەرهەمی وەسڵی، برینم کارییە «٨٣»

«سالم» دەڵێ:

١- ئەگەرچی کارییە دەردم، وەلێ نەزدیکە تەسکینم
بپرژێنێ حەکیم، ئەر عارەقی چیهرەت بەدارووما «٣٣»

٢- لە ڕووی میهرا بەئیقدامی عیادەت
ئەگەر مەجرووحی یادکا؛ یاری مەحجووب «٤٤»

«کوردی» دەڵێ:

تەبیب دێن دەوای دەردم بکا، خۆ من زەدەی دووریم
بەبێ داروویی وەسڵی تۆ، نییە ئارام و تەسکینم

**٦- کوا نیشانی مە، بەبادەی نابەوە بێ ڕوویی تۆ؟**
**ماچی تۆ، بۆ ئەو دڵەی پڕ خەم، شەرابی دەرخەمە**

بادەی ناب: مەیی نایاب و هەڵبژاردە و ناوازە.

دەرخەم (یان: دەرغەم): ناوی ئاوازێکی مۆسیقایی تایبەتە، کە بیستنی، دەبێتە مایەی ڕەواندنەوە و دوورخستنەوەی خەم و پەژارە لە ڕۆحی مرۆڤدا و نزیکخستنەوەی لە خۆشیی

و شادیی. ناوی جێگەیەکیشە لە باکووری سەمەرقەند، کە لە دروستکردنی شەراب و بادەی زۆر نایابدا بەناوبانگن (دهخدا، بەرگی ٧، ل ١٠٦٢٨).

واتە: بەبێ ئامادەبوون و دیتنی ڕوخساری تۆ لە بەرامبەرمدا، ئەگەر بادەی زۆر نایابیش بخۆمەوە، چ مەستییەکم پێ نابەخشێ. بەڵام ئەگەر لەگەڵ ئامادەبوونی تۆ و ماچێکیشم پێ کەرەم بکەیت، ئەوا ئەو حاڵەتە بۆ منی دڵ پڕ لە خەم، وەک ئەوە وایە شەرابی «دەرغەم»م نۆش کردبێ.

«سالم» دەڵێ:

جورعەنۆشیی تۆ بکەم، ئیتر لە بەزمی مەیکەدە
چاوی مەخموورت بەعاشق، کاری بادەی مەی دەکا
«٢٩»

«وەفایی» دەڵێ:

من وەها زوو مەستی نابم، بەنەشئەی چاوەکەت
مەرگی من؛ ساقی! لەگەڵ ئەو جامە، لێوت بێنەوە
«١٥٨»

**٧- بۆچمە من تەختی «کەی»، یا «جامی» جەم؛ بێ لەعلی تۆ**
**وەسڵی تۆ، تەختی «کەی»ە، بۆ من: لەبت جامی «جەم»ە**

کەی: مەبەست لە «کەیخوسرەو»ی پاشای کەیانییە.

جامی جەم: (پێشتر وتمان) ئەو جامەی کە گوایە کەیخوسرەو، یان جەمشید هەیانبووە و جیهانیان تێدا دیوە. لێرەدا «جەم» کورتکراوەی ناوی «جەمشید»ە.

واتە: من تاج و تەختی کەیخوسرەو و جامی «جەم»م بەبێ لێوی ئاڵی تۆ بۆ چین! من شەیدای دیدار و دیدەنی تۆم، کە ئەوە بۆ من، وەک تەختی «کەی»ەیە و «جامی جەم»یش لای من، هەر لێوەکانت و ماچی لێوەکانتە.

«سالم» دەڵێ:

من لە نەشئەی جامی لەعلت، مەحشەریش نایێمە هۆش
جامی وا، «سالم» لە دەورا، قیسمەتی «جەم»، «کەی» دەبێ!؟
«١٤٢»



«وەفایی» دەڵێ:

عوشرەتی هەردوو جیهان دێنێ، وەفایی فرسەتە
گۆشەیی گوڵزار و جامی بادەو و ڕوخساری یار
«٤١»

«تاهیر بەگ» دەڵێ:

بەماچێکی دەبەخشم، گەر کەرەم کات
جەمیعی خەرج و دەخڵی موڵکی «بابان»
«١٢»

**٨- نوتقی تۆ، مەعلوومە جانبەخشە، وەک ئەنفاسی مەسیح**
**دەفعەیێکیش موعجیزێک بنوێنە بۆ مە، بەو دەمە**

نوتق (نُطق): قسە، گفتوگۆ، ئاخاوتن.

مەعلوومە: زانراوە.

جانبەخشە: گیان دەبەخشێ.

ئەنفاسی مەسیح: هەناسە و ئاخاوتنی حەزرەتی مەسیح، کە کاتێ دەدوا، مردووی پێ زیندوو دەبۆوە.

دەفعە: جارێک، کەرەتێک.

بەودەمە: بەو زارودەمە؛ بەو دەمودەستە، بەو پەلە پەلە.

واتە: دیارە ئاشکرایە دەزانرێ، کە قسە و ئاخاوتنی تۆ، وەک قسە و ئاخاوتنی حەزرەتی مەسیح، گیانی تازە بەبەر مردوودا دەکاتەوە؛ دەی کەوایە خۆت ئاگات لە حاڵم هەیە، کە بێ ئاخاوتنی تۆ، لە دەمێکەوە مردووم گیانم لەبەردا نەماوە، بۆچی نامدوێنیت!، بزانم موعجیزەی تۆ و حەزرەتی مەسیح، چۆن چۆنییە!.

«وەفایی» دەڵێ:

جانبەخشە دەڵێن: ماچی دەمت، وەقتی تەبەسسوم
تاکەی بمرم؛ موعجیزەی ئەو سیرە نەزانم!
«٦٤»

**٩- ئەی دوو سەد جارت فیدای عەهدی قەدیمی بێ «ئەدەب»**

**بۆ شکا؛ ئەو عەهدی دەتفەرموو: ئەوم زۆر مەحکەمە**

عەهدی قەدیم: پەیمان و بەڵێنی کۆن.

مەحکەم: پتەو، قایم، بەهێز.

واتە: کاتی خۆی و لە سەرەتای دڵداریمانەوە، بەڵێن و پەیمانێکت دامێ و منیش بەقوربانی ئەو بەڵێن و پەیمانەت بووم، کە دەتفەرموو: ئەو بەڵێن و پەیمانەم زۆر پتەوە و هەرگیز نالەقێ و نایشکێنم، کەچی ئەو بەڵێن و پەیمانەت شکا! بۆ شکاندت؟.

«نالی» دەڵێ:

مەکە ئیخلافی ئەو وەعدەی کە فەرمووت
دەخیلت بم، کە خانەی سەبرەکەم سووت
«١٤٨»





کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)، وەک نموونەی:

١- زانی کوژ بەر جەور و جەفایان ئەلەمێن دل
رەحمێ ب گەدایێ خۆە کە، سولتان وشەهێ من
«مەلای جزیری، ٤٥٥»

٢- هەر جۆگە و جێگێکی کەوا سوور و سوێر بێ
جێی جۆششی گریانی منە و خوێنە ڕژاوە
«نالی، ٥٣٦»

٣- خۆ ڕەوشەنە خانەی دڵی من - مەنزڵی تۆیە -
مروەت نییە بەم ڕەنگە، خراپی ستەمت بێ
«سالم، ١٤٣»

سەرنج: وەک دیارە ئەم غەزەلە، لە جەژنی ڕەمەزانێکدا نووسرا بێ، چونکە ئەگەرچی ڕاستەوخۆ (جگە لە نوسخەی: ئا) ناوی جەژنی ڕەمەزانی نەهێناوە، بەڵام باسی بۆنە و خۆشییەک دەکا، کە لە نێوان کۆتایی مانگی ڕەمەزان و سەرەتای مانگی شەووالدا بووبێ، کە دیارە ئەو خۆشیی و بۆنەیەی نێوان ئەم دوو مانگەش، هەر جەژنی ڕەمەزانە.

**١- گەر غورەیی شەوواله، وە گەر ماهی صیامە**

**هەنگامی نیشات و تەرەبی عارف و عامە**

غورەی شەووال: سەرەتای مانگ.

ماهی صیام: مانگی ڕەمەزان، کە تێیدا موسڵمانان بەرۆژوو دەبن.

هەنگام: کات، دەم، وەخت.

نیشات (نشاط): جموجووڵ و بزووتن و چالاکی.

تەرەب: بەزم و شادی و گۆرانی.

عارف و عام: خواناس و تێکرای خەڵک.

واتە: گەر سەرەتای مانگی شەوواڵە، یان مانگی ڕۆژوو گرتنە، هەر کامێکیان بێ

گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە گەرمە و هەرەتی جموجووڵ و بزووتن و خۆشیی و شادی خەڵکانی خواناس و سەرلەبەری خەڵکە.

«مەولەوی تاوەگۆزی» دەڵێ:

ڕەمەزان طلووع، صوبح شادیشەن
شوال شام شورم، نامرادیشەن
«٢٦٨»

**٢- ئەو تاعەتە بێ حەصرە؛ کە عادەت بوو لەمەوپێش**
**مەنسووخە ئەوێستاکە، هەموو گەردشی جامە**

تاعەت: خواپەرستیی.

بێ حەصر: بێ سنوور، بێ ئەندازە.

مەنسووخ: لەناوچوو.

گەردشی جام: گەڕانی پیاڵە و پەرداخی بادە، دەستاودەست کردنی پێک و پیاڵەی بادەیە.

واتە: ئەو خواپەرستیی و نوێژ و ڕۆژووە بێ سنوورەی، کە لە مانگی پێشوودا، کرابووە پیشە، ئێستا هەمووی لەناوچووە و لە کۆڕ و کۆبوونەوەی مەیخواردنەوەدا، هەر لێوانی بادەیە و دەستاودەست دەگەڕێ.

«سالم» دەڵێ:

بۆ تۆ، بەسویی مەسجید، هاتم بچم لە ڕێدا
بۆ کویی مەیفرۆشان: عەزمم شەتابی هێنا
«٣٥»

«بێخود» دەڵێ:

لە بۆ میحرابی ئەبرۆی تۆبە، گەر مەجبووری مزگەوتم
لە نەشئەی چاوی مەستی تۆیە، مەفتوونی خەراباتم
«٤٢»



**٣- واعیز؛ کە دوێ مونکیری صەهبا بوو بەئیکراه**
**ئەورۆکە بەسەرخۆشیی دەڵێ: تۆبە حەرامە**

واعیز: ئامۆژگاریکار.

مونکیر: کەسێک کە کاری پێچەوانەی شەرع و یاسا نەکات.

صەهبا: بادە (بادەی باش).

ئیکراه: دزێو، قێز و بێزکردنەوە و بەناحەز زانینی شتێک، یان کارێک.

واتە: ئەو بەدرۆ و بەڕواڵەت موسڵمان و ئامۆژگاریکارە، کە دوێنێ ڕقی لە بادە و مەیخواردنەوە بوو؛ ئێستاکە هەر ئەو کەسە خۆی، سەرخۆشە و هەر بەسەرخۆشیش دەڵێ: تۆبەکردن حەرامە!.

«مەحوی» دەڵێ:

ببین گەر لە ساقی: ناز و عیشوێک، ئێمە دەبینین
بەمەی نۆشیی دەدەن فتوا، بەمەستیی: موفتیی و قازیی
«٣٠٥»

«پیرەمێرد» دەڵێ:

دوێنێ: بەتۆبەیەک قەدەحەکەم شکان
ئەمڕۆ: بەخوێنی ئەو قەدەحە؛ تۆبەکەم شکان

**٤- خەرقێکی کە دوێنێکە، بەزاهید بوو لە میحراب**
**ئەورۆکە لە مەیخانە، لە ڕەهنی مەیی، وامە**

خەرقە: پۆشاک و جبەی دەروێشان.

زاهید: بەڕواڵەت خواپەرست.

میحراب: نوێژگە.

ڕەهن: بارمتە.

وام: قەرز، (بەعەرەبی: سلفە).

واتە: ئەو پۆشاکەی کە دوێنێ زاهید، لە میحراب لەبەریدا بوو؛ ئەمڕۆ هەمان خەرقەی، لە بەرامبەر کڕینی بادەدا، بەقەرز و بارمتە، لای مەیفرۆشان دایناوە!.

«وەفایی» دەڵێ:

لە سـایەی چاوەکـانی، بوومـە ڕەند خـەرابات
لە لای پیری مەیخانان، خەرقەم لە گرۆی مەی ناوە
«١٥٣»

**٥- ئەو یاری دڵازارە، بەدڵ لێـمـە بڕا بوو**
**ئەم ساتە، وەکو تالعی سەعدم بەمەرامە**

دڵازار: مایەی ئازاردانی دڵ.

تالع: بەخت، چارە.

سەعد: بەختەوەریی.

مەرام: مەبەست، کام (کامی دڵ)، ئاوات، ئامانج.

واتە: ئەو دڵبەرەم، کە پێشتر هەر کاری ئازاردانە و لە دڵیشەوە لە من هەڵبڕا بوو. ئێستاکە، وەک بەختێکی باش و شانسێکی ڕوون و بەختەوەریی، بەگوێرەی خواست و خۆزگەی منە.

**٦- ساقی! وەرە دەی تێکە، سوراحی بدە ساغەر**
**کەم هەڵدەکەوێ عیشرەتی وا، فورسەتە، نامە**

ساقی: مەیگێڕ.

سوراحی: ئەو دەفرەی لە لێوان و پیاڵەی مەی گەورەترە و بۆ بادە و مەیی و شلە تێکردن بەکار دێت.

ساغەر: پیاڵە و پەرداخی بادە و مەی.

فورسەت: هەل، هەڵکەوت.

نامە: ئامان.

واتە: ئەهای مەیگێڕ! دەستم دامێنیت، وا وەرەوە و سوراحییەکەت بێنە و بادەم بۆ تێکە، هەڵکەوت و دەرفەتی وا خۆشی وەک ئێستا، کە بەمجۆرە، بەکۆمەڵ پێکەوە بین، کەم هەڵدەکەوێ.



**٧- دەربەستە لە ئەغیار و مەیی و جام و لەبی یار**
**بێ مووی دەماغێ، لەسەفی ئەهلی عەمامە**

دەربەستە (دەر + بەستە): دەرگای داخراو.

ئەغیار: نەیار، بیانی، نامۆ.

مووی دەماغ: ئاماژەیە بۆ ئەو کەسانەی، کە بەبێ مۆڵەت و هەر لە خۆیانەوە لە بۆنە و لە کۆڕ و لە جێگەی تایبەت و ناسکدا، قوت دەبنەوە و بەرنامەکە دەشێوێنن؛ وەک لە بەرامبەر ئەم زاراوەیەدا «مووی لووت»یش هەیە، کە هەمان مانا و مەبەست بەدەستەوە دەدات، یان وەک ئەوەی کە «بێخود» ئەمجۆرە کەسانەی وەک «دوومەڵ» ناوبردوون، کە لە جێی ناسک دەردێن:

ڕەقیب، بۆ بەزمی خەڵوەتمان، کە هاتی
وەکو دوومەڵ، لە جێی ناسک دەرهاتی

سەف: ڕیز، پۆل، دەستە.

ئەهلی عەمامە: هێمایە بۆ ئەو پیاوە ئایینیانەی سەر و مێزەریان بەستووە.

واتە: دەرگا خڕ داخراوە و کلۆم کراوە و نەیار و بیانی لە کۆڕەکەماندا نییە، هەر تەنیا بادە و لێوان و لێوی یاری لێیە. کەسێکی لەوانەیشی تێدا نییە کە عەمامە و مێزەری بەسەرەوە بێ و بەزمی خۆشییمان لێ بشێوێنێ.

**٨- ساغەر بەکەف و بەخت قەرین، یار بەرابەر**
**چەشمی بەدی لێ دوور بێ، چە عەیشێکی تەمامە**

ساغەر بەکەف: لێوان و پەرداخی بادە بەدەستەوە.

بەخت قەرین: بەختیاریی و خۆشیش لە نزیکەوە.

یار بەرابەر: دڵبەریش لە بەرامبەر.

چەشمی بەد: چاوی بەد.

عەیش: ژیانێکی خۆش.

تەمام: ساز و تەواو.

واتە: چ ژین و خۆشییەکی بێ وێنەیە، کە پەرداخ و لێوان بەدەستەوە و بەختی باشیش

لە تەکتدا و دڵبەریش بەرامبەرت. یاخوا ئەم بەزمەمان لێ نەشێوێ و چاوی بەد و بەدکارانی لێ دوور بێ.

**٩- ئەلحەق «ئەدەب» ئەورۆکە، بەئیقباڵ و سەعادەت**
**یەکبارە هەموو گەردشی چەرخم بەمەرامە**

ئەلحەق: بەڕاستیی.

ئیقباڵ: شانس و چارەنووس.

سەعادەت: بەختەوەریی.

یەکبارە: هەموو، سەرلەبەر، سەرومڕ.

گەردشی چەرخ: سووڕانەوەی ڕۆژگار.

واتە: ئەی «ئەدەب» بەڕاستی ئەمڕۆ، ڕۆژێکی خۆشە و سەرلەبەری شتەکان؛ هەر لە بەخت و بەختەوەریی و سووڕانەوەی ڕۆژگارەوە، هەموویم پێ باشن و هەمووی بەدڵی من دەسووڕێن.

«سالم» دەڵێ:

وەی وەی چ مەجلیسێ بوو، دوێنێ لە دیدە و دڵ
دڵبەر: شەرابی هێنا، سالم: کەبابی هێنا
«٣٥»





کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم: (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)، وەک نموونەی:

١- ژی هەر بێ داغ و بێ دەردی، مەپرسین میحنەتا عیشقی
چیە زانین بێ خەبەر ژان، دی لی داغ و کەسەر تیدا!
«مەلای جزیری، ٣٧»

٢- ئەمێستەش گەرچی عەیش و عوشرەتت، هەر تاڵ و تاڵاوە
بەمەرگی تۆ، لە پاشانیش دەخۆی تاڵاوی تاڵاوی
«نالی، ٦٨٢»

٣- طەبیب دێن دەوای دەردم بکا، خۆ من: زەدەی دووریم
بەبێ داروویی وەسڵی تۆ، نییە ئارام و تەسکینم
«کوردی»

**١- هەتا بۆ ماهی میقنەع پۆشی تۆ، مەتلەع گریبانە**
**لە نەخشەب میقنەعی ساحیر، لە سیحری خۆی پەشیمانە**

ماهی میقنەع: ئەگەرچی لە غەزەلی (٢٠)دا «ماهی میقنەع»مان ڕوون کردبۆوە، بەڵام دیسانەوە بۆ بەبیرهێنانەوەی خوێنەر، کورتەیەکی باس دەکەینەوە و دەڵێین «ماهی میقنەع» بریتییە لەو مانگە درۆزن و تەڵەکەبازیی و سیحراوییەی کە «هاشمی کوڕی عەتا»، یان: حەکیمی کوڕی عەتا، گوایە ئەم مانگەی بەجیوە و شتی تر، لە چاڵێکی بناری کێوی «سیام»ی نزیک شاری «نەخشەب» دروست کردووە، ئەم مانگە دەستکردە، هەموو شەوێک لەو چاڵەوە دەرکەوتووە و لە ئاسۆی شاری «نەخشەب»دا درەوشاوەتەوە و لە مەودای چوار فرسەنگ (٢٤کم)دا بینراوە (بۆ زیاتریش ئاگاداریی لەم بارەیەوە؛ بنواڕە: فەرهەنگی: (دهخدا، بەرگی ١٣، ل ١، ٢٠٠٥ و بەرگی ١٤، ل ٢١٣٥٨).

مەتلەع (مطلع): هەڵهاتن، دەرکەوتن، ئاشکرابوون.

گریبان: لە دوو بەش پێک دێت. بەشی یەکەمیان (گریب)، لە (ئاڤێستا)دا بە«گریوا» و لە «پەهلەوی»دا بە«گریوەک» هاتووە و هەردووکیشیان بەمانای (گەردنەی چیا)ن. لە هیندی کۆنیشدا بەمانای «پشت تێکردن» دێت. بەشی دووەمیشیان: «بان» کە پاشگرە؛

بەمانای (پارێزەر)ە و بەهەردوو بەشی واژەکەش مانای «پارێزەری مل و گەردن» دەدەن (دهخدا، بەرگی ١٢، ل ١٩١٢٢٠)، ئەم واژەیە بەکوردی دەبێتە «یەخەی کراس» و یەخەی کراسیش دامێنی مل و گەردن و شان و سنگ دادەپۆشێ. لە هەمان کاتدا «میقناع» بەمانای ڕووپۆش و چارشێویش دێت.

واتە: تا ئەو کاتەی، یەخەی کراسەکەت، جێی هەڵاتن و دەرکەوتن و ئاشکراکردنی مانگی داپۆشراوتە (کە سنگ و بەرۆک و مەمکەکانێتی)، ئیتر «میقنەع»ی ساحیر، لە سیحر و ئەفسوونی خۆی پەشیمانە.

**٢- هەتا کاکۆڵی شێواوت، لە بۆ ئازاری دڵ؛ دەستەن**
**دڵی جەمعێ لە ئەم دەستەت، وەکو زوڵفت پەرێشانە**

واتە: تا داوە زوڵفە شێواوەکانی تۆ، تاڵ تاڵ بەیەکدا دەچن و دەبنە یەک و یەک دەگرن و پێکەوە گرێیان دەدەیت و دەیانکەیتە، چەپکە داو، بۆ ئەوەی بەگەلەکۆمەکێ بتوانن ئازاری زۆرتری دڵ بدەن، ئیتر ئێمەی دەستەی عاشقانیشت، حاڵمان، وەک حاڵی ئاڵۆزان و بەیەکداچوونی زوڵفەکانت، شپرزە و شێواو و تێکچووە.

**٣- لەبەر حوسنی جیهانگیرت، ئەسیری چاهی میحنەت بووم**
**عــەزیزم بۆ زوڵەیخــایە، کــە یوسف بەندی زیندانە**

حوسنی جیهانگیر: جوانییەکی سەرتاسەری جیهانگیر.

ئەسیر: دیل.

چاه: چاڵ، بیر.

میحنەت: تەنگانە و ناخۆشیی.

یوسف: یەکێکە لە دوازدە کوڕەکەی حەزرەتی یەعقووب، کە یەعقووب لە پێغەمبەرانی ناوداری ئیسرائیلە، «یوسف»یش ناوبانگی لە جوانییدا، جیهان داگر بووە. داستانی «یوسف»یش بەمجۆرەیە: یوسف شەوێکیان خەونی دیوە و بۆ بەیانی بۆ باوکی گێڕاوەتەوە، کە لە خەونیدا خۆر و مانگ و یازدە ئەستێرەی دیوە و هەموویان بۆ لای هاتوون و سەریان لە بەرپێی یوسفدا دانەواندووە. باوکی بەیوسفی وتووە، بەگوێرەی مانای خەونەکەت، تۆ سەرت بەپاشایی دەگات، بەڵام نابێ ڕازی ئەم خەونە لای براکانت بدرکێنیت، نەوەک ئیرەییت پێ ببەن و لەناوت ببەن. بەڵام یوسف ئامۆژگارییەکەی باوکی



لە یاد کردووە و بۆ یەکێک لە براکانی گێڕاوەتەوە، ئەویش بۆ براکانی تری گێڕاوەتەوە و ئەوانیش ئاگری کینە و ئیرەیی لە دڵیاندا هەڵایساوە و خۆیان بۆ لەناوبردنی ئامادە کردووە. ڕۆژێک چوونەتە لای باوکیان و داوایان لێ کردووە مۆڵەتیان بۆ گەڕان پێ بدات، باوکیان لە سەرەتادا قایل نەبووە، بەڵام دوایی ڕێگەی داون و یوسفیشیان لەگەڵ خۆیاندا بۆ کەنعان بردووە. لە ڕێگە کراسەکەیان لەبەر داکەندووە و یوسفیان لە بیرێک هاویشتووە و کراسەکەیان بۆ لای باوکیان گەڕانەتەوە و پێیان وتووە کە گوایە یوسف لە ناو ڕێگەدا بەگوێی ئەمانی نەکردووە و لێیان دوور کەوتۆتەوە و گورگ خواردوویەتی و ئەمەش کراسەکەیەتی. دواتر، کاروانێک بەلای بیرەکەدا تێپەڕیوە و بەهیوای ئاو هەڵگۆستن دەفرێکیان لە بیرەکە ڕاهێشتووە و یوسف چۆتە دەفرەکە و لەگەڵ دەفرەکەدا لە بیرەکە هاتۆتە دەرێ. کاروانکارەکان یوسف بەپارەیەکی کەم دەفرۆشن. کڕیارەکە یوسفی بۆ میسر بردووە. ناوبانگی جوانیی و شەنگ و شۆخی بەهەموو لایەکدا بڵاوبۆتەوە، بەجۆرێک کە ئافرەتان بەتایبەتیش «زولەیخا»ی هاوسەری عەزیزی میسر پەرۆش و عەڤداڵی بوون. عەزیزی میسر لەسەر پێداگریی و تکای زولەیخا، کە منداڵیان نەبووە، یوسفیان کڕیوە و وەک کوڕ و نۆکەری خۆیان، بردۆتە لای خۆیان. زولەیخا لە بڵێسەی ئەوینی یوسفدا سووتاوە و یوسف بایەخێکی پێ نەداوە، تا سەرئەنجام زولەیخا، عیشقی خۆی بۆ یوسف ئاشکرا دەکات و داوای دەست تێکەڵکردنی لێ دەکات. یوسف دیسانەوە بایەخی بەزولەیخا نەداوە و زولەیخاش ئیتر لێی نائومێد دەبێ و وای لێ دێت بەتاوانی خیانەت، لای مێردەکەی گازەندەی لا بکات. عەزیزی میسریش یوسف زیندانی دەکات، تا شەوێکیان خەونێک دەبینێ و هەرچی دەکەن، کەس خەونەکەی بۆ لێ نادرێتەوە. لەم سەروبەندەدا، یەکێک لەوانەی ماوەیەک لەگەڵ یوسف لە زیندان لەگەڵیدا بووە، باسی ڕاستگۆیی یوسفی بۆ عەزیز گێڕاوەتەوە. عەزیزیش فەرمان دەکات یوسف لە زیندان دەربکەن تا خەونەکەی خۆی بۆ بگێڕێتەوە. یوسفیش خەونەکەی بەڕاستیی بۆ لێ داوەتەوە و پێی وتووە، کە گرانییەکی سەخت، بۆ ماوەی حەوت ساڵ وڵات دادەگرێ و ڕێگە چارەشی نیشانی عەزیز داوە. هەر لەم سەروبەندەدا زولەیخاش لای مێردەکەی دانی بەبێ تاوانیی یوسف داناوە و ئەویش دڵنەواییەکی زۆری یوسفی داوەتەوە و پاشایەتیی میسری بەو سپاردووە و خۆی دوای ماوەیەکی کەم، کۆچی دوایی کردووە و یوسفیش لە ئاکامی تکای زۆری زولەیخادا قایل بووە بیکاتە هاوسەری خۆی. یوسف بۆ پشتگیریی لە نەهاتی ساڵیی داهاتوو دەستپێشخەری کڕینی داونەوێڵەی لە هەموو لایەکی وڵات و

زەخیرەکردن و دەست پێوە گرتنی خۆراکی کردووە. براکانی یوسفیش لەوانە بوون، کە بۆ گەنم فرۆشتن، گەیشتوونەتە لای یوسف و ئەویش بەئەنقەست، عەیار و پێوانەی دانەوێڵەکەی لە بارەکانی «بنیامین»ی برایدا شاردۆتەوە و دوایی کە بۆ پێوانەکە گەڕاون، لە بارەکانی براکەیدا دۆزیوەتەوە و یوسف بەم بیانووە ئەم برایەی گرتووە و زیندانی کردووە. براکانی تری بۆ لای باوکیان گەڕاونەتەوە و هەواڵی زیندانیکردنی براکەیان داوەتێ و ئەویش سەری لە گریان کردووە. لە ئاکامدا یوسف خۆی لە «بنیامین» و براکانی تری ئاشکرا کردووە و بەشکۆ و دەبدەبەیەکی مەزنەوە سەردانی کەنعانی کردووە. یەعقووب، کە لە تاوی یوسف ئەوەندە گریاوە، بینایی چاوی داهاتووە، هەر بەبۆنکردن و خۆ هەڵسوون لە کراسەکەی یوسف، چاوەکانی ڕۆشن دەبنەوە و بەمەجۆرە، ئەم کوڕ و باوکە، دوای ئەم چەندان ساڵ لە یەکتر دابڕانە، بەیەکتر شاد دەبنەوە (دهخدا، بەرگی ١٥، ل ٢٣٨٨٤).

واتە: گیانەکەم! منیش لەبەر جوانییە جیهانگرەکەت، دیلی بیری تەنگانە و کارەسات بووم؛ وا دیارە منیش دەردی یوسفم بەسەر هاتووە، کە ئەویش لەسەر ئەوینی زولەیخا، لە زیندان خرا.

«نالی» دەڵێ:

تۆ یوسفی نەوحوسنی لەسەر میسری جنیانی
من پیرم و فاهنی
لەم کولبەیی ئەحزانە، نە زیندووم و نە مردووم
هەروا بەتەماتم
«٢٦٥»

**٤- دەڵێن جەننەت هەیە وەک تۆ؛ هەموو ئەفسانە و نەقڵن**
**بەهەشتی جاویدان ئەمڕۆ، فرووغی حوسنی جانانە**

جەننەت: بەهەشت.
نەقڵ: گێڕانەوە (قسە گێڕانەوە).
جاویدان: نەمر، زیندوو، هەمیشەیی.
فرووغ: ڕووناکیی، پڕشنگ.
حوسن: جوانیی.



جانانە: دڵبەر.

واتە: ئەوانەی کە دەڵێن بەهەشت هەیە، هەمووی قسەی پڕوپووچ و بێ بناغەیە. چونکە بەهەشتی ڕاستەقینە و نەمر و هەمیشەیی ئەم ڕۆژگارە، پڕشنگی ڕاستەقینەی تۆی دڵداریت.

**٥- بەبێ تۆ، کوڵخەنە: گوڵشەن، لە گوڵشەن بۆیە بێزارم**
**بەیادت گوڵشەن و کوڵخەن؛ لە لای من هەردوو یەکسانە**

کوڵخەن: توونی حەمام.

واتە: هەر گوڵزارێک (کە دیارە بۆنی گوڵزار، هەمووی خۆشە)، بەڵام تۆی تێدا نەبێت، بەلای منەوە ئەو گوڵزارە وەک توونی حەمام، بۆنی ناخۆش و ڕەش و تاریک و پڕ دووکەڵ و جێگەی تەنگەنەفەسییە، بۆیە بەبێ تۆ، بۆ سەیری گوڵ و گوڵزار ناچم و سوێندیش بەیادی تۆ دەخۆم، کە گوڵشەن و کوڵخەنیش لە بەرچاوم، وەک یەکن.

**٦- هەتا چەوگانی زوڵفی ئابەنووسیتم بەخەو دیون**
**سەرم بۆ گۆی شەقت حازر، دەفەرمووی گۆ لە مەیدانە**

چەوگان: لە دوو بەش (چەو + گان) پێک دێت، کە بەشی دووەمیان پاشگری جێگەیە. واژەکە لە بنەڕەتدا بەپەهلەوی «چوپگان» و «چو»بەکان بەعەرەبیش کردوویانە بە(صولجان) و فەرەنساییش هەر لە فارسی وەریانگرتووە و پێی دەڵێن «شیکانە».

چەوگان دارێکی ڕاست و ڕێک و لە شێوەی گۆچانیشدا سەرێکیان چەماوەتەوە، کە لە یاری «گۆبێن»دا بەکار دێت (دهخدا، ٦، ل ٨٣٢٦). وەک لە بەرهەمی شیعریی دێرینەی کوردیدا دەبینرێ. وا دیارە ئەم یارییە لە ناو کوردەواریشدا زۆر بووبێ.

گۆ: ئەو تۆپە بچووکەی لەم یارییەدا، بەهۆی چەوگانەکەوە، یارییەکەی پێ تەواو دەکرێ.

واتە: ئەووەتەی قژە ڕەنگ وەک ئابەنووسییەکەتم، لە خەوندا دیوە، کە سەری هەر تاڵە موویەکی، وەک سەری چەوگان، چەمیوەتەوە و بەهەموویان شێوەی چەوگانێک دێنێتە بەرچاو؛ ئیتر وام هاتۆتە خەیاڵەوە، کە دەبێ سەری منیش، وەک «گۆ»ی یاری بێ و لە لایەن چەوگانی زوڵفتەوە بەرشەق بدرێم و ئەگەریش بۆ ئەم یارییە «گۆ»ی سەرمت دەوێ و دەفەرموویت، ئەوا «گۆ»ی سەرم لە مەیداندا ئامادەیە.

«نالی» دەڵێ:

١- بێ ئەگەر بێتە دەرت، دیدەیە بەر شەق وەکو گۆ
نیـیـە زاتیـشی نەیێ دڵ، چ بکا قـوربەسـەرە؟
«٤١٤»

٢- شـوکـر «نالی» سـەری خـەصـمت وەکـو گـۆ
بەخـواریی، نەک بەیاریی، کـەوتە بەر شـەق
«٢٥٤»

«حاجی قادر» دەڵێ:

لە مـەیدانی بەهاردا، شـارەکـەی «کـۆ»
قوبەی کشمیری دا بەرشەق وەکو «گۆ»
«٢٥١»

«حەریق» دەڵێ:

سەردانێ لە مەیدانی موریدانی «حەریقی»
بۆ گۆی شەقێن چاکە، خۆشت وت بەکینایەت
«١٩»

**٧- زەکاتی حوسنی ڕوو؛ ماچە! دەڵێن فەرمووتە: دەیبەخشم**
**عەتای فەرموو بەمن قوربان، کە بۆ من خێر و ئیحسانە**

واتە: تۆ یەکجار جوانیت و ئەم جوانییەش، وەک هەر سەرمایەیەکی گەورە، دەبێ زەکاتی لێ بدرێ و زەکاتی ئەم جوانییەش، کە «ماچ»ە، فەرمووتە: دەیبەخشم. خۆ ئەگەر کاری وا دەکەیت و ئەو خێرە دەکەیت، من لە هەموو کەس زیاتر شایان و شایستەی ئەو خێرەم و بۆ من وەک، نەک جێگەی زەکات دەگرێ، بەڵکو جێگەی خێر و ئیحسانیش دەگرێتەوە.

«حەریق» دەڵێ:

حوزنی من و حوسنی تۆ، ئیشکالە تا ئاخر نەفەس
بۆچ زەکاتی حوسنی تۆ، یا حوزنی من، ناگا بەکەس!
«٢٦»



**٨- بەیادی خاڵی دەوری دەم، بگێڕە دەورەکەت ساقی!**
**بڵا دەوران بسوورێ دوور بەدوور، لەم سەیری دەورانە**

بگێڕە دەورەکەت ساقی: لە کۆڕی مەیخۆراندا، کە «بادە» لە لایەن مەیگێڕەوە دەستاودەست دەکات و بەسەر یەکە یەکەی ئامادەبووانی کۆڕەکەدا، دەسووڕێتەوە، بەوە دەڵێن: دەور گێڕانی ساقی.

بڵا دەوران بسوورێ: با زەمانە و ڕۆژگار، خولی خۆی بگەڕێ.

واتە: خاڵی دەوری دەم و لێوی یار، ئەوەندە جوانە، دەبێ هەمیشە یادی بکرێ و بۆنەی بۆ ساز بکرێ و بۆ ئەو بۆنەیەش، دەبێ خۆمان بەقوربان و لە دەوری بگێڕین؛ لەبەرئەوە، ئەم بەزمی مەیخواردنەوەیە بۆنەی خۆ لە دەور گێڕانی خاڵی دەم و لێوی یارە و تۆش کاکی مەیگێڕ، لەباتی هەموومان، بەسەرماندا بگەڕێ و بادەمان بدەرێ، تا خۆمان لە گەڕان و سووڕی ڕەوڕەوەی ڕۆژگار دوور بەدوور و بێ ئاگا بکەین و ئێمە و ڕۆژگار، هەر لایەکمان، بەگوێرەی بەرنامەی خۆی بگەڕێ: ڕۆژگار، بەگوێرەی ئەو بەرنامەیەی کە کردگار بۆی داناوە و ئێمەش: بەگوێرەی ئەو بەرنامەیەی کە ئەوینی خاڵی دەوری دەم و لێوی یار، بۆی داناوین و دەبێ لە دەوری بگەڕێین.

«نالی» دەڵێ:

١-لەم گەردشی دنیایە، کەوا دەورە، نە جەورە
ساقی کەرەمی سایقە، «نالی» مەکە ئیلحاح
«١٦٧»

٢- ساقی! قەدەحی گەردشی گەردوون دەشکێنێ
باریی، کە دەبێ موعتەقیدی گەردشی ئەوبە
«٣٩١»

٣- «نالی» مەبە عاجز، کە ئەمە دەورە، نە جەورە
ساقی کەرەمی یەک بەیەکە و نەوبە بەنەوبە
«٣٩٣»

**٩- «ئەدەب» نەشکێ دەماغت، گەر لە گوڵشەندا ڕەقیبت دی**

**سوپەر بۆ تیری چەشمی بەد؛ سەری خەر، زیبی بوستانە**

نەشکێ دەماغت: مەزاجت تێک نەچێ، مەزەندەت تێک نەچێ.

سوپەر: قەڵغان و زرێ و پارێزەر.

چەشمی بەد: چاوی بەد.

سەری خەر زیبی بوستانە: جاران بۆ پاراستنی باخ و بێستانی جوان، لە چاوی پیس و بەد؛ لە جێی چاوەزار، سەرە گوێدرێژێکیان بەدارێکەوە لە باخەکەدا هەڵدەواسی.

واتە: ئەی «ئەدەب» ئەگەر لە سەیری باخ و گوڵشەنی جوانیی یاردا، خەڵکی ناحەز و ڕەقیبانت بینی، خۆت مەشەمزێنە و شلوێ مەبە، چونکە ئەمە دابێکە و لە دەمێکەوە باوە، کە بۆ چاوەزاری باخ و گوڵشەنی جوان، سەری گوێدرێژ، دەکەنە مایەی ڕازاندنەوەی باخەکە و بەمەش وەک پارێزەرێک لە چاوی بەد و پیس، باخەکەی پێ دەپارێزن.



**١٠٨**

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیلن فعولن)، وەک نموونەی:

١- ئەی جیلوەدەری حوسن و جلەوکێشی تەماشا
سەرڕشتەیی دین، بێ مەدەدی تۆ نییە، حاشا
«نالی، ٧٥»

٢- یارەب گوزەران کا بەسەفا، وەختی عەزیزت
پەیوەستە لە دەوری چەمەن و گەردشی باغا
«شێخ ڕەزا، ٧»

٣- ئەم خەیمە؛ کە شەمسییەی شاهەنشی ئەرزە
تا چادری نیلووفەری سەر تەپڵەکی بەرزە
«حاجی قادر، ١٠٨»

**سەرنج:** وەک دەزانرێ ئەم غەزەلەی «ئەدەب» بەدواداچوونی چەند غەزەلێکی ناوداری «نالی»ن، کە سەرەتای هەندێکیان بەم بەیتانە دەست پێ دەکەن.

١- ئەو سیلسیلە وا میشکی خەتا نێوی براوە
پڕ پێچ و شکەن، خەم بەخەم و حەلقە کراوە
«٥٣٠»

٢- زوڵفت بەقەدتدا کە پەرێشان و بڵاوە
ئەمڕۆ لە منی شێفتە، ئاڵۆز و بەداوە
«٥٣٢»

٣- سەری زوڵفت کە ڕشتەی عومری خضرە، نیوە هەودایە
چ هەودایە؟ کە هەر حەلقەی دوو سەد زنجیری سەودایە
«٥٥٦»

٤- سەرمایەیی سەودا؛ کە دەڵێن زوڵفی دووتایە
هەر پێچشی تاییکی، سەد ئاشووبی تیایە
«٥٦٣»

**١- ئەو جەعدی موسەلسەل، کە لەسەر چیهرە بڵاوە**
**هەر دانە دوو سەد سیلسیلە، سەد حەلقە و داوە**

جەعد: گرژ و لوول.

موسەلسەل: زنجیراوی، وەک زنجیر لێکراو.

سیلسیلە: زنجیر.

واتە: ئەو زوڵفە وەک زنجیر لوولدراوە، کە لەسەر ڕوخسارت پەخش و بڵاوبۆتەوە، هەر دانە تاڵێکی، بریتییە لە سەد زنجیر و سەد حەلقەی داو، بۆ بەداوخستنی ئەوینداران.

**٢- حیرەت نییە پابەندیی مە، بەو خەتی زیبای**
**ڕۆژی ئەزەلێ ئەو خەتە، وا بۆمە کشاوە**

حیرەت نییە: سەیروسەمەرە نییە.

واتە: جێی سەرسوڕمان و ڕامان نییە، کە ئێمە دڵبەستەی ڕووی گەشی یار و خاڵ و خەتی ڕازاوەی یار بین، چونکە وەک دیارە هەر لە ڕۆژی ئەزەلەوە، خوا ئەو خاڵ و خەتەی وەک ئەرک و کارێک بۆ ئێمە کێشاوە، تا بەپێی ئەو خەت و بەرنامەیە هەڵسوکەوت بکەین.

«نالی» دەڵێ:

ئەو شەربەتە، ئەو جامە شەراوە؛ لەبی ناوە
بۆ «نالی»یە ئاخر، کە خودا بۆ ئەوی داوە
«٥٣٢»

**٣- گریانی بەیانانی منە، عیللەتی خەندەت**
**مەعلوومە کە پشکووتنی خونچە؛ بەشەواوە**

عیللەت: سۆنگە، هۆ.

شەواو: ئاوداشتنی باخ و بێستان لە شەودا.

واتە: پێکەنینەکانی تۆ، بەهۆی گریانی شەو، تا سەرلەبەیانیانی منەوەیە، چونکە ئاشکرایە، کە ئاودانی خونچە، لە شەودا، دەبێتە مایەی پشکووتن و گەشانەوەی خونچە لە بەرەبەیاندا.



«نالی» دەڵێ:

١- گریانی من و خەندەیی تۆ، ئێستە دەشوبهێ
بەو مەوسیمی بارانە، کەوا خونچە دەپشکووت
«١٥٣»

٢- من وەکو: ڕەعدم و تۆ وەک: گوڵ و سەبزەی دیمەنی
من: دەگریێم و دەناڵێنم و تۆ: پێدەکەنی
«٦٦٩»

«وەفایی» دەڵێ:

١- تا هەوری بەهاری نەبزووت، خونچە نەپشکووت
بۆیە دەگرێ خەندە بەسەر گریەیی مندا
«١٠»

٢- خەندەیی گوڵ: سەبەبی جۆششی بارانە، بەڵێ
چونکە تۆ: پێدەکەنی، بۆیە «وەفایی»: دەگری
«١٩١»

٣- مەگەر تۆ بووی بەگریەم هاتیە خەندە
کە گوڵ پشکووت، بەدەم هەوری بەهاری
«١٨٣»

٤- دەزانێ تاوی بارانە، شەرابی پێکەنینی گوڵ
دەمێک نابێ لەسەر خەندێکی؛ سەد جارم نەگرییێنێ
«٢٠٤»

**٤- قەترەی عەرەقی جەبهەتە، نەقشی قەمەری ڕوو**
**یا تەلعەتی خورشیدە، موجەددەر لەسوهاوە!**

قەترە: تنۆک، دڵۆپ.

جەبهە: ڕوخسار، ڕوو.

قەمەری ڕوو: ڕووی وەک مانگ.

تەلعەت: دەرکەوتن، ئاشکرابوون.

خورشید: هەتاو، خۆر.

موجەددەر: ئاولە دەرکردوو.

سوها: ئەستێرەیەکی بچووک و زۆر شاراوە و سەر بەپۆلە ئەستێرەی «بنات النعش»ە. (دهخدا، بەرگی ٩، ل ١٣٨٥٤).

واتە: ئەوە دلۆپە عەرەقی سەر ڕوخسارتە، کە لەسەر مانگی ڕووت بۆتە نەخش! یان ئەو کاتانەیە، کە خۆر دەردەکەوێ و ئاسمان ڕووناک دەکاتەوە و وردە ئاولەی سەر ڕوخساری ئەستێرەی «سوها» بەدەردەخا!؟.

**٥- فەرمووتە نەڵێم نوکتەیی عیشقت بەڕەقیبیان**

**ئەو ئاتەشی سوزەندە بەمن چۆن دەشەراوە!**

نوکتە: ڕاز، نهێنی.

ئاتەشی سوزندە: ئاگری سووتێنەر.

دەشەراوە: دەشاردرێتەوە.

واتە: فەرمووتە ڕازی عیشقت لای ناحەزان نەدرکێنم. منیش دەڵێم حەزم دەکرد بتوانیبایە فەرمانەکەت جێبەجێ بکەم. بەڵام گیانەکەم! عیشقت ئاگرێکی سووتێنەرە و کاتێ عیشقت دەمسووتێنێ و خەڵک بەم کڵپەی ئاگرەوە دەمبینن، چۆن بتوانم ڕازی ئەوینت بشارمەوە؟!.

«سالم» دەڵێ:

١- لەبی بەستم لە: گفتوگۆ، دڵبەر
تا نەکەم دەردی دڵ بەکەس ئیزهار
«٥٩»

٢- وام دەوێ سیری نیهانم قەت لە پەردە دەرنەچێ
جەزبەیی عیشقت دەکا پێم ڕازی مەستوور، ئاشکار
«٦٣»



«حەریق» دەڵێ:

تازە فەرمووتە: لە لای کەس، ڕازی عیشقی من مەڵێ
نەتدەزانی دڵ؛ کە کون بوو، دەنگی لێ دێ وەک جەرەس
«٢٧»

«تاهیر بەگ» دەڵێ:

بەزاهیر قەت دەبەم ئیسمی ویساڵت
لە خەوفی حاسید و طەعنی ڕەقیبان!
«١٢»

**٦- ئاشوفتەگیی خۆم بەسە، ئەو زوڵفی سیەه فام**

**بۆچی بەشەو و ڕۆژ، دەگەڕێ لێم؛ بەچراوە!**

ئاشوفتە: پەرێشان، ئاڵۆز.

سیەه فام: ڕەنگ ڕەش.

واتە: ئەوەندە شپرزە و پەرێشان و ئاڵۆزاوم، حەز دەکەم بەدەردی خۆمەوە لە پەنایەکدا خۆم گوم بکەم، کەچی زوڵفە ڕەشەکانت، بەڕۆژ و بەشەویش لێم ناگەڕێن و بەچرای کوڵم و ڕوخسارتەوە لە دوم دەگەڕێن.

«سالم» دەڵێ:

هەموو شەو چاوەڕێم، بەڵکو بەمەخفی یاری جانیی بێ
لە تاریکیی شەوا، شوعلەی چرا، موشکیل نیهانیی بێ
«١٤٠»

**٧- تەرغیبی عیلاجم دەکەی و بێخەبەری لێم**

**چارەی دڵی بێچارە، نەماوە بەدەواوە**

تەرغیب: بەلاوە خۆشەویست کردنی شتێک، هاندان بۆ ئەنجامدانی کارێک.

عیلاج: چارەسەر.

بێخەبەر: بێ ئاگا.

بێچارە: شتێک کە لە چارەکردن نەیەت.

دەوا: دەرمان.

واتە: هەر خەریکی ئەوەیت هانم بدەیت، تا چارەی دەردەکەم بکەم، کەچی ئاگات لەوە نییە، کە دەردەکەی دڵم، دەردی ئەوینە و چارەی بەدەرمان و دەوا ناکرێ.

«مەحوی» دەڵێ:

«مەحوی» ئەمرۆ زۆر نەخۆشە، قەت شیفای نابێ بەهیچ
گەر شیفای بێتن؛ بەبۆنی زوڵف و ئەو ئەگریجە دێ
«٣٣٤»

**٨- سەردان و نەگەیشتن، بەویساڵی لەبی لەعلت**
**نرخێکە لە بازاڕی وەفا، بۆ مە براوە**

سەردان: سەر لە پێناودا بەخشین و بەفیداکردن.

ویساڵ: بەیەک گەیشتن.

بۆ مە براوە: بۆ ئێمە دیاری و دەستنیشان کراوە.

واتە: ئێمە بەر لەوەی تەقەللای گەیشتن بەلێوی ئاڵ و ماچی دەمت بکەین، ئەوەمان لا ڕوون و ئاشکرایە، کە نرخ و بەهای ماچی لێوی ئاڵت، لە بازاڕی مامەڵەی ئەو ماچە و پابەندبوون بەمامەڵەتەوە، سەر بەخشین و سەر لە پێناودا دانانە؛ لەبەرئەوە پێشەکی، ئەوە دەزانین کە لە کاتێکدا حەسرەتی ماچی لێوتمان هەیە، هاوکات حەسرەتی گیان بەخشینیشمان لە یادە.

«نالی» دەڵێ:

١- وەفای عەهدە: لە من ڕۆح و لە تۆ: ماچ
چییە چارەی ئەمانەت!؟ غەیری تەسلیم
«٣١٢»
٢- ماچی دەمەکەی دامێ، کە دامێ سەر و ماڵم
بنوارە چ صەییادە، چ جەللادە بەحاڵم!
«٢٨٦»



**٩- بۆ شەککەری خامت، کە نەبوو جارێ بکا خەم**
**ئەم جیسمی نزارەم لە نمی دیدە تواوە**

شەکری خام: ئەو شەکرەی هێشتا بۆ خواردن ئامادە نەکراوە و بۆ ئەم مەبەستەش، بۆ کارخانە نەبراوە (لێرەدا مەبەست لە شەکری خام: لێوی یارە).

جیسم: تەن، لەش، جەستە.

نزار: لاواز، بێ هێز.

نم: فرمێسک، ئەسرین، ڕۆندک.

دیدە: چاو.

تواوە: تواوەتەوە.

واتە: من نەخۆش بووم و چارەم بەشەکری خام (بەماچی لێوی هێشتا ماچ نەکراوت) دەهات و جارێکیش بەخەمی ئەو دەردەمەوە نەهاتیت و بەفریا و هاواری چارەیەوە نەبوویت، بۆیە ئیتر دەردەکەم (دەردی ماچ نەکردنت) درێژەی کێشا و ئەوەندەش لە تاو ئەو دەردە بەژانە، گریام، تا وردە وردە گیان و جەستەم دەستی بەتوانەوە و پووکانەوە و لەناوچوون کرد.

«نالی» دەڵێ:

لەعلی شەککەرباری تۆ، تێراوە، شەککەرباریە
لێوی میحنەت باری من بێ ئاوە، باری گرتووە
«٥٤١»

«مەحوی» دەڵێ:

١- لەبی لەعلی؛ شیفا بەخشی برینی دڵ دەکا مەرهەم
ئیشارەی چاوی: دەکولێنێتەوە داغی جگەر لە نوێ
«٣١٦»
٢- عیلاجی دەردی عاشق، بۆتە خاصەی ئەو دەم و لێوە
شیفای ئەمرازی سەودا خاصیەت، چەشمەی عەسەل چارێ
«٣٠٠»

«تاهیر بەگ» دەڵێ:

١- مـەکـە مـەنعم لە شـەهدی لێـوی ئاڵت
دەزانی خۆ، کە: کەس ناژی بەبێ قووت
«٨»

٢- عیللەتی دەرد و شیفاکەم وا بەلێوی شەکەرت
مـایەیی ژین و حـەیاتم، دەرد و دەرمـانم وەرە
«١٥»

**١٠- بیستوومە، کە: شیرینە بەری سەبر لە ئەنجام**
**ئـەمما بـەمـن، ئـەو دارە؛ بـەری لێ نـەچنـاوە**

واتە: ئەوەم بیستووە، کە ئەگەر مرۆ، بۆ گەیشتن بەمەبەستێک، پشووی درێژ بێ و لە پێناوی ئەو مەبەستەدا ئارام بگرێ و ئەگەریش ئارام گرتنەکەی، سەخت و دژوار و تاڵیش بێ، بەڵام بەروبووم و ئەنجامی ئارام گرتنەکە، شیرین دەبێ. منیش دەڵێم ڕەنگە ئەم ئارام گرتنە، بۆ خەڵکی تر، ئاکامی شیرینی هەبێ، بەڵام من لەم بوارەدا خۆم تاقی کردۆتەوە و ئەم داری سەبرە، هیچ بەرێکی نەداوە.

«نالی» دەڵێ:

مـوددەعی زەجـرم دەکـات و پێم دەڵێ: سـەبرت ببێ
کەر بەلەعنەت بێ، کە: کەی عاشق قەراری گرتووە!
«٥٤٣»

**١١- کێ بێت و بکات جیلوە، لە لای تۆ؛ کە نەزاکەت**
**جـامـەیێکە دەڵێی لەو قـەدد و باڵایە بڕاوە**

جیلوە: دەرکەوتن، نیشاندان، درەوشانەوە.

جامە: کراس.

واتە: ئاخـۆ کێ بتـوانێ لە ئاست و لە بەرامـبـەر تۆدا، خـۆی بنوێنێ، یان لە ئاسـتی جـوانیی و درەوشـانەوەی تۆدا، خـۆی دەربخـات!؟ چونکە هەرچی جـوانیی و ناسکیی و نەزاکەتە، وەک کراسێک، لە ئەزەلەوە بەو قەد و باڵایەی تۆ بڕاوە.



**١٢- سـەودایی سـەری طوڕەتە، جانا لە سـەریدا**
**مەنعی مەکە ئەمڕۆکە «ئەدەب» فکری بڵاوە**

واتە: ئەی دڵبەرەکەم! ئەگەر هەستت کرد «ئەدەب» ئەم ڕۆژانە، خەیاڵی پەرتە؛ ئەوە هی ئەوەیە کە ئەوینی قژ و کاکۆڵی تۆ، هەست و هۆشی داگیر کردووە و دڵی لای خۆی نییە. چونکە سەودابوونی بەتۆوە، جۆرێکیش لە دێوانەیی و شێتێتی بەدواوەیە.

«نالی» دەڵێ:

وەک طوڕەیی پێچپیدەیی تۆ، ساغ و شکستەم
وەک نەرگسی نادیدەیی تۆ، خۆش و نەخۆشم
«٢٨١»

١٠٩

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف: (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)، وەک نموونەی:

١- خدمەتا پیری موغان دێ کت کەسێ مەقسوودە مەی
شیشە و جاما زوجاجێ ئێ دڤێت دێ ڕەت حەلەب
«مەلای جزیری، ٧٥»

٢- با نەقەومێت و نەزانن ئەم هەموو شوور و شەڕە
گشت لەسەر بەرخێ شەل و کاوڕێ لەڕ و بزنێ گەڕە
«شێخ ڕەزا، ١١٩»

٣- ناکەرێ مەدح و ثەنای تۆ؛ بەزوبان و بەقەڵەم
حەقە مەدحت نەکەم و قافیە زانیم عەبەسە
«حاجی قادر، ١١٤»

**١-دوو هەناری نەوڕەسن، هەریەک بەیەک گوڵنارەوە**
**یا دوو نارنجی ڕەسیدەن لەو بەهاری پارەوە!**

هەناری نەورەس: هەناری تازەپێگەیشتوو (مەبەست لە مەمکەکانی دڵبەرە).

گوڵنار: گوڵە هەنار (مەبەست لە گۆی مەمکە).

ڕەسیدە: پێگەیشتوو.

واتە: ئاخۆ ئەوانە، دوو هەناری تازەپێگەیشتوون؛ کە هەریەکەیان هێشتا گوڵەکەیان بەدەمەوەیە!، یان ئاخۆ دوو نارنجن؛ کە لە ساڵی پارەوە گەییبون؟!.

**٢- دوو شەمامەن دەم تەرەک، هەردوو لە یەک بوستانەوە!**
**یانە جووتێ گوڵبەدەم سێون، بەری یەک دارەوە!**

دەم تەرەک: دەم درز بردوو، دەم قڵیشاو.

واتە: ئەرێ ئەوە دوو شەمامەی دەم درز بردووی ناو یەک بێستانن! یان دوو سێوی گوڵبەدەمی بەری تاقە دارێکن؟! مەبەست لە بێستان و درەخت؛ سنگ و بەرۆک و بەژن و باڵای یارن.



**٣- دوو پیاڵەی زەڕنیشانن، سەر بەدوو گژنیژەوە!**
**یا دوو حوققەی گەوهەرن، بەندن بەدوو بزمارەوە!**

پیاڵەی زەڕنیشان: پیاڵەی نەخشی بەڕەنگی زێڕ و زیو.

گژنیژ (گشنیژ): گیایەکی سەوز و تام و بۆی خۆشە لە بەرەبابی کەرەوەز و (جەعفەری). شێوەی گەڵاکەی وەک نیمچە بازنەیەکە. بەفەرەنسی: کوریاندەرە و بەعەرەبی: جەلجلان-ی پێ دەڵێن. لە بنەچەدا لە «چین»ەوە بۆ خۆرهەڵاتی ناوەڕاست هێنراوە و چێنراوە (دهخدا، بەرگی ١٢، ل ١٩١٨١). بەڵام لەم بەیتەدا مەبەست گۆی مەمکە، کە دیمەنەکەی، شێوەی بازنەیی گەڵای گژنیژ دەدات.

حوققەی گەوهەر: دەفر و سندوقچەی هەڵگرتن و پاراستنی زێڕ و گەوهەر.

واتە: ئەی داخۆ ئەوانە دوو پیاڵەی دەم و لێوار، بەزێڕ و زیو، نەخشێنراون؛ کە هەریەکەیان وەک ئەوە وایە گەڵایەکی گژنیژ، بەسەریانەوە بێ، یان: دوو سندوقچەی گەوهەر و مروارین، کە هەریەکەیان بەبزمارێکەوە (گۆیەکانیان) بەندن!؟.

**٤- نار و نارنج و شەمامە، چەندە خۆش دێنە نەزەر**
**هەر لە یەک شاخ و لە یەک باخ و لە یەک گوڵزارەوە**

دێنە نەزەر: دێنە بەرچاو.

شاخ: لق، چڵ.

واتە: هەنار و نارنج و شەمامە، دیمەنیان چەند جوان دێتە بەرچاو و چەند جێی سەرنج و لێ وردبوونەوەن، کە هەمووشیان بەیەکەوە موتوربە کراون و پێکیشەوە، لە یەک چڵ و لە یەک باخ و لە یەک داری هەنارەوە.

**٥- نە هەنارن، نە شەمامەن، نە بەهێن، نە سێوی کاڵ**
**جووتێ مەمکی ئاتەشی ڕەنگن، بەبەر دڵدارەوە**

ئاتەشین ڕەنگن: ڕەنگ وەک ئاگرن.

واتە: نەخێر. ئەم دیمەنەی من دەیبینم، نە هەنار و نە شەمامە و نە بەهێ و نە فەریکە سێوی کاڵ نین، بەڵکو بۆم دەرکەوت، ئەمانە: دوو مەمکی ئاگر ڕەنگ و بەبەژن و باڵای یارەوەن.

**٦- ئەی خودا، چەندە ڕەوانبەخش و لەتیف و دڵبەرن**
**ئەو دوو نارە نەوڕەسە، بەو سەرووی خۆشڕەفتارەوە**

خۆشڕەفتار: ئاکار جوان.

واتە: خودایە! ئەم مەمکانە چەندە مایەی زیندووکردنەوە و تازەکردنەوەی گیان و ناسک و دڵفڕێنن، ئەم دوو مەمکە، هەر دەڵێی هەناری تازە پێگەیشتوون، بەبەرداری سەوڵی ئاکار جوانەوە.

**٧- حاڵی زاری من لە حەسرەت ئەو دوو نارانە، دەڵێی**
**گینگڵی مارە، بەسەر کانوونی پشکۆی نارەوە**

کانوون: مەڵبەند، چەق، ناوەند، ناوجەرگە.

پشکۆی نار: پشکۆی ئاگر.

واتە: بەڵام ئەگەر لە حاڵی بێ هێز و لاوازی من دەپرسی، کە لە حەسرەت ئەو دوو هەنارە، چۆنم!؟ لە وەڵامدا دەڵێم: هەر دەڵێی ئەو مارەم، کە بەسەر چەق و ناوەندی ئاگرێکەوە دانرابێ.

**٨- دڵبەرا! ڕەحمێ بکە، ئاخر هەتا کەی بەندەکەت**
**ڕۆژ و شەو، بێ ڕوویی تۆ؛ بەو ئاه و ناڵە و زارەوە**

واتە: گیانەکەم! بەزەییبیەکت بەم نۆکەر و زیندانییەی خۆتا بێتەوە، ئاخر هەتا کەنگێ، بەڕۆژ و شەو، لە دووری تۆ، بەئاخ و ئۆف و حەسرەتی دیدارتەوە بژیم!؟.

**٩- گەر لە تاڵیی شەربەتی هیجرت دەپرسی؛ بەو سەرەت**
**خۆزگە دەخوازم هەموو جارێ: بەژەهری مارەوە**

واتە: دڵبەرەکەم! ئەگەر هەواڵی شپرزەیی و ژیانی تاڵ و ناخۆشم لە تاو دووری و دابڕانت دەپرسیت، سوێند بەسەری خۆت دەخۆم، کە وام لێ هاتووە و ژیانم ئەوەندە لێ تاڵ بووە، ئاوات بەوە دەخوازم مارێکی ژەهر کوشندە، پێمەوە بدات؛ یان بۆ خۆ ڕزگارکردن لەم ژیانە تاڵە، ژەهری مار بخۆم و دوایی بەم بارەم بهێنم.



**١٠- ئەی «ئەدەب»، ئێستا لە هیجران، ناڵە بێ وەجهە لە لام**
**هەر دەبوو ئەووەڵ نەچووبایتایە ژێر ئەم بارەوە**

ناڵە بێ وەجهە: داد و هاوار و گازەندە؛ کەڵکێکی نابێ.

واتە: کار لە کار ترازاوە و تازە چارەی هیچ ناکرێ و هەر دەبێ بەرگە بگریت؛ چونکە هەر لە سەرەتاوە دەبووایە بزانیت کە ئەویندارییی، دووری و دابڕانیشی تێدایە و دەبێ ئەم ئازارە سەختە بچێژیت. یان دەبوو هەر لە سەرەتاوە توخنی کاری ئەوین نەکەویت.

کێش: بەحری هەزەجی مەقبووز (مفاعلن مفاعلن مفاعلن مفاعلن)، وەک نموونەی:

١- پەردە کـو رابتن ژ بەر عـارزێ دڵسـتـانە خـۆش
دل ژ غـەمـان کـو بێـتـە دەر، بلبلێ گولسـتـانە خوش
«خانی»

٢- ئەحوەلی تەفرەقە نەزەر، تەقـوییەتی سـەبەب دەکا
عـارفی وەحـدەت ئاشنا، لەم قسـەیە ئەدەب دەکـا
«نالی، ٩٧»

٣- عـەرەق نییـە لە عـالەمـا، کـە لابەرێ لە دڵ غـەمـا
بەغەیری قـەترە عارەقێ، کە لە ڕووی دێتە خوارەوە
«زێوەر، »

سەرنج: وەک دیارە ئەم پێنج خشتەکییەی «ئەدەب» لە کارە سەرەتاییەکانی تەمەنی شیعر نووسینێتی، بۆیە ئەوەندەی سەلیقەی لە سنعەتسازیی بەکارهێنانی واژە و زاراوەی فارسی و عەرەبیدا نواندووە، ئەوەندە سەلیقەی شاعیرانە و وێنەی شیعریی و خەیاڵی بڵاوی شاعیرانەی (لە چاو غەزەلەکانی تریدا) نەنواندووە. لەبەرئەوە لە خێراترین سەرنجدا لەم (١٣) بەندە، هەست دەکەین زۆرترینی ئەو واژە و زاراوە فارسی و (بەتایبەتیش) عەرەبییانەی لێرەدا چڕی کردوونەتەوە، بارتەقای زۆربنەی ئەو واژە و زاراوە بیانییانە دەبن، کە لە سەرومڕی غەزەلەکانی تریدا بەکاری هێناون. هەر لەبەرئەمەشە لە ڕاڤەکردنی ئەم پێنج خشتەکییەدا، ئەوەندە لە باری (قاموس)یەوە پەنا بۆ لێکدانەوەی ئەو واژە و زاراوانە دەبەین؛ ئەوەندە پەنا و دەرەتانی لێکدانەوەی مانای شیعریی و خەیاڵی شاعیرانەمان لە بەردەمدا، تەسک و بەرتەنگە. بۆیە هەست دەکەم لێکدانەوەی ئەم (١٣) بەندە، دەبێتە کارێکی دووبارەی مانای لێکدانەوەی هەمان واژەگەلی غەزەلەکانی پێشووتری «ئەدەب» و لەم ڕوانگەیەوە لێکدانەوەی ئەم پێنج خشتەکییەم بەپێویست نەزانی. بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئەو واژانەی لەم (١٣) بەندەدا، پێشتر بەر لێکدانەوە نەکەوتبن، لە لیستی فەرهەنگیی شیعریی تایبەتی ئەم کتێبەدا دەبن.





کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن) وەک نموونەی:

١- ڕۆژی کـردە پەردەوە، باقڵ لە باخـەڵ مـانگی کـرد
بۆیە وا وەقـتی زەفـافی ئەکـشـەری بووکـانە شـەو
«حەمدی، ٧٧»

**سەرنج:** ئەم غەزەلە، جگە لە (ئا)، لە دەقەکانی تری دەستنووس و دیوانە چاپکراوەکانی «ئەدەب» هەبوو. بەڵام بەهەڵە و کەمێک جیاوازییەوە (کە نازانم بۆچی!) لە دیوانی «تاهیر بەگی جاف»، لاپەڕە «١٨»دا هەبوو. پێم سەیرە ئامادەکارانی پێشووتری ئەو چەند جارەی دیوانی «ئەدەب»، چۆن هەستیان بەمە نەکردووە.

جیاوازییەکانی ئەم غەزەلە، لای تاهیر بەگ و ئەدەب و دەقەکانی تردا ئەمانەن:

١- لای ئەدەب «٧» بەیتە.

٢- لای تاهیر بەگ (٦) بەیتە.

٣- لای تاهیر بەگ، بەپێچەوانەی غەزەلەکانی تریەوە، نازناوی خۆی لە دوایین بەیتدا نەنووسیوە.

٤- لە «گم»دا، (دیسانەوە بەهەڵە) لە جێگەی بەیتی پێنجەم، بەیتێکی «حەریق» تێکەڵ ئەم غەزەلە کراوە، کە ئەمەیە:

دڵ ئەوا کـەوتۆتە زیندانی خـەمت، قـوربانـتم
تایەکی زوڵفت بنێـرە، بەڵـکو بۆم دەربێـتـەوە

ئەم بەیتە لە دیوانی «حەریق»، لاپەڕە «٥٧»دا، لە دوو توێی غەزەلێکدا چاپکراوە، کە سەرەتاکەی بەم بەیتە دەست پێ دەکات:

چاوەڕێی مژدەی نەسیمم تا لە گوڵشـەن دێتەوە
بەڵـکو فـەرمـایش بکا گـوڵ؛ بلبلم بـابێـتـەوە
«٥٥»

***

**١- دڵ لە حەسرەت غەمزەکەی دوو نێرگسی پڕ خەوتەوە**
**وەک خەمی زوڵفت عەزیزم، چوو بەڕووداو کەوتەوە**

واتە: وەک چۆن تاڵی زوڵفەکانت، بۆ پێشەوەی سەرت هاتوون و لەسەر ڕوخسارتدا چەمیونەتەوە، دڵی منیش هەر بەوجۆرە، لە حەسرەتی سەیرکردنی چاوە نێرگسی و خەواڵووەکانی تۆوە، بەپەرۆشەوە بەرەو ڕووت هاتم، بەڵام کە ڕوخسارە ڕووناکەکەتم دی، چاوم بڕی نەکرد و هەڵەنگوتم و دەمەوڕوو لێی کەوتم.

**٢- تفڵی دڵ چونکێ گرووی قەندی لەبی تۆی گرتبوو**
**دوێ شەوێ تا ڕۆژ هەدادانی نەبوو، نەسرەوتەوە**

تفڵ: هەر (طفل)ی عەرەبییە و کورد وای بەسەر هێناوە و بەمانای کۆرپە و منداڵە.

گروو: بیانووی گریاناوی.

هەدادان: ئارام گرتن، ئۆقرە گرتن، سوکنایی هاتن، پشوودان. ئەم واژەیە و واژەی پێشووتری هەمان ئەم بەیتە: «گرو»، بەدڵنیاییەوە لەو واژە ڕەسەن و کوردییە پەتییانەی ناوچەی موکریانن، کە هەر چاوی تیژ و هونەری شاعیرانەی «ئەدەب» دەیاندۆزێتەوە و بەم شیرینییە بەکاریان دەهێنێ. ئەمانەش بەڵگە و پشتیوانیی ئەو بۆچوونەمان پتەوتر دەکەن، کە وەک وتمان ئەم غەزەلەی «ئەدەب»، چۆن لەم ماوەی «٥٠» ساڵەی ڕابووردوودا لە دیوانی «تاهیر بەگی جاف»دا چاپکراوە و ڕەخنەگر و لێکۆڵەری کورد، نایبینێ!؟ لە کاتێکدا هەموو ناوچەی «شارەزوور» و دیوانی شیعری «تاهیر بەگ»، دوو واژەی وەک: «هەدادان» و «گرو»ی نییە.

واتە: چونکە کۆرپەی دڵم بیانووی لە شەکری لێوی تۆی گرتبوو، دوێنێ شەو، تا بەرەبەیان، ئارام و ئۆقرەی لێ بڕا بوو، بێ پشوو هەر دەگریا و داوای شەکری لێوتی دەکرد.

لە فۆلکلۆری کوردیدا هاتووە:

کۆرپەی دڵەکەی من، بۆم نانوێ شەوێ
گرووی لێ گرتووم، باوەشتی دەوێ



**٣- مەصحەفی خۆشخەتی کوڵمەت، گەر ببینێ شێخی مە**
**کافرە؛ گەر بۆ سوێندیش بچێتە ناو مزگەوتەوە**

مەصحەف: قورئان.

خۆشخەت: خەتی جوان و خۆش.

شێخی مە: شێخی مە و ڕابەری ئایینی ئێمە.

واتە: ئەگەر شێخەکەی ئێمە، کە زۆر پابەندی ئایین و قورئانە، ئەگەر لە دەرفەتێکدا کوڵمەکانی تۆی بەرچاو بکەوێ، ئیتر تێدەگات کە کوڵمەکانت وەک لاپەڕەکانی «قورئان» پیرۆز و درەوشاوەن و باوەڕ دێنێ، کە کوڵمەکانت قورئانێکن، بەخەتێکی زۆر جوان نووسراون و ئیتر لەمەودواش بۆ کاروباری سوێندخواردن و شتی وا، بەقورئان، کاری بەمزگەوت نامێنێ و سوێند بەدرەوشانەوە و پیرۆزیی کوڵمەکانی تۆ دەخوات.

**سەرنج:** واژەی «بچێتە» بۆ سەروای شیعرەکە، کراوە بە: «بچتە».

**٤- مەنعی سووتانم دەکا ئەبلە لە عیشقی تەلعەتت**
**چۆن نەسووتێم ئەو بەئاگر، من بەبارێ نەوتەوە!**

مەنع: ڕێگریی.

ئەبلە: دەبەنگ، نەزان، گەلحۆ.

واتە: خەڵکی نەزان و دەبەنگ، ڕێگریی ئەوەم لێ دەکەن، کە خۆم نەخەمە بڵێسەی ئەوینی تۆوە. بەڵام وا دیارە ئەو نەزانانە بێ ئاگان لەوەی، کە ئەگەرچی ئەوینی دڵبەر، ئاگراوییە، ئاخر منیش وەک نەوت وام و حەز بەسووتان دەکەم و وا هەست دەکەم هەمیشە بارێک نەوتم لەسەر شانە و دەبێ تا زووە ئاگری پێ خۆش بکەم.

**٦- ماچی کوڵمەت قووتە بۆ مە، کونجی لەب: چەشمەی حەیات**
**هەر حەیاتێ بۆ مە بێ، یا لەمەوە، یا لەوتەوە**

قووت: خۆراک.

گەنجی لەب: سامانی لێو (کە لێرەدا مەبەست لە ماچی لێوە).

ئاوی حەیات: ئاوی ژیانی هەتا هەتایی.

واتە: ماچی کوڵمەکانت بۆ ئێمە، وەک خۆراکی ڕۆژانەیە و کەسیش بەبێ خۆراک ناژی.

ماچی لێوەکانیشت، ژیانی هەر مانمان پێ دەبەخشێ. کەواتە: کولمەکانت، یان: لێوەکانت؛ هەر کامێکیان ڕێگەمان بدەیت ماچیان بکەین، جۆرێک لە ژیانمان پێ دەبەخشێت؛ یان ژیانی ئاسایی وەک سەرلەبەری خەڵک؛ یان: ژیانێکی هەمیشەیی و هەتا هەتایی. سا ئیتر کامیانمان پێ دەبەخشیت، هەر باشە.

«مەحوی» دەڵێ:

خضر ئەگەر چاوی حەیاتی برییە ئاوی حەیات
من لە خاکی دەری جانانەمە، هەر چاوی حەیات
«٦٣»

**٧- نیسبەتی زوڵفت لەگەڵ حەڵقەی زرێ نابێ بدەن**
**لەحنی داوودیی چ دەخڵێکی بەدەنگ و سەوتەوە!**

نسیبەت: بەراورد.

لەحنی داوودی: ئاوازی داوودی، جۆرە ئاوازێکی مۆسیقاییییە و دراوەتە پاڵ حەزرەتی داوود پێغەمبەر، کە بەدەنگخۆشێکی باڵا بەناوبانگ بووە.

دەخڵ: لێرەدا بەمانای پێوەندی و سەروکار-ەوەیە.

سەوت: دەنگ.

واتە: نابێ ئەڵقەی زرێ و ئەڵقەی زوڵفت، لەگەڵ یەکدا بەراورد بکرێن. چونکە ئەگەرچی ئەڵقەی زوڵفەکانت، دەبنە مایەی ڕاوکردنی ئەوانەی دەیانەوێ لە زوڵف و ڕووت نزیک ببنەوە؛ هەروەک چۆن کاری «زرێ»ش کاری ئەوەیە: پارێزەری لە خاوەنی زرێیەکە بکات. بەڵام ئەم بەراوردە هەڵەیە، وەک بەراوردکردنی «ئاوازی داوودی»یە، لەگەڵ «دەنگ»دا؛ لە کاتێکدا ئاوازی گۆرانی، هیچ پێوەندییەکی بەدەنگەوە نییە. چونکە ئەو ئاوازە، هەموو کەسێک دەتوانێ بە«دەنگ» بیچڕێ و تەنیا ئەو کەسە تیایدا ناوبانگ پەیدا دەکات کە بەدەنگی زۆر خۆش بەراورد بکرێ؛ چونکە زوڵف و ڕووی دڵبەرم بێ وێنەن و نموونەیان لە شتی تردا نییە.



**٨- گەر دەڵێ ئەمڕۆ قسەت بۆ هێندە شیرینە «ئەدەب»**
**شەککەر ئەفشانە لەبم، جانا لە ماچی شەوتەوە**

شەکەر ئەفشان: شەکر پژێنە.

واتە: هەر کەسێک پێم بڵێ: ئەی ئەدەب، بۆچی ئەمڕۆ قسەت ئەوەندە شیرین و خۆشە!؟. لە وەڵامدا دەڵێم: گیانەکەم هەر لە دوای ئەوەوە، کە ئەمشەو ماچم کردیت، ئیتر لێوەکانم شەکریان لێ دەبارێ و شەکر بەدەوری خۆیاندا دەپرژێنن.

«مەحوی» دەڵێ:

هەتا ئەو ناوە پاکەم کردە زیکر و فیکری ڕۆژ و شەو
هەناسەم بۆنی میسکی گرتووە، لێوم شەکەربارە
«٤٦٦»

١١٢

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)، وەک نموونەی:

١- جەورێ هندێ دێ کشینت هەر کەسێ طاوس دڤێت
گەوهەر و دورا یەتیم بێ تەرکێ سەر تێتن طەلەب
«مەلای جزیری، ٧٧»

٢- بوومی وێرانە بەڕۆژ و سەگی ئەو کۆیە بەشەو
هەردووکی خزمی یەکن «حاجی» بەبێ خزم و کەسە
«حاجی قادر، ١١٤»

٣- سەرو و نەی چین، کە لەگەڵ قامەتی تۆ بێنە نەبەرد
شەکەری خواردووە: نەی، سەرو: سەری داوە لە بەرد
«شێخ ڕەزا، ٤٦»

**١- شۆخەکەم دیسان دیارە جیلوەیی نازی هەیە**
**چیهری ڕەنگین، مووی مشکین، حوسنی مومتازی هەیە**

جیلوە: درەوشانەوە.
چیهری ڕەنگین: ڕوخساری ئاڵ و واڵا و هەمەڕەنگ.
مووی مشکین: قژی ڕەش و بۆن خۆش.
حوسنی مومتاز: جوانییەکی نایاب و تایبەتی.

واتە: دڵبەرە شۆخ و شەنگەکەم، وا سەرلەنوێ کەوتەوە خۆنواندن و درەوشانەوە و نازکردن؛ چونکە دەزانێ هەر خۆی خاوەنی ڕوخساری ئاڵ و واڵا و ڕەنگین و قژی ڕەش و جوانییەکی تایبەت و بێ وێنەیە.

**٢- لەنجەیی تاوس و خەتتی کەبک و پەروازی شەهێن**
**سەوتی بولبول، خاڵی قومری، چەشمی شەهبازی هەیە**

خەتی کەبک: خاڵ و مێڵی کەو.
پەروازی شەهێن: فڕینی وەک شەهێن.



سەوتی بلبل: دەنگی وەک بلبل.
چەشمی شەهباز: چاوی شاباز.

واتە: جوانییەکانی یار، وەک ئەو جوانییانەن، کە هەندێ باڵندەی جوان، ناویان پێ دەرکردووە؛ وەک لەنجەولار و نیسکەی تاووس؛ کە «ئەدەب» هەر لە سەرەتای ئەم غەزەلەوە، ڕوخساری دڵبەرەکەی بەڕوخساری هەمەڕەنگەی وەک ڕەنگە تێکەڵەکانی تاووس و دەنگی بلبل و خەت و خاڵی قومری و چاوی شاباز و خەتی گەردنی کەو چوواندووە و جیلوە و نازی یارەکەیشی وەک فڕین و باڵگرتنی شەهێن بەرجەستە کردووە؛ بەوەی کە ئافرەتی شۆخ و شەنگ، لە کاتی ڕەوت و ڕۆیشتنیدا؛ کە جیلوە و نازیشی تێکەڵ دەکات، وێنە و دیمەنێکی وەک نیمچە بەرزبوونەوە لەسەر زەوی و وەک فڕین هێناوەتە پێش چاو؛ تا بتوانێ ڕادەی هەستی خۆیان، لە چێژ وەرگرتنی دیمەنی ڕەوت و ڕۆیشتنی یارەکەی، لە هەست و خەیاڵ و چاوی ئێمەی خوێنەریشدا بەرجەستە بکات، کە «گۆران»ی شاعیر، هەمان ئەمجۆرە ڕێکردن و ڕۆیشتنە جوان و پڕ نازەی ئافرەتی شۆخ و شەنگی لە شیعری «ڕەوتێکی جوان»دا، بەڕۆیشتن و ڕەوتی باڵندەی وەک کۆتر و قاز و مراوی و پۆڕ و شنەی بای شەوان و لەرینەوەی پڕشنگ و خوڕەی ئاو، بەمجۆرە چوواندووە:

یا: پۆڕ، لە گوێ ڕێگای دەشتا
لە ژێر سایەقەی پاش وەشتا
چەند ورد و جوان، بەلەنجەولار
ئەشێلێ سەوزە گیای بەهار
یا: کۆتری حەوشی مزگەوت
چەند خنجیلانەی لێ دێت: ڕەوت
ئەوەندە جوان؛ لەوە جوانتر
لە: شنەی بای شەو ڕەوانتر
لە: لەرەی پرشنگ، ئاوازە
لە: خوڕەی ئاو، شیعری تازە
بەئاهەنگتر، بەخرۆشتر
بەگوێچکەی دڵ دەنگی خۆشتر

پێی ناز ئەنێ بەســــــەر ئەرزا
جـــــــوانێ؛ لە بەژنێکی بەرزا
«١١»

**٤- وەک دوو لەعلی شەکەرئامێزی؛ کە لێوی پێ دەڵێن**
**حاشا لیللا، گەر لە مەعدەن، میثل و ئەنبازی هەیە**

ئەنباز: هاوتا، هاوشان.

واتە: ئەو شتەی کە وەک دوو لەعلی کانگای شەکرە و پێی دەڵێن: لێو؛ ئۆباڵ بەئەستۆم، نموونە و وێنەی لە هیچ مەعدەنێکدا نییە.

**٥- عەسکەری موژگانی، ئێرانی موسەخخەر کردووە**
**وەک ئەمن بیستوومە ئێستا؛ مەیلی قەفقازی هەیە**

موسەخخەر: داگیرکردن.

واتە: لەشکری مژۆڵەکانی یار، سەرتاسەری وڵاتی ئێرانی داگیر کردووە و وەک بیستووشمە: ئێستا نیازی هێرش بۆ سەر قەفقاز و گرتن و داگیرکردنی ئەوێشی هەیە.

**٦- هەر کەسێ رووی ئەو بتی زیبایی دیبێ، تێدەگا**
**«تبت» و «فەرخار» و «کەشمیر» شۆخی تەنن‌ازی هەیە**

بتی زیبا: بتی جوان.

تبت: شارێک بووە لە وڵاتی «چین»، لە نزیک «خەتا» و بەناوبانگ بووە بەوەی کە «مسک»ی باش و زۆری تێدا بووە. (دهخدا، بەرگی ٤، ل ٦٣٥٢).

فەرخار: ناوی شارێکە لە تورکستان و بەناوبانگیشە لە ئافرەتی جواندا (دهخدا، بەرگی ١١، ل ١٧٠٤٤).

کشمیر: هەرێمێکە لە هیندستان و کەوتۆتە دامێنی چیاکانی هیمالایەوە (دهخدا، بەرگی ١٢، ل ١٨٣٧٤).

شۆخی تەنناز (طناز: عەرەبی): کچی شەنگ و شۆخی پڕ لە توانج.

واتە: هەر کەسێک ڕوخساری ئەو کچە وەک بت و جوانەی دیبێ، بۆی دەردەکەوێ کە: تبت و فەرخار و کشمیر، کچی جوان و شۆخ و شەنگ و پڕ توانج و پلاریان هەیە.



**٧- ماه و میهرە، زوڵف و چیهرە، یانە سیحرێکی موبین؟**
**یا وەکو مووسا یەدی بەیضا و و ئیعجازی هەیە؟**

ماه: مانگ.

میهر: خۆر، هەتاو.

سیحری موبین: سیحر و جادووی ئاشکرا و ڕوون.

واتە: ئەرێ زوڵفی ئەو کچە، هەر بەڕاستی زوڵفە، یان شەوە؟! ئەی ڕوخساری ئەو کچە (یار)، مانگە؛ یان: هەتاو؟! یان: سیحر و جادوویەکی ئاشکرا و ڕوون؟! یان: وەکو حەزرەتی مووسا، خاوەنی مەچەکی سپی و دەرخستنی موعجیزەیە؟!.

**٨- گەر دەپرسی: دڵ بەتەنهایی لە دووریت چۆن دەژی؟**
**شەو هەموو شەو، یاری وەک خەم، مەحرەمی ڕازی هەیە**

واتە: گیانەکەم! ئەگەر پرسیاری ئەوەم لێ دەکەیت، کە دڵم لە کاتی دووری تۆدا، چۆن چۆنی بەتەنیا دەژی!؟ لە وەڵامدا دەڵێم: هەموو شەوانێک، تا بەرەبەیان، هاوڕێ و هاودەمی ترم زۆر پەیدا کردوون، کە هەموویان ناویان «خەم» و هەموویان بوونەتە هاوڕێی ڕۆحم و لەگەڵیاندا ڕاز و نهێنیی دڵمیان بۆ باس دەکەم و ئەوانیش بەبێ من هەڵناکەن و خوویان بەوەوە گرتووە، تا دڵیان حەز دەکات، هەر باسی خەمی دوور و تەنیایی تۆیان بۆ باس بکەم و بەمەش هاوخەمیی یەکتر دەکەین.

«نالی» دەڵێ:

غەم دەڵێ: «نالی»، کە غەمخوارییم نەکا
ناعــــیــــلاجم من بەنی ئادەم دەخـــۆم
«٢٩٨»

**٩- عاشق و مەعشووقە زۆرن، ئەی ڕەفیقان حەق بڵێن**
**کێ وەکو گوڵ، یاری وەک من؛ نوکتە پەردازی هەیە؟**

نوکتە پەرداز: خاوەن قسەی شاعیرانە و جوان.

واتە: جووتە دڵداران لە دنیادا زۆر هەن و ئەمە شتێکی سەیر نییە؛ بەڵام ئەی هاوڕێیان ئێوە ڕاستیی بڵێن؛ کێ یاری وەک یاری منی هەیە؛ کە هەر لە گوڵ دەچێ، کەچی ئاخاوتنی پڕە لە قسەی شاعیرانە و جوان.

**١٠- ئەی «ئەدەب» هەرچەندە شیعرت کوردییە، ئەمما بەمن**
**شیعری تۆ، سەبکی کەلامی شێخی شیرازی هەیە**

سەبک: دارشتن؛ شێوازی دارِشتن.

شێخی شیراز: مەبەست لە شاعیری گەورە و ناوداری ئێرانی: «خواجە شەمسەدین محەمەد»ە، کە پێش ساڵی (١٣٢٠ز - ٧٠٠ھ) هاتۆتە دنیا و لە (٧٩١، یان ٧٩٢ھ)دا، کۆچی دوایی کردووە. هەرچەندە شاعیری گەورەش: «سەعدی - شێخ موشریف کوڕی موسلیح» کە بە«سەعدی شیرازی» ناسراوە و لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی کۆچی - سەرەتای سەدەی سیازدەی زایینیدا لە دایک بووە و لە ساڵی (٦٩١ھ - ١٢٩١ز)دا، لە شیراز کۆچی دوایی کردووە. بەڵام «ئەدەب» مەبەستی لێرەدا «حافظ»ە، چونکە شیعری «سەعدی» زۆرتر پەند و ئامۆژگاریی ئامێزن و شیعری «حافظ»یش سەرلەبەری، هەر باسی ئەوینی قووڵ و بێ سنوورە.

واتە: ئەی «ئەدەب»، ئەگەرچی شیعرەکانی تۆ، بەزمانی کوردین؛ بەڵام لە هەمان کاتیشدا، شێوەی دارِشتن و هەڵچنینیان، لە شێواز و شێوەی دارِشتنی شیعری «حافظ»ی شیرازی دەچێ.

وەک دیارە «ئەدەب» لەم غەزەلەیشیدا، جگە لەوەی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە «ئەدەب» بەهوشیارییەکی زۆرەوە، شیعر بەزمانی کوردی دەڵێ؛ بەڵام لە هەمان کاتیشدا نوارینێکی لێکۆڵەرەوانە و ڕەخنەگرانەشە بەشێوازی شیعری خۆیدا، کە ئاستی شیعر و شاعیرێتی خۆی، بۆ ئاستی شاعیرێکی زۆر بەناوبانگ و مەزنی وەک «حافظ» دەبا.





کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)، وەک نموونەی:

١- هەر مەجالێ ئەو د جەنگێ بێت و ڕەت هەر جارەکی
ڕاست و چەپ دێ بێختن سەد سەد ب مزراق و قەصەب
«مەلای جزیری، ٧٢»

٢- لەحظەیێک و لەمحەیێک چاوم بەچاوی ناکەوێ
کێ دەڵێ وەحشی غەزالە، مەیلی ئینسانی هەیە؟!
«نالی، ٥٧٦»

٣- تا بەسەر باخی دڵا بێ: بای خەزانی فیرقەتت
عارضم بۆ سێوی ڕوخسارت، لە ڕەنگی بەی دەکا
«سالم، ٢٩»

**١- نامرێ هەر کەس کە یارێکی وەفاداری هەیە**
**هەر سەحەرگاهان صبوحی جامی سەرشاری هەیە**

سەحەرگاهان: بەربەیانان، کازیوە.

سەبووحی: ئەو خۆراکەی لە بەرەبەیاناندا بەناشتا دەخورێ، کە لێرەدا مەبەستی (مەی)یە.

سەرشار: پڕاوپڕ، لێواولێو.

واتە: سەلا لەو کەسەی کە یارەکەی ئەوەندە بەوەفایە؛ شەو تا بەربەیانی لەگەڵیدا دەمێنێتەوە و جێی ناهێڵێ و لە بەرەبەیانیشدا پیاڵەیەکی پڕی لە بادە هەیە.

**٢- هەر کەسێ عومری دەگەڵ شەککەر لەبێکی ڕانەبوورد**
**ئەلحەق ئەو شەخسە، عەجەب ڕەنجێکی دشواری هەیە**

دشوار: دژوار، سەخت، نالەبار.

واتە: هەر کەسێک ئەگەر تەمەنێکی لەگەڵ یارێکی لێو شەکریندا بەسەر نەبردبێ، بێ گومان ئەو کەسە وەک ئەوە وایە هەر بەژیانەوە ماندوو بووبێ و هیچ چێژێکی لە تەمەنی خۆی کام نەکردووە.

**٣- زیللەتی دنیـا وەیە: خـەمـخـوارە یارێکت نەبێ**
**بەختی بێدار ئەو کەسە: دڵداری خەمخواری هەیە**

زیللەت: ناخۆشیی و دەردەسەریی.

واتە: دەردەسەریی ئەم دنیایە لەوەدایە، کە دنیایەکی یەکجار وشک و بێ تام و دژوارە، بۆیە ئەگەر بۆ تێپەڕاندنی ئەو دەردەسەرییە تەقەڵلا نەدەیت، دەردەسەرییەکانت لەگەڵ هاوخەمێکدا بەسەر نەبەیت، ئەوە ئەوەندەی تر ڕۆژگارت بەسەختیی لێ تێپەڕ دەبێ. بەڵام هەر کەسێک توانی دڵدارێکی خەمخۆری هەبێ، ئەوا بەختەوەرە و ژیانێکی خۆشتر لەوانیتر بەسەر دەبات.

**٤- عیشق و ویژدان؛ عالەمێکە، غەیری ئەو دوو عالەمە**
**بێخەبەر هەر ئەو دەوابەی، بەند و هەوساری هەیە**

دەواب: ئاژەڵ.

واتە: ئەوین و ویژدان، هەریەکەیان جیهانێکن و بەهەردووکیان جیهانێکی هوشیاریی و چێژ وەرگرتن لە دنیا پێکدێن، خۆ ئەگەر کەسێک لەو دوو جیهانەی ئەوین و ویژدان، بێ بەش و دابڕاو بێ، ئەوە ئیتر هیچ تامێک لە خۆشییەکانی ئەم دنیایە وەرناگرێ و وەک گیانلەبەرێکی بێ هەست و خوست دەژی و دروست لەو ئاژەڵە دەچێ، کە گوریس و هەوساری لە مل دەکرێ و ئیتر خاوەنەکەی، یان خەڵکانی تر، بۆ هەر جێگەیەکیان بوێت، ڕایدەکێشن و دەیبەن.

**٥- خونچە وا هێشتا دەپەردەیدا نەهاتۆتە دەرێ**
**سەد هەزاران عاشقی وەک بولبولی زاری هەیە**

واتە: خونچە، کە هێشتا لە ناو گەڵاکانیدایە و هێشتا لە ماڵە سەوزەکەیدا نەهاتۆتە دەرێ، کەچی سەد هەزاران ئەویندای وەک بلبلی هەیە، کە چاوەڕێیی هاتنە دەرەوەی دەکەن و بۆ پێشوازیی لە هاتنە دەرەوەکەیشی، بەردەوام گۆرانی بۆ دەڵێن.

**٦- هەر کەسێ وەسڵی بوێ، تاقەت دەبێ بێنێ بەخەم**
**گوڵچنین ناچارییە؛ هەر زەحمەتی خاری هەیە**

واتە: بەڵام ئەو خونچەیە، کە دوایی دەبێ بەگوڵ و کەسانێک حەز لە بۆنی گوڵ دەکەن و حەز دەکەن ئەو گوڵانە بچنن، دەبێ ئەوەشیان لە یاد بێ، کە لەگەڵ ئازارکێشانیشدا دەبێ



ڕابێن؛ چونکە ئەوانەی ئارەزووی گوڵ چنینیان هەیە، دەبێ ئەوەیان لە بیر بێت، کە گوڵ دڕکی هەیە و دەبێ دڕک بەدەست و پێیاندا بچێ. (واتە: دڵداریی، بەبێ کێشە و ماندووبوون ناچێتە سەر).

**٧- شێخی مە دیسان بەزاهیر هاتە سەر وێردی سەحەر**
**ئەی خودا! خۆت عالم و ئاگات لە کرداری هەیە**

شێخی مە: ڕابەر و نوێنەری ئایینی ئێمە.

بەزاهیر: بەڕواڵەت.

وێردی سەحەر: ویرد و دوعای سەرلەبەیانان.

واتە: وا دیسانەوە ڕابەری ئایینی ئێمە، کە بەڕواڵەت پابەندی ئایینە؛ دەستی بەویرد و دوعا خوێندنی سەرلەبەیانیان کردەوە. بەڵام خوا، کە خۆی ئاگای لە هەموو شتێکە، ئاگاداری ئەم شێخە درۆزنەشە، کە کار و کردەوەی چۆن چۆنی هەیە.

**٨- موددەعی، فەخری بەگەنج و گەوهەرە و من: گەنجی طەبع**
**پیاوی دانا تێدەگا: کێ گەنجی زەخخاری هەیە**

موددەعی: نەیار، ڕەخنەگری نادۆست.

گەنجی طەبع: سامانی شیعر.

زەخخار: ئەو کەسەی سامان و دارایی کۆ دەکاتەوە.

واتە: نەیارانی من (یان ئەوانەی ڕەخنەم لێ دەگرن) شانازیی بەوەوە دەکەن، کە سامانێکی زۆری زێڕ و گەوهەر و خشڵیان هەیە و منیش سامانم هەمووی هەر شیعرە. لەم بەراوردەشماندا، پیاوی هۆشیار دەزانی من و نەیاران و ڕەخنەگرانم، کامیان زەخیرەی بەکەڵکمان هەیە!. یان: کامیان سامانەکەمان دەژی و نەمرە!؟.

**٩- دەفتەری فەزڵ و هونەر، باوی نەما لەم عەهدەدا**
**فازڵ ئەو نادانەیە؛ ئەمڕۆکە دیناری هەیە**

واتە: لەم سەردەمەدا هونەر و زانین باوی نەماوە، وا دیارە خەڵکی هەر خەریکی کۆکردنەوەی سامانن، بۆیە وای لێ هاتووە هونەرمەند و بەهرەمەند، ئەو کەسەیە کە سامان و ماڵ و موڵک و پارەی زۆری هەیە.

**١٠- با نەکا قیمەت، «ئەدەب» لەم عەسرەدا؛ کاڵای هونەر**

**هەر چلۆنێ بێ مەتاعی؛ ئەو خەریداری هەیە**

واتە: بەڵام قەیناکە، ئەی «ئەدەب» گوێی مەدەرێ و با کەلوپەلی هونەر و بابەتی هونەریی، پارە نەکەن و نرخیان نەمێنێ، چونکە شتومەک و کەرەسە و بابەتی هونەریی تۆ، چونکە لە ئاستێکی بەرزدایە، لە هەموو ڕۆژگارێکدا، نرخی گران دەهێنێ و کڕیاری تایبەتی خۆی هەیە.

وەک دیارە «ئەدەب» ئازارێکی زۆری بەم ئاستی دواکەوتوویی خەڵکی نیشتمانەکەیەوە چەشتووە و لە نموونەگەلێکی زۆری شیعر و بەیتە شیعریدا، ئەم هەستەی دەربڕیوە:

بەعەدەز لەئیم: سیم و زەڕە، یادگار و بەس
بەعەدەز مە، یادگاری ئەمەش: ئەم قسانەیە
ساحێب هونەر: لە زاویە و بێ هونەر: بەکار
چبکەم خودا! لە کەچ نەظەریی ئەو زەمانەیە!
جەوری زەمانە خۆشە، «ئەدەب»! تەعنە لێ گەڕێ
تیری جگەر، مەلامەتی ئەو: ناکەسانەیە
«کۆتایی غەزەلی ١١٥»

«حەریق» دەڵێ:

بازاڕی جەهل؛ گەرم و هونەر: ساردە ڕەواجی
عەسری خەزەفە، حەیفە گەوهەر بێنییە مەیدان
«٤٧»

(وەک دیارە «ئەدەب» لەم غەزەلەشدا، بەشانازیی و سەربەرزییەوە، داکۆکی لە بەرهەمی شیعریی خۆی دەکات و خۆی بەشاعیری باڵا و هەموو سەردەمێکیش دەزانێ).



### ١١٤

کێش: بەحری موزاریع موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف (مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن)، وەک نموونەی:

١- سەر: بەردەبازی ڕێتە، تەن: تەختەبەندی جێتە
دڵ: مەیلی خاکی پێتە، ڕۆح: ماڵی خۆتە، بیبە
«نالی، ٣٩٥»

٢- تیماری چاکی سینەم؛ راجیع بەچاوی مەستە
بەختیش موافیقی عیشق، بۆ من خراپی هێنا
«سالم، ٣٥»

٣- مەعلوومە بۆچی «حاجی»، مەدحت دەکا بەکوردی
تا کەس نەڵێ: بەکوردی، نەکراوە مەدحی باری
«حاجی قادر، ١٤٤»

**١- لەو دەم بەباغی ناز، گوڵی مە ڕەسیدەیە**

**جامەی شکۆهی خونچە دەهانان دڕیدەیە**

باغی ناز: مەبەست لەو باغەیە، کە «ئەدەب» هەر لە «ناز»ی یارەکەی ئەم غەزەلەی لێ دروست کردووە و لەو باغەدا ئەم کەشوهەوا ڕەنگین و شاعیرانەیەی سازاندووە، کە باخێک لە «ناز»ی یارەکەی دروست بکات و ئەم هەموو گوڵ و درەختە و جوانییەی تێدا هەبن.

ڕەسیدە: پێگەییوو.

جامە: کراس.

شکۆه: عیززەت و مەزنایەتی.

دەهان (کۆی دەهەن): زار، دەم.

دڕیدە: دڕاو، دادڕاو.

واتە: لەو ساتەوەی یاری من، باغێکی لە ناز-ی دروست کردووە، ئیتر دەبێ گوڵ پێ بگات و بەوجۆرەش پێ بگات؛ کە لە تەمەنی خونچەییەوە، دەبێ بگاتە تەمەنی بەگوڵ

بوون. لە تەمەنی خونچەییشەوە، کە هێشتا خونچەیە و گەڵای سەوز داپۆشیوە و ئەو گەڵایەی وەک کراسێک، بۆ داپۆشینی حەیا و عیززەت لەبەر کردووە، دەبێ ئەو خونچەیە، هەرکە «ناز»ی یاری من دەبینێ، ئیتر بەتەنگ عیززەت و حەیاوە نەبێ و کراسەکەی (گەڵاکانی خونچەکە) لەبەر خۆیدا دابدڕێ و شکۆی خۆیان لە دەست بدەن... بەمانایەکی تر: کە یارم ناز دەکات؛ ئیتر گوڵ و خونچە، نرخێکیان نامێنێ و شکۆیان دەشکێ.

**٢- سەد جارە: سەروو، جیلوەیەکی بێ، لە تەرزی ئەو**
**کوا وەک قەدی سنەوبەری وی، سەرکەشیدەیە!**

لە تەرزی ئەو: وەکو ئەو، لە شێوەی ئەو.

سەرکەشیدە: سەروگەردن هەڵکشاو و هەڵچوو، باڵا بەرز.

واتە: ئەگەر داری سەروو، بیەوێ وەک جیلوەی یارم، خۆی دەرخا و لاسایی بکاتەوە. بەڵام هەرگیز بەژنی، وەک بەژنی یار، بەرز و هەڵکشاو نییە.

«نالی» دەڵێ:

١- نالی مەکە وەسفی تۆ، باریکە نەمامی تۆ
مەعلوومە کە سەرووی تۆ، بێ مێشلە لە دنیایە
«٥٦٣»

٢- بەسەرووم وت: کە ڕاستە سەرکەش و بەرزی، کەچی لەرزی
کە فەرقیشم بگاتە ئاسمان، بەندەی قەدی یارم
«٢٧٣»

**٣- شەو تا سەحەر، لە نێشی سەری زوڵفی؛ حاڵی من**
**وەک حاڵەتی شەوانەی ئەفعی گەزیدەیە**

نێش: پێوەدانی مار و دووپشک.

ئەفعی: مار.

واتە: شەو، تا بەرەبەیانی، لە تاو پێوەدانی سەری زوڵفی یار، بەدڵمەوە؛ حاڵم لە حاڵی شەوانی ئەوانە دەچێ، کە ماران گەستەن.



«نالی» دەڵێ:

تا سەری زوڵفت لەسەر ڕوو حەلقەدا
من، وەکو: ماری سەر ئاگر، خەم دەخۆم
«٢٩٦»

**٤- خاڵی زومورڕودی، کە لەسەر لەعلی لێوییە**
**بۆ: وی کەماڵی حوسن و بەمە: نووری دیدەیە**

زومورڕود: پێشتر وتمان: بەردە پیرۆزەی گرانبەها.

کەماڵی حوسن: ئەوپەڕی جوانیی.

واتە: ئەو خاڵە زومورودینەی کە کەوتۆتە سەر لێوە ئاڵەکەی، لێی بۆتە نەخش و بۆ ئەو، بۆتە مایەی ڕازاندنەوەی و ئەوپەڕی جوانیی و بۆ ئێمەش بۆتە ڕووناکی چاومان.

**٥- داغی قبوولی عیشقی، لە دیداری عاشقان**
**ڕەنگی پەڕیدە، قامەتی چەنگی خەمیدەیە**

داغ: ئەو نیشانەیەی بەکەسێکەوەیە و پێوەی دەناسرێ.

ڕەنگی پەڕیدە: ڕەنگی پەڕیو، ڕەنگ پێ نەماو.

قامەت: بەژن و باڵا.

چەنگی خەمیدە: کۆماوە و گێڕ.

واتە: بۆ ئەوەی کەسێکی عاشق، لە ناو دەستەی عاشقاندا بناسرێتەوە، دەبێ نیشانەیەکی پێوە بێ. سا ئیتر ئەو نیشانەیە مەرج نییە لای هەموو دڵدارێک وەک یەک وابێ؛ بەڵکو هەریەکەیان بەجۆرێک دەبێ؛ کە «ئەدەب» لێرەدا نیشانەکانی عاشق بوونی بەوە داناوە، کە دەبێ ئەو عاشقە، ڕەنگی لە ڕوو بڕا بێ و باڵایشی، لەبەر باری خەمدا، چەمیبێتەوە.

«مەحوی» دەڵێ:

١- هەر دڵێ پێوە نەبێ: داغ و خەتی جێ دەمی تیغ
دەعوەییی عیشقی ببێ؛ دەعوییە بێ مۆر و سەنەد
«١١٢»

٢- لە خەزنەی دڵمدا هەرچی هەیە، هەر داغی سەودایە
دەسا ئەم نەقدە؛ دەردی عیشقی پێ سەودا نەکەم، چبکەم!
«٢٣٠»

«تاهیر بەگ» دەڵێ:

هەر کەسێ هات و وتی: من عاشقم؛ بڕوا مەکە
تا بەپەیکانی موژەی مەحبووبەکەی بیمار نەبێ
«١٦»

**٦- دڵ، گەر بەدامی زوڵفەوە بوو، شەوقی خاڵی بوو**
**دانە نەچیدە، بەستەیی دامێکی چیدەیە**

دام: داو، تەڵە.

دانە نەچیدە: هێشتا دان نەخواردوو.

دامی چیدە: داوی ئامادەکراو بۆ ڕاوکردنی نێچیر.

واتە: دڵم، بەتاسە و حەسرەت و شەوقی خاڵی سەر ڕوومەتی یارەوە، ڕووەو ڕوومەتی چوو، بەڵام نەیزانی ئەو خاڵە، دانەی داوە و هێشتا مەلی دڵم فریای ئەوە نەکەوتبوو دانەکە بخوات، کەچی بەداوێکی تریشەوە بوو. واتە: تاڵەکانی زوڵفی یار، هەمووی کردبوونە حەڵقەی داو.

«نالی» دەڵێ:

١- عاشق دەڵێ: نابێ کە بدا خۆی لە داوم
زوڵفم کە هەموو داوە، هەموو دانەیە خاڵم
«٢٨٧»

٢- حەلقە حەلقەی چ دەکەی داوی کەمەندی زوڵفت
بۆ دڵی خەستە، کەوا بەستەیی هەودایێکە؟!
«٤٦٢»

**٧- تا تێک نەچێ بەبادی سەبا، چینی طوڕەکەی**
**دەرناکەوێ چ خوێنێ دەکا؛ ئەم طەریدەیە**

طەریدە: مانای زۆرە، بەڵام لێرەدا بەمانای: ڕاوکار، نێچیروان دێت.



واتە: تا «با»ی سروە، چینی قژ و کاکۆڵی تێک نەدا، دەرناکەوێ کە ئەم یارە نێچیروانە، لە دوو توێی داوە قژەکانیدا چەندان دڵداری بەداوە قژەکانییەوە بوون و چ تاوان و چەندان خوێنی کردووە.

**٨- جانا! «ئەدەب» خوماری مەیی عیشقە، توخودا**
**جامی لە بالەبێکی، لە بادەی لەبی دەیە**

واتە: ئەی دڵبەرەکەم! «ئەدەب» مەستی مەی نییە، بەڵکو مەستی بادەی عیشقە. بیکە بۆ خاتری خودا، با خومارییەکەم نەڕەوێتەوە و هەر مەستی ئەوینت بم، پیاڵەیەکی تری پڕ پڕم لە بادەی لێوەکانت بدەرێ.

«نالی» دەڵێ:

جێی، دەم، دەمە، جێی لەب: لەبە، ساقی وەرە ئیمشەب
هەم ماچی لەبالەب بدە، هەم جامی لەبالەب
«١٣٣»

«سالم» دەڵێ:

جورعە نۆشیی تۆ بکەم، ئیتر لە بەزمی مەیکەدە
چاوی مەخموورت بەعاشق؛ کاری بادەی مەی دەکا
«٢٩»

«مەحوی» دەڵێ:

با وجوودی لێوی شەککەر باری تۆ
بێ وجوودە نەشئەبەخشینی شەراب
«٤٤»

«وەفایی» دەڵێ:

من وەها زوو مەستی مەی نابم، بەنەشئەی چاوەکەت
مەرگی من؛ ساقی لەگەڵ جامە، لێوت بێنەوە
«١٥٨»

کێش: بەحری هەزەج ئەخرەب موسەممەن مەکفووف مەحزووف (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)، وەک نموونەی:

١- گەر شوبهەتی پەروانە د بەزمێ تە چ سەدگەڕ
سەد نالە هەزار ڕەنگ وەکی چەنگ و ژەهێ من
«مەلای جزیری، ٤٥٦»

٢- سۆزی دڵمە باعیشی تاو و کوڵی گریان
مەعلوومە: کە ئاگر، سەبەبی جۆششی ئاوە
«نالی، ٥٣٧»

٣- یاقووتی لەبت جایزە بەخشینی بەئیسپات
بێتو بەقەدەر خزمەتی من، گەر کەرەمت بێ
«سالم، ١٤٣»

**١- تاکەی صەنەما وەعدە لەگەڵ مە، بەجەفا بێ!**
**جارێ چ دەبێ تالعی مە، وەعدە وەفا بێ!**

واتە: ئەی دڵبەرە وەک بتەکەم! تاکەی لەگەڵ ئێمە، ئەو پەیمانەی لەگەڵمانت کردووە، هەر بەدەردەسەریی و دژواریی و چەوساندنەوەمان بەسەری دەبەیت!؟ ئاخر بەزەییت پێماندا بێتەوە و دڵت پێمان بسووتێ و لە یاد بێن، کە بڕیار و پەیمانێکیشت لەگەڵ ئێمە هەیە و بیر لە ئەنجامدان و پابەندبوونی بکەرەوە.

«نالی» دەڵێ:

مەکە ئیخلافی ئەو وەعدەی کە فەرمووت
دەخیلت بم، کە خانەی سەبرەکەم سووت
«١٤٨»

**٢- بۆ غەمزەیەکت، ئەو دڵی ئێمەت بەگرەو برد**
**جارێکی نەبوو یەک نیگەهت، بۆ مە کلابێ**

گرەو (یان: گروو): بارمتە.



نیگەهت: نیگات.

کلابێ: تیلەی چاو.

واتە: ئەرێ ئەوە بۆچی گیانەکەم، هەرکە دەتەوێ نیگایەکمان تێبکەیت، لەباتی ئەو نیگایە، دڵمان بەبارمتە دەبەیتە لای خۆت!؟ ئەی باشە ناکرێ وەک چۆن تۆ دڵی ئێمە، بەبارمتە لای خۆت دادەنێیت، تۆش نیگایەکی خۆتمان (لەجیاتی ئەوە) بەبارمتە لا دابنێی؟!.

**٣- مەعلوومە کە تۆ پادشەهی و ئێمە گەدای ڕووت**
**شاها! چ دەبێ گەر نەزەرێکت بەگەدا بێ!**

گەدای ڕووت: چەند مانایەک هەڵدەگرێت: گەدای سادە؛ هەژاری سادە و ساکار و بێ ڕووتوش؛ هەژاری ڕوخسارت؛ ئەو هەژارە ڕووت و بێ جلوبەرگەی، پێویستی بەخۆ لە بەرهەتاو هەڵخستنە، وەک ئەم بەیتەی «نالی»:

١- هەرچەندە کە ڕووتم، بەخودا عاشقی ڕووتم
بێ بەرگییە عیللەت، کە هەتیو، مەیلی هەتاوە
«٥٣٤»

٢- لە ڕووت و قووتیی وەک من، ڕوو مەپۆشە
کە وەسڵی تۆیە، قووتی عاشقی ڕووت
«١٤٨»

٣- ڕۆژپەرستی ڕووتە «نالی»، بۆیە دائیم وەک غوڵام
زەرد و گەردن کەچ، لە دەرگات حازرە دەستەونەزەر
«٢٠٣»

شاها: ئەی پادشا و سوڵتانەکەم.

واتە: ئەوە زۆر ئاشکرا و ڕوونە، کە تۆ پاشا و سوڵتانیت و ئێمەش هەژار و دەست و پێ سپی و ڕەعییەتی سادە و ساکار؛ ئەی پاشا و سوڵتانەکەم! خۆ نەریت وایە هەر دەبێ پادشایان چاوی بەزەییان، بەهەژارانی وڵاتی خۆیاندا بخشێنن... یان: تۆ پاشا و سوڵتانی جوانیت و ئێمەش شەیدایانی ڕوخسارت؛ چ دەبێ ئەگەر ڕێگەمان بدەیتێ، تێر سەیری ڕوخسارت بکەین!.

«نالی» دەڵێ:

ئەتۆ: شا، من: گەدا، دادم بپرسە
لە زوڵفی چاوی بیمارت کوژاوم
«٢٩٣»

«کوردی» دەڵێ:

گەدایی کۆیی جانانە، بەشاهی عالەمی نادەم
گەدایی خۆشترە بۆ من، لە شاهیی، گەر موخەییەر بم

«مەحوی» دەڵێ:

مەحاڵە بێتو ئەو: پێ، سەر سەرم نێ
بەتاجی پادشا ناگا: گەدا؛ قەت
«١٥٩»

**٤- حوسنی چییە گوڵزارێ، کە نامەحرەمی بێتێ**
**گوڵشەن ئەوەیە: قەت چ گوڵی لێ نەچنابێ**

حوسن: چاکە.

واتە: کوا ئەوجۆرە گوڵشەن و گوڵزارانە باشن، کە خەڵکی لاوەکییان تێدەچێ؛ بەڵکو گوڵزاری جوان و پارێزراو ئەوەیە، کە خەڵکی بیانی و لاوەکی تێنەچێ. (واتە: ئەو دڵبەرانە بەشکۆن، کە هەر تەنیا یارێک و هەر تەنیا خاوەنێکیان هەیە).

**٥- سەد جار وەنەوشەی بەسەبا بێتە تەمایل**
**حەددی چییە جانا، بەسەری زوڵفی دوو تابێ!**

بەسەبا بێتە تەمایل: بەسروە با بشنێتەوە.

واتە: با گوڵی وەنەوشە، بای سروە و شنەی شەماڵ، سەدان جار شنە شنی پێ بکەن و سەد ئەوەندەی تر، بەو شنە شنە، دیمەنی جوانتر بێ، بەڵام هێشتا ڕایەی ئەوەی نییە ئەوەندەی قژ و زوڵفی تۆ جوان بێ.



«نالی» دەڵێ:

گوڵ هاتە دەرێ، لافی لە حوسنی بتی ما دا
لەرزی قەدی بەرزی، لە ڕقا زوڵفی کە بادا
«٨٣»

«وەفایی» دەڵێ:

کە تۆ هاتی بەگوڵشەندا، لە شەرمی زوڵف و ڕووی تۆ بوون
وەنەوشە و گوڵ سەراسەر غەرقی خوێن، مات و سەرئەفگەندە
«١٢٠»

«مەحوی» دەڵێ:

١- تۆ چوویە باغ و پشتی شکا، حەقیە باغەوان
بازاڕی گوڵ شکاوە، دڵی بلبلی شکا
«٢٠»

٢- غونچە، دەمی لە باسی دەمی تۆوەدا، سەبا
مشتێکی دا لە دەمی، دەم: قسەی زلی شکا
«٢١»

٣- بەغەمزەی نازەوە ئەو سەرووی نازە، کەی چووە گوڵشەن
کە نێرگس وا بووە چاوی سپی، سەرووی بووە تۆپاڵ!
«٢٠٣»

٤- خەندێکی لە غونچەی دەمی تۆ دی کە لە باغا
هەر لەو دەمەوە، لێو و دەمی غونچە لە گۆچوون
«٢٤٥»

**٦- باوەڕ مەکە بیدەم بەهەموو لەززەتی جەننەت**
**سوبحی شەوی هیجرت، کە ویساڵی لە دوا بێ**

واتە: بەهەشت و کامی بەهەشت زۆر خۆشن؛ بەپێچەوانەشەوە شەوی دووریی و دابڕان لە یار، یەکجار ناخۆش و پڕ دەرد و ژانە؛ بەڵام لەگەڵ ئەم ناخۆشیی و دەرد و ژانەی دووریشدا، ئەگەر ئومێدی دیدار و ژووانی لە دوا بێ، ئەو دیدار و ژووانە، بەهەموو

لەززەتی بەهەشت ناگۆڕمەوە.

«وەفایی» دەڵێ:

هەتا ڕۆژی ئەبەد قوربان، لەسەر عەهدی قەدیمی تۆم
بەهەشتم لێ حەرام بێ؛ گەر بەبێ ڕووی تۆی تەمەنناکەم
«٧٧»

**٧- بێ وەجهە موداوای ئەرەستوو لە دڵی زار**
**ئەو ساعید و مشتە نەبووە تیری خەتا بێ**

بێ وەجهە: هیچە، بێ مانایە.

موداوا: دەرمانکردن، چارەی نەخۆشیی کردن.

ساعید: مەچەک.

واتە: دەست و مەچەکی یار، ئەوەندە تیریان کارییە و بەجۆرێک دڵمیان پێکاوە، چارەی زامی دڵی بریندار و زامدارم، بە«ئەرستۆ»ش ناکرێ.

«وەفایی» دەڵێ:

زەڕڕێکی لە سیری دەمی تۆ، مرد و نەزانی
حەیرانی کەمالاتی (فلاطوون) و (ئەرەسطوو)م
«٧٢»

**٨- شێخی مە، کە وەعدەی بەموکافاتی جەزادا**
**بۆچی چ دەبێ، گەر بەموکافاتی جەزا بێ**

شێخی مە: ڕابەری ئایینی ئێمە.

وەعدە: بەڵێن.

موکافاتی جەزا: سزای تاوان.

واتە: ڕابەری ئایینەکەمان، ئێمە بەوە دەترسێنێ کە دوارۆژ سزای گەورە و وا و وامان دەدرێ. ئەرێ ئەی چ دەبێ ئەگەر کارەکە بەپێچەوانەوە بێ! واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەوجۆرە شێخانە سزا بدرێن!.



**٩- واعیز وە نییە قەستی نەسیحەت بە«ئەدەب» بێ**
**هەر عادەیە بەو زۆر وتنە، ماڵی خەرا بێ**

واعیز: ئامۆژگاریکار.

قەست: مەبەست.

نەسیحەت: ئامۆژگاریی.

عادە: خوو.

ماڵی خەرا بێ: ماڵی کاول بێ.

واتە: ئەم ئامۆژگاریکارەی ئێمە، مەبەستی لەم قسانەی بۆ ئەوەی نییە، بەڕاستی «ئەدەب» ئامۆژگاریی بکات، بەڵکو هەروەک خوویەک کردوویەتی بەپیشە و فێری ئەم زۆر وتن و هەڵەوەڕییە بووە، یاخوا ماڵی خۆی کاول بێ.

«نالی» دەڵێ:

ئەی تەلەفی گفتوگۆ، جامیعی کیذب و درۆ
واعیزییە ئیشی تۆ، عاشقییە کاری من
«٣٣٦»

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)، وەک نموونەی:

١- ژ هەر بێ داغ و دەردی مە پورسن محنەتا عیشقی
چ زانن بێ خەبەر ژانا دلێ داغ و کەسەر تیدا
«مەلای جزیری، ٣٧»

٢- نەفەس بگرە لە هاتوچوویی خۆڕایی هەتا ماوی
کە ئەم بایە، هەتا ئێستاکە هەر عومری بەبا داوی
«نالی، ٦٧٩»

٣- ڕەفیقی کونجی میحنەت، عاجزن هەر شەو لە نالێنم
بزانن گەر لەبەر لێشاوی بەحری مەوجی ئەسرینم
«کوردی»

**١- وەدەرنێن زاهید و سۆفی، نەوەک ئەو بەزمە ساوا بێ**
**بڵێن موتریب دەگەڵ ساقی؛ بەچەنگ و تارەوە بابێ**

وەدەرنێن: دەریان بکەن.

ئەو بەزمە ساوا بێ: ئەو بەزمە تێک بچێ.

موتریب: گۆرانیبێژ.

واتە: ئەمشەو، دەمەوێ ئاهەنگێک ساز بکەم، بۆ ئەمەش بنێرنە دوای گۆرانیبێژ و مەیگێڕ، با بەچەنگ و تارەوە بێن. بەڵام نەیەڵن زاهید و سۆفی خۆیان تێکەڵ ئەو ئاهەنگەمان بکەن و ئەگەریش هاتن، بەپاڵ دەریان بکەن.

**٢- «نەکیسا» و «باربەد» هەردوو، بەعوود و ڕوودەوە بێنن**
**لە بەزمی خوسرەویشدا بێ، بڵێن شەککەر ئەوێستا بێ**

نەکیسا و باربەد: دوو مۆسیقاژەنی زۆر ناودار و لێزانی سەردەمی ساسانی و ڕۆژگاری خەسرەوپەروێز بوون.

شەککەر: دووەمین ژنی خەسرەوپەروێزە (دوای شیرین) و خەڵکی ئەسفەهان بووە.



واتە: هەردوو مۆسیقاژەنی ناسراو: نەکیسا و باربەد، بەئامێری مۆسیقاکانیانەوە، کە بریتی بوون لە: عوود و ڕوود، ئامادە بکەن. بنێرن بەشوێن «شەککەر»ی ژنی خەسرەویشدا، با بۆ ئەم ئاهەنگە ئامادە بێت و پۆزش بۆ هاتن و هێنانی مەهێننەوە و ئەگەر «شەککەر» لە بەزمی ئاهەنگی خەسرەوی مێردیشیدایە، پێی بڵێن دەبێ ئامادە بێت.

**٣- لە کیشوەر، سادە ڕوو، چی هەن، لە هیند و بەڵخ و کەشمیر**
**لە بەزمی عەیشی من ئەوشۆ، دەبێ پاکی موهەییا بێ**

کیشوەر: وڵات، نیشتمان.

موهەییا: ئامادەساز، تەیار.

واتە: بچن سەرتاسەری وڵات هەمووی بگەڕێن و سەرنج بدەن، هەر کەسێکی جوانتان لە هیند و بەڵخ و کشمیر چاو پێکەوت، هەموویان بۆ بەزمی خۆشیی ئەمشەو، ئامادە و ساز بکەن.

**٤- لە هەر جێیەک دەزانن بەچچە تەرسایەک هەیە؛ بێنن**
**نییە عوزری پەزیرا؛ گەر خودی پاپای کلێسا بێ**

بەچچە تەرسا: منداڵە مەسیحی، مەسیحی زادە.

عوزری پەزیرا: پۆزسی پەسەند کراو.

پاپای کلێسا: ڕابەری ئایینی مەسیحی.

واتە: لە هەر شوێنێک منداڵێکی مەسیحی زادەتان بینی، هەر بیانوویەکی هەبێ، لێی قبووڵ مەکەن و ئەگەر خودی پاپای کلێساش بێ، دەبێ بەزۆرەملێ بۆ ئێرەی بهێنن.

**٥- لە هەر جێ: چەنگییەک، ڕامشگەرێک، ئاوازەخوێنێک بێ**
**بەتار و بەربەت و سەنتوورە بێنن؛ لەگەڵ شا بێ**

چەنگیی: چەنگژەن.

ڕامشگەر: گۆرانیبێژ.

ئاوازەخوێن: مەقامبێژ.

تار و بەربەت و سەنتوور: ئامێرگەلی مۆسیقایین.

واتە: لە هەر جێگەیەک چەنگژەن و گۆرانیبێژ و مەقامزانێکتان شک برد، بەئامێرگەلی تار و بەربەت و سەنتوورەوە (کە ئامێری مۆسیقاکانیانن)، لەگەڵ خۆتاندا بیانهێنن و گوێ مەدەنە ئەوەی لەوکاتەدا کە ئێوە، داوایان لێ دەکەن، چ بەرنامەیەکی تریان هەیە؛ چونکە ئەگەر بەرنامەی مۆسیقاژەندنیان بۆ «شا»ش هەبێ، هەر دەبێ بیانهێنن.

**٦- لە هەر جێ: دڵبەرێک، شۆخێک، بوتێ سیمین بەرێکو دی**
**بەحوکمەن بۆ منی بێنن، نەصارا بێ، چ تەرسا بێ**

سیمین بەر: لەشولار زیوین.

بەحوکمەن: بەزۆرەملێ، بەتۆپزی.

نەصارا: دیان.

**٧- لە هەر جێ: موغبەچێکو دی، دەگوێی نووسێن و بیهێنن**
**بەتەوع و کورهـ و زۆریی بێ، دەبێ هەر بێ، نەیێ نابێ**

موغ بەچچە: منداڵی جوانی زەرتوشتی.

دەگوێی نووسێن: گوێی بگرن، بەگوێ ڕاکێشان بیهێنن.

تەوع: بەخۆشیی، ئارەزوومەندانە.

کورهـ: بەتۆپزی.

**٨- لە هەر جێیەک: فریشتە پەیکەرێ، غیلمان لەقایێ بێ**
**بەباوەش بۆ منی بێنن، لە فیردەوسی موعەللا بێ**

فریشتە پەیکەرێ: ئافرەتی لەشولار وەک پەری و فریشتە.

غیلمان: کوڕی بەهەشتیی.

فیردەوسی موعەللا: بەهەشتی باڵا.

**٩- لە جەننەت: هەرچی غیلمان بەچچە هەن، پێیان بڵێن پاکی**
**بەخولد و توور و تووباوە، بەعەینوانی تەماشا بێ**

غیلمان بەچچە: کوڕی جوانی بەهەشتیی.

پاکی: سەرلەبەری.

خولد و توور (طور) و تووبا: هەرچی بەهەشتیی و خەڵکی ئەم سەر دنیایەش هەن.



**١٠- بڵێن بەو زوهرەیی زەهرا، دەبێ بۆ ڕەقسی ئەو بەزمە**
**دوو چنگی ماهـ و ڕۆژ، دەستیان لە مل عەقدی سوورەییا بێ**

زوهرەیی زەهرا: ئەستێرەی زەهرا، کە ئەستێرەی مۆسیقاژەن و سەماکار و ئەستێرەی گەڕۆکیشی پێ دەڵێن.

عەقدی سوورەییا: کۆئەستێرەی پیروو.

واتە: بەئەستێرەی زوهرە ڕابگەیەنن، تا بۆ بەزمی سەمای ئیمشەو خۆی ئامادە بکات و لە سەماکەشدا، دەست بخاتە دەست و ملی کۆئەستێرەی پیروو و وەک مانگ و خۆر، دەست لە دەستی یەکتر بئاڵێنن.

**١١- خەبەر کەن چەرخی مینایی، بەشیشە و جامی میناوە**
**دەقیقێک بێتە ئەم سەیرە؛ بڵا چەرخێک نەسووڕا بێ**

خەبەرکەن: هەواڵ بنێرن، ئاگاداری بکەن.

چەرخی مینایی: ئاسمان.

بەشیشە و جامی میناوە: بەلێوان و بادەی وەک میناوە.

بڵا چەرخێک نەسووڕا بێ: با دەورەیەک نەسووڕابێتەوە.

واتە: ئاسمانیش ئاگادار بکەن، با ئەویش بەپیاڵەی پڕی لە مەی و وەک میناڕەنگەوە، بێتە سەیری ئەم بەزمە و جارێ واز لە سووڕاندنی ڕەوڕەوەی زەمان بهێنێ و (زەمان)یش لەم بەزمەی ئێمەدا لە بەرنامەی ئاسایی خۆی دەرچێ و گەردوون نەسووڕێ و هەرچی شتێک لە گەردوواندایە، لەبەر خاتری ئەم بەزمەی ئێمە، ڕاوەستێ و سەیرمان بکەن.

**١٢- بڵێن ئەنجوم، هەتا ڕۆژ دەیدەبان بن، چاو لە دەرگادا**
**نەیێنە مەجلیسی عەیشم؛ چ ئەسکەندەر چ دارا بێ**

ئەنجوم: کۆی ئەستێرەیە، ئەستێرەگەل.

دیدەبان: پاسەوان.

واتە: ئەستێرەکانیش ئاگادار بکەنەوە، تا بەرەبەیان پاسەوانی ئێمە بن و چاویان لە دەرگا بێ؛ تا ئەگەر «ئەسکەندەر» و «دارا»ش ویستیان بێنە ژوورێ، ڕێگەیان نەدەن.

**١٣– حەریفان بێن و موتریب لێ بدەن، لەم ساز و چەنگ و نەی**
**بەشەرتێ یاری خۆم ساقی بێ، جام و تونگی سەهبا بێ**

حەریف: هاوپیشە.

تونگی: یان: تونگە: سوراحی.

سەهبا: مەیی نایاب.

واتە: با هەموو هاوپیشەکانی هونەری مۆسیقایی بێن و مۆسیقا بژەنن؛ بەمەرجێک لەم بەزمەدا، یاری خۆم: مەیگێڕ و سوراحییەکەی دەستیشی، شەراب و مەیی سەهبای پڕ بێ.

«مەحوی» دەڵێ:

وەرنە سەیری سەرخۆشان! ئەو شۆخی مینا گەردنە
بوو بەساقی، دەم بەشەککەر خەندە دێ، مینا بەکەف
«١٧٤»

**١٤– لە لایێ شاهید و سادە، لە لایێ ساقی و بادە**
**لە لایێ مەی، لە لایێ نەی، وەکو مەحشەر کە بەرپا بێ**

شاهید: منداڵی جوان. (منداڵی جوانی بەهەشتیی).

**١٥– کە یار هات؛ بوو بەساقی، بادەخۆریی جا بەسە، تاکەی!**
**لە ئەمشەو، تا دەڵێن وەقتە، کە ڕۆژی حەشر بەرپا بێ**

واتە: کە یارم بووە مەیگێڕ، ئەوسا ئیتر گۆوەند و بەزمی مەیخواردنەوەکە خۆش دەبێ و دەستیش لەم خۆشییە هەڵمەگرن، تا ئەو کاتەی دەڵێن: ڕۆژی حەشرە، با هەر بەردەوام بێ.

**١٦– «ئەدەب» لەو بەینەدا دەستەملانی سەروی زیباکە**
**هەتا دەوری مەسیح و ئاخری دەورانی دنیا بێ**

واتە: با «ئەدەب»یش لەو گۆوەند و بەزمەدا، دەست بکاتە مل و گەردنی یاری جوانی باڵابەرزی وەک سەرو و هەتا ڕۆژی حەشریش دەستی لە گەردن و ملی یار نەبێتەوە.



## ١١٨

کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)، وەک نموونەی:

١– بروسکا باطینی دا دل دێپێتێ سینە وێ وەربوو
کو دێ بیتن تەبێتا دل د ناڤ وێ نار و پیتێدا
«مەلای جزیری، ٣٨»

٢– عەجەب ماوم لە جەرگت، ئەی دڵەی غافڵ، کە موودێکە
لەسەر ئەم ئاگرەم داناوی، هێشتا هەر نەبرژاوی
«نالی، ٦٨٠»

٣– ئەگەر مومکین نەبوو وەسڵێت، کە من مردم، وەسییەت بێ
لەباتی قەوم و خوێشانم، لەسەر قەبرم بکە شینم
«کوردی»

**١– هەتا تەشریفی نیکوویی تەرازی قەددی زیبا بێ**
**دەبێ کێ ئارەزووی جامەی حەیاتی خۆی دەبەردا بێ**

تەشریفی نیکوویی: جلوبەرگی چاکیی و نەخشینی.

تەراز: ڕازێنەرەوە، هاوشان، بەرامبەر.

قەددی زیبا: بەژن و باڵای جوان و شیرین.

جامەی حەیات: کراسی ژیان.

واتە: ئەو یارە جوان و بەژن و باڵا ڕێک و جوانە، هەتا خۆی جلوبەرگی چاکیی و نەخشینی و بەئەندازەی قەد و باڵای خۆی لەبەر بکات، ئیتر ئاخۆ دەبێ کێ خۆزگە بەوە بخوازێ جلوبەرگی ژیان، لە دوای ئەو، لەبەر بکات. واتە: هەتا ئەو یارە جوانە باڵا بەرزە، کراسی ژیانی لەبەردا بێ، ئیتر پێویست ناکات کەس بەهیوای ژیان بێ.

**٢– لە نێوان زوڵف و ئەگریجەت، گرفتارە دڵی زارم**
**لە نێویدا دەبن ئاخر، چ لەملا بێ، چ لەولا بێ**

واتە: دڵی بریندار و لاوازم، لە نێوان زوڵف و ئەگریجەدا گرفتار و گیرۆدە و داماوە،

نازانێ چ بکات! ڕوو لە هەر کامیان دەکات، دەزانێ دەبێ سەری تێدا بچێ و ڕۆحی دەرچێ.

«نالی» دەڵێ:

زوڵفی دووتایی ترازوو مەیلی دڵکێشت،
ڕۆح دەکێشن بەدوو سەر، ئەم بەسەرێ، ئەو بەسەرێ
«٦٥١»

**٣- بڵێسەی ئاگری دووریی، ئەگەر وانێ مەعازەڵڵا**
**بەبێ تابی تەجەللادی ڕوو، کە سینەم نووری سینا بێ**

مەعازەڵڵا: خوایە هاوار، پەنا بەخوا.

تاب: توانا و هێز.

تابی تەجەللای ڕوو: ئاماژەیە بەچیرۆکی کێوی طوور و دەرکەوتن و تەجەللای ڕووناکی و پڕشنگی خوا و ئاگر تێبەربوونی کێوەکە.

سینا: بیابانی سینا.

واتە: تۆیش، وەک دووریی پڕشنگ و نووری خوا و کێوی طوور، ئەگەر زەبری ئاگری دووریت، بەمجۆرە بێ، ئەوا دەبێ بڵێم: خوایە هاوار! چونکە سنگم بەو ئاگرە (وەک کێوی طوور) سووتاوە و لەم بیابانەی «سینا»دا، تاقەت و توانای بەرگەگرتنی دیتن و دیدارم نەماوە.

«نالی» دەڵێ:

دڵم بەردە!؟ ئەگەر شاخە؟! بەچاوی سووکی مەنوارێ
بەخۆڕایی نەسووتاوە، ئەمیشە کێوی طوورێکە
«٤٥٨»

**٤- سەری بێحاڵە زوڵف و دڵ، ئەوەن فرمانی قەتڵی دا**
**سزای قەتڵە؛ غوڵامێکی بەڵێ گەر عاقی مەولا بێ**

غوڵام: نۆکەر، بەندە.

عاق: ئەو منداڵەی ئاکار و هەڵسوکەوتی بەرامبەر دایک و باوک و گەورەکەی خۆی،



یاخی بێ و سەرپێچی بکات و ئازاری ڕۆحیان بدات (دهخدا، بەرگی ١٠، ١٥٦٦٥).

مەولا: گەورە، خاوەن.

واتە: دڵم؛ منداڵ و جگەرگۆشی زوڵفەکانێتی، بەڵام زوڵفەکانی؛ ئەوەندە دڵمیان لە حەرەمی خۆیانەوە دەرکردووە و دڵیشم وەک ئەو منداڵە لاسار و هار و هاج و سەرکێشەی، بەقسەی دایک و باوکی خۆی ناکات و لە قسەیان دەردەچێ و هەرچی ئامۆژگاریی و ڕێنوێنی فێر دەکەن، بەقسەیان ناکات، بۆیە بەگوێرەی یاسا، منداڵی لەمجۆرە، سزای کوشتنە و ئەوا زوڵفەکانیشی، فرمانی یەکجارەکی کوشتنی دڵمیان داوە. چونکە پێشتر چەندان جاری تریش، هەر لەسەر ئەم بێعاری و نافەرمانییەی دڵم، فرمانی کوشتنی لە لایەن زوڵفەکانییەوە درا بوو.

**٥- کە دیم شەمعی جەمالی تۆ، لە فکری سەربڕین کەوتم**
**بەڵێ عاشق بەدیدارت، دەبێ پەروانەئاسا بێ**

شەمعی جەمال: مۆم و چرای جوانیی.

واتە: (ئەم بەیتە تەواوکەری مانای بەیتی پێشووە): زوڵفەکانی ڕاستیان کرد، کە فرمانی کوشتن و سەربڕینی سەرمیان دەرکردبوو، چونکە کاتێ سەیری ڕووناکیی جوانییەکەی یارمم کرد؛ دیمەنی پەپوولە و مۆم و چرام بیر کەوتەوە، کە چۆن پەپوولە، خۆی لە دەوری مۆمێک دەگێڕێ و تا نەسووتێ، داناکەوێ، ئەوسا منیش بۆم دەرکەوت، کە ئەویندار، بۆ دیدار و دیتنی یار، دەبێ پەروانە ئاسا، خۆی بسووتێنێ.

**٦- دڵی هیجران شکستەم، گەر لە خارای عیشقدا زانیم**
**سەبوو دەشکێ لە خارادا؛ بڵا سەد دەفعە خارا بێ**

هیجران شکستەم: ئەوەی لە تاو دووریی تێکشکاوە.

خارا: بەردی زۆر ڕەق.

سەبوو: گۆزە و دیزەی گڵێنەی لە ئاگردا سوورەکراو.

واتە: ئەگەرچی دڵم وەک گۆزە و دیزە، لە ئاگردا سوورەوە کرا بوو، بەڵام کە بەر بەردی خارای ئەوین و دووریی و دابڕان کەوت، شکا. کاتێکیش کە شکا، ئەوسا بۆم دەرکەوت، کە ئەگەر دڵێک (وەک گۆزە سوورەوە کراوەکە) سەد جاریش لە ئاگردا سوور کرابێتەوە، بەڵام کە بەر بەردی ڕەق دەکەوێ؛ دەشکێ.

**٧- گوتم: ماڵم دەشێوێ من، کە «با» زوڵفت دەشێوێنێ**
**گوتی: مەفتوونی زوڵفی من، دەبێ ماڵی بە«با»دا بێ**

واتە: هەرچەندە دەزانم کە عاشق، هەمیشە خۆزگە و ئاوات و بەرنامەکانی شپرزە و ئاڵۆز و شێواون، بەڵام کاتێ پێم وت: ئەو کاتانەی «با» زوڵفەکانت بەناویەکدا دەکا و دەیانشێوێنێ، منیش سەرم لێ تێکدەچێ و دەشێوێم و ماڵم خراپ دەبێ. کەچی لە وەڵامدا پێمی وت: بۆچی لە بیرت چۆتەوە؛ کە ئەو کەسەی شەیدای زوڵفی من بێ، دەبێ وەک ئەو کەسە وابێ، کە بەردەوام ماڵەکەی لەبەر ڕەشەبادایە!!.

**٨- گوتم: جانا دەڵێن وەک تۆ، لە چەرخا تالعە ڕۆژی**
**ئیشارێکی بەکوڵمەی کرد، گوتی: گەر ڕۆژ، ئاوا بێ**

ڕۆژ (ی یەکەم): هەتاو، خۆر.
ڕۆژ (ی دووەم): ئاماژەیە بۆ کوڵم.
تالعە ڕۆژی: بەختی درەوشاوەیە.

واتە: بەیارم وت: وەک چۆن تۆ، لەم سەر زەمینەدا دەرکەوتوویت، خۆریش وەک تۆ، ئاوا لە ڕۆژگاری خۆیدا بەختەوەرە. کەچی یارم هێمایەکی بۆ کوڵمەی کرد و وتی: ئەگەر خۆر، وەک کوڵمم، ڕووناک و درەوشاوە بێ، ئەوا ئەویش بەختی، وەک بەختی من، چاک و درەوشاوەیە.

**٩- بەکاری عاشقیی نایە، لە شەیدایی بەدەر، عەقڵێک**
**کە دانا هات و عاشق بوو، دەبێ دانایی دانا بێ**

واتە: ئەوانەی بەلێکدانەوەی عەقڵەوە، بیر لە عەشقێنی و ئەڤین دەکەنەوە، ناتوانن بینە عاشق؛ چونکە زانا و دانایی لە ئەویندا نییە و دەبێ ئەو شتانە بەلاوە بنێ و هەمووی لە دەست بدات.

«کوردی» دەڵێ:

چاوی مەستت داپۆشیوە، وێڵ و وەحشیی کردووم
قەت بەقەد زەڕڕەم نەماوە: عەقڵ و ئیدراک و کەماڵ



«سالم» دەڵێ:

قەراری عاشق و قانوون و حیکمەت، ضدی یەک هاتن
کە تەسکینی برینی دڵ، بەنەفخەی زوڵفی مشکین بوو
«١٠٩»

**١٠- بەغەیرەز عەشق و موڵکی دڵ، جنوودی خاڵ و خەت کێ دی**
**کە سوڵتان و سوپاهی خۆی، لە موڵکی خۆی بەیەغما بێ**

بەغەیرەز: جگە لە.
جنوودی خاڵ: سەربازی خاڵ.
سوپاه: لەشکر.
یەغما: تاڵان، بڕۆ.

واتە: جگە لە سوپا و لەشکری خەت و خاڵ، کە لەشکری ئەوین و نیشتمانی دڵن و دەبێ پارێزی لە نیشتمان و سەرمایەی نیشتمان بکەن، کەچی کێ دیوێتی، یان بیستوویەتی، کە ڕابەر و سوڵتانی ئەو لەشکرە (کە: یارە)، هێرش بکەنە سەر سامان و دارایی خۆیان؛ کە مەبەست لەو سامان و داراییيە؛ ئەو سەرمایەی دڵ و جەستەیەیە، کە عاشق، پێشکەش یاری کردووە و یار بۆتە خاوەنی هەموو ئەو شتانەی، کە دڵدارەکەی هەیەتی!.

**١١- ئەنیسی وەحشی وەک مەجنوون و وێڵی کۆهی سەودایی**
**ئەوێستاکەش دەبێ لەیلا، کە عاشق؛ وەک «ئەدەب» نابێ**

ئەنیس: هۆگر، هاودەم.
وەحشی: کێوی، ئەوەی دەستەمۆ نەبووە.
مەجنوون: مەبەست لە قەیسی عامیرییە، کە شەیدای «لەیلا» بوو.
کۆه: کێو، شاخ، چیا.

واتە: ئێستاشی لەگەڵدا بێ، ئەگەر هەر کەس وەک «ئەدەب» دڵداری بکات، ئەوا دەشێ چیرۆکی مەجنوون و لەیلا دروست ببنەوە و مەجنوون و لەیلایەکی تر پەیدا ببنەوە.

١١٩

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)، وەک نموونەی:

١- گەلۆ دیسا ببینم ئەز چرایێ وەسڵەتێ هل بت
بسوژم شوبهی پەروانێ ل بەر وێ نوور و شەوقێدا
«مەلای جزیری، ٤٠»

٢- زەمانی بەزمی رەندانە، بدە ساقی بەپەیمانە
لەبەر تەعزیمی مەیخانە، بلێن پیری موغان بابێ
«کوردی»

٣- مەثەل دنیا ژن و چەرخیش خەرەک، دەم دەم بەدووخی خەم
ڕەگی تاری وجوودت بادەدا، هێشتاکو هەر ماوی
«نالی، ٦٨٠»

**١- دڵئاراما! هیلالی نەو، بەدیدارت موبارەک بێ**
**بەدیدارت مەهی وەک مە، گرفتارت موبارەک بێ**

دڵئاراما: ئەی دڵئارامەکەم، ئەی مایەی ئۆخژن و هێوربوونی دڵم.

هیلالی نەو: مانگی تازە.

واتە: ئەی مایەی ئارامیی و حەسانەوەی دڵم، ئەوا مانگی تازەیە و سەرەتای هەموو مانگێکی تازەت لێ پیرۆز بێ. سەرەتای ئەم مانگە تازەیەش، کە دیداری مانگ ئاسای تۆ دەبینێ، وەک ئێمە گیرۆدە و پەرێشانت دەبێ و بەم بۆنەیەشەوە، کە مانگی نوێش گیرۆدەت بوو، پیرۆزباییت لێ دەکەم.

**٢- شوعاعی لێوی گوڵنارت؛ شەرابی ئەرغەوانیی کرد**
**لە جامی بادەدا عەکسی دوو گوڵنارت موبارەک بێ**

شوعاعی لێوی گوڵنارت: تیشکدانەوەی لێوە ئاڵەکانت؛ کە وەک گوڵە هەنار وان.

واتە: لێوە ئاڵەکانت، کە دەڵێی گوڵە هەنارن، تیشکیان دایەوە و تیشکدانەوەیان ڕەنگی شەرابەکەمانی وەک ڕەنگی ئەرخەوانیی لێ کرد و وێنەی هەردوو لێوەکانیشت، لە



پەرداخی بادەکەدا دەرکەوتن؛ بەم بۆنەیەوە کە وێنەی لێوەکانت، لە پەرداخی بادەکەدا تیشک دەدەنەوە، پیرۆزباییت لێ دەکەم.

**٣- لەبی شەهدی گوڵی ئێمە، چ شیرین گەوهەر ئەفشانە**
**گەوهەر باری لەبی لەعلی شەکەربارت موبارەک بێ**

لەبی شەهد: لێوی هەنگوینی.

گەوهەر ئەفشان: گەوهەر پژێن.

واتە: لێوە هەنگوینییەکانت، کە لێوی ئێمەن، چەند شیرینانە گەوهەر دەپژێنن و دەدوون. بەم بۆنەیەوە کە لێوەکانت لە کاتی ئاخاوتندا، گەوهەریان لێ دەبارێ، پیرۆزباییت لێ دەکەم.

**٤- بەفەرمانی خەمی ئەبرۆت، مژۆڵت سەف بەسەف کەوتن**
**سەفارایی سپاهی تازە سەردارت موبارەک بێ**

مژۆڵت سەف بەسەف کەوتن: برژانگەکانت وەک دەستە دەستەی سەرباز، ڕیز بوون و خۆیان بۆ جەنگ ئامادە کرد.

سەفارایی (سەفئارایی): ڕیزی جوان و ڕازاندنەوەی سەرباز.

واتە: بەفەرمانی برژانگە خوارەوەبووەکانت، برژانگەکانت دەستە دەستە ڕیز کراون و بۆ جەنگ ئامادە کران، بەم بۆنەیەوە کە ئەم ڕیزانەی سەربازگەلی برژانگت، جوان ڕازاندوونەتەوە و ئەم سوپا تازەیەت پێکەوە ناوە و هەر خۆشت فەرماندەیانیت، پیرۆزباییت لێ دەکەم.

**٥- قەتارەی دوگمەکەی سینەی ترازا، بۆ تەماشای من**
**دوو ناری نەورەسی سەحنی سەمەن زارت موبارەک بێ**

قەتارە: ڕیز، کاروان.

نەورەس: تازەپێگەیشتوو، فەریک.

سەحن: مەیدان.

سەمەن (سەمەن زار): گوڵی یاسەمین و ئەو باخەی کە هەر گوڵجاڕی یاسەمین بێ.

واتە: یەکە یەکەی دوگمە و قۆپچەکانی بەرۆکی ترازا و هەڵیش دەست من کەوت، تا

تەماشای هەردوو مەمکە وەک هەناری تازەپێگەیشتووی تەختی سنگە وەک گوڵجاڕی یاسەمینەکەت، لێ پیرۆز دەکەم.

**٦- چ ڕەنگینە لە دەستتدا؛ بریقەی ساغەری سەهبا**
**بەدەست ئەو ساغەری ڕەنگین و سەرشارت موبارەک بێ**

ساغەر: پیاڵە و پەرداخی مەی و بادە.

سەهبا: شەراب.

سەرشار: لێوان لێو، پڕپڕ، لێوڕێژ.

واتە: ئەو پەرداخە پڕ لە شەرابەی دەستت، هەر لە دەست خۆتا جوانە و هەر لە خۆت دێت پیاڵەی پڕ لە شەراب بەدەستەوە بگریت، بەم بۆنەیەوە ئەو پەرداخە ڕەنگین و پڕەت بەدەستەوە، لێ پیرۆز بێ.

**٧- چ خۆش دێنە نەزەر: سیحری سەر زوڵف و فرووغی ڕوو**
**یەدی بەیزا، بەدەستی زوڵفی سەححارت موبارەک بێ**

دێنە نەزەر: دێنە بەرچاو.

فرووغی ڕوو: تریفەی ڕوخسار.

یەدی بەیزا: پێشتر وتمان یەدی بەیزا، مەبەست لە موعجیزەی دەست و مەچەکی حەزرەتی مووسا بوو، کە دەستی لە باخەڵی دەردەهێنا، دەست و مەچەکی سپی دەبوون.

واتە: ئەو دیمەنە چەند جوان و شیرین لە بەرچاو دەردەکەوێ، کاتێ سەری زوڵفە ڕەشەکانت، یەکسەر گزنگ و تریفەی ڕوخسارت بەرچاو دەکەون، ئەمەش موعجیزەی مووسایە، کە بەدەست زوڵف و قژە سیحراوییەکەتەوە ئەنجام دەدرێ و بەم بۆنەیەوە، پیرۆزباییت لێ دەکەم.

**٨- ڕوخت؛ گەر کەعبەیی ئیسلامە، زوڵفت: ئایەی کوفرن**
**لە ماڵی کەعبەدا؛ ئیحداثی زوننارت موبارەک بێ**

ڕوخت: ڕووت، ڕوخسارت.

ئیحداث: ڕۆنان، دروستکردن.

واتە: ڕوخسارت، کە وەک کابەی موسڵمانان ڕووناک و درەوشاوەیە و لای هەموو



موسڵمانانەوە ددانی پێدانراوە، کە دەبێ ڕووگەی هەمووان بێ، کەچی زوڵف و بسکە ڕەشەکانت، نیشانە و سونبلی کفرن! ئەمەش موعجیزەیەکی سەیر و تازەیە، کە ماڵی کابەدا، بانگەوازی ئایینێکی تازە ڕادەهێڵێت و بەبۆنەی ئاشکراکردنی ئەم ئایینە تازەیەشەوە، پیرۆزباییت لێ دەکەم.

**٩- بەعوششاقی دڵ ئەفگارت، موسەللەم خاصصەیە ئەورۆ**
**حوزوری عامی موشتاقان؛ بەدەربارت موبارەک بێ**

ئەفگار: ماندوو، شەکەت، زامدار.

دڵ ئەفگار: دڵ بریندار، دڵ ماندوو.

موسەللەم: ئەو شتانەی سەلماون و پێویستیان بەسەلمان و مشتومڕکردن لەسەریان نییە، یەکلایی بوونەتەوە.

خاصصە: تایبەت.

حوزوور (حضور: عەرەبی): ئامادە، ئامادەبوون.

واتە: ئەمڕۆ، کە سەرلەبەری دڵدارانت، بەتایبەت هاتوون بۆ دیدەنیت، چاو ڕوونیت لێ دەکەم، کە ئەو هەمووە ئەویندارە بەتاسەیە لە دەورت گردبوونەتەوە و بەم بۆنەیەوە پیرۆزباییت لێ بێ.

**١٠- عەجایەب سایە ڕەوشەن بوو، خەتی زوڵف و ڕوخی ڕەنگین**
**بەهەم ئامێزشی شەنگە ڕفوزە نیگارت موبارەک بێ**

سایە: سێبەر.

ڕەوشەن: ڕووناک، گەش.

ئامێزش: تێکەڵ.

هەم ئامێزش: بەیەکتر تێکەڵبوون.

شەنگ: جوان، قۆز، شۆخ.

ڕفوزە: واژەکە لە بنچینەدا فەڕەنسییە: «Refuse»، یان «Rofuze» و بەمانای: پەسەند نەکردن، یان: ئەو قوتابییەی لە ئەزمووندا دەرناچێ و دەمێنێتەوە (دهخدا، بەرگی ٨، ل ١٢١٨١)، هەروەها فەرهەنگەکانی: سُخن، بەرگی ٤، ل ٣٦٥٤، فرهنگ فارسی «الفبایی – قیاسی»، بەرگی ١، ل ٩١٤. فرهنگ فارسی عامیانە، بەرگی ٢، ل ٧٦٣.

واته: زۆر سەیرە! ئەگەر هەر کاتێ شتێک بەسەر شتێکی ترەوە بێت، دەبێ یەکێکیان سێبەر بۆ ئەویتریان بکات؛ کەچی زوڵف و بسکەکانی تۆ، لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕەنگیان ڕەشە و کەوتوونەتە سەر کوڵم و لاجانگ و سەر ڕوخسارت؛ بەڵام چونکە ڕوخسارت ڕووناک و گەشە؛ ئەوا ڕووناکایی ڕوخسارت، زوڵفەکانیشتی ڕووناک کردۆتەوە!. بۆیە لەم بۆنە سەیروسەمەرەدا، کە تێکەڵبوونی ئەم چەند دیمەنە، دەبووایە بەپێچەوانەشەوە بێ و بڕوا نەدەکرا یەکتری پەسەند بکەن، ئەوا دەبێ پیرۆزباییت لێ بکەم.

**١١- هەتا لوتفت نەفەرمووبوو، حەقیقەت ڕووی نەدا بۆمە**
**ظهوری موعجیزەی عیسا؛ لە ڕوخسارت موبارەک بێ**

ظهور: دەرکەوتن.

موعجیزەی عیسا: پێشتر باسمان کرد و وتمان حەزرەتی عیسا؛ خاوەنی چەند موعجیزەیەکی خودایی بوو، کە یەکێکیان بریتی بوو لەوەی: کاتێ دەدوا، بەهەناسەکانی مردوو زیندوو دەبوونەوە.

واته: هەتا میهرەبانییت نەنواند و بەهەناسە عیساییەکانت ئێمەی مردووی گیان تێدا نەماوت، زیندوو نەکردەوە؛ بڕوامان نەدەکرد، چونکە بەچاوی خۆمان ئەو ڕاستییە (مردوو زیندووبوونەوە)مان نەدیبوو. بەڵام ئێستا، کە موعجیزەکەتمان بەچاوی خۆمان بینی، دەبێ پیرۆزباییت لێ بکەم.

**١٢- بەڕەسمی تەهنیەت ئەوڕۆ، ئەگەر جانم فیدای تۆ کرد**
**«ئەدەب» عەرزت دەکا قوربان، دوو سەد جارت موبارەک بێ**

بەڕەسمی تەهنیەت: بەناوی پیرۆزباییەوە.

واته: بەم هەموو بۆنەیەوە، کە لەم تازەبوونەوەیەی سەری مانگی تازەدا پەیدات کردوون، ئەگەر بەناوی پیرۆزباییەوە، منیش دیاری خۆمت پێشکەش دەکەم، هیوادارم لێم پەسەند بکەیت و سەد جاریش لێت پیرۆز بێ، کە ئەو دیارییەش هەر گیانی خۆمە!.



### ١٢٠.

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)، وەک نموونەی:

١- ساقی! قەدەحی گەردشی گەردوون دەشکێنێ
باریی، کە دەبێ موعتەقیدی گەردشی ئەوبە
«نالی، ٣٩١»

٢- باکم نییە لەو خەنجەرەی دەیکەی بەکەمەردا
شمشێری بروت جەرگی بڕیوم بەئیشارەت
«حەریق، ١٥»

**١- بێ زەوق و موحیببەت، مەی و مەیخانە دەڵێ چی!**
**بێ نەشئەیی زاتیی، بەط و پەیمانە دەڵێ چی!**

بەط (بەربەط): ئامێری مۆسیقایی.

پەیمانە: دەفری مەی، پەرداخ، لێوان.

واته: ئەگەر کەسێک لە قوولایی و ناخی خۆیدا، هەست و ئارەزووی بەرامبەر بەخۆشەویستیی شتێک نەبێ، ئیتر خواردنەوەی بادە و سەرکردن بەمەیخانەدا، چ شتێک لە قوولایی هەستیدا، نایکاتە عاشقی ئەو شتە؛ لەبەرئەوە بەبێ بوونی خولیایەکی ڕاستەقینە، ئیتر مۆسیقا و پەرداخی مەی، چ کارێک لە دەروونی ئەو کەسە دەکەن!؟.

**٢- هەر صیدقە؛ دەبا مەردی خودا ڕێگە بەمەقسوود**
**شێخ و شەمەن و کەعبە و بوتخانە دەڵێ چی!**

صیدق: ڕاستگۆیی، ڕاستیی.

مەقسوود: مەبەست، ئاوات.

شەمەن: بتپەرست.

واته: هەر ئەو ڕاستگۆییەی ناخی مرۆیە، کە مرۆ بەئاواتەکانی دەگەیەنێ، نەک شتێک بڕوات پێی نەبێ و بەڕواڵەت خۆتی پێوە هەڵکێشیت، وەک ئەوەی بەڕواڵەت و چاولێکەریی، دەبێ شێخێکت هەبێ، یان پەنا بۆ «کەعبە» و بتپەرستیی و پەرستگە بەیت.

**٣- عاقڵ ئەوەیە: قەیدی عیلاقەی نییە؛ وەک شێت**
**فـەزڵ و هونەری عـارف و فـەرزانە دەڵێ چی!**

قەیدی عیلاقە: پابەندی پێوەندی.

فەرزانە: ژیر، عاقڵ.

واتە: ژیرایەتی مرۆڤ لەوەدایە، بەدرۆ پابەند و دەروەستی شت نەبێ و ئازادانە، وەک شێت، بێ پەروا بژی. ئیتر فلانە کەس زۆر ژیر و هونەرمەند و خواناسە و دەبێ پێوەندیت پێیەوە هەبێ، شتێکی پڕوپووچە.

**٤- زادی ڕەهی هامـوونی تەریقـەت مـەبە زاهیـد**
**ویردی سەحەر و سەبحەیی سەد دانە دەڵێ چی!**

زاد: توێشە، خۆراکی ڕێ.

ڕەه: ڕێگە.

هامـوون: ناوی زەریاچەیەکە لە «سیسـتـان - باشووری خۆرهەڵاتی ئێـران»، کە بەتەنیشتییەوە زەریاچەیەکی بچووک بەهەمان ناوەوە هەیە و شێوەکەی و هەڵکەوتی، لە «هۆر»ەکانی باشووری خۆرهەڵاتی عێراق دەچن. هەروەها بەمانای «بیابان»یشە (دهخدا، بەرگی ١٥، ل ٢٣٣٥٩)؛ کە دیارە «ئەدەب» ئەم مانایەیانی مەبەستە، چونکە بەیتە شیعرەکە باس لە چۆڵەوانیی و دووریی ڕێگە دەکات.

زاهید: موسڵمانی بەڕواڵەت و بەدرۆ.

سەبحە: تەسبیح.

واتە: ئەی زاهیدی بەدرۆ و بەڕواڵەت موسڵمان! تۆ، کە بڕوات بەو شتانە نییە، وا شوێنی کەوتوویت، ئیتر بۆچی بەدرۆ توێشە بەرەی ڕێگەی دووری هاموونی - تەریقەتت گرتۆتە بەر و بەیانییانیش هەر بەدرۆ، خەریکی ویرد خوێندن و هەڵگرتنی تەسبیحی سەد دانەیت!؟.

**٥- تۆ ناوی سەری شەمعێ مەبینە، کە دەسووتێ**
**بنواڕە لە سـۆزی دڵی پەروانە؛ دەڵێ چی!**

واتە: براله! ڕواڵەت بین مەبە و هەر لە دوورەوە سەیری مۆمێک مەکە، کە چۆن دەسووتێ و دەوری خۆی ڕووناک دەکاتەوە؛ بەڵکو لە سۆز و کوڵی دڵی پەروانە (پەپوولە)



ورد ببەوە، بزانە چ ئەوینێکی لە دڵدایە و بۆچی بەم شەیداییە خۆی دەسووتێنێ و لێی بپرسە؛ بزانە پەیامی چییە!!!.

«سالم» دەڵێ:

شوعلە نەیدا فرسەتی پەروانە، مەتڵەب کا بەیان
سیڕی سەربەستەی لەبی شەمعا، هەموو پۆشیدەما
«٣٢»

**٦- باطن ئەوەیە مـەخزەنی ئەسـرارە، سـەراسـەر**
**بێ گەنجی حەقیقەت، دڵی وێرانە دەڵێ چی!**

باطن: ناوەوە، ناخ.

مەخزەنی ئەسرار: گەنجینەی نهێنی.

واتە: ناخی دەروون و قووڵایی هەست، گەنجینەی نهێنی و پەیامی ئەوینی شاراوەیە و ئەمانەن کە سەرلەبەریان گەوهەری زاتی مرۆڤ پێک دەهێنن، ئیتر ئەگەر ئەمانە لە قووڵایی گیانی مرۆدا نەبن، دڵێکی خاڵی و بەتاڵ و بێ پەیام، چی پێ دەکرێ و لە وێرانە دەچێ.

**٧- میسباح ئەوەیە: سائیرە نووری لە هەموو جێ**
**قـەندیلی زەڕ و زیوەری کـاشـانە دەڵێ چی!**

میسباح (مصباح: عەرەبی): چرا.

سائیر: تێکڕایی، گشتی.

قەندیل: جۆرە چرایەکە.

کاشانە: ژووری بچووکی زستانە.

واتە: چرا؛ ئەوەیە بەئاشکرا هەڵبێ و ڕووناکییەکەیشی بەهەموو لایەکدا پەخش و بڵاو بێتەوە، ئیتر ئەگەر چرا لە زێڕ و زیو و بابەتی تر، هەر بۆ ڕازاندنەوەی ژووری بچووک و ئەو جۆرە جێگایانەی بۆ جوانیی دادەنرێن، چ پێوەندییەکیان بەڕووناکیی ڕاستەقینەوە هەیە!؟.

**٨- واعیز؛ وەرە یەک هەفتە «ئەدەب» فێر بە لە لای من**
**پەندی بەڕیا و لۆمـــە و ئەفـــســـانە دەڵێ چی!**

واعیز: ئامۆژگاریکار.

پەندی بەڕیا: پەندی بەڕواڵەت و درۆزنانە و ڕووپامایی و ماستاوکارانە.

واتە: ئەهای ئەو کـەسـەی خـۆت بەئامـۆژگـاریکاری خـەڵکی دەزانیت، وەرە واز لەو درۆودەلەسە و نموونە هێنانە و فڕوفیشالانەت بهێنە و بەم شتە پڕوپووچانە خەڵکی تەفرە مەدە؛ وەرەو تەنیا یەک هەفتە لای من گل بخۆرەوە، با فێری ڕاستیی و ڕەوشتی مرۆڤانە و ئەدەبت فێر بکەم، بزانە کاری تۆ، لەگەڵ ڕاستیدا، چەندیان جیاوازیی هەیە!.





کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)، وەک نموونەی:

١- ئەسپی نەفەست دێت و دەچێ، گەرمە عەنانی
ئەی مەستی ریاضەت، هەلە! هوشیاری جڵەو بە
«نالی، ٣٩٣»

٢- نوقتەی دەهەنت، وا دڵی هێناومە تەنگیی
جێگای خەیاڵی نییە بۆ فیکری بەکارەت
«حەریق، ١٤»

**١- بۆ زوڵفی سیەهچوردە لەسەر چیهری قەشەنگی**
**یاران بەخودا وەختە بچم ببمە فەرەنگی**

سیەهچوردە: ڕەنگی ڕەش.

چیهر: ڕوخسار.

ببمە فەرەنگی: ببمە مەسیحی، لە دین وەرگەڕێم.

واتە: قژە ڕەشەکەی سەر ڕوخسارە قەشەنگەکەی، لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕەمزی تاریکی و تاریکیش ڕەمزی کفر و لە ئایین لادانە؛ ئەوەندەم بەلاوە جوانە، خەڵکینە! سوێند بەخوا وام لێهاتووە، خەریکم لە دین وەردەگەڕێم و باوەڕ و ئیمانم بەهیچ نامێنێ.

**٢- ئامانە! لە دەس شۆڕشی ئەو غەمزەیی جادوو**
**هاوارە! لەبەر فیتنەیی دوو چەشمی سپەنگی**

ئامانە: هاوارە، داد و بێداد.

فیتنە: بەڵا و دەردەسەریی و وەی.

چەشم: چاو.

سپەنگ: ترێ کێویلە، ترێ ڕێوییانە (دهخدا، بەرگی ٩، ل ١٣٤٤٠).

واتە: گەلۆ! فریام کەون؛ سەیرکەن بزانن چاوە سیحراوییەکانی چ هەرایەکی ناوەتەوە! ئەی هاوار و داد لە دەست بەڵا و وەیی ئەم دوو چاوە وەک ترێ کێویانە!.

**٣- غەیرەز سەفی خاڵی، کە لە ڕووی پەرش و بڵاوە**
**نەمبیستووە ڕێی جەننەتی بێ: کافر و زەنگیی**

غەیرەز: جگە، بەبێ.

سەفی خاڵ: ڕیزی خاڵ.

زەنگیی: پێست ڕەشی هیندی و ئەفەریقاییی، کە ناموسڵمانن.

واتە: ڕیزە خاڵەکانی، کە بەڕوخساریدا پەخش و بڵاوبوونەتەوە و ڕوخساری یاریش هەر دەڵێی بەهەشتە و ئەو ڕیزە خاڵانەش، کە دەڵێی پێست ڕەشە ناموسڵمانەکانی هیندستان و ئەفەریقان، جێی سەرسووڕمانن! چۆن چۆنی ئەو ناموسڵمانانە، ڕێیان لە بەهەشت کەوتووە و تێیدا دەگەڕێن!؟.

«کەمالی» دەڵێ:

سەد حەیفە؛ لە ناو جەننەتی ڕووتایە بەدائیم
خاڵی حەبەشی زادە، کە هیندۆکی سیایە
«١٠٧»

**٤- چیهرە و دەهەنی؛ وەک گوڵە، ئەمما بەتەفاوەت**
**یەک صوورەیی خەندان و یەکێ خونچە بەتەنگی**

دەهەن: دەم، زار.

ئەمما: بەڵام.

تەفاوەت: جیاواز.

صورە: وێنە.

صوورەیی خەندان: وێنەی زەردەخەنە.

واتە: ڕوخسار و دەمی، هەر دەڵێی گوڵە؛ کەچی سەیر لەوەدایە، هەر خودی ئەم گوڵە، جیاوازیی تێدایە، چونکە ڕوخساری ئەم گوڵە (یار)، وێنەیەکی پڕ لە زەردەخەنەیی تێدا دەبینرێ؛ کە وێنەی زەردەخەنەش، دەبێ دەم و لێوی؛ بەچاو ببینرێ، کەچی لێو و دەمی؛ هەر دەڵێی خونچەی هێشتا نەکراوە و نەپشکووتوون!.



«وەفایی» دەڵێ:

١- لە فەهمی جەوهەری خەندەی دەمت، عومرم چوو، نەمزانی
کە سیری حاڵی ویجدانیی، وەرایی فەهم و ئیدراکە
«١٢٨»

٢- چییە ئەم نوقتە! کەوا بۆتە نیشانەی دەمی تۆ!
نوقتەیی هیچە؛ کەچی نوکتەیی سەد ئاهی دڵە
«١٣٣»

**٥- ئەو ڕۆژە کە دڵ بەستەیی چەنگی خەمی مووی بوو**
**زانیم کە هەتا مەرگێ؛ ڕەها نابێ لە چنگی**

بەستە: گیرۆدە، بەستراو.

چەنگ: چەماوەی وەک چەنگاڵ.

خەم: پێچ و لوول.

خەمی موو: قژی لوول و پێچ خواردوو.

واتە: هەر ئەو ڕۆژە، کە دڵ بەقوللاب و داوی تاڵە مووەکانی یارەوە گیر بوو، ئیتر بۆم دەرکەوت: دەبێ تا ئەو ڕۆژەی دەمرم، لەم داوە مووانە ڕزگاریم نەبێ و کەس نەزانێ چیم بەسەر دێت.

«وەفایی» دەڵێ:

سەری دانا لەسەر ڕووی تۆ، بەشوێنی زوڵفی تۆدا چوو
«وەفایی» ئاخیری خێر بێ؛ دەمێکە بێ سەروشوێنە
«١٤٦»

**٦- هەر بۆیە بەعەمدەن دەچمە بەر نەزەری؛ زۆر**
**بەشکو بەغەڵەت جارێ بمە صەیدی خەدەنگی**

بەعەمدەن: بەئەنقەست.

نەزەر (نظر: عەرەبی): نواڕین، سەیرکردن.

دەچمە بەر نەزەری: دەچمە بەرچاوی، خۆمی نیشان دەدەم.

بەغەڵەت: بەهەڵە.

صەید: نێچیر.

خەدەنگ: تیر.

واتە: بەو هیوایەوە، بەدەستی ئەنقەست، زوو زوو خۆمی نیشان دەدەم، بەڵکو ئەمە خوایە! جارێک پڕشنگێکی چاوەکانیم بەرکەوێ و ببمە نێچیری.

**٧- دوو شت «ئەدەب»ی کردووە خەستە و ناڵاڵن**
**یەک: ڕەنجشی زوو زووی و یەکێ: وەسڵی درەنگی**

فیرقەت: دووریی و لێکدابڕان.

وەسڵ: دیتن و دیدار و پێگەیشتن.

واتە: بەلای «ئەدەب»ەوە، دوو شتی یار، بوونەتە مایەی ماندووکردن و ناڵینی؛ یەکێکیان: دووریی و لێکدابڕانی زوو زووی. دووەمیان: دیتنی و دیداری درەنگ درەنگی؛ کە ئەم دووانە لە بنەڕەتیشدا هەر یەک شت و یەک دەردی کوشندەن.





کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن سالم: (فعلاتن، فعلات، فاعلاتن)[١]، وەک نموونەی:

صەنەمێ ژ قەوسێ ئەبرووا  دوو هلالێ نەو نوماندن
دو کەمان ل بورجێ میزان ب غەزەب ل من کشاندن
«مەلای جزیری، ٤٥١»

**١- بەسەحەرگەهی بەهاران، دەمی کازیبەی بەیانی**
**چ مەیێک لە دەستی جانان، چ هەزار زیندەگانی**

سەحەرگە: بەربەیانی.

کازیبە: گرنگی درۆیین، بەر لەوەی خۆر بکەوێ.

واتە: ئا لەو کاتەدا؛ کە هێشتا خۆر هەڵنەهاتووە و گرنگی نەداوە؛ ئەگەر یار، بەدەستی خۆی پەرداخێکت لە بادە بداتێ، ئەو پەرداخە مەیە، بەرامبەرە بەهەزار ژیانی ئاسایی.

«وەفایی» دەڵێ:

دەستم بگری تۆ، کە بەجامێکی صەبووحی
بەو چاوە؛ ئەگەر پادشەهی شامە؛ گەدامە
«١٣٥»

**٢- دوو هەزار موڵک و دەوڵەت، بەفیدای دەمێکی خەڵوەت**
**بەخسووس کە جورعەشت بێ؛ لە کەفی نیگاری جانی**

بەخسووس: بەتایبەتی.

جورعە: قوم.

کەف: دەست.

نیگار: یار.

جانی: گیانئاسا.

واتە: ئەگەر بۆت هەڵکەوێ بەتەنیا لەتەک یاردا بیت و بەدەستی خۆی، کە بەرامبەرە

(١) کێشی ئەم غەزەلە، لای «ئا» بەمجۆرەیە: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەشکول: (فعلات فاعلات فعلات فاعلاتن) - ل ٢٤٢.

بەگیان، جار جارە قومێک بادە بنۆشیت، دوو هەزار سامان و موڵک و دەسەڵاتی دنیایی دەهێنێ.

**٣- وەرە ئەی گوڵی وەتاغیی، بنوارە سەیری باغی**
**بشکێنە ڕەونەقی گوڵ، بەدوو زوڵفی خەیمەرانی**

وەتاغ: ژوور.

خەیمەرانی: مانای تەواویم نەزانی؛ بەڵام بیر بۆ ئەوە دەچێ، کە مەبەست لە زوڵفی وەک «خێمە» و «ڕەشماڵ» بێ. لە فەرهەنگیشدا بۆی گەڕام، لە هەندێ فەرهەنگدا، ناوی چەند گوندێک باس دەکەن، کە ناویان «خەیمەران»ە و هەندێکیان لە نزیک: بەندەری «ئەنزەلی» و شاری «فومن» و شاری «ئەسفەهان» کە ئەم سێ گوندە، لە ناوچەی کوێستاندان و ڕەز و میوەی باشیان هەیە و گومانی ئەوە دەکرێ لەم گوندانەدا «خەمر = مەی» دروست بکەن (دهخدا، بەرگی ٧، ل ٩٩٦٤).

**٤- وەرە سەیری بەزمی مەستان، بگەڕێ لە ناو شەبوستان**
**بدە ساغەری لەبالەب، لە شەرابی ئەرخەوانیی**

شەبوستان: ژووری خەوی دەسەڵاتداران، سەراپەردە.

واتە: گیانەکەم. سەرێک لە کۆڕی بەزمی مەیخۆران بدە و سەرێکیش لە ژووری خەوەکەم لار بکەرەوە و پەرداخێکی پڕی بادەم لە شەرابێکی ڕەنگ ئەرخەوانیی بدەرێ.

**٥- بدە جامێ مەی بەپەنجەت، بکە جیلوەیێ بەلەنجەت**
**ببە زینەتی تەمایول، لە نەهالی خەیزەرانیی**

زینەتی تەمایول: زینەتی لار و لەنجە و نێسکە.

نەهال: نەمامی کۆرپە، دەوەن.

خەیزەران: دارێکی باریک و باڵا بەرزە و لە چەمینەوەشدا، کەمتر دەشکێ.

واتە: بەسەری پەنجەکانت، مەی بدە دەستم و بەناز و عیشوەوە لەنجەولاری جوان و دڵفڕێنت هەبێ و وەک تازە نەمامی خەیزەران ئاسا، هەر شنە شنت بێت.



**٦- وەرە ئەی نیگاری جاران، بەتەریق و ڕەسمی یاران**
**بکە ڕەفعی دەردی سەرمان، لە خوماری ناتەوانیی**

تەریق و ڕەسمی یاران: ڕێ و ڕەسم و شێوەی یاران.

ڕەفع: هەڵگرتن، لابردن.

خوماری ناتەوانیی: ژانەسەری دوای مەستیی.

واتە: ئەی یارە دێرینەکەم، ئاکاری دڵدار و دلبەرانە لەگەڵمدا بنوێنە و ژانەسەری دوای سەرخۆشیی و مەست بوونیشمان، لەسەر هەڵگرە.

**٧- لە عەوەز هەموو عیتابت، بەمنی جگەر کەبابت**
**بدە یەک دوو ماچی شیرین، بەکەماڵی میهرەبانیی**

عەوەز (عوض: عەرەبی): لەجیاتی، لەبری.

عیتاب: گلەیی، سەرزەنشت.

کەماڵی میهرەبانیی: ئەوپەڕی سۆز.

واتە: لەبری هەموو گلەییەکانیشت، بەوپەڕی هەست و سۆزتەوە، یەک دوو ماچی شیرین و بەتامم بدەرێ، کە منی دڵدارت، لە تاوت جگەرم بۆتە کەباب.

**٨- ئەگەر ئەم نیگارە تۆ بی، گوڵی نەوبەهارە تۆ بی**
**بەخودا ئەگەر بکەم ڕوو، لە بەهەشتی جاویدانیی**

واتە: سوێند بەخودا، ئەگەر بەوجۆرەم لەگەڵدا بکەیت و بەمجۆرە وەک بەهاری سەوز، ژیانەوەم پێ ببەخشیت، ئەوا هەرگیز بەهەشتی هەمیشە ژیان و هەر مانم ناوێ و هەر ڕووی تێناکەم.

**٩- چییە بێ گوڵی جەماڵت، چییە بێ دوو چاوی کاڵت**
**بەمە تاجی پادشاهی، بەمە تەختی ئەرسەلانیی**

بەمە: بەلای ئێمەوە (بەلای منەوەی مەبەستە).

واتە: هەتا خاوەنی چاوە کاڵەکانی تۆ و جوانیی تۆ بم، ئیتر تاجی پاشایی و تەختی ئەرسەلانی و دەسەڵاتی جیهانداریم بۆ چییە؟! چونکە ئەگەر بەپێچەوانەوە: تاجی پاشایەتی و تەختی ئەرسەلانیم هەبێ؛ بەڵام تۆم نەبێ؛ چ لەزەتێک لە ژیان و لە دەسەڵاتداریتی دەبینم!؟.

**١٠- چ بەهارە صورەتی تۆ، چ نیگارە قەوسی ئەبرۆ**
**کە خەجاڵەتە لە نەقشی، قەڵەمی نیگاری مانی**

چ بەهارە صورەتی تۆ!: شێوەت چەند بەهارانەیە!.

چ نیگارە قەوسی ئەبرۆ: برۆت چەند بازنەیی کێشراوە!.

واتە: شێوەت چەند ڕەنگین و پڕ لە ژیان و تازەیی و بەهارانەیە و برۆکانیشت؛ چەند جوان و بازنەیی کێشراون!، کە دڵنیام قەڵەمی «مانی - نیگارکێشی بەناوبانگ» ، لە ئاست دیمەنتدا، شەرمەزار و ڕووزەردە.

**١١- بەکەمەندی زوڵفی خاوت، دڵی ئێمە کەوتە داوت**
**عەجەبا کە شەهسوارم، بەشکاری مەی نەزانی**

عەجەبا: سەیرە!.

شەهسوار: شاسوار، شۆڕشوار.

واتە: دڵی من، نێچیرێکی گومناو بوو، ئەوەندە بێ دەنگ، بەکەمەندی زوڵفی یارە وەک شاسوارەکەمەوە بووم، هەر پێشی نەزانی!. یان: بەو هۆیەوە، کە یارم هەر کاری ڕاوکردن و نێچیرگرتنە، لە ئەژمارکردنی نێچیرەکانیدا ماندوو بووە، هەر لەبەرئەمەش بوو، لە سەرژمێریی زۆری نێچیرەکانیدا، منی لە یاد کردبوو.

**١٢- «ئەدەب»ا، بەشەرتی جاران، ئەمنم کە جان سپاران**
**کە نەڵێ ڕەقیبی نادان؛ بەوەفا نەبوو فلانی**

واتە: ئەی «ئەدەب» ، من هەر لەسەر بەڵێن و پەیمانی جارانم و لەوانەم کە گیانبەخشینم بۆ یار، بەلاوە ئەرک و پێویستە و لە یادە؛ نەک نەیاران و ناحەزان نەڵێن «ئەدەب» بێ وەفا بوو.





کێش: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون مەحزووف: (فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن) ، وەک نموونەی:

١- عاشقێ مەستی ب عشقێ نیە حاجەت ب مەیێ
واردێ وارد و ئەحـــــوال ب ئەوراد دێ چ کت؟
«مەلای جزیری، ١٣٤»

٢- وەسفی ڕوخساری لە فیکری بەنی ئادەم بەدەرە
ئیبتیدای مەدحی دەمی، وەک خەبەری بێ ئەثەرە
«نالی، ٤١١»

٣- گەر دەلیلی وەکو نوقتەی: دەهەنت نەبووایە
منیش ئینکارم ئەکرد، وەک حوکەما جەوهەری فەرد
«شێخ ڕەزا، ٤٦»

**١- شیفتەم بۆ صەنەمی، ماهڕۆخێ، سیم تەنێ**
**حۆریی لالەعوزارێ، پەریی خۆش سوخەنێ**

شیفتە: هەڵوەدا، عەڤداڵ، پەرۆش.

ماهڕۆخێ: ڕوخسار وەک مانگێک.

سیم تەن: لەش زیوین.

حۆری: فریشتە، پەری.

لالەعوزار: ڕوخسار وەک گوڵی «گوڵاڵە» ، گوڵ ڕوو، گوڵ ڕوخسار.

خۆش سوخەن: قسە خۆش.

واتە: هەڵوەدای کچێکی: ڕوو وەک مانگی، لەش زیوینی پەری و ڕوومەت گوڵ و قسە خۆشێکم.

### ٢- زوڵفی بۆ حەبسی دڵم، شاری «سیبرە» بەمەثەل
### کە بەقانوونی مەسیحی، دز و عاسیی دەبەنێ

سیبرە (یان: سیبریا): ئەو پێدەشتە بەرینەیە، کە هەموو باکووری ئاسیای گرتۆتەوە و هەر لە ڕیزە چیاکانی (ئۆراڵ)ەوە تا ئۆقیانووسی «ئارام»ی گرتۆتەوە و لە باکووریشەوە بەئۆقیانووسی بەستەڵەکی باکوورەوە لکاوە. پێوانەی ئەم دەشتە (١٢٣٨٠٠٠) کیلۆمەتر چوارگۆشەیە، کە سەرلەبەری دەشتاییییە (دهخدا، بەرگی ٩، ل ١٣٨٧٤). بەو هۆیەشەوە کە ئەم دەشتە بەرین و پڕ دارستان و ساردە، لە سەدەکانی پێشوودا، نەیارانی دەوڵەتی ڕووسیایان تێدا زیندانی دەکرد و وەک دوورگەیەکی تاراوگە لە بەرچاو دەگیرا، بۆیە لەم بەیتەشدا وەک زیندانێکی گەورە ناوی براوە.

بەمەثەل: بەنموونە.

قانوونی مەسیحی: یاسای ئایینی مەسیحی.

عاسی دەبەنێ: خەڵکانی سەرکێش و یاخی و لە یاسا دەرچووی دەبەنێ.

واتە: زوڵفی یارم، کە هەر دەڵێی زیندانی «سیبریا»یە و بەپێی یاسای مەسیحی، دز و جەردە و یاخیبووی دەبەنێ، منیش هەروام بەسەر هاتووە و لە ناو زوڵفی یارمدا گیرۆدە و زیندانی کراوم. تۆ بڵێی بەگوێرەی یاسای مەسیحی، چیم کردبێ و چ جۆرە سەرکێشی و سەرپێچییەکم کردبێ!؟.

«مەحوی» «سیبریا»ی بەمجۆرە ناوبردووە:

پڕ «سیبریا»، بەبێ مەدەدی زاتی کیبریا
ئەسباتت هەیە، نییە شایانی ئیعتیبار
«١٢٣»

### ٣- نێرگسە چاوی؛ بەلا نێرگسی شەهلایە، چ تەرح
### لە نمی ژاڵە بیێتە فەڕ و زیبی چەمەنێ

بەلا: بەڵام.

تەرح: جۆر، شێوە.

نم: تکە (لێرەدا مەبەست لە شەونمە).

زیب: جوان.



واتە: چاوی دڵبەرم هەر لە نێرگسی شەهلا دەچێ. بەڵام لە کامە نێرگس!؟ لەوجۆرە نێرگسەی کە بەشەونمی چاوەکانی، ئەوەندەی تر، جوانیی و فەڕ و بەرەکەت، بەچیمەنی ناو گوڵزار دەبەخشێ.

### ٤- لەبی وەک خونچە و چیهرەی بەمیثالی گوڵی گەش
### گوڵ دەبارێ لە دەمی، خونچە: ئەگەر پێدەکەنێ

واتە: لێوەکانی یارم؛ هەر دەڵێی خونچەن و ڕوخساریشی دەڵێی گوڵی گەشە. بۆیە کاتێ یارم پێدەکەنێ، دەمیشی وەک ئەو خونچەیەی کە تازە دەپشکوێ، ئاوا گوڵی لێ دەبارێ.

«مەحوی» دەڵێ:

خونچە دڵ بوونم لە حەسرەت لێوی تۆیە، خونچە دەم!
خونچەکەی تۆم مەر شیفا دا خونچەکەم، ئەی خونچەکەم
«٢٣٨»

«وەفایی» دەڵێ:

گوتم: قوربان! زەدەی چاوم، شیفای دەردم چییە، بیدە
دەمی خۆی کردە: خونچە و پێکەنی، فەرمووی: کە گوڵ قەندە
«١٢٠»

### ٥- گوڵبونە قەددی؛ بەڵام گوڵبونی شەبنم زەدەیەک
### باغەبان بۆ تەمەعی خونچە، چ دەستی نەکەنێ

گوڵبونە قەددی: بەژن و باڵای گوڵی گرتووە و لەو درەختانە دەچێ، کە گوڵ دەگرێ.

شەبنم زەدە: شەونم لێدراو.

باغەبان: باخەوان.

بۆ تەمەعی خونچە: بەتەماعی خونچە چنین و لێکردنەوە.

واتە: بەژن و باڵای یارم، لەو درەختانە دەچێ، کە گوڵ دەگرێ و گوڵەکانیشی لە شەونمدا شەلاڵن، بۆیە کاتێ باخەوان تەماع دەکاتە گوڵ و خونچەکانی، ئەوەندە تەڕ و شەونماوین، باخەوانەکە خونچە چنینەکەی بۆ ناکرێ.

**٦- سینە وەک ڕەوزە، چ ڕەوزە، کە بەوەعدەی خالق**
**لە جەزای تاقەتی مەقبوولی، گرامی دەچنێ**

ڕەوزە (روضة: عەرەبی): باخی بەهەشت.

وەعدەی خالق: بەڵێنی کردگار.

تاعەتی مەقبووڵ: خواپەرستییەکی پەسەند و قبووڵکراو؛ لە لایەن پەروەردگارەوە.

گرامی: مرۆی مەزن و ڕێزدار.

واتە: سنگ و بەرۆکی یارم لە باخی بەهەشت دەچێ. بەڵام کام باخی بەهەشت؟! ئەو باخی بەهەشتەی، کە خوای گەورە، لە پاداشی خواپەرستییەکی پەسەندکراودا، مرۆگەلێکی بەڕێز و شکۆداری دەچنێ.

**٧- نافە؛ وەک نافە، کە لە ئێرانەوە چاک**
**نوکهەتی موشکی بکەن، ئاهووی دەشتی ختەنێ**

نافە: ناووک.

نوکهەت: بۆن و بەرامەی خۆش، بۆنی خۆش.

واتە: ناووکی یارم، لە ناووکی هەرە بۆنخۆشەکان دەچێ، کە خۆی لە ئێرانە، کەچی بۆن و بەرامەکەی بەئاسانی دەگاتە مامزەکانی دەشتی ختەن.

**٨- مەمکی وا تورتە، وەکو جووتە هەناری نەورەس**
**دەپەڕن؛ گەر لەپڕا دەستی بەقایم بدەنێ**

نەورەس: تازەپێگەیشتوو، فەریک.

واتە: مەمکەکانی ئەوەندە تورت و تەڕن، هەر دەڵێی هەناری تازەپێگەیشتوون، بۆیە ئەگەر لەپڕێکدا و بەتوندیی دەستیان بدرێتێ، دەپەڕن.

**٩- چ بڵێم! چەفتەیی ڕەنگینی لە نێو ڕانی سپی**
**وەک پەڕی لالەیی حەمرایە، لەسەر نەستەرەنێ**

چەفتە: مانای گەلێک زۆرە (بۆ زیاتر ئاگاداریی بنواڕە: دهخدا، بەرگی ٦، ل ٨١٩٣ و...)، بەڵام ئەوەی لێرەدا مەبەستە، بەمانای: کۆمەوە بوو، قۆقز، ماسیاو... دێت.

لالەیی حەمرا: گوڵاڵەسوورە.



نەستەرەن: گوڵی نەستەرەن.

واتە: چۆن چۆنی وەسفی بکەم!؟ کە لە نێوان هەردوو ڕانی سپی یاردا، چی هەیە!؟ هەر دەڵێی پەڕی گوڵاڵەسوورەیە و لەسەر گوڵی نەستەرەن دانراوە.

**١٠- یا لە حەککاکی ئەزەل، نەقشە لە عینوانی تەلیسم**
**صورەتی نوقتە و لایێ، لە عەقیقی یەمەنێ**

حەککاکی ئەزەل: پەیکەرتاشی ئەزەلیی، کردگار.

عەقیقی یەمەن: بەردێکی پیرۆز و گرانبەهای ڕەنگ ئاڵە، لە وڵاتی «یەمەن» دۆزراوەتەوە و هەمان جۆریش لە ڕۆخەکانی زەریای ڕۆم هەن. (بۆ زیاتر زانیاریی، بنواڕە: دهخدا، بەرگی ١٠، ل ١٦٠١٠).

واتە: هەر دەڵێی پەیکەرتاشی ئەزەل (کردگار) بەوجۆرە تەلیسماوییە وێنەی کێشاوە و نەخشاندوویەتی؛ وێنەی نوقتەیەک و دیمەنی (لا)یێکی لە بەردە پیرۆزەی عەقیقی یەمەندا نەخش کردووە.

**سەرنج:** وەک پێشتریش لە جێی خۆیدا وتمان: ئەم غەزەلە و غەزەلی پێشوو: (١١١) نزیکایەتیی زۆریان هەیە، ئەگەرچی ئەویان (١١) بەیتە و ئەم (١٦) بەیت، بەڵام «کێش» و کەشوهەوایان هەر یەک حاڵەتە و ڕەنگە لە بنەڕەتیشدا هەر یەک غەزەل بووبن و لەبەر هەر هۆیەک بووبێ «ئەدەب» هەندێ وردە دەستکاریی لە هەندێ بەیت و ژمارەی بەیتەکاندا کردبێ... سەرەڕای ئەم نزیکایەتییەشیان، هەر بەچاکم زانی هەردووکیان، وەک خۆیان بنووسینەوە. بەڵام ئەو واژە و بەیتانە شەرح نەکەین کە لە غەزەلی پێشوودا شەرحمان کردبوون.

کێش: بەحری ڕەمەل مەخبوون مەحزووف: (فعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن)، وەک نموونەی:

١- هەر گل و سەنگ دبتن ب زێڕ ب تەدبیرێ حەکیم
قابلییەت کو نەبت حکمەتێ ئوستاد دێ چ کت؟
«مەلای جزیری، ١٣»

٢- نەونیهالی قەدی تۆ؛ عەرعەرە، دڵخواهی منە
ڕاستە دڵ دارە، وەلێ حەیفە کەوا بێ ثەمەرە
«نالی، ٤١٢»

٣- خەبەرێکم بدەنێ؛ ئەهلی خەبەر، حەشرە مەگەر!
ڕۆژ، کەوا ئەمڕۆ لە مەغریب سەری هێناوەتە دەر!؟
«کوردی»

**١- شیفتەی سیمبەرێکم، بتی شیرین سوخەنێ**
**هەر وەکو بەرهەمەنان والە بە زیبا وەثەنێ**

بەرهەمەن: پێشەوای ئایینی پیرەوی بەراهمایی، کە یەکێکە لە ئایینە کۆنەکانی هیندستان.

والە: عەڤداڵ، هەڵوەدا.

زیبا: جوان.

وەثەن: بت.



واتە: هەڵوەدا و شەیدای یارێکی وەک بتی لەشولار زیوین و قسە شیرینم؛ وەک ئەو بەرهەمەنانەی عەڤداڵی بتی جوانن.

«مەحوی» «بەرەهمەن»ی بەمجۆرە بەکاربردووە:

١- دڵ عەرشی خودا «مەحوی»، خەجاڵەت بە لەبەر غەفڵەت
کە بۆتە بوتکەدەی بێ بەرەهمەن، یا دەیری بێ ڕاهیب
«٥٥»

٢- گەر بتی ئێمەت نەدیوە، بۆچی دوێنێ دەتپەرست؟
ئەی بورەهمەن، تۆ لە لات ئەمڕۆ کەچیی وەک لاکە: لات
«٦٠»

٣- دەیوت کە بەرەهمەن، مەهی ڕووی ئەم صەنەم دی
گەر بت ئەمە بێ، خزمەتی بتخانە حەرامە
«٢٧٥»

**٢- قامەتی نارەوەنی گوڵشەنە، ئەمما بەقیاس**
**سونبول و سۆسەن و گوڵ بەرگ و بەری نارەوەنێ**

واتە: بەژن و باڵای دار هەناری ناو باخ و گوڵشەنە، بەڵام هەر خۆی دەڵێی گوڵە سونبول و سۆسەن و گەڵای گوڵە و کەچی بەرەکەی هەنارە.

«وەفایی» دەڵێ:

بەو قامەتە حەیرانی شکۆفەی قەد و باڵام
قەد: نارەوەنی باغی گوڵان؛ باغی هەنارە
«١٢٢»

**٣- زوڵفی بۆ مەحبەسی دڵ، شەهری «سەبیرە» بەمەسەل**
**کە بەقانوونی مەسیحی، دز و عاسیی دەبەنێ**

ئەم بەیتەمان لە غەزەلی پێشوودا شەرح کرد.

**٤- تیغی ئەبرۆیی کەشیدەی، لەسەر ئەو چەشمی سیاە**
**وەک دوو شمشێری بڕندەن، بەدوو تورکی خۆتەنێ**

واتە: هەردوو برۆکانی، تیغن و بەسەر چاوە ڕەشەکانییەوە، وەک دوو شمشێری تیژ و بڕندەن، کە بەدەست دوو کچە تورکی جوانی ولاتی (خوتەن)ەوە بن.

**٥- فەوجی موژگانی بەرابەر، بەدوو سەف خستە نیزام**
**وەک سەفئارایی پیران، لە سپاهی پەشەنێ**

سەفئارایی: پۆلێن کردن.

پیران: قارەمانێکی بەناوبانگی «توران» و سەرلەشکری ئەفراسیابی کوڕی وەیسەیە. لە جەنگەکانی نێوان ئێران و توراندا (ئەو جەنگەی سیاوەش-ی تێدا کوژراوە) جوامێرییەکی زۆری نواندووە لە «شانامە-ی فیردەوسی»شدا ناوی پاڵەوانانەی هاتووە. (بۆ زیاتر زانیاریی، بنواڕە: دهخدا، بەرگی ٤، ل ٥٩٠٧).

پەشەن: ناوی ئەو جێگەیەیە، کە تیایدا لەشکرەکانی: «پیران» و «وەیسە» و «توس نەزەر»، جەنگیان کردووە و «توران»یان گرتووە و زۆربەی کوڕەکانی «گودەرز»ی تێدا کوژراوە. ئەم جەنگە، بەجەنگی «لادەن»یش دەناسرێ. (بۆ زیاتر زانیاریی لەم بارەیەوە، بنواڕە: دهخدا، بەرگی ٤، ل ٥٦٥١).

واتە: مژۆڵەکانی؛ وەک پۆلێن کردنی لەشکرەی «پیران»، کردە دوو بەشی وەک یەک و لە لەشکرگەی «پەشەن» دایمەزراندن.

**٦- چەشمی شەهلایی سیەهـ، مەستی خومار ئالوودەی،**
**نەرگسێکە، سەحەری بێتە فرووغی چەمەنێ**

چەشمی شەهلایی: چاوی کەژاڵ.

ئالوودە: تووش بوو.

فروغ: خەرمانە، تریفە، درەوشانەوە.

واتە: چاوە کەژاڵە ڕەنگ ڕەشەکانی، وەک گوڵە نێرگسە وان، کە بەیانیان بەسەرخۆشیی دێتە ناو باخ و چیمەنەوە و دەبێتە فەڕی درەوشانەوەی باخ و چیمەنەکە.



**٧- لەبی وەک غونچە و چیهرەی بەمیسالی گوڵی گەش**
**گوڵ دەبارێ لە دەمی، غونچە: ئەگەر پێدەکەنێ**

ئەم بەیتەمان لە غەزەلی پێشوودا شەرح کرد.

**٨- نوتقی شیرینی بڵێم چۆنە؛ وەکو شەهد و شەکەر**
**چەشمی بەد دوور بێ لە فیرۆزەیی خاڵی زەقەنێ**

نوتقی شیرینی: گفتوگۆی ناسک و شیرینی.

فیرۆزە: بەردە پیرۆزەی گرانبەها.

زەقەن (ذەقەن): چەناگە.

واتە: ئاخاوتنی؛ دەڵێی هەنگوین و شەکرە و خاڵی سەر چەناگەیشی (چاوی بەدی لێ دوور بێ)، هەر دەڵێی فیرۆزەیە.

**٩- گەردەنی هەر وەکو مینایی لەبالەب لە زوڵاڵ**
**چ زوڵاڵێکی! فەقەت جەوهەری جانێ بەتەنێ**

مینایی لەبالەب: بادەی پڕ بەپەرداخ. هەڵبەتە «مینا» بەمانای گەردنی بەرزیش دێت.

زوڵاڵ: سازگار و ڕەوان و لە هەرسیشدا سووک و ئاسان.

بەتەنێ: بەتەنیا، تەنیا و تەنیا و هەر، هەر ئەو و بەس.

واتە: گەردنی؛ هەر دەڵێی شووشەی باریک و بەرزی پڕ لە بادەی سازگارە، بەڵام سازگارێکی چۆن چۆنی؟! سازگارێک وەک گەوهەری گیان!.

**١٠- سینە؛ وەک گوڵشەنی نەسرینە، شکوفتە، ئەمما**
**باغەبان بۆ تەمەعی خونچە، چ دەستی نەکەنێ**

واتە: سنگ و بەرۆکی، هەر دەڵێی باخی نەسرینی پشکووتووە و ئەوەندە جوانە، دەترسم باخەوان، بەنیازی خونچە چنین، دەستی بۆ ببەن.

**١١- جووتێ پستانی؛ وەکو جووتێ هەناری خڕ و تورت**
**دەپەڕن؛ گەر لەپڕێ دەستی بەقایم بدەنێ**

ئەم بەیتەمان لە غەزەلی پێشوودا لێکدایەوە.

**١٢- چ بلێم ناف و شکەم؛ چۆن و چ تەرزن بەسیفەت**
**نافی وەک نافە؛ شکەم: خەرمەنی بەرگی سەمەنێ**

ناف و شکەم: ناووک و سک.

چ تەرزن: چۆن چۆنین.

واتە: ناووک و سکی؛ چی بلێم و چۆن چۆنی باسیان بکەم و بلێم شێوەیان چۆنن!؟ دەلێم: ناووکی، وەک ناووکی ئاسکە و پێستی سکیشی، وەک خەرمانێکە لە پەڕەی گوڵی یاسەمین.

**١٣- بێینە سەر جفتەیی ڕەنگینی، لە نێو ڕانی سپی**
**وەک پەڕی لالەیی، مونەققەشە لەسەر نەستەرەنێ**

ئەم بەیتەشمان لە غەزەلی پێشوودا شەرح کرد.

**١٤- خڕ و پڕ، نەرم و سەمین، وەک فەنەری کاری فەرەنگ**
**جوست و خێزێکی هەیە؛ وەختێ کە دەستی دەگەنێ**

جوست: جووڵە، بزووتن.

خێز: بەرزبوونە لە جێی خۆیدا.

واتە: ئەوەی لە بەیتی پێشوودا ئاماژەی پێکرا: نێوان ڕانی)، ئەوەندە خڕوپڕ و نەرم و قەڵەوە، هەر دەڵێی فەنەری دەستکاری ئەوروپاییە، چونکە هەر کاتێ دەستیان بەردەکەوێ، لە جێی خۆی ڕادەچڵەکێ و دەلەرێتەوە و جووڵە جووڵی پێ دەکەوێ.

**١٥- ئیشتیاقی شەبەقم، هەر شەوە، بەو جفتەیی تەنگ**
**هەر وەکو شەوقی غەریبانە، بەبادی وەتەنێ**

شەبەق: ئارەزووی نێرایەتی بۆ سێکس.

واتە: حەسرەتی سێکسم، لە شەودا، بۆی (بۆ ئەوەی نێوان هەردوو ڕانی، کە زۆر تەنگە)، هەروەکو حەسرەتی کەسانی دوورە وڵاتن، بۆ گەیشتنەوە و دیداری نیشتمانیان.

**١٦- خۆزگە جۆلایی موحیببەت، بەمەکووکێکی نوعوز**
**پوودی وەسڵێکی لەسەر کارگەهی دابتەنێ**

ئەویش هەر تەواوکەری حەسرەتی بەیتی پێشووە و خوێنەر خۆی لێی ورد بێتەوە چاکترە.



## ١٢٧

کێش: بەحری هەزەج مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)، وەک نموونەی:

١- وەک ماه و ستارەت؛ کە ببێ مەیلی هەڵاتن
سەرکردەیی ڕۆژ، ڕەهڕەوی شەو، ڕەهزەنی خەوبە
«نالی، ٣٩٣»

٢- میوەی ئەمەلم کاڵە، بەدوو چاوەیی کاڵی
کاڵای خەیاڵم، هەموو ڕۆیووە بەغارەت
«حەریق، ١٤»

**١- راحێ؛ کە مەزەی عیشق نەدا، زەوقی چ دێنێ**
**عیشقێ کە زیای عەقڵ نەبا، شۆری چ دێنێ!**

ڕاح: خۆشیی، شادمانیی، ئۆخژن، تەسکینی، ژیانەوە، کەیف. لە هەمان کاتیشدا ناوی جۆرە ئاوازێکی مۆسیقاییە (دهخدا، بەرگی ٨، ل ١١٦٨٦). بەڵام «ئەدەب» ماناکانی پێشەوەی مەبەستە.

مەزەی عیشق: تامی ئەوین.

زیا (ضیاء)ی عەقڵ: پرشنگی هزر و مێشک.

واتە: کەیف و خۆشیی و ئۆخژنێک، ئەگەر وەک لەزەتی عیشق، لەزەت بەگیان نەبەخشێ، ئەوە چ لەزەت و خۆشییەکە!؟. عیشقێکیش، کە هۆش لە سەر و لە مێشکدا لانەبات، ئەوە کەی جۆش و خرۆشی عیشقە!.

**٢- ساقی بەسەفا، ساغەری مەی دا بەحەریفان**
**گەر دەهری موعەربەد بەجەفا پێی نەڕژێنێ**

حەریف: هاوکار، هاوپیشە، هاومەشرەب.

دەهر: ڕۆژگار.

موعەربەد: ئەو کەسەی لە کاتی مەستیدا، کۆڕی مەیخواردنەوە دەشێوێنێ و بەدمەستیی دەکا.

واتە: مەیگێڕ، زۆر بەدڵخۆشییەوە، مەی بەدەست هاومەشرەبانەوەدا، ئەگەر چەرخی بەدمەست، بادەکەی پێ نەڕژێنێ.

**٣- جانا وەرە، تا جان بەنیشاری قەدەمت کەم**
**گەر خاکی ڕەهت بێت و لە من گیان بستێنێ**

نیثار: پێشکەش، شاباش.
خاکی ڕەهت: خاکی ڕێگات.

واتە: ئەگەر خاکی سەرە ڕێگات، ببێتە باجگر و گومرگ و بێتە لام داوای باج و شاباشی هەقی هاتنتم لێ بسێنێ؛ ئەوا ئامادەم یەکسەر «گیانم» بکەمە شاباش و پێشکەشی ئەو هاتنەت؛ کەواتە گیانەکەم! تەشریف بهێنە، تا گیان پێشکەش ئەو ڕێگەیە بکەم، کە تۆی پێدا دێیت.

**٤- ماچێ بدە من لەو دەهەنی خونچە میسالت**
**با حەسرەتی سەد ساڵە، لە دڵ هیچی نەمێنێ**

واتە: گیانەکەم! سەد ساڵە! حەسرەتی ماچی دەمتم هەیە و بۆ ئەوەش ئەو حەسرەتە لە دڵم دەرچێ، ماچێکم لەو دەم و لێوە، وەک خونچەیەت بدەرێ.

**٥- ئازوردە دەکەی ئەو دڵی عوششاقە؛ دەترسم**
**جارێکی لەو ئازوردەگییەت دڵ بشکێنێ**

ئازوردە: ئازاردان.
واتە: دەترسێم جارێکی تریش ئەو دڵە عاشقەم، بەهۆی ئەو دڵشکانەتەوە؛ بشکێ.
شاعیران: «سالم»، «کوردی»، «مەحوی» و «وەفایی» «ئازوردە»یان بەمجۆرە بەکاربردووە:

١- خەوفناکە دڵم ئازوردە لە زوڵف
حاڵەتی تەڵخە، لە شەودا بێدار
«سالم، ٥٧»

٢- لەبەرچی وا لە من ئازوردە بووی تۆ؟
نییە ڕەحمەت بەحاڵم، لەب نەباتم
«کوردی، ١٠٨»



٣- کەسی من، گەر کەسن، کەس من نەخاتە فکری ئەو شاهە
بەیادی ناکەسان ئازوردە حەیفە خاطیری عاطیر
«مەحوی، ١٢٧»

٤- قیامەت بۆ دڵان هەستا، کە چاوی مەستی وەرگێڕا
مەگەر ئازوردە بوو ساقی، کە بەزمی مەیکەشان ڕۆیی
«وەفایی، ٢٠٧»

**٦- هێندەی مەنوێنە ڕوخی ئاینیە؛ مەبادا**
**ئاهی دڵی مەزلووم، بەڕووتی بنوێنێ**

مەبادا: نەوەکو، نەک.
ئایینە: ئاوێنە.

واتە: ئەوەندە لە بەرئاوێنەدا، خۆت بەڕازاوەیی ڕامەگرە، با ئەم دڵە پڕ ئازار و پڕ حەسرەتەم ئەوەندە بەحەسرەت و ئاهی دیدارتەوە ئازار نەچێژێ و ئاه و سکاڵام نەگاتە لای خودا و خوا تۆڵەی منت لێ نەسێنێ.

یان: دڵم؛ کە ئاوێنەی ڕووی تۆیە، ئەوەندە خۆتی تێدا نیشان مەدە و بەو خۆنیشاندانانە، بەحەسرەتەوەم ئازار مەدە، نەک ئاهی ئەم حەسرەتانەی من، خوا تۆڵەت لێ بکاتەوە.

یان: ڕوخسارت، کە وەک ئاوێنەیە، ئەوەندە ئێمەی ئازار چەشتووی دیدارتی تێدا نیشان مەدە، نەوەکو خوا تۆڵەی ئەم حەسرەتانەمان لە ڕوخسارت بکاتەوە.

«نالی» دەڵێ:

لە ئاوی چاوی مندا خۆت ببینە
لەباتی مەنزەرە و ئاوێنە، قوربان

«سالم» دەڵێ:

تابی کوا ئاوێنە، ڕووی تۆی بێتە ناو
گەر لە سەنگ بێ؛ نەقشی تۆ دەیکا بەئاو
«١٠٨»

**٧- ساقی بەخوم و دەن، بە«ئەدەب» مەی بدە، ئەمما**
**جورعێکی لەبەر شێخ، کە ئەو مەستە ببینێ**

خوم و دەن: کووچە و گۆزە.

جورعێک: قومێک.

واتە: کاکی مەیگێڕ! بەکووپە و گۆزە، مەی بە«ئەدەب» بدە و قومێکیش بەو شێخە بدە، با کەمێک مەست ببێ و بەمەستیی ئەو شۆخە ببینێ، بزانین چۆن درۆ و ڕیاکاریی لێ دەردەکەوێ!. واتە: بابزانین کە شێخ مەست دەبێ، چۆن حەقیقەتی خۆی دەردەخا و چۆن شەیدای ئەو شۆخە دەبێ!.

«مەحوی» دەڵێ:

ببینن گەر لە ساقی: ناز و عیشوێک، ئێمە دەیبینین
بەمەی نۆشیی دەدەن فتوا، بەمەستیی موفتیی و قازیی
«٣٠٥»

شاعیران: «سالم»، «وەفایی» و «حەریق» واژەی «سەبوو» بەمجۆرە بەکار هێناوە:

١- مەستیی من، وەرایی یارانە
ساقیا! خوم بدە بەجامی سەبوو
«سالم، ١١٦»

٢- غافڵ مەبە بۆ ڕابیطەیی گەردەن و چاوی
مەی بگرە «وەفایی»، کە ئەمە جام و سەبووتە
«وەفایی، ١١٨»

٣- نەوەک مەیخانە خاڵیی بێ، هەتا پیری موغان ماوە
سەرم قوربانت ئەی ساقی! گەلێ تینووم «سەبوو» بێنە
«حەریق، ٥٥»





کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم: (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)، وەک نموونەی:

١- حەبیبێ بێ خەتا کوشتم، ب دەربا فورقەتێ ئاخر
ژ وێ ڕۆژێ دی زانی من، کو بار ئەو نیر ل جەرگێدا
«مەلای جزیری، ٣٩»

٢- لە هەمدەرت مەکە وەحشەت، وەرە بلبل ڕەفیقت هات
بناڵین با بەجووت هەر یەک، ڕەهەندەی گوڵعوزارێکین
«سالم، ٩٦»

٣- هەتا شەقەقەی فەلەک نەبووە بەکافووریی کفن، هەستە
کە ئەمشەو فرسەتە، هێشتا فەلەک ماویی، ئەتۆش ماوی
«نالی، ٦٨٤»

**١- دڵئارامـا چ زیبایی، دڵئازارا چ ڕەعنایی**
**چ دڵکەش چیهر و سیمایی، چ سەرکەش قەدد و باڵایی**

دڵئارام: مایەی ئارامی دڵ.

دڵئازارا: پێچەوانەی دڵئارام، دڵئازاردەر.

ڕەعنا: زراڤ، باڵا بەرز.

دڵکەش: دڵکێش.

چیهر: ڕوخسار.

سیما: ڕوو، ڕوخسار.

**٢- شەکەر لەب، شاهیدی شیرین، بتی چین، لوعبەتی ماچین**
**سەراپا سۆسەن و نەسرین، چ لەب نووشین دڵئارایی**

شەکەر لەب: لێو شیرین.

شاهید: مانای زۆرە؛ بەڵام لێرە بەمانای«شێوە شیرین»و«ئێسک سووک»و منداڵی جوانی بەهەشتیش دێت(بۆ زیاتر زانیاریی لەم بارەیەوە، بنوارە:دهخدا، بەرگی ٩، ل ١٤٠٧٢).

لوعبەت: بووکی ڕازاوە.

لەب نووشین: ئەوەی کە لێوی بۆ مژین خۆش و شیرینە.

**٣- خوداوەندا چ مومتازی، چ شۆخ و شەنگ و غەممازی**
**چ دەمسازی، چ هەمڕازی، چ تورفە مەجلیس ئارایی**

مومتاز: هەڵبژاردە، ناوازە، نایاب، سەرتۆپ.

غەمماز: ئەوەی چاوی پڕە لە سەرنجی تیلاویی و ناز و عیشوە.

دەمساز: هاودەم.

هەمڕاز: هاوڕاز.

تورفە: ناوازە و سەمەرە و نایاب.

مەجلیس ئارا: ڕازێنەرەوە و ئارایشگای کۆڕ و کۆمەڵ.

**٤- دزی دڵ، ئافەتی جانی، قصوری عەقڵی ئینسانی**
**فتوری زوهد و عیرفانی، فەسادی دین و دنیایی**

ئافەتی جان: مایەی دەردەسەریی گیان.

قصوری عەقڵی ئینسانی: سۆنگەی لە دەستدانی هزر و فیکری مرۆ.

فتوری زوهد و عیرفان: خواپەرستی و ئاییندارییی دەشێوێنێ.

فەسادی دین و دنیایی: مایەی لەناوبردنی ئایین و دنیایت.

واتە: دڵبەرەکەم؛ دڵ دەدزێ و دەردەسەریی بۆ گیان ساز دەکات و مایەی کزکردنی هۆش و هەستی مرۆیە؛ سۆنگەی ئاژاوەی خواپەرستی و ئاییندارییە، هۆی خراپکردنی دین و دنیاشە.

«کوردی» دەڵێ:

تووشی یارێ هاتووم: سەححار و دز و حیلەباز
تورک ڕەفتار و تەبیعەت کافر و سۆفی نوما



**٥- بەصورەت ماهی ئافاقی، بەمەعنا جانی موشتاقی**
**چ خۆش ئاداب و ئەخلاقی، چ مەحبووبی، چ زیبایی**

بەصورەت: بەشێوە، بەدیمەن.

ماهی ئافاق: مانگی ئاسمان (ئاسۆ).

بەمەعنا: بەناوەرۆک، بەگەوهەر.

جانی موشتاق: گیانی حەسرەتاوی و عەڤداڵ.

**٦- چ بێ دینی، چ بێ ئیمان، چ بێ بونیان، چ بێ ئەرکان**
**چ بێ شەرتی، چ بێ پەیمان، چ بەد عەهدی، چ بەد ڕایی**

بێ بونیان: بێ بناغە، بێ ڕەچەڵەک.

بێ ئەرکان: بێ بنچینە.

بەد ڕا: بێ پەیمان.

**٧- بەعاریز: مەعجەری پشکۆ؛ بەگێسوو: گوڵشەنی شەوبۆ**
**ئەگەر حەققەت دەوێ ئەمڕۆ، لە دنیا تاق و تەنهایی**

بەعاریز: بەڕوخسار.

مەعجەری پشکۆ: ئاگردانی پڕ لە پشکۆ، مقەڵی.

بەگێسوو: بەزوڵفەکانتا.

گوڵشەنی شەوبۆ: باخی شەوبۆ، گوڵجاڕی شەوبۆ.

واتە: بەڕوخسار، هەر لە ئاگردانێکی پڕ لە سکڵ و پشکۆ دەچیت. بەزوڵفەکانیشتەوە: لە گوڵجاڕێکی گوڵە شەوبۆ دەچیت. بۆیە ئەگەر ڕاستت دەوێ، نموونەی تۆ، لە دنیادا نییە و تۆ تاقانەی هەموو دنیایت.

**٨- لە مەغریب تا بەماچینت، موسەخخەر بوو بەئایینت**
**منیش هاتوومە سەر دینت، ئەگەر سەد کە نەصارایی**

لە مەغریب تا بەماچین: لە خۆرئاواوە تا هەرێمی ماچین.

موسەخخەر: داگیرکراو.

واتە: شێوە و ڕەوشت و ئاکارت، جۆرێکە تایبەت و کەچی هەر لە خۆرئاواوە تا وڵاتی چین، کەوتوونەتە ناو بازنەی ئایینەکەتەوە؛ بۆیە منیش وەکو هەموو ئەو خەڵکە، ناچارم بێمە سەر ئایینت، ئەگەرچی لە سەدا سەدیش دڵنیام، کە ئایینەکەت لە ئایینی من جیاوازە و ئەوی تۆ: ئایینی مەسیحاییە.

**٩- نەخۆشی دەردی هیجرانم، ئەتۆی دەرمانی دەردانم**
**وەرە ئەی ڕاحەتی جانم، کە بۆ من، تۆ مەسیحایی**

واتە: گیانەکەم! نەخۆشی دەردی دووریتم و هەر خۆشت دەرمانەکەیت. کەواتە خێرا بمکەرێ، ئەی مایەی سوکنایی و ئۆخژنی گیان و نەخۆشیی گیانم و دەزانم تۆ بۆ من، کە لە تاو دووریت، لە سەرەمەرگدام، وەک موعجیزەی مەسیحیت بۆ من و هەرکە بمگەیتێ؛ دەمودەست چاک و زیندووم دەکەیتەوە.

**١٠- وەرە ئەی ماهی تابانم، ببە جارجارە میوانم**
**کە دەتکەم تاکو دەتوانم، بەجان و دڵ پەزیرایی**

پەزیرایی: خزمەتکردن و پێشوازیی.

**١١- وەرە ئەی یاری دڵدارم، ببە ساتێ بەخەمخوارم**
**بپرسە حاڵەکەی زارم، بزانە دەردی سەودایی**

واتە: ئەی دڵبەرەکەم! هیچ نەبێ هەر ساتێک خەمخۆرم بە و لە نەخۆشیی و دەردەکەم بپرسە، بزانە حاڵی شەیدابوونی ڕاستەقینەی مرۆ، چۆن چۆنییە!.

**١٢- وەرە ساتێ بەڕەعنایی، ببینە حاڵی شەیدایی**
**بڵێ چۆنە بەتەنهایی، «ئەدەب» بێ من، شەکیبایی**

شەکیبایی: ئارام و خۆڕاگریی و پشووی درێژ، لەبەر قورسایی نەخۆشیدا.

واتە: گیانەکەم! هەر تەنیا ساتێک، بەو باڵا زراڤەتەوە، سەرێکم لێ بدە، بزانە سەودایی و شەیدایی بوونم بەتۆوە، چی لێ کردووم و بزانە «ئەدەب» بەم دەردی سەوداییەی خۆتەوە، چۆن بەتەنها دەناڵێنێ و چەندیش لە ژێر باری ئەم دەردە سەختەدا (دەردی شەیدایی)، پشووی درێژە و دان بەخۆدا گرتووە و چەند بەئارامە!.



## ١٢٩

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم: (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)، وەک نموونەی:

١- هەچی فورقەت نەدی هجران نەبێ من داغ و کەی لێنە
ژ ب ل دەربێ دی هجرانێ، فراقێ روح و جان کێ دا
«مەلای جزیری، ٣٦»
٢- سەدای گریانی خۆم و دەنگی ناڵەی دڵ؛ لە دەس هیجران
وەها دێ، موتتەسیل، شەو، هەر دەڵێی زەنگی زوارێکێن
«سالم، ٩٦»
٣- وەرە ئەم نیکتەیە من پێت بڵێم «نالی» ئەگەر فەرضەن
هەموو دنیات ببێ، هێشتاکو هەر حەیران و داماوی
«نالی، ٦٩٠»

**١- ئەرێ تەرسا بەچە، گورجی ڕەوش، مەزهەب مەسیحایی**
**فەرەنگیی خووی، نەصارا تینەتی گەبری کلیسایی**

تەرسا بەچە: ئەی مەسیحی زادە. بەزەرتوشتی زادەش دێت.
گورجی ڕەوش: ئاکار «گورجستان»یانە.
مەزهەب مەسیحایی: ئایینی مەسیحی.
فەرەنگیی خوو: ڕەوشت و خوو ئەورووپاییانە.
نەصارا: فەلە، دیان.
تینەت (طینە): هەوێن.
گەبر: گاور.

**٢- بەڵای ئێران و فیتنەی ڕۆم و شۆخی تورک و ماهی کورد**
**نیگاری بەڵخ و شاهی هیند و تورکی چین، بەڕەعنایی**

بەڵای ئێران: ئەو جەنگ و داماویی و برسێتییانەی ئێران، بەهۆی جەنگەکانی لەگەڵ ڕووسیا و عوسمانی و ئاکامەکانی ئەو جەنگانە لەسەر ئەستۆی خەڵک.

فیتنە: بەڵا، دەردەسەریی، هەرا، پشێویی.

ڕۆم: مەبەست لە ئیمپراتۆری عوسمانییە.

شۆخی تورک: کچانی جوانی تورک؛ کە لە جوانیدا بەناوبانگن.

ماهی کورد: مانگی کورد (کە دیارە مەبەستی لە کچانی جوانی وەک مانگی کوردن).

نیگاری بەڵخ: دیسان مەبەستی لە کچانی وڵاتی «بەڵخ»ە، کە لە سەیرکردن و تیلەی چاوی سیحراویی و پڕ نازدا بەناوبانگن.

شاهی هیند: شاهانی وڵاتی هیندستان، کە لە خۆ جوان ڕازاندنەوەدا بەسەلیقە و بەشکۆن.

تورکی چین بەڕەعنایی: کچانی تورکی وڵاتی چین؛ کە لە باڵابەرزیدا ناودارن.

**۳- مونەققەش صورەت و ڕەنگی، مەگەر ئەرتەنگی ئەرژەنگی**
**مقەووەس ئەبرۆی مشکین، مەگەر تەصویری لەو شایی**

مونەققەش صورەت و ڕەنگی: ڕوخسار و شێوە ئارایشکراوی ڕەنگاوڕەنگ.

ئەرتەنگ و ئەرژەنگ: یا: ئەرزەنگ، یا: ئەرثەنگ: بەهەموویان ناوی ئەو کتێبەن؛ کە نیگارکێشی بەناوبانگ «مانی»، بەرنامەی نیگارکێشیی خۆی، بەشێوەی وێنەی ڕەنگاوڕەنگ، تێیدا باس کردووە و نەخشاندووە. هەندێ جار ئەم کتێبە «کارنامەی مانی»یشی پێ دەڵێن و هەموو بەهرە و سەلیقە و توانای وێنەکێشان و نیگارکێشیی خۆی لەم کتێبەدا یادداشت کردووە. (بۆ زیاتر زانیاریی لەم بارەیەوە، بنواڕە: دهخدا، بەرگی ۲، لاپەڕەکانی: ۱٦٥۱ و ۱۸۳۰). وەک لە یادمان بێ، لە زۆرینەی شیعری کلاسیکی کوردیدا، ناوی مانی، وەک نیگارکێشێکی ناودار و ناوازە، هاتووە.

مقەووەس: کەوانەوە بوو.

ئەبرۆ مشکین: برۆی بۆن خۆشی وەک میسک.

مەگەر تەصویری لەو شایی: دەبێ خۆت بۆ گۆوەند و شایی ڕازاندبێتەوە!. (ئەم ڕستەیەم هەر بەم مانایە بۆ لێکدرایەوە و: لەو شایی-م هەر بە: لەو شاییە بۆ خوێندرایەوە)...



**٤- مەگەر هەمسایەیی نووری، لەتیف و نەغز و مومتازی**
**مەگەر هەمزادەیی حوری، زەریف و شاد و زیبایی**

هەمسایەی نوور: دراوسێ و هاوماڵی ڕووناکیی.

لەتیف: ناسک و نازدار.

نەغز: جوانی بێ وێنە. (دهخدا، بەرگی ١٤، ل ٢٢٦١٢).

مومتاز: هەڵبژاردە، نایاب، سەرتۆپ، ناوازە.

هەمزادەی حور: هاوزایین و هاولەدایکبووی پەری، دووانەی پەری، جمکانەی فریشتە.

زەریف: شیرین.

زیبا: جوان.

واتە: دەبێ تۆ دراوسێی ڕووناکیی بیت، ئاوا ناسک و نازدار و جوانی بێ وێنە و هەڵبژاردەیت!؟ یان لەگەڵ پەری و فریشتەدا و بەسکێک لە دایک بوون، ئاوا شیرین و جوانیت!؟.

**٥- سیپهیرم رام و هەمدەم، جام و واعیز: دڵبەری تازی**
**خودارا ساقیا تێکە؛ لە مینای بادەی صەهبایی**

سیپهر: ئاسمان.

رام: هۆگر و ماڵیی و دەستەمۆ.

هەمدەم: هاودەم.

جام: دەفری بادە.

واعیز: ئامۆژگاریکار.

تازی: چەند مانایەکی هەیە: ١- چادر و ڕەشماڵ نشین. ٢- عەرەب. ٣- تازە. کە لێرەدا «ئەدەب»، وەک دیارە، هەر «عەرەب»ی پێ مەبەستە و هەر واش دەخوێنرێتەوە. هەرچەندە واژەکە زۆرتر بۆ دوو مانای یەکەم و دووەم، لە بەرچاو دەگیرێ و بەهەردووکیشیان هەر مەبەست لە ڕەگەزی عەرەبە و ماناکەش لەوێوە هاتووە، گوایە عەرەب لە نەژادی «فەرزانە کوڕی بەهرام کوڕی فەرزانە فەرهاد تاز» کەوتوونەتەوە و ئەمیش کوڕی «سیامەک کوڕی میشی کوڕی کەیومەرث» بووە و باوکی سەرلەبەری ڕەگەزی عەرەب نەژادە؛ هەروەک چۆن ڕەگەزی هەموو «عەجەم» بۆ سەر «هۆشەنگ شا»

دەگەڕێننەوە. هەندێ کەسیش پێی وایە کە «تاژ» و «تاز» بەمانای چادرنشینانن و ئەم واژەیە لە بەرامبەر «جووتیاری گوندنشین»دا بەکار دەهێنن. بەم پێیەیە: «تازی» بۆ چادر و ڕەشماڵ نشینان و «جووتیار»یش بۆ گوندنشینان بەکار دێ. هۆیەکەش ئەوەیە کە «عەرەب» لە سەرەتا و دێرزەمانەوە، لە ڕەشماڵدا ژیاون و پاشان وردە وردە واژەی ڕەشماڵ نشین بەپاڵ عەرەب درا و گەلانی دنیا، ڕەگەزی عەرەبیان بەتازی دەناساند. هەرچەندە وڵاتێکی وەک «چین»، ڕەگەزی عەرەب بە«تاش» دەناسێ و ئەمانیش هەر لە «تازی» و «تاژی» فارسییانەوە وەرگرتووە.

هەر لەم بوارەدا نووسەری ناسراوی ئێرانی «ملک الشعراء: بەهار» دەڵێ: لە پێشدا خەڵکی ئێران، بەهەموو کەسێکی بیانییان دەوت: «تاچیک»، یان: «تاژیک»، هەروەک چۆن یۆنیانیای دێرینە، بەخەڵکانی بیانییان دەوت: «بەربەر» و ڕەگەزی عەرەبیش لە کۆندا بەخەڵکی ئێرانیان وتووە: «عەجەم»، یان: «عەجەمی». (بۆ زیاتر ئاگاداریی لەم بارەیەوە، بنوارە: دهخدا، بەرگی ٤، ل ٦٢٥٩).

واتە: ئاسمان هۆگر و هاودەمە، پیاڵەی بادەکەم لە شێوەی یارم دەچێ و واعیزیش لە شێوەی عەرەب دەچێ. هادەی مەیگێڕ! لەو مەیە مینایی و نایابەم بۆ تێکە.

«مەحوی» دەڵێ:

وەرنە سەیری سەرخۆشان! ئەو شۆخی مینا گەردنە
بوو بەساقی، دەم بەشەککەر خەندە دێ، مینا بەکەف
«١٧٤»

**٦- سەر و ڕوو شۆخ و شیرینی و شەکەر لەب شاهید و شەهدە**
**دلێر و دلبەر و دلدار و دلسەخت و دلئارایی**

سەر و ڕوو: سەر و ڕوخسار.
شەکەر لەب: لێو وەک شەکر شیرین.
شاهید و شەهد: جوان و هەنگوین.
دلسەخت: دلڕەق.
دلئارا: مایەی ئارامی دڵ.



**٧- بەزوڵف و ئەبرۆ و موژگان و خەت و پەرچەم و باڵا**
**کەمەند و تیغ و تیر و جەوشەن و خەفتان و واڵایی**

کەمەند و تیغ و تیر و جەوشەن و خەفتان: چەکی جەنگیی کۆنن؛ کە «جەوشەن» و «خەفتان» لە شێوەی (زرێ)دا بوون.

شاعیران: «سالم»، «کوردی» و «وەفایی» واژەی «جەوشەن»یان بەمجۆرە بەکار هێناوە:

١- ڕووبەڕووی دڵ، دڵبەرم کێشاویە شمشێری برۆ
حەلقە حەلقە، سیلسیلەی زوڵفی، بەمیثلی جەوشەنە
«سالم، ١٣٢»

٢- وەک خەنجەری «ذی الجەوشەن» تا ڕۆژی حەشر دەتکێ
خوێنی دڵی مەزڵوومان، لەو ناوەکی موژگانت
«کوردی»

٣- تاقە ئەبرۆی تۆ، بەخوێنڕێژیی بەدوو زوڵفی سیاه
خەنجەری «ذی جەوشەنە»، عیشوە و ئیشارەی جەوهەرە
«وەفایی، ١٢٣»

**٨- بەکوڵمە و ڕوومەت و ڕان و بەمەمک و سینە و گەردن**
**عەقیق و لەعل و یاقووت و دوڕ و بللوور و مینایی**

عەقیق و لەعل و یاقووت و دوڕ و بللوور: هەموویان بەردە پیرۆزەی جوان و گرانبەهان.

**٩- جەسوور و چابوک و چالاک و جوست و جەڵد و طەڕاڕی**
**غەیوور و ڕووگەش و بەدخوو، حروون و توند و خودڕایی**

جەسوور: ئازا و چاوقایم و جەربەزە.
جوست: بزێو و پڕ لە جووڵە.
جەڵد: دلێر.
طەڕاڕ: ئەوەی شت دەدزێ و دەفڕێنێ، قۆڵبڕ و دەستبڕ، عەییار (دهخدا، بەرگی ١٠، ل ١٥٣٩٨).

غەیوور: فیزاوی.

حەروون: مایین و ئەسپی سلّوک و سەرکێش و چەمووش. (دهخدا، بەرگی ٦، ل ٨٨٩٢).

خودرِا: لەسەر قسەی خۆی پێدادەگرێ و قسەی کەسی تر نابیستێ.

**١٠- جەفا ئاداب و بێ میهری، جیهان ئاشووب و عەییاری**
**خەتاکار و جەفاداری، ستەم کردار و هەرجایی**

جەفا ئاداب: ڕەوشتی ئازاردانی خەڵک.

جیهان ئاشووب: فیتنەی جیهان.

هەرجایی: ئەو کەسەی شوێنێکی دیاریکراوی نییە و هەر دەمەی لە جێگەیەکە.

**١١- مەکەن مەنعی «ئەدەب» یاران؛ لە دنیادا بەمەجنوونی**
**مەگەر بازاڕ و سەودایە و هەزاران باری ڕسوایی**

واتە: گەلۆ! سەرکۆنەی «ئەدەب» مەکەن و دەست مەخەنە کارییەوە و بیەڵن با هەر شێت و شەیدا بم، چونکە لە جیهانی شەیدایی و سەودایی و هەڵوەدا بووندا، هەزاران باری شەرمەزاریی و ڕسواییش لە ڕێگەدایە و دەربەستی هیچیان نابم و ئامادەی لە ئەستۆ گرتنی هەموو بەدناوی و شەرمەزارییەکم.



### ١٣٠.

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن سالم: (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)، وەک نموونەی:

١- خەدەنگا فورقەتی رەعدە، دلێ ئەو غەفلەتێ لی دت
دبیژم وەر جەبەل بت ئەو بکەر بت وێ دگاڤێدا
«مەلای جزیری، ٣٦»

٢- کە جێگەت بۆ عیبادەت بێ، چ فەوقانیی، چ تەحتانیی
کە حوببت بۆ سیادەت بێ، چ«بەرزنجی»، چ «باراویی»
«نالی، ٦٨٩»

٣- لە سایەی دەوڵەتی ساحیب مەکان و ئاشنام دەسکەوت
لە کۆی جانانەدا دایم لەگەڵ سەگ؛ یاری غارێکێن
«سالم، ٩٦»

**سەرنج:** وەک پێشتریش لە جێی خۆیدا ئاماژەمان پێ کردبوو، ئەم غەزەلە و غەزەلی پێشوو (١١٥)، جگە لەوەی بەیتی یەکەم و «کێش»ەکانیشیان (بەتایبەتیش بەیتی یەکەم، هەر ئەو وێنە و واژانە بەسەر دەکەینەوە، کە لە غەزەلی پێشوودا نەبوون).

**٢- ئەرێ ئەی ئەرمەنی زادەی، حەسەب مەئمەن، مەزەب تەرسا**
**ئەرێ ئەی لوعبەتی سادا، موغ ئادابی کلیسایی**

ئەرمەنی زادە: بەچکە ئەرمەنی.

حەسەب: بنەچەی بنەماڵە (لە باوکەوە).

حەسەب مەئمەن: بنەچەی جێی دڵنیایی.

مەزەب (مەزهەب): ئایین، باوەڕ.

تەرسا: پێڕەوانی ئایینی مەسیحی. (وتمان: زۆر جار پێڕەوانی ئایینی زەرتوشتیش دەگرێتەوە).

لوعبەتی سادا: بووکی ساکار و سادە.

موغ: ئاگرپەرست، پێڕەوی ئایینی زەرتوشت، کە لە ئاڤێستادا بە«مەگۆ» و «ماگا» و لە

پارسی کۆندا بە«ماگۆ» و لە پەهلەویدا بە«ماگو» هاتووە (دهخدا، بەرگی ١٤، ل ٢١٢٠٤).

موغ ئادابی کلیسایی: ئەو زەرتوشتییەی لە کلێسای مەسیحیدا پەروەردە دەبێ.

**٣- جەفا وەرزی، وەغا پیشە، ئەلەم بەخشی، بەڵا باڵا**
**خەتاکاری، دڵئازاری، جەفا کرداری هەرجایی**

جەفا وەرز: جەفا پیشە، ئەو کەسەی کە پیشەی هەر ستەم کردن و جەفا نواندنە.

وەغا: جەنگ و شەڕ و هەرا.

وەغا پیشە: جەنگاویی، شەڕانی.

ئەلەم: ئازار.

ئەلەم بەخش: ئازار بەخش.

بەڵا باڵا: وەی و کێشەی گەورە و فەرتەنەی گەورە، شەڕی لابەلای قەبە و گەورە.

**٤- هەتا کەی من لە دەستانت، لە بەندی میحنەت و غەمدا؟**
**هەتا کەی من لە هیجرانت، لە قەیدی ناشەکیبایی؟**

واتە: تا کەی بەدەستتەوە لە گیروداری غەمدا بم!؟ تا کەی لە دووریتدا، لە پێوەندێکی پشوو درێژانەدا، دان بەخۆمدا بگرم!؟.

**٥- هەتا کەی کیبر و نازی تۆ، بەیادی ڕاز و بازی تۆ**
**بەدۆشی بوردەباری خۆم بکێشم من بەخۆڕایی؟**

کیبر: خۆ بەگەورە زانین.

دۆش: ئەستۆ، شان، ئۆباڵ.

بوردەباری: لە بنەڕەتدا واژەکە (بەردە + بار)ە و بەمانای ئەو کەسانەی دیل و بەردە بوون و (بار) و (کار)یان لە ئەستۆ بووە و دەبووایە کارەکە ئەنجام بدەن، ئیتر کارەکە زۆر بووبێ، یان بەردەوام بووبێ. بۆیە دواتر مانای واژەکە وا کەوتەوە کە مەبەست لە «پشوو درێژیی» و «خۆڕاگریی» و «بەئارام» و ئەوجۆرە مانایانە بێ (دهخدا، بەرگی ٣، ل ٤٥٥٢).



**٦- هەتا کەی ئەی شەهی خوبان، دەگەڵ زومرەی غوڵامانت**
**بەو ئەندازە، کە بێ لوتفی، ئەوەندە بێ موحابایی؟**

شەهی خوبان: گەورەی چاکان، شای چاکان.

زومرە: دەستە، پۆل.

غوڵامان: کۆی غوڵامە و بەمانای نۆکەر و خزمەتکار.

موحابات: پشتیوانیی و هاوکاری و چاودێری و پارێزگاری کردن و ئەمجۆرە مانایانە دێت، کە لێرەدا «ئەدەب»، لای دڵبەرەکەیەوە، پێچەوانەکەی بەرامبەر دەکرێ.

واتە: ئەی شای چاکان و باشان! من کە لە دەستەی خزمەتکار و نۆکەرانی تۆم، بۆچی تا ئەو ئاستە بێ سنوورە، بەرامبەرم نامیهرەبان و ناهاوکار و ناچاودێر و ناپارێزگاریت!؟.

«وەفایی» دەڵێ:

ئاخر ئەی سوڵتانی خوبان، تابەکەی نامیهرەبانیی؟!
چاکە مەحروومم نەفەرمووی، یا خیتابێ، یا عیتابێ «١٧١»

**٧- نە ئاخر دڵبەرا جارێ، بەدەردی بێ عیلاجیی من**
**شیفا دەستێکی عیسایی، موداوایێکی سینایی**

دەردی بێ عیلاجی: دەردی بێ دەرمان.

شیفا: چارە.

دەستێکی عیسایی: ئەو دەستە موعجیزاوییەی حەزرەتی عیسا، کە مردووی پێ زیندوو دەبووەوە.

موداوا: دەرمانکردن.

سینا: مەبەست لە «ئەبو عەلی کوڕی سینا» پزیشکدانی ناودارە، کە بە«شیخ الرئیس» دەناسرێ (بۆ زیاتر زانیاریی: بنوارە: دهخدا، بەرگی ١، ل ٨١٤ - ٨٣٢).

واتە: ئاخر گیانەکەم! چۆن وادەبێ؟ تۆ خۆت ئاگات لێمە، من وا بەم دەردی ئەوینەی تۆوە (کە دەردی بێ دەرمانە)، دەناڵێنم و دەتلێمەوە و چونکە دەردەکەش هەر لە خۆتەوە تووشم بووە، هەر خۆشت دەتوانیت چارەم بکەیت و موعجیزەی دەستێکی عیسایی، یان دەرمانێکی لەوانەی «ئیبن سینا»م بۆ پەیدا بکە و چارێکم بۆ بدۆزەرەوە.

**٨- هەتا تاب و تەوانا بوو، لە باری خەم نەبوو ماڵم**
**لە دیدارت-کە چی دەیکەم- نەما تاب و تەوانایی**

تاب: هێز و توانا و ورە، گوڕ.

واتە: هەتا توانا و گوڕم تێدا بوو، هەر چییەکت پێ دەسپاردم، لە ئەستۆم دەگرت و بەتەنگ خەم و کەم هێزییەوە هاوارم نەبوو؛ بەڵام ئیتر توانا و بڕستم لێ براوە و ناتوانم سەردانت بکەم، چونکە دەردی دووریی، هیچ هێزێکی تیامدا نەهێشتووە.

**٩- هەتا ئەو گەنجی زیبایی، دووسەد ئەووەڵ بەجێ بێنە**
**کە هەر پێنج و دوو ڕۆژێکە، دەوامی گەنجی زیبایی**

گەنجی زیبایی: سەرمایەی جوانیی.

دووسەد ئەووەل بەجێ بێنە: هەرچی کە لە هەرەتی جوانیتدا شک دەبەیت، لەباتی جارێک، دووسەد جاری بەکار بهێنە.

واتە: هەتا هەرەتی جوانیی لە دەستتدایە، بەزیادەوەی بنوێنە، چونکە سەرمایەی جوانیی، هەر ماوەیەکی زۆر کورتە و زۆر خێراش لە دەستت دەچێ.

«نالی» دەڵێ:

عەجەب ماوم ئەی دڵەی غافڵ، کە مووێکە
لەسەر ئەم ئاگرم داناوی، هێشتا هەر نەبرژاوی
«٦٨٠»

«مەحوی» دەڵێ:

بەچی، بۆچ ئەم غوروور و کیبر و نازە، دەبیە تۆزێ خاک
بەئەسڵ و فەصڵ ئەنازیی؟ چۆرە ئاوێک ئەسڵتە و ئەووەڵ
«٢١٠»

«هەردی» دەڵێ:

ئەی دیدەپەری! بەو دەمە، بەو کوڵمە گوڵینە
بۆکەس نییە تا سەر، ئەوەرێ: ئەم گوڵی ژینە
تا سەر نییە ئەم نازە، وەها دووری مەبینە
ئەو چاوە گەلاوێژە، خەڵاتی کە برینە!



ئەو زوڵفە، کە ئێستاکە دوو توێی عەنبەری چینە
ڕۆژێکی کە دێ، تێکەڵی توێی خاکی زەمینە
ئەو گەردنە بێگەردە، کە وەک تەختی بلوورە
ئەو لێوە، کە وەک خونچە تەڕ و ناسک و سوورە
ئێستاکە بەبێ ڕەحمیی سزای جەور و فتوورە
لای وایە، کە ژین فانی نییە و ڕێگەی دوورە
نایزانێ: کە هەر پەنجەیێ لەم خاکی زەمینە
کوڵمی دە هەزار (لەیل) و دەمی سەد (مەم و زین)ە
«٥١»

**١٠- هەتا کەی گوڵعوزاری من، لە هیجرەت ڕۆزگاری من**
**وەکو زوڵفی پەرێشانت، پەرێشان بێت و سەودایی**

گوڵعوزار: ڕوخسار وەک گوڵ.

واتە: ئەی دڵدارە ڕوخسار گوڵینەکەم، ئەم ژیان و ڕۆژانەی ژیانم، کە وەک قژ و زوڵفی تۆ، بەیەکدا چووە و ئاڵۆز و پەشێوە؛ تاکەی بەم دار و پەرێشانییەوە دەمهێڵیتەوە!؟.

«وەفایی» دەڵێ:

گا پەرێشانی ڕوخ و گا دڵشکستەی قامەتم
هەر دە زوڵفی تۆ دەچم، سەرگەشتە و سەوداسەرم
«٦٠»

**١١- «ئەدەب» چی دی نەیە ناڵەت، لە تاراجی دڵ و دینت**
**کە ئەمرۆ ناڵە، بێ وەجهە، لە لای تورکانی یەغمایی**

تاراج: تاڵان، دزراو.

بێ وەجهە: بەبێ وەڵام و بەبێ کەسێکی ئاراستە کراوە.

تورکانی یەغمایی: تورکانی بەتاڵان و بڕۆ و داگیرکردن و بردن فێرن؛ کە لێرەدا مەبەست لە کچانی جوانی تورکە، کە دڵ و گیان و هەست دەفڕێنن.

واتە: ئەی «ئەدەب» ئیتر ئەوەندە داد و هاوار و ناڵەت، لە دەست تاڵانی دڵ و ئایینت نەبێ، چونکە کچانی جوانی فێر بوو بەتاڵان و بڕۆ و فڕاندنی بەڕەگەز تورک، دەربەستی

بیستنی ناڵە و دادی دڵدارانی خۆیان نییە و گوێ بەهاواری ئەوانە نادەن، کە لە دەست فڕاندنی دڵ و ئایین و هەست و هۆشیان؛ هاواریانە.

«سالم» دەڵێ:

١- تا دەڵێم: مروەتکە، ڕەحمێ، جەوری تۆ ئەفزوون دەبێ
داد و بێدادم لە گوێتا، هەروەها نەشنیدە ما
«٣٢»

٢- ناڵە سوودی نییە «سالم» لە دڵی کافردا
لەب بدۆزە لە ئەلەم،ئەم هەموو هاوارە عەبەس
«٧٢»

«مەحوی» دەڵێ:

کە نادا «مەحویا» دادێ بەحاڵت
بەسی بێ: داد و ئاه و ناڵە، بابەس
«١٤٦»

«وەفایی» دەڵێ:

کێو هاتە سەدا و ناڵە، بەهاواری «وەفایی»
جارێکی لە تۆ کاری نەکرد: ئاه و فوغانم
«٦٥»



## ١٣١

کێش: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەحزووف: (مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)، وەک نموونەی:

١- «نالی» وەکو زوڵفت کە موطیعی بەری پێتە
تێکی مەشکێنە، بەجەفا مەیخەرە لاوە
«نالی، ٥٣٧»

٢- فیلجوملە وەکو خاڵی ڕوخی دڵبەری «حاجی»
دڵ پەستە، دەسا بادی سەبا هەستە مەلەرزە
«حاجی قادر، ١٠٩»

**١- بەختی منی ئەی زوڵف، کە هەموارە نگوونی**
**یا سەیری منی ئەی موو، کە تۆ بێ تاب و زەبوونی؟**

هەموارە: مانای زۆرە، بەڵام ئەوەی لێرەدا مەبەستە، بەمانای هەمیشە، بەردەوام دێت.

نگوون (یا: نخوون): دەمەونخوون، هەڵاوگێڕاو، هەڵگەڕاوە، سەرەوژێر.

واتە: ئەرێ ئەی زوڵفی یار! ئەوە لە بەختی من دەچیت، کە بەردەوام دەمەونخوون بوویتەوە!؟. یان سەبری درێژ و پڕ ئارامی منیت، کە تۆش وەک من؛ لە لاوازیی و بێ هێزیدا، هەر خۆت گرمۆڵە دەکەیت؟!.

**٢- جیسمی منی ئەی طوڕە، مەگەر پڕ تەب و تابی**
**یا چاوی منی چیهرە؛ کە وەک کاسەیی خوونی؟**

تەب و تاب: پەرۆش، حەسرەت، بێ حاڵ، بێ ئارام، هەڵوەدا.

واتە: تۆش ئەی کاکۆڵی یار! هەر دەڵێی منی بێ ئارام و هەڵوەدایت، کە ئەوەندەت جووڵە و هاتووچوون لە ڕۆحتدایە؟!. تۆش ئەی ڕوخساری یار! ئەوە وەک منیت، کە ئەوەندە ئاڵ هەڵگەڕاویت، هەر دەڵێی کاسەی پڕ خوێنیت!؟.

«نالی» دەڵێ:

وەک طوڕەیی پێچپیدەیی تۆ؛ ساغ و شکستەم
وەک نەرگسی نادیدەیی تۆ؛ خۆش و نەخۆشم
«٢٨١»

**٣- هەمفەردی منی عوود، مەگەر دوودە هەناسەت!**
**هەمدەردی منی ڕوود، مەگەر زار و زەبوونی؟**

هەمفەرد: هاوجووت.

عوود: دارێکی ڕەنگ ڕەش و بۆن خۆشە، کە بۆ دووکەڵی بۆن خۆش لێ پەیداکردن دەیسووتێنن و بە زمانی هیندی «ئاگر»ی پێ دەڵێن. هەر لە هیندستان و «چین»یش دێتە بەرهەم و دوای بڕینی لە دارستان، ماوەیەک لە ژێر خاکدا دەیهێڵنەوە؛ تا بەوجۆرەی لێ دێت. (دهخدا، بەرگی ١١، ل ١٦٤٣١).

دوود: دووکەڵ.

ڕوود: ڕووبار.

واتە: ئەی داری عوود! ئەوە تۆش هاوجووتی منیت، کەوا وەک من، دووکەڵ و بۆسۆ، لە هەناسەکانت هەڵدەستێ؟! ئەی تۆ: ڕووبار! تۆش هاودەردی منیت، وا بەکزیی و لاوازیی تێدەپەڕی و ڕێ دەکەیت!؟.

«وەفایی» دەڵێ:

عەکسی زوڵف و ڕووتە، مایەی جۆششی گریانی من
چبکەم! ئاخر چاو: پڕ ئاوی دوودی عوودی مەجمەرم
«٦٠»

**٤- ئەی لالە! مەگەر سۆزی فیراقت لە جگەردا**
**ڕوخسارە بەخوێنی، وەکو من داخ دەروونی؟**

لالە: گوڵاڵەسوورە.

واتە: ئەی گوڵاڵەسوورە! ئاخۆ تۆش وەک من، لەبەر دووریی یار، ئەوەندە گریاویت، وا تۆش وەک من، ڕوخسارت سوور هەڵگەڕاوە و ناوجەرگیشت بەداخی دووریی یارەوە ڕەش بووە!؟.

«مەحوی» دەڵێ:

١- لالە ڕوخسارم لە سایەی ئەشکی خوێنین ڕەنگەوە
چونکە ڕووسوورم لە قاپیی عەین و شێن و قافەوە
«٣٢٣»



٢- لە شینی فیرقەتی ئەودا، ئەوەندە ئەشکی سوورم ڕێت
بەدەوری جێگەما تا بڕ دەکاتن دیدە، گوڵزارە
«٤٢٦»

**٥- ئاهی منە شام و سەحەر و دەردی دڵی سوز**
**یاڕەب! چ عەجەب ئایینە، لەم ئاهە مەصوونی**

لەم ئاهە مەصوونی: لەم ئاهە پارێزراوی.

واتە: هاوار و ناڵە و دووکەڵی ئاه و هەناسەی من، ئەوەندە بەئاسماندا چووە، بەری ئاسمانی تاریک کردووە و کە دەڵێن شەو دادێ؛ ئەوە شەو نییە، هەناسەی دووکەڵاویی منە و کە ڕۆژیش هەڵدێ، ئەوە نێوان پشووی گریانەکانی منە، کە ئاسمان دووکەڵی هەناسەی منی لێ دەبڕێ و ڕووناک دەبێتەوە... کەچی سەرەڕای ئەم هەموو ئاه و ناڵەیەشم؛ کە تا ئاسمان چووە، بەڵام دڵبەرەکەم هیچی لێ نەهاتووە و ئاهی من نەیگرتووە، یان: وا دیارە داد و هاوار و هەناسەی دووکەڵاویی من، کە تا ئاسمانیش دەگات، کاری لێ ناکات! تۆ بڵێی ئەو یارەی من لەسەر چ ئایینێک بێت، وا لەم ئاهەی من پارێزراوە!؟.

**٦- بۆ تیغی بڕۆت؛ چاکە دەڵێن: وەسڵەتە جەبری**
**لەم چاکە دوو ڕۆژە، بەوەفا چاکە دەروونی**

وەسڵەتە جەبری: دوو واژەی لێکدراون و بەدوو ماناش دێن: ١- وەسڵەت: بەیەک گەیشتن و دیدار و یەکتر دیتن.

جەبر-یش: بەمانای لە گەچ گرتنی ئێسکی شکاو، کە بۆ چاککردنەوەی ئێسکە شکاوەکە، دەبێ هەردوو سەری ئێسکە شکاوەکە، بەیەکەوە بلکێنرێنەوە ئەوسا بۆ ئەوەی لە یەکتر دوور نەکەونەوە، دەبێ گەچیان تێ بگیرێ و تا چەند ڕۆژێک، ئەو شوێنە شکاوە، بەو گەچەوە بمێنێتەوە.

بەکارهێنانی ئەم وێنە شیعرییەش، هێمایە بۆ ئەو پەیمانەی کە یار، بۆ: ژووان و یەکتر دیتنی دەدا و دوایی لە کاتی ئەنجامدانی بەڵێنەکەدا، یار بەڵێنەکە جێبەجێ ناکات. واتە: پەیمانەکە دەشکێنێ. بۆیە شکاندنی پەیمان؛ بەشکاندنی ئێسکی جەستە چوێنراوە، کە لە کوردیدا پەندە و دەوترێ: دەستی شکاو، لە گەردن و مل و ئەستۆی خاوەنەکەیەتی؛ واتە:

مرۆ کاتێ دەستی دەشکێ و لە گەچی دەگرن، دەبێ بۆ ئەوەی نەجوولێ، بەپارچە شتێک، لە گەردن و ملی بکەن. بۆیە کە یاریش پەیمان و بەڵێنێک دەشکێنێ، دەبێ بەڵێنی چاککردنەوەی بدات، لە گەردن و ئەستۆی بگرێ و لە گەردن و ئەستۆ گرتنیش، لە مەودایەکی تردا، مانایەکی شاعیرانەی هەیە و مەبەست لە دەست گەردن و مل کردنی یارە. بۆیە «نالی» لە بەیتە شیعرێکی لەم بابەتەوەیدا، زۆر شاعیرانە و زیرەکانە، ئۆباڵی پەیمان شکاندنی «دیدار» و «ژووان» لە ئەستۆی دڵبەر دادەنێ و دەخوازێ بڵێ: سزای ئەو بەڵێن شکاندنە، دەبێ دەستم لە گەردن و ملت بخەیت و قسەکەیشی لە دوو توێی ئەو پەندە کوردییەدا دەکات، کە ئاماژەمان پێ کرد و «نالی» بەمجۆرەی دارشتووە:

دەستم، کە بەسەد وەعدە، لە سەد جێگە شکاوە
جەبری نییە ئەم کەسرە، هەتا نەیخەیە ئەستۆ
«٣٨٥»

«ئەدەب»یش دەڵێ: بۆ چاکبوونەوەی برینی دەروونم، کە لە بەرامبەر بەجێ نەهێنانی پەیمانێکتدا، بریندار بووە، دەبێ سزاکەی ئەوە بێ، کە تا دوو ڕۆژ، دەستم لە مل و گەردنت بکەیت.

«وەفایی» دەڵێ:

لەباتی خوێنی خۆم، وەک زوڵفی، تەسکینم بەهیچ نایێ
مەگەر دەستی شکستەی خۆم، لە گەردنی زەردی وەربێنم
«٦٧»

**٧- هەر کەس کە توهی بێ «ئەدەب» ئاسا لە هەوای عیشق**
**ڕازیم بەخـــــــودا مـن بەنـەبوونی؛ نـە بـەبوونـی**

توهی: مانای گەلێک زۆرە، لەو مانایانە و بەتایبەتیش: خاڵی، خاڵی بوونەوە. بەڵام ئەوەی لێرەدا مەبەستە، بەمانای: عەڤداڵ، پەرێشان، شەیدا، هەڵوەدا، نوقم بوون، ون بوون... دێت. (دهخدا، بەرگی ٥، ل ٧١٥٩).

واتە: هەر کەسێک وەک من (ئەدەب)، لە ئەویندا هەڵوەدا و نوقم و ون بێ، ئیتر خۆزگە دەخوازم هەر جیهانی ئەوینی خۆم ببینم و هەر ئەو جیهانەم هەبێ و هیچی ترم نەبێ.



(١)





(٢)

لاپەڕەی (١) و (٢)ی نوسخەی دەستخەتی ڕەسووڵ ئاغای ئێلخانی زادە «ڕە».

(٥)



(٦)

لاپەڕەی (١١)و(١٢) نوسخەی شێخ محەمەد جەمیل زیائەدینی، کە بە «شج» ناومان بردووە.



(٧)





(١٠)

بەڵگەی (٩) و (١٠) دامێنی لاپەڕەی ئەو کتێبە مێژووییەی کە میرزا ساڵح، مێژووی مەرگی میصباح دیوان «ئەدەب»ی تیادا نووسیوە، کە مێژووەکە ئاوایە:

«١٩ جماد الثانی ١٣٣٤هیجری.

١٢٩٥/٢/٢٢ هەتاوی.

١٩١٦/٥/٢٢ زایینی.

١٧ شهر ربیع الثانی
١٣٣٢

خدمت جناب مستطاب فضائل آداب فاضل محترم [illegible]

آقا [illegible] زید فضله .

انشاالله مزاج افادت امتزاج عالی مقرون بصحت [illegible]

دقایقات شریف عاری از هر گونه کلال و ملال است

ثانیاً اگر در زحمت جواب تاخیری رفته [illegible]

انحراف مزاج باعث بوده [illegible]

گاهی مساعدت در تحریرات نمینمود [illegible]

خصوصاً [illegible] بشدت [illegible]

[illegible] در این تغییر موسم [illegible]

که اگر ناچار نبودم و خود را مجبور نمی‌ساختم تا چندی دیگر هم [illegible]

تاخیر پیدا میشد

بهر حال مکتوبات اول و ثانی جنابعالی [illegible]

سابقه شرف وصول پذیرفته [illegible]

که [illegible] طلب بود [illegible] اراده [illegible]

[illegible] گشت اگرچه اراده [illegible]

بر جنابعالی البته محقق و مشخص است [illegible]

(١٣)

(١١) و (١٢) و (١٣) نموونەی چەند نامەیەکی دەستخەتی خودی «ئەدەب» کە تیایاندا چەند مێژووییەکی جیاجیای تۆمار کردووە.



وێنەی گڵکۆی «ئەدەب» لە گوندی (باخچە)
پێش هەڵبەستنی گڵکۆکەی



وێنەی گڵکۆی «ئەدەب» لە گوندی (باخچە)
لەکاتی مەراسیمی هەڵبەستنی گڵکۆکەیدا
رۆژی ٢٠٠٥/٥/١٦

## پێڕستی دیوانی ئەدەب

### أ



### ب



### ت







### چ



### د



### ر



### ز



### س

**ی، ێ**

## سەرنج:

**١– ئەم شیعرانە لە دوایین «دیوانی ئەدەب»دا نین، کە کاک ئاسۆ «محەمەد سەعید نەجاری» ئامادەی کردووە:**







**بەشی فارسی**

**٢- ئەم شیعرانەی تریش لە سەرجەمی نوسخە چاپەکانی پێشووتری «دیوانی ئەدەب»دا نین.**



**بەشی فارسی**

## فەرهەنگی واژە

ئەمــە زۆرینەی ئەو فـەرهەنگی واژانەیە، کـە «ئەدەب» لەم دیوانەیدا بەکـاری بردووە. بۆ مـەبەسـتـەی ڕەنگە لە داهاتوودا ڕەخنەگر و توێژەر، بۆ بابەتی تر کەڵکیـان لێ ببینێ، بۆیە بەچاکم زانی ئاماژەیان پێ بکەم و لەهەمـان کـاتیشـدا خوێنەری ئەم دیوانە دەتوانێ ماناکانیـان لەناو بەشی (فـەرهەنگی ئەدەب)دا ببینێتەوە.

ئ

ئاب
ئاباد
ئابدار
ئابنووس
ئاتەش
ئاتەشین
ئاتەک
ئاخر
ئادەم
ئارا
ئاراستە
ئارام
ئارایش
ئارەزوو
ئازاد
ئازار
ئازەر
ئازوردە
ئاسایش
ئاستانە
ئاسک
ئاسمان

ئاسوودە
ئاشکار
ئاشکرا
ئاشنا
ئاشوفتە
ئاشوفتەگیی
ئاشووب
ئاشیانە
ئاگەهی
ئاگر
ئاغاز
ئافاق
ئافتاب
ئافەت
ئاڵ
ئاڵۆز
ئالوودە
ئامیختە
ئامێز
ئامێزش
ئاو
ئاوا
ئاوازەخوێن

ئاور
ئاورنگ
ئاوێنە
ئاه
ئاهستە
ئاهوو
ئایە
ئایینە
ئیهتیمام
ئوزار
ئوستاد
ئولفەت
ئومێد
ئۆگر
ئەبر
ئەبرۆ
ئەتەک
ئەتڵەس
ئەجەل
ئەحلا
ئەحوەل
ئەختەر
ئەخضەر

ئەخلاق
ئەحمەدی
ئەدا
ئەژدەها
ئەرتەنگ
ئەرەستوو
ئەرخەوان
ئەرژەنگ
ئەرسەلان
ئەرغەنوون
ئەرکان
ئەرمەغان
ئەرمەن
ئەزەل
ئەسپەند
ئەسەر (اثر)
ئەستوور
ئەسرار
ئەسفەهان
ئەسکەندەر
ئەسیر
ئەشعار
ئەشک



ئەشکال
ئەشکبار
ئەضحا
ئەگریجە
ئەعدا
ئەعلا
ئەعمال
ئەعوەر
ئەغیار
ئەفروز
ئەفسانە
ئەفسەر
ئەفسونگەر
ئەفسوون
ئەفشان
ئەفعی
ئەفلاک
ئەقاریب
ئەقدەم
ئەلەم
ئەلحەد
ئەلحەزەر(الحذر)
ئەلحەق
ئەلعەجەب
ئەلغاز
ئەڵماس
ئەمەل
ئەمثال
ئەمساڵ
ئەمیر

ئەمین
ئەنباز
ئەنجام
ئەنجوم
ئەنجوومەن
ئەندازە
ئەندام
ئەندوهـ
ئەندێش
ئەنگەبین
ئەنگوست
ئەنفاس
ئەنوەر
ئەنەلحەق (انا الحق)
ئەهل
ئەهل
ئەهواز
ئەورەنگ
ئەووەڵ
ئەیاز
ئەیمەن
ئەیوان
ئەییام
ئیبتیسام (إبتسام)
ئیجابەت
ئیجارە
ئیحاتە (إحاطە)
ئیحترام
ئیحتساب (احتساب)
ئیحتیشام

ئیختیار
ئیختیراق
ئیرەم
ئیرتیحال
ئیرتیعاش (إرتعاش)
ئیرتیقا (إرتقا)
ئیرشاد
ئیزتیراب (إضطراب)
ئیزهار (إظهار)
ئیستیفا (إستفا)
ئیسلام
ئیسم
ئیسناد
ئیعتیلا (اعتلا)
ئیعجاز (إعجاز)
ئیقبال
ئیقتیفا (إقتفاء)
ئیقرار
ئیکراه
ئیلتیجا (إلتجا)
ئیلتیفات
ئیلتیهاب
ئیمان
ئیمتیاز
ئیمکان
ئینتیزار (انتظار)
ئینس
ئینساف
ئینشا
ئینقیلاب

ئیهتیدا (إهتدا)
ئیهتیزاز

ب

باب
باخی ئیرەم
باخی یار
باد
بادام
بادە
بادەخۆر
بادەگوساری
بادیە
بار
باربەد
باریک
باز
بازاڕ
بازی
باسەڕە
باعیس (باعیث)
باغچە
بالا
باڵ
بالانما
ئوفوق
باڵەنگ
بۆسە
بازوو
باطن

بالێن
بام
بت
بتخانە
بخوور
بڕندە
بریقە
برین
بریندار
بزمار
بیسات (بساط)
بلا
بلوو
بلێسە
بنگێن
بوتگەر- بتگەر
بوخارا
بوردەبار
بوستان
بولبەشەر
بولحەسەن
بولبول
بونیاد
بونیان
بەبر
بەحر
بەخت
بەد
بەدەخشان
بەدەن

بەدر
بەدرەقە
بەدری مونیر
بەدڕیکاب
بەدو
بەدیع
بەرابەر
بەرات
بەربەت
بەرگ
بەرقەع
بەرهەڵست
بەرین
بەزم
بەسباسە
بەستە
بەستەر
بەشەر
بەچەئاهوو
بەچەتەرسا
بەگ
بتگەدە
بەرگەشتە
بەفر
بەقا
بەڵا
بەڵان
بەڵخ
بەم
بەموو

بەنالوش
بەنەفش
بەنەوش
بەند
بەندە
بەندەر
بەندەگی
بەها
بەهار
بەهەشت
بەهمەن
بەهێ
بەی
بەیان
بەیز بیض
بەین
بەچەتەرسا
بەر
بەرمەلا
بەعدەز
بەلا
بەهانە
بەیع
بێباک
بێجا
بێحاڵ
بێخەبەر
بێدار
بیر
بێزار

بیزاعەت (بظاعة)
بێستان
بێشە
بێچارە
بێگانە
بێعار
بیلاد
بیم
بیمار
بێهوودە

## پ

پا
پابەند
پاتەخت
پاپا
پاداش
پادشەه
پار
پاسەبان
پاماڵ
پایان
پایبەند
پایماڵ
پایین
پڕ
پرتەو
پرگار
پست
پستان



پستە
پسەر
پشکۆ
پشکووتن
پوستان
پوود
پووشیدە
پوور
پەخش
پەدیدار
پەڕ
پەرەنگ
پەرداز
پەردە
پەردەدار
پەرستار
پەرش
پەرچەم
پەرواز
پەروانە
پەروەر
پەروەرش
پەروین
پەری
پەڕیدە
پەرێشان
پەزیر
پەزیرایی
پەسەندیدە
پەشەن

پەشیمان
پەلەنگەر
پەناه
پەنجە
پەنجەی تورکان
پەند
پەنهان
پەیاپەی
پەیام
پەیغام
پەیک
پەیکار
پەیکان
پەیکەر
پەیمان
پەیمانە
پەیوەند
پیاڵە
پیر
پیرۆزە
پیران
پیرەهەن
پیلەگر
پیما
پیلە
پیلەوەر
پێ
پێچ
پێش ئەز
پێکان

پێکەنین
پێوەند

## ت

تاب
تابان
تابدار
تابش
تابع
تابناک
تاتا
تاتار
تاج
تاجدار
تار
تاراج
تاریک
تازە
تاعەت
تاق
تاقەت
تاقی کیسرا
تاڵ
تالب (طالب)
تاڵح
تالع
تام
تاو
تاوان
تاووس

تبت
ترش
تشرین
تفل (طفل)
تلووع (طلوع)
توربەت
تۆبە
تورت
تورفە
تورک
تورنج
تورک تازەیی
تورکی کەماندار
توند
تونگی
تووبا (طوبا)
تووتی
توور (طور)
توول
توولانی (طولانی)
توولە نەمام
تەئەمول
تەئەننی
تەبەسسوم
تەبع (طبع)
تەبیب (طبیب)
تەجەڕوع
تەجەللا
تەحسین
تەحریک

تەحەممول
تەخت
تەختە
تەختەتوع (تخطؤ)
تەدبیر
تەدریس
تەدەللول
تەڕ
تەراز
تەرازوو
تەراوەت (طراوة)
تەرەب (طرب)
تەرەف
تەرەک
تەرح (طرح)
تەردید (تردید)
تەرز
تەرسابەچە
تەرغیب
تەرکەش
تەرکیب
تەڕلان
تەرنسا
تەرسا
تەروق
تەرەف
تەریق (طریق)
تەریقەت
تەزەروو
تەزویر

تەسەوور (تصور)
تەسخیر
تەشبیه
تەشریح
تەشککور
تەصویر
تەطاول (تطاول)
تەعریف
تەعزیم
تەعم (طعم)
تەعن
تەعنە
تەعەللول
تەغەزوول
تەغافول
تەفاوەت
تەفەققود
تەفەککور
تەفەیوء
تەفریح
تەقازا (تقاضی)
تەقدیر
تەقوا
تەکەببور
تەکفیر
تەڵا
تەڵخ
تەلافی
تەڵەب (طلب)
تەلەففوز

تەلعەت
تەلیسم
تەماشا
تەمام
تەمایل
تەمەتوع
تەمەع (طمع)
تەمەللول
تەمیز
تەن
تەنەفور
تەنگ
تەنها
تەنناز (طناز)
تەهنیەت
تەوئەم
تەوازوع
تەوانگەر
تەوبە
تەوزیح
تەوسەن
تەوع (طوع)
تەوق
تەووقوع
تەوەسسول
تەهمتەن
تەیهوو
تیبەت (طیبە)
تیپ
تیر

تیرە
تیرەباران
تیرەگی
تیرەنداز
تیشک
تیغ
تێکەڵ
تیکرار تکرار

### ج

جادووگەر
جام
جامە
جامی جەم
جان
جان سپاردە
جانان
جانب
جانبەخش
جانبەروەر
جانشکار
جانفەزا
جانیب
جانیسپار
جاویدان
جرم
جزو
جگەر
جگەرسۆز
جنوود



جە
جەبر
جەبهە
جەبین
جەدوار
جەژن
جەڕاڕ
جەرەس
جەزا
جەسارەت
جەستە
جەسوور
جەعبە
جەعد
جەفا
جەفاکێش
جەلا
جەڵد
جەمال
جەمع
جەم
جەناب
جەنگ
جەننان
جەننەت
جەواب
جەواڵ
جەور
جەوشەن
جەوهەر

جەیحوون
جەیران
جوبران
جودا
جودایی
جورعە
جورم
جوز
جوست
جووت
جۆیبار
جۆڵا
جۆبار
جیسم
جیلوە
جیلوەگەر
جیهان
جیهاندار
جیهانداریی
جیهانگیر

### چ

چابووک
چادر
چارە
چاردە
چار
چالاک
چاه
چاوەنواڕ

چەرخ
چەشم
چەگیل
چەفتە
چەلیپا
چەم
چەمەن ئارا
چەنبەر
چەنگ
چەو
چەوگان
چرا
چراغ
چما
چنگ
چیدە
چین
چین و چەنبەر
چیهرە
چیرە
چارەبین
چەنگیز

### ح

حاجەت
حازر
حاڵ
حاڵەت
حساب
حوباب

حور
حوزن
حوزوور
حوسن
حوققە
حوکم
حۆری
حۆری وەش
حەبەش
حەپس
حەد
حەدد
حەروون
حەریر
حەریف
حەزەر
حەزرەت
حەزم
حەزین
حەسار
حەسەن
حەسرەت
حەشر
حەصر
حەفت
حەقیق
حەقیقی
حەککاک
حەلاڵ
حەلاوەت

حەلقە
حەمدان
حەمل
حەملە
حەنزەل (حنضل)
حەواڵە
حەورا
حەوسەڵە
حەیات
حەیران
حەیف
حیجاب
حیجلە
حیرە
حیرەت
حیشمەت
حیلەت
حیلە

## خ

خۆشئاواز
خۆشان
خۆشخەت
خۆنوێن
خاتەم
خار
خارا
خارەزم
خاریج
خازن خازین
خاس
خاسییەت
خاشاک
خاقان
خاکەدەر
خاڵ
خالق
خالیس
خام
خامە
خانە
خاو
خاوەر
خڕ
خڕۆش
خراب
خزمەت
خدر (خضر)
خسووس
خواب
خوابگەهـ
خوب
خوبان
خوبی
خوبس (خبث)
خوتەن
خوجەست
خوداوەند
خودڕا
خودڕوو
خودسەر
خوڕەم
خورسەن
خورشید
خوسرەویی
خوسوس
خولد
خولدی بەرین
خوللەر
خوم
خومار
خونخوار
خونین
خوو
خووبان
خوون
خوێن
خوێنرێژ
خەبەر
خەبەردار
خەت
خەتا
خەتابار
خەتەر
خەتم
خەجاڵەت
خەجەڵ
خەدەنگ
خەر
خەرابات
خەرابە
خەرامان
خەرقە خاک
خەرمەن
خەریدار
خەزانە
خەزەر
خەس
خەستە
خەستەحاڵ
خەسرەو
خەشم
خەضرا
خەططاب
خەگوسار
خەفیتەن
خەڵات
خەلایق
خەلەست
خەڵق
خەللاق
خەڵوەت
خەلیق
خەم
خەمبار
خەمەن
خەمخوار
خەمڕەوێن
خەمسەیی عەبا
خەملێو



خەمیرە
خەنجەر
خەندان
خەندە
خەنزەران
خەو
خەوەرنەق
خەوش
خەوف
ختیاب
خەیاڵ
خەیمە
خەیمەران
خیتاب
خیتتە خیگە
خێر
خیرە
خێز
خیلاف
خیلعەت
خیلقەت

## ژ

ژاژە

## د

دادگەر
داو
دەست
دڵدوز
دان
دانە
دڵبەر
دڵدۆز
دڵکەش
دورج
دەربەدەر
دەن
دەهر
دەهەن
دید
دیدە
دیوار
دیوان

## ذ

ذەقەن
ذی نەظەر

## ڕ

ڕا
ڕائیحە
ڕاح
ڕاحیلەزاد
ڕاحیلەڕێ
ڕاز
ڕاسان
ڕام
ڕامشگەر
ڕان
ڕاهنما
ڕابەر
ڕایح
ڕستە
ڕسوا
ڕفو
ڕوئیەت
ڕواق
ڕوباب
ڕوبەند
ڕوح
ڕۆحپەروەر
ڕوحولئەمین
ڕوخ
ڕوخام
ڕوخسار
ڕورەش
ڕۆز
ڕۆزا
ڕۆژگار
ڕۆشن
ڕۆم
ڕوکن
ڕوهەر
ڕوهڕەو
ڕوو
ڕوود
ڕووسیەهـ
ڕووس
ڕوومەت
ڕەئفەت
ڕەبت
ڕەتڵ
ڕەجا
ڕەحم
ڕەحمەت
ڕەحیق
ڕەخشا
ڕەخشندە
ڕەززاق
ڕەزم
ڕەستەخێز
ڕەسەن
ڕەسم
ڕەسیدە
ڕەعشە
ڕەعنا
ڕەغبەت
ڕەغم
ڕەفح
ڕەفیق
ڕەقس (رقص)
ڕەقیب
ڕەمانە
ڕەم
ڕەنج
ڕەنجە
ڕەند
ڕەنگ
ڕەنگین

ڕەھ
ڕەھگوزار
ڕەھا
ڕەھبان
ڕەھن
ڕەواق
ڕەوانبەخش
ڕەوەزە
ڕەوەند
ڕەوش
ڕەوشەن
ڕەونەق
ڕەیخوور
ڕەققاس رقاص
ڕیا
ریاز (ریاض)
ڕێزە
ڕێزوان
ریسالەت
ڕیکاب
ڕیواق
ڕەقەم
ڕاهزەن
ڕەنج
ڕەفتار

**ز**

زائیقە (ذائیقە)
زات
زاد
زار
زاهیر
زرێ
زنج
زنجیر
زود ڕەم
زورەنەب (ذوذەنەب)
زوغەن
زوقم
زومرود
زولاڵ
زوڵەیخا
زوڵف
زوڵمەت
زومرە
زومڕدین
زوهد
زوهرە
زووتبار
زویر
زەبوون
زەحم
زەحمەت
زەخخار
زەخمدار
زەڕ
زەڕگەڕ
زەڕنیشان
زەریف
زەغەن
زەقەن
زەکات
زەلیق
زەنەخدان
زەنگ
زەنگار
زەنگبار
زەنگین
زەواڵ
زەوت
زەوق
زەیغەم (ضیغم)
زیب
زیبا
زیبەندە
زیڕ
زیروبەم
زیکر
زیللەت
زینەت
زیندان
زیندە
زیندەگانی
زیندەگی
زیهد
زێوەر
زود
زۆر
زاویە
زەمانە

**ژ**

ژاژە

**س**

سات
ساحەت
ساحێب
ساحیر
ساحیل
سادە
سادەروو
سادق
سارا
سارەوان
ساز
ساعەت
ساعید
ساغەر
ساف
ساقی
ساکین
سامان
سانیع
ساوا
سایە
سایە نشین
سبوت (ثبوت)
سبوح
ستاڵە
ستەمکار



سروشت
سروود
سپەنگ
سپی
سڕ
سرەوت
سرپشک
سروەت
سزاوار
ستەمگەر
سکوون
سلێمان بەگی یاوەر
سمیعنا واطعنا
سنەوبەر
سنێممار
سوبحە
سوپاھ
سوپەر
سوپەھ
سوحبەت
سوحبەتی ناوا
سوخبەت
سوختە
سوخەن
سوخەندان
سوخەنوەر
سوخمە
سورەت
سورەییا
سورمە
سوزان
سوزەندە
سوعبان (ثعبان)
سولب صُلُب
سوڵتان
سوڵتانی خوتەن
سولەیمان بەگی یاوە
سویحدەم
سوڵح
سونبول
سوها
سوهەیل
سوور
سوورە
سۆز
سۆزە
سۆسەن
سۆفی
سەبا
سەباح
سەبەب
سەبەبکار
سەبر
سەبز
سەبزە
سەبک
سەبوو
سەبووحی
سەتح
ستەم
سەتوەت
سەتیر
سەجار
سەحەر
سەحەرگاھ
سەحرا
سەحن (صحن)
سەحیب
سەحیق
سەخابەچە
سەخت
سەخرە
سەخرەیی صەمما
سەدا
سەدەف
سەددانە
سەر
سەرئەنجام
سەرا
سەراپا
سەراپەردە
سەراحەت
سەراسەر
سەراسیمە
سەراوێز
سەرباز
سەرپاک
سەرخۆش
سەردار
سەرزەدە
سەرسەری سوراحی
صواحی
سەرشار
سەرچەشمە
سەرگەردان
سەرف
سەرفی نەزەر
سەرکەش
سەرکەشیدە
سەرکیش
سەرنگوون
سەرو
سەرواز
سەروچەمان
سەری کەرزیبی
بوستان
سەگەشتە
سەعادەت
سەعد
سەفا
سەف
سەفئارایی
سەفا
سەفەر
سەفحە
سەقەر
سەقر
سەقف
سەلام
سەڵتەنەت

سەلسەبیل
سەلّقەت
سەم
سەمەنگون
سەما
سەماع
سەماوات
سەمەترار
سەمەر (ثمر)
سەمەن
سەمەن سا
سەمەندەر
سەمتوور
سەمین
سەنا (ثنا)
سەندەل (صەندەل)
سەنەم
سەنتوور
سەنجاب
سەنجەر
سەنگ
سەنگەر
سەنگین
سەنعەت
سەهبا
سەهەرگاه
سەهن
سەواب (ثواب)
سەواد
سەوت

سەودا
سەوداسەر
سەوداگەر
سەوسەن
سەیاحەت
سەیر
سەیران
سەییاد صیاد
سیاه
سیبەر
سیبرە
سیەهمار
سیجاب
سیحەت صیحە
سیحر
سیدرە
سیدق
سیراب
سیرە
سیفارش
سیفەت
سیلسیلە
سیما
سیمتەن
سیم
سیمین
سیمین بەر
سیمین تەن
سیمینبەر
سینا

سینە
سیەه
سیەهپۆش
سیەهچوردە
سیەهزاغ
سیپهر
سەفوەت
سروود
سەرین
سپەر

**ش**

شۆخ
شۆر
شۆرب
شۆرش
شا
شاتووت
شاپەڕ
شاخ
شاد
شادان
شار
شاری جەلال
شافیع
شام
شاه
شاهی بوخارا
شاهید
شاهێن

شایستە
شکار
شکست
شەککەرین
شکڵ
شکۆفە
شکۆه
شکەم
شکەن
شکەنج
شڵ
شمش
شمشاد
شەئن
شەب
شەبەق
شەبوستان
شەت (شەط)
شەتاب
شەیپور
شەمەن
شەدداد
شەڕ
شەراب
شەربەت
شەربەتی نار
شەرت
شەرەنگ
شەرح
شەرزە



شەرگار
شەرمەزار
شەست
شەشپەر
شەشدەر
شەعرا
شەفەق
شەفیق
شەق
شەقایق
شەققولقەمەر
شەقیق
شەکەرخێر
شەکەرناز
شەکەرین
شەکر
شەکرخان
شەککەر ئەسفەهانی
شەککەرساز
شەکیب
شەکیبایی
شەم
شەماڵ
شەمامە
شەمایل
شەمس
شەمع
شەمیم
شەنا
شەهاب

شەهبار
شەهباز
شەهد
شەهدی موصەففا
شەهر
شەهسوار
شەهلا
شەهی خاوەر
شەهی خوبان
شەهێن
شەو
شەوارە
شەواو
شەوبۆ
شەوەزەن
شەوەزەنگ
شەوەکی
شەوڕەنگ
شەوگار
شەوق
شەوکەت
شەووال
شەیدا
شوان
شوبهە
شوعاع
شوعبەدە
شوعلە
شوعلەوەر
شوهرە

شوهرەیی ئافاق
شووش
شووشە
شێت
شیتان
شێخ
شێر
شیراز
شیرین
شیشە
شیفا
شیفتە
شین
شێواز
شێواو
شێوەباز
شاکار
شەریک
شەرا
شانە
شەوەکی
شینا

**ض**

ضیا

**ص**

صەما
صەندەل
صەید
صیام
صەبووحی
صەییاد
صەباح

**ط**

طوور
طەبع
طەڕار
طەراوت
طەریدە
طەعم
طەناب
طەنناز
طیبەت
طیراز

**ظ**

ظل
ظەلام
ظەلما
ظهور

**ع**

عابید
عاج
عادە
عادەت
عادل
عار
عارەقچین

عارز
عارف
عاريز
عاسی
عاشق
عاق
عالەم
عام
عروس
عشرەت
عقيد
عورەفا
عوزار
عوزر
عوززا
عوزلەت
عوزو (عضو)
عوشرەت
عوششاق
عوقاب
عوقد
عولوو
عومر
عوود
عەبد
عەبير
عەتا
عەتر
عەتنار
عەجايب

عەجەب
عەجەم
عەجيب
عەدەم
عەدل
عەرەق
عەرز
عەرسە
عەرش
عەرەب
عەزاب
عەزادار
عەزم
عەزيز
عەساكەش
عەسەس
عەسر
عەسكەر
عەقد
عەقدی ثورەييا
عەقرەب
عەقڵ
عەقيق
عەكس
عەلاوە
عەلەم
عەمامە
عەمدەن
عەنان
عەنبەر

عەنبەری لەرزان
عەنبەرين
عەندەليب
عەنقا
عەهد
عەوەز
عەيب
عەيش
عەين
عەييار
عيادەت
عيان
عيبرەت
عيتاب
عيجز
عێراق
عيزر (عِزّ)
عيزز
عيسا
عيسەوی
عيسمەت
عيشق
عيشوە
عيشوەگەر
عيلاج
عيلاقە
عيللەت
عينوان
عيززەت
عيبادەت

## غ

غارەت
غارەتگەر
غافڵ
غايەت
عاليە
غروور
غوبار
غوراب
غوڕە
غوسسە (غصّە)
غولاّم
غەددار
غەبغەب
غەرق
غەرقاب
غەريب
غەريق
غەزا غەزا
غەزال
غەزەل
غەزەلخوان
غەش
غەفار
غەفوور
غەڵەت غەمماز
غەزەنفەر
غەمام
غەمبار



غەمخوار
غەمڕەوێن
غەمزە
غەمزەدە
غەمگوشار
غەمناک
غەنەج
غەنج
غەوغا
غەير
غەيرەز
غەيوور
غيلمان

## ف

فاريغ
فازڵ
فاش
فەتتان
فايدە
فتوور
فرسەت
فرسەنگ
فرمان
فروزان
فروزەندە
فروغ
فرياد
فريب
فريشتە

فشان
فكەن
فكرەت
فلان
فنجان
فەتەن
فەتح
فەخر
فەڕ
فەراخور
فەراهەم
فەرەحبەخش
فەرەخرا
فەرەش
فەرەيدوون
فەرخار
فەرزانە
فەرمانبەر
فەرمايش
فەرهاد
فەروەردين
فەريادڕەس
فەزا
فەزڵ
فەساد
فەسڵ
فەغان
فەقير
فەلەک
فەن

فەنا
فەنەر
فەهم
فەوج
فەيز (فيض)
فيترەت
فيتنەزا
فيدا
فيراق
فيراق
فيردەوس
فيرعەون
فيرقەت
فيرووزە
فيتنە
فيكر
فەرمايش

## ق

قابيل
قاتيل (قاتل)
قادری
قار
قاروون
قاسيد
قافلە
قافيە
قاقوم
قاڵب
قامەت

قانوون
قايم
(قَدُكُفَا)
قدووم
قڕوقاڵ
قسوور
قوتبی بەستامی
قودرەت
قوڕابە
قورب
قوربان
قورص
قورنفول
قول
قوم
قووت
قووەت
قەبا
قەبا
قەتار
قەتارە
قەترە
قەتڵ
قەد
قەدەح
قەدەر
قەدەحدار
قەدەم
قەدر
قەديم

قەرار
قەراڵ
قەریب
قەرین
قەزا
قەست
قەسەم
قەسد
قەسر
قەشەنگ
قەفا
قەفەس
قەفقاز
قەڵەم
قەلعە
قەمەر
قەمسەر
قەند
قەندان
قەندی بەندەر
قەندیل
قەهر
قەهقەهە
قەوارە
قەوام
قەوس
قەیسەر
قیاس
قیافە
قیامەت

قیبلە
قیدەم
قیر
قیرتاس قرگاس
قیسمەت
قەراوەل

## ک

کاخ
کارگە
کاروان
کازیبە
کاژ
کاژووژ
کاسە
کاشانە
کاشغەر
کاشمەر
کافر
کافوور
کافی
کاڵ
کاڵا
کامیل
کان
کانوون
کاینات کائینات
کبریا
کردار
کردگار

کرمان
کرێشمە
کشاو
کشت
کشوەر
کفر
کلا
کلیسا
کن
کورتەک
کورد
کورە
کوشتە
کوڵخەن
کوڵم
کونج
کووچە
کوهساران
کوێر
کۆتر
کۆتەه
کۆڕ
کۆڵان
کۆهسار
کۆه
کەباب
کەبک
کەتیبە
کەح
کەدەر

کەرەم
کەساد
کەسر
کەسک
کەشتی
کەشش
کەشف
کەشیدە
کەعبە
کەف
کەفی مووسا
کەلا
کەلام
کەلام
کەلیم
کەم و بیش
کەمال
کەماندار
کەمانکەش
کەمەن
کەمەند
کەنار
کەنارەجو
کەنگێ
کەو
کەواکیب
کەوان
کەوە
کەوسەر (کوثر)
کەوکەبە



کەی
کەیفیەت
کەبکی مطەووەق
کیبر
کیسوەت
کینەسازی
کێهە
کێمە
کەم
کۆهکەن
کەمین
کشت
کەچ نەزەر
کەمینە

## گ

گاز
گاه گا
گاهگاه
گرام
گرەو
گڕزیدە
گرشە
گرفتار
گژنیژ
گروگاڵ
گروو
گریان
گرێه گرەه
گڵ

گورج
گوزەر
گوزەرگاه
گوزەشتە
گوڵ
گوڵبەدەم
گوڵاب
گوڵاو
گوڵبەدەن
گوڵبەرگ
گوڵبەندەم
گوڵبون
گوڵپەیکەر
گوڵخیز
گوڵڕەنگ
گوڵروو
گوڵزار
گولستانی
گوڵشەکەر
گوڵشەن
گوڵچنین
گوڵگوون
گوڵعوزار
گوڵنار
گومڕەه
گوناه
گونەهکار
گونجایش
گوهەر
گوهەر سەنج

گوهەر گون
گوهەربار
گوهەرزا
گێلاس
گینگڵ
گۆشە
گۆ
گۆزەرتاب
گۆشەوارە
گەزاف
گەبر
گەدا
گەداسان
گەرد
گەرداب
گەردش
گەردن
گەردوونی
گەزاف
گەزیدە
گەش
گەنج
گەنجینە
گەه
گەوارا
گەواه
گەوهەر
گەوهەرین

## ل

لات
لادەن
لازم
لاف
لاک
لالە
لالە ڕوو
لالەڕوخ
لالەزار
لالەعوزار
لالەیی حەمرا
لایق
لنگە
لوتف
لوججە
لوعاب
لوعبەت
لۆمە (لەومە)
لوولە
لەئم
لەئالی
لەب
لەبالەب
لەبڕێز
لەتافەت
لەتیف
لەحزە لحظە
لەحن

لەززەت
لەزیز
لەشکرگەھ
لەعل
لەعلی بەدەخشان
لەغز
لەنجە
لەنگ
لەنگەر
لەیل و دوجا
لیباس
لیقا
لێو

**م**

مائی موعین
مابەین
ماتەم
مار
ماسیوا
ماشقە
ماچ
ماچین
مامضی
مانی
ماه
ماهتاب
ماهروو
ماهی
ماهیر

ماوەرا
مایە
مایل
محاڵ
مژۆڵ
مراوی
مرووەت
مزجات
مزدوور
مزگەوت
مستەفا
مسەلەپ میلپ
مسک
مسکین
مشتەری
مشق
مشک
مشکین موو
مصەووەر
مقەووەس
ملەووەن
منەووەر
مننەت
موئمین
موئنیس
موافق
موبارەک
موبتەلا
موبدیع
موبین

موتەحەییر
موتەشەکیل
موتریب
موتڵەق
موجەددەر
موجەسسەم
موحابات
موحتاج
موحەققەر
موحظەر
موحیبەت
موحیت محط
موخاتەب
موختار
موختەبەر
موختەسەر
موخەیەر
مودام
موداوا
موداوا
موددەعی
موژە
موژدە
موژگان
مورەببەع
موردە
مورشید
مورغ
موزەییەن
موساحەبە

موسەتتەر
موستەعار
موستەوجیب
موسەججەع
موسەخخەر
موسەلسەل
موسەللەم
موشتاق
موشەووەش
موشیر
موصەووەر
موطظەڕا
موظلیم
موعەتتەر
موعەربەد
موعجیزە
موعەللا
موغ
موغبەچە
موغەللا
موقابیل
موقەتەع
موقەددەر
موقەڕەر
موقەششەر
موقەننەع
موکافات
موکەددەر
موکەڕەڕ
مەکەن



مول
مولەممەع
مولستان
موڵک
مومتاز
مومکین
مونەججیم
مونەققەش
مونجیم
مونحەسیر (منحصر)
مونکیر
مونیر
موهەڕەب
موهەززەب
موهەننا
موهەییا
موهرە
موو
مووسا
موبیەسەر
مەئاثر
مەئمەن
مەئوا
مەتاع
مەتڵەب
مەتلەع
مەجازیی
مەجلیس
مەجمەز
مەجنون

مەجووس
مەحال
مەحبەس
مەحجەر
مەحرووم
مەحزوون
مەحسوول
مەحشەر
مەحفەل
مەحکەم
مەحکووم
مەحمود
مەحو
مەحەببەت
مەخزەن
مەخلووق
مەخموور
مەدامە
مەدح
مەدحی ستەبدەق
مەددی نەظر
مەدهۆش
مەدهەتگەر
مەراڵ
مەرام
مەرجان
مەرحەل
مەرحەمەت
مەرد
مەڕمەڕ

مەرهەم
مەریەم
مەریز مریض
مەزاب
مەزاح
مەزار
مەزە
مەزڵووم
مەزهەب
مەسافەت
مەست
مەسروور
مەسموع
مەسنەد
مەسیح
مەشام
مەشەققەت
مەشق
مەشهوور
مەشیئەت
مەصحەف
مەصووب
مەصوون
مەگەس
مەعازەڵڵا
مەعاسی
مەعانی
مەعدووم
مەعدوون
مەعشووق

مەعلووم
مەعلووم
مەعنا
مەغبوون
مەغز
مەغفەر
مەفتوول
مەفتوون
مەقبوول
مەقدەم
مەقسەد
مەقسوود
مەکر
مەکووک
مەکەن
مەکید
مەلائیک
مەلال
مەلامەت
مەلەنگ
مەلعوون
مەللاح
مەلیح
مەلیحان
مەمات
مەمک
مەملەکەت
مەملوو
مەنجەنیق
مەنزەڕ منظر

مەنزڵ
مەنزوور
مەنسووخ
مەنصوور
مەنع
مەنکیر
مەه
مەهئاشام
مەهتاب
مەهجەبین
مەهلیقا
مەهوەش
مەهی خاوەر
مەهپەیکەر
مەوتەن
مەوج
مەوزوون
مەوزیع
مەوعیزە
مەولا
مەوهووم
مەوهیبەت
مەی
مەیدان
مەیزەدە
مەیگوسار
مەیکەدە
مەیل
میجمەر
میحراب

میحنەت
مێزەر
میسباح
میسر
میسل (مثل)
میقنەع
مینا
مینوو
میهان
میهر
میهرەبان
مشکین
مەنواڕە
مەوار
موصعەفا
مەککار
موعین
مۆنیس
مەحبوب
مەرجەلە
مەرعەر بەرد
مینا
مینود
مەنزوور
مورغ
مەتبوع
مەقبوول
مەعجوون
مەلەک
مەقدەم

موهد
مضمد

### ن

ناب
ناتەوان
ناجی
ناخون
نادان
ناژوو
نار
نارەوەن
نارنج
ناری دانە
ناز
نازەنین
نازدار
نازک
ناسک
ناسیخ
ناچار
ناگاه
ناگەهان
ناف
نافە
نافەبار
نافەدار
ناکام
ناکەس
ناڵە

ناڵین
نام
نامە
نامویەسەر
ناهەموار
ناوا
ناوەک
ناووک
نایرە
نبوودت
نثار
نرخ
نسار
نگونسار
نگوون
نعم المآب
نم
نموودار
نوتق
نوسرەت
نوغوز
نوقتە
نوقرە
نوقڵ
نوکتە
نوکهەت
نوما
نوور
نووشین
نۆش



نەبات
نەجات
نەخشەب
نەخشین
نەخچیر
نەخل
نەدیم
نەرم
نەزاکەت
نەزە
نەزەر
نەززارە (نظارە)
نەزم
نەس
نەسرین
نەستەرەن
نەسیحەت
نەسیم
نەشئە
نەصارا
نەغز
نەغمە
نەغمە نەواز
نەفەس
نەفخە
نەفخی سوور
نەقس نقص
نەقش
نەقشبەند
نەققاش

نەقڵ
نەمام
نەکیسا
نەنگ
نەهات
نەهاڵ
نەهانی
نەو
نەوا
نەواز
نەوبەهار
نەوجەوان
نەورەس
نەوع
نەوکار
نەی
نەیڕەنگ
نەیشەکەر
نیاز
نیران
نێرگس
نیروو
نێزە
نیسبەت
نێش
نیشات
نیشات (نشاط)
نیثار
نیشان
نیشانە

نیگار
نیگاه
نیگەه
نیعمەت
نیقاب
نیکو
نیلوفەڕ
نیهاڵ

### ه

هات
هادیی
هالە
هاموون
هاوار
هاوەن
هوشیار
هوڵوو
هەدادان
هەدەر
هەدەف
هەدیە
هەژار
هەژار
هەرا
هەزار
هەزل
هەفراد
هەفرادە
هەلا هەل

هەمبەستەر
هەمجوار
هەمدەرد
هەمدەرس
هەمدەم
هەمڕاز
هەمرەزم
هەمسەر
هەمسوحبەت
هەمصورەت
هەمفەرد
هەمنەفەس
هەمنشین
هەموارە
هەمیشە
هەنار
هەنەر
هەنگام
هەنیە
هەوا
هەواڵە
هەوز
هەوسار
هەیئەت
هەیبەت
هەیهات
هیولا
هیجر
هیجران
هیجرەت

هێرش
هیلاک
هیلال
هیمەت
هیند
هیندوو

و

واجب
وادی
واعیز
واقیع
واله
وەتاغ
وەتەن (وطن)
وەجد
وەجھ
وەحشی
وەدیعە
وەرا
وەرع
وەسەن (وثن)
وەسڵ
وەسڵەت
وەسواس
وەسوەسە
وەعدە
وەغا
وەفا
وەفادار
وەقت
وەنەوشە
وەهم
وجوود
ویژدان
ویرد
ویساڵ
ویستاکە
ویسعەت
وێڵ
وێنە

ی

یادیاران
یاسمین
یاقووت
یاللعجب
یوسر
یوسرا (یسری)
یوسف
یومنا (یمنی)
یوونس
یەدی بەیزا (ید بیضاء)
یەسار
یەغما
یەکبارە
یەکسان
یەڵدا
یەمەن
یەمین
یار
یەقین
یادگار
یاسەمەن

**بەرهەمی چاپکراوی نووسەر:**

١- ژوان، شیعر، چاپی یەکەم، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی ١٩٨٠.
٢- گەشتی ڕیچ بۆ سلێمانی، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، بەرگەڵوو ١٩٨٤.
٣- کێشەی کورد، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، یاخ سەمەر ١٩٨٦.
چاپی دووەم، ئێران، تەورێز ١٩٩٠.
چاپی سێیەم، هەولێر، ١٩٩٢.
٤- گوڵەکانی دۆزەخ، شیعر، چاپی یەکەم، ئێران، تەورێز ١٩٩٠.
چاپی دووەم، هەولێر ١٩٩٢.
٥- گەشتی ڕیچ بۆ کوردستان، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، ئێران، تەورێز، ١٩٩٢.
چاپی دووەم، ئێران، تەورێز، ١٩٩٥.
چاپی سێیەم، هەولێر، ٢٠٠٢.
٦- ئەفسانەی ئەدۆنیس، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، ئێران، تەورێز، ١٩٩٤.
٧- گۆرانی کوردی، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، ئێران، تەورێز، ١٩٩٤.
٨- مێژووی مۆسیقای کوردی، چاپی یەکەم، ئێران، شهر کُرد، ١٩٩٦.
چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٢.
٩- سەیید عەلی ئەسغەری کوردستانی، چاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٩٨.
چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٢.
١٠- ڕاوە گزنگ، وتار و ڕەخنەی ئەدەبیی، چاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٩٨.
١١- بیرەوەرییەکانی وەفایی (تحفة المريدين)، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، هەولێر، ١٩٩٩.
١٢- کەروێشکی زیرەک و گورگی دانا، چیرۆکی منداڵان، وەرگێڕان، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٠.
١٣- شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەی قاجاریدا: چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٠.
١٤- میرنشینی ئەردەڵان، بابان، سۆران، لە بەڵگەنامەی قاجاریدا: چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٢.
١٥- ڕاپەڕینی هەمزاغای مەنگوڕ لە بەڵگەنامەی قاجاریدا: چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٢.
١٦- کەروێشک و چەقەڵ: چیرۆکە شیعری منداڵان، هەولێر ٢٠٠٥.
١٧- دیوانی ئەدەب: میصباح دیوان، ئامادە و بەراورد و فەرهەنگ.

**بەرهەمی داهاتوو:**

١- شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەی نێودەوڵەتیدا.
٢- خوێندنەوەیەکی تازەی مەولانا خالیدی نەقشبەندی، لێکۆڵینەوە.
٣- دیوانی مەولانا خالید، تەرجەمەکەی کوردی.
٤- خوێندنەوەیەکی تازەی مەولەوی تاوەگۆزی.
٥- دیوانی مەولەوی تاوەگۆزی.
٦- ڕاپەڕینی سمکۆ لە بەڵگەنامەی قاجاریدا.